



# شوناسی ئۆلی و فەلسەفەی نەتەوەی کورد





محەمەد حیجازی




حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرێتیی گشتیی رۆژنامەنووسیی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی






بەڕێوەبەرێتیی

چاپ و بڵاوکردنەوەی

سلێمانی

٢٠١٢

# شوناسی ئۆلی و فەلسەفی نەتەوەی کورد


- نووسەر: محەمەد حیجازی
- بابەت: لێکۆڵینەوەی مێژوویی
- پیتچنی: نووسەر
- هەڵەچنی: محەمەد عەبدوڵلا
- نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: ئەکرەم محەمەد ئەمین
- سەرپەرشتیاری کتێب: کارزان عەبدوڵلا
- ژمارەی لاپەڕە: ٤٠٨ لاپەڕە
- زنجیرەی گشتیی کتێب: ( ٩٠٨)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- چاپخانە: چاپخانەی کەمال
- نرخ: ( ٤٠٠٠) دینار
- ژمارەی سپاردنی (٢٦٧٧)ی ساڵی ٢٠١٢ی وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

**بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی**
**گردی ئەندازیاران**
**ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩**

# کورتە بەسەرهات

محەممەد حیجازی لە پاییزی ١٩٤٩ لە شاری سنە لەدایکبووە، هەر لەوێ خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی تەواو کردووە. لە حەفتاکاندا لە زانکۆی "تەبرێز" خوێندوویەتی و کارنامەی ماستەری لە "زانستە کۆمەڵایەتییەکان" وەرگرتووە. لە ١٩٨٠تا ٢٠٠١ مامۆستای "کۆمەڵگاناسی" خوێندنگاکانی کرماشان و سەقز و سنە بووە. لە ٢٠٠١دا خانەنشین کراوەو ئێستا لە سنە دەژی. بەرهەمیتری ئەم نووسەرە جگە لە هەندێ وتار لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی رۆژهەڵات و باشوور، راستکردنەوەی هەڵەکانی دیوانی مەولەوییە بە ناوی "دیوانی مەولەوی" محەممەد حیجازی، حەسەن گۆران، کە چاپی دووهەمیشی بڵاوکراوەتەوە.

--

## سەرەتا

مەبەست لە شوناس، تایبەتمەندیگەلێکە کە تەنیا پێوەندی بە یەك شتەوە هەیە و دەبێتە هـۆی جیابوونەوەی لە شتگەلی دیکە. کورد وەکو مرۆڤ تایبەتمەندیگەلێکی فەرهەنگـی و مرۆڤناسـانە «ئانترۆپۆلۆژیك»ی هەیە کە لەگەڵ مرۆڤگەلی دیکەدا هاوبەشە. ئەمە شوناسی مرۆڤایەتییە نـە شوناسی گەلی کورد، هەروەها وەکو موسڵمان تایبەتمەندیگەلێکی هەیە کە لەگەڵ موسـڵمانانی جیهاندا هاوبەشە. ئەمە شوناسـی ئیسـلامییە. بـەڵام وەکـو کـورد لـە بوارگـەلـی جۆراوجـۆری فەرهەنگیدا تایبەتمەندیگەلێکی هەیە کە تایبەت بە خۆیەتی و دەتوانین دابەشی بکـەیـن، وەکـو شوناسی ئوستوورەیی، شوناسی هونەری کە خـۆی بـە چـەنـد لایـەن دابـەش دەکـرێ، و.... پـاش توێژینێکی زۆر نووسەری ئەم پەرتووکە بۆی روون بـۆوە کـە کـوردیش وەکـوو گـەلانـی گـەورە و سەرکەوتوو، لە فەرهەنگە درەوشاوەکەیدا بۆ خۆی خاوەنی سیستەمگەلی باوەڕمەنـدی و دیـنی و فەلسەفی تایبەتە، بەڵام توێژینی لەسەر نەکراوە و بەتایبەت فەلسەفەکەی لکاوە بە فـەلسـەفـەی ئیسلامیەوە. فەلسەفەی کوردی لەگەڵ باوەڕمەندی ئۆلی ئیسلامیدا جیاوازی گرنگی هەیە، بەڵام دژایەتی نییە. جگە لە فەلسەفە کورد بۆ خۆی خاوەنـی سیسـتەمـی ئـۆلی (دیـنی) و هـەنـدێ سیستەمگەلی باوەڕمەندی تریشە و تایبەت بە خۆیەتی کـە لـەم بەرهەمـەدا بناغـەکـانی روون کراوەتەوە و ناساندراوە.

چۆنیەتی پێکهاتنی ئەم بەرهەمە وابوو کە لە ساڵی ١٩٧٠دا وەکو سەرباز مامۆستا لە زەمانی شای پێشووی ئێراندا لە سنەوە بۆ خۆی و لەوێوە بۆ گوندەکانی سنووری تورکیا هەناردرام. لـەوێ متمانەیان پێ کردم و مامۆستایەکی ئاینی دەستخەتێکی مەم و زیـنی پێـدام بیخوێنمـەوە. کـە خوێندمەوە وەکو چیرۆکێکی ئەویندارانە کە هەندێ لایەنـی سـۆفیگەری و عیرفـانی تێدایـە بـۆم روانی. بەداخەوە روانگەی ئەو مامۆستایەش هەر ئەوە بوو. زەمان تێپەڕ بوو. لە ١٩٧٩دا لە ئێران

شۆڕشی ئیسلامی پێش هات و منیش بۆ ماوەیەك تووشیاری پەتای چەپ و چەپبینی بووم و وەکو هەزارانی دیکە وزەی هزر و بیرمەندیمان لە ڕێگای نەتەوەدا نەبوو. تا لە ۱۹۸۹دا مەم و زینی ئەحمەدی خانی بە تێکۆشانی کاك «پەروێزی جیهانی» لەلایەن بڵاوگەی سەلاحەددینی ئەییووبیەوە لە چاپ درا. ئەم جار بە وردی خوێندمەوە. لەو دوو بەیتەدا کە دەڵێ: دا خەلق نەبێژتن کو ئەکراد + بێمەعریفەتن ژ ئەسڵ و بونیاد، ئەنواعی میلەل خودان کتێبن ـ کورمانج تنێ دبێ حسێبن. مەبەستی تەنیا ئەوە نییە کە بەرهەمەکەی بە کوردی هۆنیوەتەوە بەڵکو زۆر بە ئاماژە و دەس بە گۆچانەوە لە «مەعریفەت» و کتێب قسە دەکات و باوەڕمەندی و مەعریفەتی کوردان دەناسێنێ. هەندێ لە ئاماژەکانی بۆم روون کرایەوە و کردم بە وتارێك و لە گۆڤاری «سروە»ی ژمارە ۹۲ ڕەشەمەی ۱۹۹٤دا بڵاوکرایەوە. لەوەدا بە هەندێ لایەنی عیرفانی و وەحدەتی وجوودی و بناغەیی چیرۆکەکە ئاماژەم کرد. بەڵام وام دەزانی کە ئەم چیرۆکە بە تەواوی خانی خۆی دایڕشتووە. مەم و زینە فولکلۆرەکەم خوێندەوە، بەڵام هەر «مەعریفەت»ی کوردان بۆم روون نەبوو. کەوتمە توێژینەوەی دینە کوردیەکان و لە زۆربەی ئاماژەکانی مەم و زین تێگەیشتم بەتایبەت زیندانە تاریکەکەی مەم. دیم مەم و زین هەر وتنەوەی دینە کوردیەکانە جا بە چیرۆك. بەڵام هێشتا مەعریفەت بۆم روون نەبوو. دەبێ لە فەلسەفەدا بۆی بگەڕێم.

نەختێ لە فەلسەفەی «ئیشراق»ی شەهابوددینی سوهرەوەردی کوردم دەزانی. کەوتمە خوێندنەوەی حیکمەت (فەلسەفە)ی ئیشراقی سوهرەوەردی و بەرهەمەکانیتری ئەو. جگە لە دەستپێکی چیرۆکەکە وا لە نەورۆزدایە ئاماژەکانیترم بۆ روون کرایەوە و زانیم شوناسی تۆلی و فەلسەفی کوردان لە سێ گۆشەیەکدایە کە گۆشەکانی ۱ـ بەیتە کوردیەکان بەتایبەت مەم و زینی خانی و فۆلکلۆر و هەندێ بەیتیتر ۲ـ دینە کوردیەکان ۳ـ فەلسەفەی ئیشراقی سوهرەوەردی کورد. هەر سێ یەك باوەڕمەندین ۱ـ وەکوو چیرۆك ۲ـ وەکوو دین ۳ـ وەکوو فەلسەفە. ئەو سێ گۆشەیەم لە وتاری سەرچاوەکانی ئوستوورەی کوردستان لە گۆڤاری ئایندە ژمارە ۳۹ی ۲۰۰۲ی سلێمانی لاپەڕە ۲۱دا پیشان داوە. هەروەها زانیم کە فەلسەفەکەی سوهرەوەردی کە لەسەر ئەوە بە دەس مەلەك زاهیر کوڕی سەلاحەددینی ئەییووبی کوژرا فەلسەفەی ئیسلامی نییە و پێوەندی زۆر پتەوی بە دینە کوردیەکان و پێشینەی ئاینی پێش ئیسلامی کوردەوە هەیە. هەروەها هیچ پەیوەندیەکی بە ئاینی زەردەشتیەوە نییە (ئەو جۆرە کە گشت نووسەرە ئێرانیەکان و هەندێ نووسەری ئەورووپایی دەڵێن) بۆ ئەم مەبەستە تا ڕادەیەك

ئەوێستایی فێر بووم و هەروەها دوو پەهلەویەکەش فێـر بـووم و تـەنیـا بـە تەرجەمـەی ئـەوانـە بەسندەم نەکرد و گشت دەقە زەردەشتیەکانم چ بە ئەوێسـتایی و چ بـە پەهلـەوی و چ بـە پـازەنـد خوێندەوە. کەوتمە توێژینی میهرپەرستی و مانەوی و مەزدەکی و زروانی و هەروەها نەورۆز لە دەقە مێژینەییەکاندا. بە گشتی لەم توێژینگەلەدا چەند شتی گرنگم بۆ روون کرایەوە کە لێکۆڵـەرانی ئێرانی و کورد و دەرەوە پێی نەگەیشتوون.

لەم وارەدا هەم بۆ ئێرانناسان گرنگە و هەم بۆ کوردناسان کە مەبەستی نووسەری ئەم کتێبەیە. هۆی ئەوە کە توێژینەرانیتر بەو ئاکامانە نەگەیشتوون ئەوەیە کـە توێـژینی زانسـتی و بـەسـندە لەسەر سیستمە باوەڕمەندیەکانی کورد نەکراوە و ئەوانەش تەنیـا لـەم چوارچـێوەدا قـابیلی روون بوونەوەیە. یەکێ لە هۆکارەکانی گرنگ، سەرلێشێواویەکەوا بە عەمد لە زانستگاکانی دەوڵـەتـە شوورێنییەکانی دژ بە کورد دروست کرابوو کـە هێشـتا لێکۆڵـەرانی کـورد بـە تونـدی لـە ژێـر کاریگەری ئەوانە دان.

لەو سەر لێشێواویگەلە، یەکێ پەتای زەردەشتی بە بناغە زانینە کـە ئامـاژەی پێـدەکـرێ. بـە گشتی ئەو راستیانە کە لە توێژینی سیستمی باوەڕمەندی کۆنی کورد بۆ نووسەری ئەم بەرهەمـە دەرکەوت ئەمانەن:

١ـ پێوەندی چوار جەژنی هۆزە ئێرانیەکان واتە «نەورۆز» و «سێزدەبەدەر» و «شـەوی چـلە یـان شەوی یەلدا» و «چوارشەمە سووری» یان چارشەنیێ سوور لە ناو ئێزدیەکاندا.

لە هەفتەنامەی «ئاسۆ» لە شاری سنەدا ژمارە ٢٣ رێکەوتی ٢٥ی رەشـەمـەی ١٣٨١ بەرانبـەر بە ١٦ی مارسی ٢٠٠٣ پێوەندی ئەم چوار جەژنەم بۆ یەکەم جار لە یەك لاپەڕەی هەفتەنامەکـەدا زۆر بە گشتی ئاماژە پێ کرد. دۆستانی بە ئەمەگ هانیاندام کە بەرهەمەکـانی توێژینەکـە وەکـو کتێبـێك چاپ بکرێت، سوپاسیان دەکەم.

٢ـ شتی دووهەم روون کردنەوەی ماهییەتی پەیکەرگەلێکی ترسناکە کە لە ستایشـتگاگـەلـی میتراپەرستی (میترائیسم) لەگەڵ پەیکەرگەلی میترا کە لـە وڵاتـە ئەورووپاییـەکـان و تورکیـە و «هەترا» لە سووریە و... دۆزراونەتەوە و بۆ روون کردنەوەی ماهییەتی ئەم پەیکەرانە توێژینـەرانی ئەورووپایی و ئێرانی و کورد بە هەڵەدا چوونە. بـەڕێز «تـەوفیـق وەهبـی» زۆرکـەم لـە شـەرحی پەیکەرەکەی هەترا خۆی نزیك کردەوە، بەڵام بە ئاکامی راستەقینە نەگەیشت. هۆی ئەوە بوو ئـەو

بەڕێزە و کەسانی پاش ئەو بە تەواوی فیکر و فەلسەفە و ئاینی کۆنی کوردانیان تەحقیق نەکرد بوو.

٣ـ ئەو فرقەگەلەی کە لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەت لە ئێران و عێراقدا بە ناوی «غوللاتی شیعە» یان «شیعەیانی غالی» (ئەو ئاینانەی کە لە کەسایەتی حەزرەتی عەلی (د ـ خ) غولۆ و زێدڕۆیی دەکەن و مەقامی خودایی بۆ قایلن) ناو و ئیستیلاحێکی هەڵەیە و بناغەیەکی‌تری جگە لە شیعە هەیە کە بە کوردەوە پێوەندی هەیە.

٤ـ بۆ توێژینی بناغەی فەلسەفەی «ئیشراق»ی «شەهابوودینی سوهرەوەردی» کورد ناچار مام پەرتووکی «عەقڵی سوور» کە ٢٥ لاپەڕەیە و زۆر سەمبولێك و ئاماژەییە سەمبول و ئاماژەکانی بدۆزمەوە. زۆر نووسەری ئێرانی هەوڵیان داوە بۆ کردنەوەی ئەۆ موعەممَاگەلە بەڵام بێ‌سەرنجدان لەسەر ئاینە کوردیەکان بەتایبەت ئێزدی و ئەهلی حەق (کاکەیی) هەروەها بەیتە کوردیەکان بەتایبەت «مەم و زین»ی فولکلۆر و مەم و زینی ئەحمەدی خانی و ئاینی پێش ئیسلامی کوردان ئاکامی بەسندە و ڕازیکەر بە دەست نایەت. ئەو نووسەرانە هەندێ ئاماژەکانیان کردۆتەوە، بەڵام چەند یەکەی هەیە کە هیچکام بە دروستی لێکیان نەداوەتەوە. لەم کتێبەدا ئەوانیشە کەشف و شرۆڤە کراون.

٥ـ مەم و زینی ئەحمەدی خانی کە ئەویش بەرهەمێکی ئاماژەیی ئۆلی و عیرفانی کۆنی کوردە بە تەواوی شرۆڤە کراوە و مەبەستەکان و ئاماژەکانی ئەو چیرۆکە دەرخراوە.

هەروەها ئاماژەگەلی مەم و زینی فۆلکلۆریش تا ئەو جێگا بۆ باسەکەی ئێمە پێویستە روون کراونەتەوە. ئەم دوو بەرهەمە ئاشکراکەری بەشێ لە سیستمی ئۆلی کۆنی کورد و ئاوەزمەندی (عەقڵیەت)ی ئەوانە.

٦ـ پێوەندیەك هەیە لە نێوان «خوەڕەدینی» بەتایبەت بزوتنەوەکەی «بابەکی خوەڕەمدین» لەگەڵ ئیعتیقاداتی میهرپەرستی (میترائیسم) و ئاینە کوردیەکاندا کە ئەم پێوەندیگەلەش روون بوونەتەوە. هەروەها «خوەڕەمدینی» دروستە و «خورڕەمدینی» فارسی هەڵەیە.

٧ـ زەردەشتی نەبوونی زۆرینەی کوردانی پێش ئیسلام و لاوازبوونی زەردەشتی لە ناوچە کوردنشینەکاندا بە پێچەوانەی ئەو شتەی کە لە نیو رووناکبیرانی کورددا هەیە. ئەم باسەم زۆر بە کورتی لە گۆڤاری «ئاینده» ژمارە ٣٤دا دەرخستووە.

٨ ـ بۆچی ئەسکەندەری ویرانکەری ئێران لە سەدەی چواری پێش زایینـدا، لە زەمانی ساسانیەکاندا بەڕێزناسرا و پاش ئیسلام کردیان بە «زولقەرنەین»ی قورئان.

٩ـ پەیکەری سەرکەتیبەی بیستوون و قزقاپان و سەهەنە لە کوردستان و هەندێ نەخشـیتری هیخامەنشی هی میترایە نەك ئەهوورامەزدا یان فرووهەر (فرەوەهر).

١٠ـ تێکەڵاوبوونی نەورۆز لەگەڵ جەژنی سەری ساڵی میهرپەرستی و گاسانباری ئاخری زەردەشتیدا. جەژنی سەری ساڵی ئێزدی بە وردی لەگەڵ سەری ساڵی کوردانی پێش ئیسلامدا یەکە. روون دەکرێتەوە کە نەورۆز لەگەڵ جەژنی سەری ساڵدا تێکەڵاو بوو و پاشان مانگێك دواخرا.

١١ـ ئاینی مەزدەکی لەسەر بناغەی میهرپەرستی پێکهات، بەڵام لەگەڵ میهرپەرستیدا جیاوازی هەیە و خوەڕەمدینی پاشماوەی مەزدەکی نییە.

١٢ـ مانای راستەقینەی پەیکەرەکەی تاقەوسان کە شاردراوەتەوە یان هەڵەی لەسەر کراوە کە ئەویشم روون کردۆتەوە.

١٣ـ مانای ئەوێستایی مەم و زین.

١٤ـ لە ئاوەزی سووری سوهرەوەردیدا زۆر بواری سەخلەت و سەنبولێکی ئەوە روون کراوەتەوە و لەگەڵ باوەڕمەندی ئێزدی و کاکەییدا هەڵسەنگێندراوە.

١٥ـ شرۆڤەی زۆر پەیکەری میترایی لەوانە شێوی ئاخری میترا لەگەڵ باوەڕمەندی کاکەیی. هەروەها دەیان شتیتر کە بۆ خوێنەری بەڕێز روون دەبێتەوە. لەوانە سەربڕینی کەڵەشێر بە جێگای گاو...

ئەم کتێبە لە پێشدا بە فارسی نووسیم بۆ ناساندنی بواری ئۆلی و عەقیدەتی کۆنی کورد بە خوێنەری ئێرانی، بەڵام وا باشتر بوو لە پێشدا بە کوردی لە چاپ بدرێت.

## پێوەندی جەژنەکانی

## «نەورۆز» ـ «سێزدە بەدەر» ـ «شەوی یەلدا» و «چوارشەمە سووری»

چون بوارگەلی ئۆلی و فەلسەفی کوردان پێوەندی زۆری بەم جەژنگەلەوە هەیە، چاکوایە لە پێشدا ئەمە شرۆڤە بکرێت.

بناغەی نوستوورەیی (نە، ئۆلی) ئەم جەژنگەلە «ئاریایی» واتە هیندوئێرانییە. هیندوئێرانیەکان چوار هۆز بوون: هیندی ـ ماد ـ پارس و سەکا. ماد و پارس یان فارس ئێرانین. کورد واتە فەرهەنگی کورد و زمانی کوردی لە گۆڕانکاری زمانی مادەکان کە ئەوێستا کتێبی پیرۆزی زەردەشتی پێ نووسراوە بەدیهاتووە. (بۆ واتای وشەیکورد و خزمایەتی لەگەڵ زمانە ئاریەکانی‌تر، ب. ب وتاری نووسەری ئەم پەرتووکە «ڕاڤەی وشەی کورد» گۆڤاری ئاینده. ژمارە ۳٤ تەمووزی ۲۰۰۲ سلێمانی).

سەبارەت بە پێوەندی ئەم چوار جەژنە تا ئێستا هیچ نووسەرێك چ ئەورووپایی و چ ئێرانی و چ کورد هیچیان نەنووسیوە و تەنانەت هیچ ڕوانگەیەکیان دەرنەبڕیوە چون دەرخستنی ڕاستەقینە لەم بارەدا تەنیا بە توێژینەوەی دینە کوردیەکان دەردەکەوێ.

زەردەشت لە ڕۆژاوای ماد واتە لە کوردستانی ئێستادا ڕاپەڕی، بەڵام لە «گاسا» (بە سینی‌نووك ددانی) کان کە هۆنراوەی خودی زەردەشتە هاتووە کە ئەو بە دەستی «کاوە» کانەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ماد (ئەو سەردەمە هێشتا ناوی ئێران لە گۆڕێدا نەبوو) بۆ دەرباری گوشتاسپشا ڕاوەدوونرا و لەوێدا دینەکەی ئاشکرا کرد. کاوە لە ئەوێستادا «کەویە» و «کاویە» بە مانای سەرۆك هۆزە. لە «وێدا»کانیش کە کتێبی پیرۆزی هیندیەکانە هەر ئەم مانایەی هەیە لە پەهلەویدا کە خوشکی زمانی کوردیە وەکوو «کەی» و «کێ» و لە کوریدا وەکوو «کا» بە دووپاتکردنەوەی

وەکوو کاکا «کاکە» بۆ سەرۆکی ماڵبات و بە مانای سەروەر و ئەفەندی تورکی و سەییدی عەرەبی بە کاردەچێت. بۆ ئەوە دەڵێم لەناو کورداندا هەستا ئەوەیە کە بە هۆزە کۆچەریەکانی ماد کورتە (پاشان کورت و کورد) دەگوترا. مادەکانی‌تر دێنشین و شارنشین بوون و وەکوو هۆز نەبوون. ئایینی زەردەشت لە باکووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵات و باشووری ئێراندا پەرەیسەند. مادەکان لەو سەردەمەدا ئایینی زەردەشتیان قبووڵ نەکردو لەسەر ئایینی کۆن واتە پەرستنی خودایانی ئارییایی بە گوێرەی ئەوێستا «دێو» گەل مانەوە. مادەکان و پارسەکان دژایەتی و دووبەرەکێی سەخت و هەمیشەییان لەگەڵ یەك بووە. دەزانین کە حکومەتی مادەکان کە ئاشووریان لە نێو برد بە دەست پارسەکان رووخا. دیارە لە ناوەندی پارسەکاندا کە ئێستا، باشووری ئێرانە، ئایینی زەردەشتی لە پێشدا هەندێ پەرەی سەند. بەردنووسراوەکانی سەردەمی هیخامەنشی بە ناوی «ئەهوورا مەزدا» وە دەست پێدەکات و ناوی خودایانی‌تری ئارییایی کە زەردەشت رەتی کردنەوە نییە. هەرچەند شاکانی‌تری هیخامەنشی پاشان لە بەردنووسراوەکانیاندا لەگەڵ ئەهوورامەزدا ناوی «میترا» و «ئەناهیتا»ش دەهێنن، بە گشتی ئەوە دەگەیەنێ کە زەردەشتی لە پارسدا پەرەی سەندووە. پادشاکانی ساسانیش کە لە سەدەی سێی پاش زایین لە پارسەوە هەستان و پادشایی ئێرانیان بە دەستهێنا زەردەشتی بوون. بۆ فەرمی کردنی ئایینی زەردەشتی پاش رووخاندنی ئەشکانیەکان دوو شەڕیان لەگەڵ کوردەکان بە سەرۆکایەتی «کوردانشای مادی» کرد. لە شەڕی یەکەمدا تێکشکان و لە شەڕی دووهەم بە سەر کوردەکاندا سەرکەوتن. لە ڕۆژهەڵاتی باکووری ئێران کە ئێستا تاجیکستان و تورکمەنستانە و ڕۆژهەڵات کە ئێستا ئەفغانستان و بەشێ لە پاکستان و پارێزگای خوەراسانە هەروەها باشووری ئێران کە پارێزگاکانی فارس و کرمانە ئایینی زەردەشتی پەرەی سەندبوو. ناوچەی ماد بریتی بوو لە بەشێ لە خوەراسان و پارێزگاکانی سمنان و دامەغان و گورگان و مازندەران و گێلان و ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا و ئەردەبێل و وڵاتی ئازەربایجانی ئێستا و کوردستانی باشوور و ڕۆژهەڵات و کوردستانی باکوور (ئەم بەشە پاش شکستی سەکاکان لە مادەکان داگیر کرا و تا چۆمی هالیس «قزل ئێرماق»ی ئێستا مادەکان چوونە پێشەوە و هێدی هێدی هۆزەمادیەکان «کوردەکان» لە کێوەکانیدا نیشتەجێ بوون و پاشان لە سەردەمی ئەشکانیەکاندا نەختە نەختە لە شارەکانی ئەوێدا گیرسانەوە. ناوی پەهلەوی و کوردی هەندێ لە شارەکان لە زەمانی ئەشکانیەکاندا وەکوو ولاش کەرت «مەلازگەرد» و... ئەم راستیە دەسەلمێنێ). هەروەها ناوەڕاستی ئێران واتە پارێزگاکانی یەزد و «ئەسفەهان» و «تاران» و «ئەراك» و «قوم».

هەروەها ڕۆژاوای ئێران هەمــوو زنجیرە چیاکانی «زاگــروس» تــا ســنووری پارێزگــای فــارس کــە پارێزگاگەلــی «بــەختیــاری» و «کۆهکیلوویــە و بویــەر ئــەحمــەد» و «لورســتان» و «ئــیلام» و «کرماشان» و «کوردستان» هەروەها هەموو کوردستانی باشوور کە پاش ڕووخانی ئاشــوور بــەرە بەرە حەشیمەتی هۆزە مادیەکان (کوردەکان) لەوێ نیشتەجێ بوون. پاشان زمــانی مــادەکــان لــە درێژەی زەماندا گۆڕا و دوو زمانی نزیك بە یەك لەو ناوچەگەلەدا پێکهاتن، کــوردی و پەهلــەوی. پەهلەوی زمانەکان خەڵکی باکوور و ناوڕاستی ئێران و ئازەربایجانەکانی ئێستا بوون. کوردیش لە ڕۆژاوا و باکووری ڕۆژاوای ماد پێکهات. کوردی و پەهلەوی وەکوو دوو خوشك لــە دایکــی زمــانی ئەوێستایی واتە زمانی سەرەکی مادەکان پێکهاتن.بە جۆرێ کە زمــانی کــوردی زۆر لــە پەهلــەوی نزیکترە، تا لە فارسی. زبانی فارسی کۆن واتە فارسی زەمانی هیخامەنشیەکان لە سەدەکانی ٦ تا ئاخری سەدەی چواری پێش زایین لە باشووری ئێران زبانی هۆزی هیخامەنشیەکان و زبانی فــەرمی ئێران بوو کە بەردنووسراوە و سواڵەت نووسراوەو سەرمۆر و ئامرازیتری زۆر لێ بە جێمــاوە و لــە گشت گرنکتر بەرد نووسراوەی «بێستوون» لە کوردستان، لەگەڵ زبانی مادەکان واتە ئەوێستایی و زبانی کۆنی هینــدیەکان واتە سانسکریت کە «وێدا» کانی پێ نووسراوە وەکوو سێ زاراوەی کوردی لە یەك نزیکن. زبانی پەهلەوی دوو جۆر ناسراوە یــەکــەم: پەهلــەوی ئــەشــکانی، یــان پەهلــەوی باکووری ڕۆژاوا، کە زبانی خەڵکی ڕۆژاوا و باکووری ڕۆژاوا و باکوور و ناوەنــدی ئێــران بــوو واتــە گشت ئەو جێگەگەلە کە بە ناوی ناوچەی ماد ناوی لێ برا جگە لە ناوچە کوردنشینەکان زبانیان پەهلەوی بوو. لە تەواوی خولی پانسەدوسی ساڵەی فرمانداریەتی ئەشکانیەکاندا زبــانی فــەرمی ئێران بوو. لە ســەدەی سێی زاییــنی کە ساسانیەکان لە باشوورەوە هــاتن و بــوون بــە فــەرمانڕەوای ئێران تا یەك سەدە هەر پەهلەوی ئەشکانی زبانی فەرمی بــوو. پاشــان هــەنــدێ وشــەی فارســی باشوور هاتنە نێو پەهلەوی و خودی پەهلەویش هەندێ گوڕانکاری بە سەردا هاتبوو و ئــەوشــتەی کە لەمانە دروست بوو ئەمڕۆ پێ دەڵێن پەهلەوی ساسانی (پەهلەوی باشووری ڕۆژاوا) کە زۆر لــە پەهلەوی ئەشکانی نزیکە. زبانی پەهلەوی ساسانی لە هێرشی عەرەبەکان لە سەردەمی ئیسلامدا لە فەرمیەت کەوت و عەرەبی بوو بە زمانی فەرمی ئێران، بەڵام تا چەند سەدە پاش ئیســلامیش زەردەشتیەکان بەم زمانە دەقە دینیەکانیان دەنووسی.

نزیکی هەرە زۆری کوردی بە پەهلەوی و ئەوێستایی و زبانە ئاریەکانیتر هەروەهــا جەژنــەکانی نەورۆز و... کە ئارییاین (ئەم باسە شرۆڤە دەکرێت) و زبانی کوردی کە خاوێن و خالیسترین زبانی

ئاریایی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاسته بە ئێمه پێشان دەدات کە زۆر ناڕەوایە ئێمه فەرهەنگی کورد بە هۆزە نائاریاییەکانی نێوچۆمان وەکوو بابل و ئاشوور و ئەکەد و سۆمر و «قەر دوو» کە بە یونانی کراوه بە کاردووخ و کاردووس پێوەندی بدەین و ئوستوورە جوانەکانی کوردی کە بە ئوستوورەکانی ئاریایی ڤێداکان و ئەوێستا پێوەندی هەیە، لە مێژووی ئەواندا تاووتوێ بکەین. بەڵگە بە دەستەوەیە کە نەورۆز لە ناو فارسە هیخامەنشیەکاندا (سەدەکانی شەش تا سێی پێش زایین) نەبووە و بەڕێوە نەچووە هەروەها بەڵگەی پێویست بە دەستەوەیە کە نەورۆز و سێ جەژنەکەی‌تر هیچ پێوەندیەکی بە ئاینی زەردەشتیەوە نییە.

لە هیچکام لە بەشەکانی ئەوێستا و هیچکام لە دەقە پەهلەویەکانی دینی زەردەشتی و دەقی پەهلەوی شرۆڤەی ئەوێستا (زەند) و «پازەند» واتە شرۆڤەکانی پاش ئیسلامی زەند هیچ ناوێك لە نەورۆز و سێ جەژنەکانی دیکە نییە، جا دەبێ بۆ سەرچاوەی ئاریایی جگە لە ئاینی زەردەشتی بگەڕێین.

نەورۆز و ئەو جەژنانە جگە لە ئوستوورە سەرچاوەی ئاینیشیان هەیە. وتمان زۆربەی ناوچەی ماد بە تایبەت ڕۆژاوای ماد واتە ناوچەکانی کوردستانی ئەمڕۆ، پێش ئیسلام زەردەشتی وەکوو کەمینە دەژیان. شوێنەوارگەلێ لە فەرهەنگی کوردا هەن و لەم پەرتووکەدا بەوانە ئاماژە کراوە و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێ بە جوانی پیشان دەدات کە فەرهەنگی عەقیدەتی و ئاینی کۆنی کورد و شوێنەوارەکانی لە فەرهەنگی ئەمڕۆی کورددا بە تەواوی «میترا»یی واتە «میهرپەرستیە» و پاش ئیسلام وەکوو ئاینە کوردیەکان و فەلسەفەی ئیشراق و تەریقەتەکانی وەحدەتی وجودی بەتایبەت عیرفانی توندڕەو داب و نەریتگەلی نەورۆز و هەندێ داب و نەریتی جۆراوجۆری‌تر و هەندێ لە چیرۆك و بەیتە کوردیەکان شوێنەواری لە کوردستاندا ماوەتەوە. لە کوردستاندا شوێنەواری زەردەشتی وەکوو «ئاتەشگا» واتە ستایشتگای زەردەشتی نییە، بەڵام سەدان ئەشکەوت و دێری میهرپەرستی لە کوردستانی باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات ماوەتەوە کە پاشان بەوانە ئاماژە دەکرێ. ئەو چیایەی کە لە شاری «پاوە»ی هەورامانی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا هەیە و بە «ئاتەشگا» ناسراوە شوێنەواری ئاتەشگای زەردەشتی نییە. کیوێکە بەرز کە نووسەری ئەم پەرتووکە پێدا گەڕاوە. لە لووتکەکەیدا چاڵە بەردێك هەیە کە جێگای ئاگر کردنەوە بووە بەم بۆنەوە بە «ئاتەشگا» ناسراوە. لە کاتی هێرشی دوژمندا لەسەرلووتکە بەرزەکان کێو بە کێو بە ئاگر کردنەوە و دووکەڵ خەبەر بە هەموو لایەکی وڵات دەگەیشت. لە دەور و داوێنی کێوەکەدا هیچ

شوێنەواری ئاتەشگای زەردەشتی نییە. ئاتەشگاکانی زەردەشتی نە لە لووتکەی کێوەکان بەڵکو وەکوو مزگەوتی موسڵمانەکان لە ناو دێ و شارو شارۆچکەدا دروست دەکرا. زۆر ئاتەشگای زەردەشتی چکۆلە و گەورە بە یەك چەشن میعماری لە پارێزگاکانی ئێرانی باشووری، نیوەڕاست و ڕۆژهەڵات ماونەتەوە کە شێوە میعماریان یەکسانە و لە نێو ئاوەدانیدایە نە لە چۆڵ و لووتکەی کێو ئەویش کێوێکی هەرەبەرزی وەك ئاتەشگا کە لانی کەم بە سێ کاتژمێر دەتوانی بگەیتە لووتکەکەی. لە ژێر بەردی لووتکەکەیدا ئەشکەوت هەیە کە دزانی شوێنەوارە مێژوویییەکان سەدان تەن خاکیان لێ دەردا بوو. چون لەم پەرتووکەدا باسی شوێنەوارەکانی میهرپەرستی دەکرێت لێرەدا باسەکە دەخەینە سەر چۆنیەتی پێکهاتنی میهرپەرستی لە ڕۆژاوای ماد واتە ناوچە کوردنشینەکاندا.

مادەکان دژبەریان لەگەڵ دوو جێگا هەبوو یەکەم لەگەڵ پارسەکان کە حکومەتەکەیان بە دەست ئەوان ڕووخاو بوون بەژێردەستەی پارسەکان کە ئاینی زەردەشتیان قبووڵ کردبوو.

دووهەم لەگەڵ بابلیەکان و هۆزەکانی نێوچۆمان کە خۆیان لە مەترسیدا دەدی کە وەکو ئاشوور بە تەواوی بە دەست مادەکان بڕوخێن. ڕوونەکە بابلیەکان و عیلامیەکان بۆ تێکشکانی حکومەتی مادەکان یارمەتی پارسەکانیان دابوو. دیارە بەرهەمی دژبەری سیاسی و ئابووری دەبێ بە دژبەری لە ئاین و باوەڕمەندیدا. شێوەی بەرهەمهێنان لە زەوی و پێوەندیەکانی ئابووری مادە ئاریەکان گۆڕا بوو و هەروەها ئیدی زەمانی ئوستوورە پەرستیش نەمابوو و دەرگای بە دیهاتنی دینێکی تازە ئاوەڵا بوو. بە گومانی من لە ئاخری سەدەی پێنجی پێش زاین چەند دە ساڵ پێش هێرشی ئەسکەندەری یۆنانی بۆ ئێران و تێك ڕمانی حکومەتی هیخامەنشیەکان لە موقابیلە و دژبەری لەگەڵ ئاینی زەردەشتی ڕۆژهەڵات و باشووری ئێران و لەگەڵ ئاینی بابلیەکاندا ئاینی تاکپەرستی میهرپەرستی لە نێو مادەکانی ڕۆژاوا واتە لە کوردستانی ئەمڕۆدا درووست کرا. بۆ ئەوە دەڵێم مادەکانی ڕۆژاوا کە ئەو جێگایەیە وا سنووری ماد و بابلیە و موقابیلەی عەقیدەتی ئاریایی و بابیلی تێدایە. دەبێ بزانین مادەکانی ڕۆژاوا کوردن. لە پەرتووکی پەهلەوی «کارنامەکی ئەرتەخشەترەی پاپەکان» یان «کارنامەی ئەردەشێری بابەکان» کە بە سەرهاتی ئەردەشێری یەکەم شای ساسانیە و چەند سەدە پێش ئیسلام نووسراوە بۆ یەکەم جار ناوی کورد وەکوو «ماد»یش هاتووە لەم پەرتووکەدا بە کورد هەم «کورتان» و هەم «ماتیکان» واتە مادیەکان گوتراوە لە بەشی ئاخری ئەم کتێبەدا نووسراوە پەهلەویەکە دەهێنین.

مادەکان لەسەر بناغەی ئوستوورەی «میترا» کە ئوستوورەی هاوبەشی هیند و ئیرانیەکانە و لە ویداکان بەتایبەت ویدای کۆن واتە «ریگ ویدا» وەکوو میترە و هەروەها لە ئەویستای نویدا وەکوو «میثرە» (سینی نووك ددانی) هاتووە. لە نێو ئاریە هەرە کۆنەکانیشدا کە هەزار ساڵ زووتر لە مادەکان کۆچیان کردووە و وەکوو میتانیەکان هاتوونەتە ناوەڕاست و ڕۆژاوای تورکیای ئەمڕۆ، میترایەکێ لە خودایانی گەورەی ئەوانیش بووە، جگە لە میترا، ئوستوورەی هاوبەشی هیند و ئێرانی لەویداکان و لە ئەویستادا زۆرە وەکوو زەحاك یان دەهاك (زوحاك هەڵەیە)، فەریدوون، کاوس و جەم (جەمشێد) و ڕام و... میترا یان بە دابێژی ئەمڕۆ میهر لە نێو ماد و فارسەکانیشدا زۆر بەڕێز بووە و چەند سەد ساڵ پاش مردنی زەردەشت بە پێچەوانەی ڕوانگەی ئەو میترا و هەندێکیتر لە خودایانی ئاریاییان هێنایە نێو ئەویستاوە و وەکوو ئافرێنراو و کارگێڕانی ئەهوورامەزدا دەرهاتن. زەردەشت لە گاتاکاندا[٤] لەگەڵ تەواوی خودایانی ئاریایی دژبەری هەیە و پەرستنی ئەوانە بە کوفر دەزانێت بەتایبەت دژبەری خۆی لەگەڵ قوربانی گا و خواردنەوەی شەرابی «هۆم» کە پێوەندی لەگەڵ میترا هەیە بە ئاشکرایی دەرخستوە، بەڵام لە بەشەکانیتری ئەویستادا کە پێ دەڵێن ئەویستای نوێ یان ئەویستای دوایین خواردنەوەی شەرابی هۆم وەکوو دەستوورێکی دینی هەیە و ئەم پارادۆکسە لە ئەویستادا هۆی سەر سوورمانی ئەویستا ناسانە.

زەردەشت تاك پەرستێکی گەورەیە. ئەو خودای تاك و ئافرێنەری گشتی وەکوو «ئەهورامەزدا» کە یەکێ لە ئەهووراکان و لە خودایانی ئاریاییە و لە ویداکاندا وەکوو «ئەسوورا» هاتووە وەکوو خودای تاك بە کۆمەڵگای ئێران ناساند، بەڵام بەداخەوە پاشان تێکەڵاوی هەندێ شەریعەتی دواکەوتوو هات و لە زەمانی ساسانیەکاندا هەندێ خورافەی پێ زیادکرا و وەکوو دوانەپەرستی لێهات.

ئاینی میهری گۆڕدراوی ئاینە کۆنەکانی ئاریاییە کە لەسەر بناغەی «تەناسوخ»[٥] یان «دوونادوون» و تەجەللای خودا لە زویدا پێکهات، بەڵام بە تەرحێکی تازە و تاکپەرستیەکی جوانتر. نووسەری ئەم پەرتووکە ڕێز و ئیحترامی قووڵی بۆ ئاینی زەردەشتی هەیە و ئەوە بە یەکەمین دینی تەوحیدی لە جیهاندا دەناسێ (لەو بەشەی تەورات کە «یەهوە» بە خودای تاکی ئافرێنەری گشت جیهان ناساندراوە هی پاش کۆچرانی جووەکانە بۆ بابل و بە تایبەت سەدەکانی چواری پێش زایین تا دووی زایینیە. لە پێشدا یەهوە خودای تەنیا قەومی بەنی ئیسرائیل بووە نە خودای جیهان (ب.ب «تحقیقی در دین یهود. مهندس جلال‌الدین ئاشتیانی») بەڵام دەبێ بزانین

پێش حکوومەتی ساسانیەکان و فەرمی بوونی زەردەشتی و نووسینی شەریعەتی ئەوە لە «وەندیداد»دا، زەردەشتی دینی زۆربەی خەڵکی ئێران نەبوو. لە زەمانی ساسانیەکاندا «مەزدەك» تێکۆشا ئاینی میهری کە خەڵکێکی زۆر باوەڕیان پێ بوو بە گۆڕانکاریگەلێکەوە بیکا بە ئاینی گشت ئێران. ئەو دەستوورگەلێك و شەریعەتگەلێکی بۆ عیرفانی میترایی نووسی، بەلاّم نەیتوانی و لە ڕۆژێکدا خۆی و دە هەزار لە باوەڕمەندانی ئەو کوشتارکران و دەیان هەزار کەسی‌تر هەلاّتن و هەندێ کەسانی‌تریش بە شاراوەیی لەسەر ئەو باوەڕە مانەوە. هۆی ئەوە بوو کە ئاینی زەردەشتی ڕەسەن و دوور لە خورافە و هەروەها ئاینی میهری و مەزدەکی ناتوانێت سیستمێکی دینیی باش بۆ کۆمەڵگا و پێوەندیە ئابووریەکانی فیودالیسم واتە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی بێت. ئاینی میهری وەکوو تەریقەتێکی وەحدەتی وجودیە و وەکوو عیرفان و دینە کوردیەکانی ئەمڕۆ بۆ کومەڵگای چینایەتی ناگونجێ. ئەوە بوو کە لە زەمانی ساسانیەکاندا زەردەشتی دوایین و پڕ خورافە بە سەر زەردەشتی ڕەسەن و ئاینی میهرپەرستیدا سەرکەوت. بەلاّم میهرپەرستی بە شاراوەیی لە نێو کوردانی ڕۆژهەلاّت و باشوور و بە ئاشکرا لە کوردستانی باکووردا مایەوە و پاش ئیسلام دەوری بالاّی لە شوڕشە دژ بە عەرەبەکاندا گێڕا (لە سەری باس دەکرێ).

وتمان بنچینەی ئاینی میهرپەرەستی لەسەر بنەمای ئوستوورەی میترا دروست کراوە کە ماد و پارسەکان لەگەڵ خودایان و ئوستوورەکانیان پاش کۆچیان لە هەوەڵی هەزارەی یەکەمی پێش زایین واتە ۱۰۰۰ تا ۸۰۰ ی پێش زایین لەگەڵ خۆیان هێنایانە ئەو ناوچەگەلە کە داگیریان کرد. ئەم ئوستوورەگەلە زۆربەیان بە جوانی لە «وێداکان» کتێبی پیرۆزی هیندیەکاندا پارێزراون. هیندیەکان چەند سەدە پێش کۆچی ماد و پارسەکان لەوان جوێ بوونەوە و بۆ هیندوستان و پاکستانی ئەمڕۆ کۆچیان کرد زمانی «ئوردوو»ی ئەمڕۆ پاشماوەی زبانی سانسکریتە کەوێداکانی پێ نووسراوە و زۆر لە ئەوێستایی و فارسی هیخامەنشی نزیکە. لە کۆنترین بەشی وێداکان واتە «ریگ[۷] وێدا» داهاتووە کە مانگ لە پێشدا پڕمانگ واتە بەدری تەواو و زۆر پڕ نوور بوو. ئەو بە تەواوی نوور واتە گیانەکانی لە خۆیدا بەند کردبوو. هەنجەمەنێك[۸] لە خودایان بۆ چارەسەری پێکهات و بڕیاریان دا سۆما واتە مانگ (لە وێداکاندا «سەئومە» لە ئەوێستادا «هەئومە» لە کوردی کرمانجیدا «هەیڤ» کە کورت کراوەی هەئومەی ئەوێستاییە بکوژن.

بۆ کوشتنی سۆما واتە مانگ «میترا» هەڵبژێردرا. میترا بە خەنجەرێك مانگی کە لە هەئیەتی گایەکدا بوو کوشت. گیانەکان وەکوو بارانێك لە نوور ڕژانە سەر زەوی و ژیانی گیاو ژینەوەر و

مرۆڤ پێکهات. پاش مردنی جەستەکان گیانەکان بۆ ناو مانگ سەردەکەون و مانگ دووبارە پڕ دەبێ و پاشان مانگ هێدی هێدی کەم دەکا و گیانەکان بۆ تەکامول و ژیانێکیتر واتە تەناسوخ (دوونادوون) دێنەوە سەر زەوی و ئەم ڕەوتە هێشتا درێژەی هەیە. ئەم ئوستوورە ئارییایییە بناغەی پێکهاتنی ئایینی میترایییە لە ناوچەی مادی ڕۆژاوا واتە لە کوردستانی ئەمڕۆدا کە پاشان باسی چڕ و پڕی لەسەر دەکرێ.

بە هەر حاڵ چ لە زەردەشتی دوایین و چ لە زەردەشتی ڕەسەندا هیچ ناوێك لە نەورۆز و چوارشەمە سووری و سێزدە بەدەر و یەلدا[٦] نییە. مامۆستای پایەبەرزی ئێرانی خوالێخۆشبوو «ئیبراهیم، پووورداود» یەکەم وەرگێڕی ئەوێستا بە فارسی جەژنی «فرەوەرتەکان»[٩]ی زەردەشتی بە بۆنەی نزیکی لەگەڵ «نەورۆز»ی ئێستا بە یەك زانیوە، بەڵام زۆر ئاشکرایە کە ناوی ئەو جەژنە نەورۆز نییە و ئەم مامۆستا لەگەڵ مامۆستایانیتری ئێرانی و دەرەوە بۆ سێ جەژنەکەیتر لە نێو ئایینی زەردەشتیدا هیچیان بەدی نەکردووە. لە لایەکیترەوە هەروەها کە ڕوون دەکرێتەوە پێش ئیسلام و تا چەند سەدە پاش ئیسلامیش جەژنی نەورۆز لە جێگای ئەمڕۆی خۆی واتە ٢٠ یان ٢١ی مارس نەگیراوە تا نزیك بە جەژنی «فەرە وەشیەکان»[١٠]ی زەردەشتی بێت. ئەو مامۆستاگەلە ناوی جەژنی «میهرەگان» کە ناوی کۆنی شەوی یەلدایە دەهێنن بەڵام جگە لە هەندێ لە مامۆستایانی ئەورووپایی مامۆستایانی ئێرانی ئەو شەوە کە ئێستاش شەوی یەکەمی زستانە بە شەوی شانزدەهەمی پاییز دەزانن تا لەگەڵ میهرەگانی زەردەشتی ڕێك بێتەوە. دەبێ بزانین شەوی نەورۆزی ڕاستەقینە لەسەردەمی ئیسلام و پێش ئەوە لە زەمانی ساسانی و ئەشکانیەکاندا بۆ ماوەی زۆرتر لە هەزار ساڵ لە شەوی یەکەمی هاوین واتە ٢١ یان ٢٢ی جوولای بەڕێوە دەچوو و ئەو شەوە کورتترین شەوی ساڵە. دەزانین چوارشەمە سووری ئاخرین شەوی چوارشەمەی پێش نەورۆزە. لە کوردستانی ئێران بەتایبەت لە سنەو و سەقز و کرماشان و ئیلام و هەورامان و... بەو شەوە «کوڵە چوارشەمە» واتە کورتە چوارشەمەیش دەڵێن. جا کورتترین شەوی چوارشەمەی ساڵ بە وردی دەکاتە ئاخرین شەوی چوارشەمەی پێش دەستپێکردنی وەرزی هاوین نەك ئاخرین شەوی چوارشەمەی پێش وەرزی بەهار، کە ئێستا بەڕێوە دەچێت.

پێش ئەوە شەوی ڕاستەقینەی نەورۆز ڕوون بکرێتەوە دەبێ ئاماژە بە دوانزە مانگی ئێرانی ئەمڕۆ بکرێ کە ناوی ئەو مانگانە ناوی مانگەکانی زەردەشتیە کە لە زەمانی ساسانیەکاندا بە فەرمی باو بوو.

مێژوویترین سەنەدگەلێ کە ناوی مانگەکانی زەردەشتی پێوەیە نووسراوەگەلی سەر سواڵەتە کە لە سەرچاوەی تەحویل گرتنی سرکە و شەرابەوە نووسراوە و لە «نیسا» ۱۸ کیلۆمیتری «عشق ئاباد» (ئەشك‌ئاباد) پایتەختی تورکمەنستاندا[11] کە ئەو زەمانە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران بووە نزیکترەوە جێگایەك کە ئاینی زەردەشتی یەکەم جار لەوێدا سەقامگیر بوو. لە ۳۳۵ سواڵەت نووسراو کە بەتایبەت لە بەرانبەر گرتنی شەراب لە خاوەن ڕەزو باخەکانە لە دوودانەدا ناوی مانگ هاتووە و ئەوانەش هی ساڵی ۷۲ی پێش زاینە. لە یەکەمی بە ژمارە ۳۰۷ داهاتووە: «لە ساڵی ۱۷۶ی (درووسبوونی حکومەتی ئەشکانی) مانگی فرەوەرتین (فەروەردین) ڕۆژی ئەتەر (ئاگر) گشت شەرابە تازەکان بە خەزینەی شاهی تەحویل درا کە ۲۹۳۳ مەر، شەرابە «مەر، یەکەی پێوانی شەراب و سرکە بووە) لە سەنەدی ۳۰۸ دا هەرناوی مانگی فەروەردین و ڕۆژی ئاگر هاتووە. لە سەنەدی ۳۰۹دا کە ڕێکەوتی نییە و هەر لەسەر تەحویلی شەرابە ناوی ڕۆژگەلی تەقویمی زەردەشتی وەکوو ڕۆژی هەروەتات (خورداد) و «ئەتەر» (ئاگر) و «تیر» هاتووە. لە دوایی ئەم سەنەدەدا ناوی ڕۆژگەلی «هوەر» (خۆر) «ماه» (مانگ) «تیر»[12] (گەلاوێژ)، «dethos»[13] (دەی) و «میهر» هاتووە. ئیتر لە هیچ لەم سەنەدانەدا ناوی مانگ و ڕۆژی تەقویمی زەردەشتی‌تر نەهاتووە و بۆ کەس ڕوون نییە کە ئەو مانگانەی ناوبراو هی کام وەرزی ساڵە ﴾ببیب. کەتیبەگەلی ئەشکانی نیسا. نووسەر «ام ـ دیاکونوف» و «ئا ـ لیوسیتس»، وەرگێڕ بە فارسی، شەهرام حەیدەر ئابادیان﴿ (ئەوەی ناو کەوانە هی نووسەری ئەم پەرتووکەیە). دیارە پێش ئەم زەمانە لە زەمانی هیخامەنشیەکاندا تەقویمی زەردەشتی باو نەبووە و ناوی نۆ مانگ کە لە بەرد نووسراوەی بێستوون کە هی داریووش هیخامەنشیە هاتووە، پێوەندی بە ئاینی زەردەشتیەوە نییە. ئەمە ئەوە ناسەلمێنێ کە ئاینی زەردەشتی لە زەمانی هیخامەنشیەکاندا نەبووە. بووە بەڵام هیشتا ئەو ناوانە کە زۆربەی هێ زەردەشتی دواییینە نەهاتوەتە نێو زەردەشتیەوە. لەو نۆ مانگەی کەتیبەی بێستووندا یەکی لەوانە «بەغە یادیش» واتە «یادی بەغ» مانگی «یاد کردنی خودا»، بەغ کە لە وشەی «بەغدایش»دا هەیە بە مانای خودایە» گشت مێژوونووسان دەڵێن ئەم مانگە تایبەت بە میترا بووە و لەوەدا جەژنی «میترەکانە» یان بە دابێژی ئەمڕۆی فارسی و کوردی میهرەگان بووە و پاش ئەم جەژنە خەڵك تازەڵ و دانەوێڵە و میوە و... وەکوو پێشکەشیان بۆ دەرباری شا دەبرد.

هیچ بەڵگەیەك لە دەستدا نییە کە «بەغـەیادیش» هـەر ئـەو جـەژنی میهرەگـانی زەردەشـتی دوایینییەیە کە بەرانبەر ١٦ی مانگی میهری ئێستا (بەرانبـەر ٧ و ٨ی ئوکتـوبر) بـەڕێوە دەچـێ هەرچەند کەسانێ وەك «ئارتوور کریستیەنسن» و «مـارکوارت» و «پـووورداود» و «هاشـم رەزی» تەئکیدی لەسەر دەکەن. ئەگەرمەبەست لـە بـەغ مـیترا بێـت و جەژنەکـەیش هـی مـیترا بێـت دیسانیش ناتوانین ئەوە بە جەژنی میهرەگانی زەردەشتی دوایین بزانین. چون لە زەردەشتی رەسـەنـدا رێزگرتنی میترا وەکوو کوفرە. هەروا کە لـە لاپـەڕەکانیتـردا دەنووسـرێ زانسـتوەر و توێژینـەری گەورەی ئێرانی «ئەبوورەیحانی بیروونی»ش لە سەدەی چواری کۆچیدا زۆرتر لە هەزار ساڵ لـەمـەو پێش نەورۆز و میهرەگان هاو مانا و وەك یەك بەکار دەبات.

لە باسەکانی داهاتوودا دەیسەلمێنین کە نەورۆز شەوی «بەیابەسـت» یـان پـەیمـانی ئـەزەلـی و عرووجی میترایە و میهرپەرستان لە شەوی یەکەمی هاوین کە رۆژی پـاش ئـەوە درێـژترین رۆژی ساڵە جەژنیان دەگرت. جەژنی تایبەت بە میهر لە زەمانی هیخامەنشیەکاندا وەکوو «میترەکانـە» گیاوە بەلام رێکـەوتـەکـەی نادیـارە. ئـەو جەژنـەی کـە بـە نـاوی «میهرەگـان»ەوە لـە زەمـانی ساسانیەکاندا دەگیرا زیاد کراوەی زەردەشتی دواییینیە کە بۆ مـیترا کـە کـرا بـوو بـە ئـافرێنراو و کارگێڕی ئەهوورامەزدا جەژنیان دەگرت.

پێش ئیسلام ساڵی ئێرانی ساڵی هەتاوی بوو بریتی بوو لە دوازدە مانگی سـی رۆژەو پێـنج رۆژ کە بە ئاخری ساڵ زیاد دەکرا کە بە کوردی بـەو پێـنج رۆژە دەڵـێن «پـەنجـەی تـار» (مـەولـەوی دەفەرمێ: وەی من دیارەن پەنجەی تارمەن ـ سەروەخـت هـامن نـەو وەهارمـەن...) لـە فارسـی و عەرەبیدا پێ دەڵێن پەنجەی دزراو، واتە پێنج رۆژ دەدزن و دەیخەنە سەر ٣٦٠ رۆژە کە تا ساڵ دوایی بێت. چوار ساڵ جارێکیش «کەبیسە»یان دەگرت و پێنج رۆژ دەبوو بـە شـەش رۆژ. پـاش هێرشـی کاولکـەری عـەرەب و داگیرکردنـی ئێـران و بـە موسـڵمان کردنـی خـەڵکی ئێـران دیـن و باوەڕمەندییەکانی ئەوان لە نێو چوو و تەقویمی کۆنیش نەما بوو و کرابوو بە ساڵ ژمێری مـانگی عەرەبەکان کە ساڵەکانی ٣٥٤ رۆژە. جا بۆ گرتنی نەورۆز خەڵك کەوتنە سەر لێ شیواوی. رێبـەرە دینیەکان یا کوژرابوون یان موسڵمان بوو بوون. حیساب لـە دەسـتی خـەڵك دەرچـوو. کـاتێ کـە حکوومەتی ئومەویەکان و عەبباسیەکان لە بەغدا هاتنە سەر کار نەیانتوانی بۆ گـرتنی نـەورۆز بەرگری لە خەڵك بکەن بەلام بە هۆی نەبوونی تـەقـویمی هـەتـاوی و یـان پشـت گـوێ خسـتنی

کەبیسەکان گرتنی نەورۆز پێش دەخرا. دوای دوو سەدە، جێگای ڕاستەقینەی نەورۆز لە بیرەوە چوو.
سەرنج بەم سەنەدەی هەزار ساڵ پێش ئێستا بدەن:

توێژینەر و زانیاری هەرەبەرزی ئێرانی «ئەبوو رەیحانی بیروونی» کە بەرهەمەکانی بە عەرەبی (زبانی فەرمی ئەو زەمانەی وڵاتە ئیسلامیەکان) نووسیوە، لە کتێبی «آثار الباقیة عن قرون الخالیة»دا نووسیویەتی:

«پاش لە نێو چوونی تەقویمی «یەزد گردی»[١٤] ئێرانی تەقویمی هەتاوی هی، احمد بن طلحة امیرالمؤمنین موعتضد بالله، خەلیفەی عەبباسیە کە بە ساڵگەلی ڕۆمی و مانگی ئێرانیە بەلام لەسەر چاوەگەلێکیتر... بۆ ئەوە ئەم تەقویمە هەتاویە دروست کرا هەروا کە، ابوبکر صولي، لە کتێبی اوراق، حمزة بن حسن الاصفهاني، لە قەسیدەکەی خۆیدا هێناویانە دەڵێن ڕۆژێ، متەوەکل، خەلیفەی عەبباسی لە نەچیرگا خەریکی گەڕان بوو کە گەیشت بە کێڵگەیەك کە هێشتا هێشوە گەنمەکان پێ نەگەیشتبوون وتی: عبیدالله بن یحیی، لە من ئیزنی خواستوە کە لە خەلکی باج و خەراج بستێنم ( بە ڕەسمی پێش ئیسلام کە شاهانی ئێرانی پاش جەژنی نەورۆز باج و خەراجیان دەستاند) بەلام هێشتا بەرهەمی کێڵگەکان پێ نەگەیشتوە، خەلکی لە کوێ بێنن تا باج و خەراج بدەن. پێیان عەرز کرد کە ئەم کارە زیانگەلێ زۆری لە خەڵك داوە و ئەوان بەرهەم و دەسرەنجی خۆیان پێش فرۆش دەکەن و هەندێکیش چون نیانە باج و خەراج بدەن بۆ جێگایەکی دیکە کۆچ دەکەن. خەڵك لەم بارەوە سکالایان زۆرە.

متەوەکل وتی ئەم کارە هی زەمانی منە یان پێش لە من بووە؟ وتیان ئەمە لە خوو و خدەی شاهانی ئێران بوو کە لە پاش نەورۆزدا باج و خەراجیان دەستاند و پاشان بوون بە سەرمەشقی شاهانی عەرەب. "متەوەکل" فەرمووی "مووبەد"[١٥] (سەرۆکی موغەکانی زەردەشتی. ئەو زەمانە کەمینەیەکی چکۆلەی زەردەشتی لە بەغدا هەبوون) حازرکەن. بە مووبەدی وت قسەی زۆرمان لەسەر ئەم پرسە کردووە. منیش ناتوانم لە داب و نەریتی شاهانی ئێران خۆم لادەم چون خەڵکیان خۆش ئەویست و بە عەدالەت ناوداری جیهان بوون جا بۆ چی لە هەوەڵی نەورۆز کە هێشتا کێڵگەکان بەرهەمیان بە دەست نەهاتووە باج و خەراجیان دەستاند. مووبەد وتی دروستە بەلام ئەو کاتە نەورۆز زەمانێ دەگەیشت کە زۆربەی بەرهەمی باخ و کێڵگەکان بە دەس هاتبوو. «متەوەکل» وتی چون شتی وا دەبێ؟ مووبەد چۆنیەتی ساڵ و ژماردنی ڕۆژەکانی کەبیسە کە پشت گوێ خراوە بۆ خەلیفەی تاوتوێ کرد و پاشان وتی، چون دینی ئیسلام هات و شاهی ئێمە

لە نێو چوو کەبیسەکان نەژمێردران، پشت گوێ خستنی کەبیسەکان (چوار ساڵ یەك ڕۆژ) زیانگەلی زۆری لە خەڵك داوە. لە زەمانی هشام بن عبدالملك لای خالد قسری کۆوە بوون و پێیان گوت کە پشت گوێ خستنی کەبیسەکان زیانی زۆری لە خەڵك داوە و ویستیان یەك مانگ نەورۆز پاش بخرێ «خالد قسری» ئەم کارەی نەکرد. هەروەها چون زەمانی «هارون‌الرشید» هات دیسان خەڵك لە دەرگای «یحیی خالد بن برمك» (وەزیری هاروون) کۆوە بوون. لێیان خواست دوو مانگ نەورۆز پاش بخرێت. یەحیا ویستی ئەم کارە بکات بەڵام دوژمن‌گەلی «بەرمەکیەکان» بە هاروونیان ڕاگەیاند کە یەحیا دەیەوێ ئایینی باوکانی «مەجووسی»[١٦] خۆی زیندوو کاتەوە (یەحیا بەرمەکی سەرۆك وەزیرانی هاروون ئێرانی خەڵکی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران بوو) چون قسەکانی مووبەد دوایی هات «متەوەکل» ابراهیم بن عباس صولی" بۆ دەربار بانگ کردوو دەستووری پێدا کە لەگەڵ مووبەد هاوکاری کات و کاتی نەورۆز دیاری بکرێ و پاش بخرێ و بیکەن بە قانوون و بە گشت وڵات ڕایگەیەنن. ئیبراهیمی سەولی لەگەڵ مووبەد نەورۆزیان خستە هەفدەهەم (نەنووسراوە هەفدەهەمی چ مانگێ بەڵام لە وتەکانی پاشدا دیارە هەفدەهەمی حوزەیرانە) نامەگەلیان بۆ حاکمانی وڵاتنووسی تا ئێرانی‌گەل نەورۆز پاش بخەن ئەم کارە لە ساڵی ٢٤٣ کۆچی مانگی دابوو «بحتری» قەسیدەیەکی لەم بارەوە هەڵبەستوە: ان یوم النیروز (نەورۆز) قدعاد للعهد الذي کان سنة اردشیر ـ انت حولته الی الحالة الاولی و قدکانه یستدیر ـ فافتتحت الخراج فیه فللامذ في ذاك مرفق مذکور منهم الحمد و الثناء و منك العدل فیهم و النائل المشکور....

متەوەکل کوژراو کارەکە ناتەواو ما «موعتەزید» هاتە جێگای ئەو. لە تاوتوێی کاروباری خەڵکدا گرنگترین کار کە هاتە بیری پاش خستنی نەورۆز بوو. جیاوازیەك لە حیسابی «متەوەکل» و «موعتەزید» دا بوو ئەوە بوو کە «موعتەزید» سەرەدەمی حیسابەکەی لە ڕۆژی کوژرانی یەزدگرد ئاخرین شای ساسانیەکان گرت کە دەکاتە ٢٤٣ ساڵ و کەبیسەکانی دەکاتە ٦٠ ڕۆژ کە بە نەورۆزی ئەو ساڵە زیادکرا و نەورۆز کەوتە چوارشەمە یانزەی حوزەیران پاشان بۆ نەگۆڕانی جێگای نەورۆز هاتنی نەوزۆزیان خستە نیومانگە ڕۆمیەکان تا لەگەڵ کەبیسە گرتنی ئەواندا نەورۆز لە جێگای خۆی بمێنی. ئەم کاریانە سپارد بە «عبیدالله بن سلیمان بن وهب» «علی بن یحیی» بۆ ئەو ڕووداوە وتوویە: یوم نیروز (نەورۆز) یوم واحد لا یتأخر ـ فی حزیران یوافی ابدا احد عشر

بیروونی لە درێژەی نووسراوەکەیدا دەڵێ: ئەگەرچی ئەو کارە بە سەرنجی وردەوە کرا بەڵام نەورۆز بەو ڕۆژە کە دەبوا نەگەیشت چون ئێرانیگەل حەفتاد ساڵ پێش یەزدگرد (بە بۆنەی شەڕە دژوارەکانی نێوان ئێران و ڕۆم و تێکچوونی باری ئابووری و ڕامیاری ئێران کە هەر ئەوە هۆی شکستی لە عەرەبەکان بوو) کەبیسەکان بە ئەژمار نەدەهاتن پاشان بیروونی بە حیسابێکی ورد دەڵێ نەورۆز دەبوا بەرانبەر بە بیست و هەشتی حوزەیران بێت (ئەم ڕێکەوتە زۆرتر نزیکە بە ڕۆژی یەکەمی هاوین)... (اثار الباقیة، وەرگێڕ بە فارسی «ئەکبەری داناسرشت» لاپەڕەکانی ٥١ تا ٥٤ ئەوەی ناوکەوانەکان هی نووسەری ئەم پەرتووکەیە)

**لە نووسراوەکانی بیروونی ئەم ڕاستیانە بە دەست دێن:**

١ـ پێش ئیسلام نەریتی نەورۆز زەمانێ بەڕێوە دەچوو کە زۆربەی میوەو دانەوێڵە و ئاژاڵ پێ گەیشتبوو و خەڵك دەیانتوانی وەکوو پێشکەشیان باج بە دەرباری بدەن واتە هەوەڵی هاوین.

٢ـ پاش هێرشی عەرەب تا چەند سەدە بۆ گرتنی نەورۆز سەر لێ شێواوی هەبوو.

٣ـ ئەگەر بۆ زیندوو کردنەوەی نەورۆز لەلایەن خەلیفە عەرەبەکانەوە هەوڵ درا، بۆ گرتنی باج و خەراج بوو نە بۆ خزمەت بە نەتەوە ئاریەکان. دەیانەویست ئەم باجدانە لەگەڵ نەریتی کۆن و جەژنی نەتەوەیی تێکەڵ و شادی خەڵکی لەگەڵدا بێت.

پاش موعتەزید ئیتر نەورۆز نەهاتەوە جێگای ڕاستەقینەی خۆی.

زانستوەری ئێرانی و ئیسلامی و مێژوونووسی بە ناوبانگ «مەسعوودی» کە ئەویش لە سەدەی چواری کۆچیدا کتێبەکانی بە عەرەبی نووسیوە لە کتێبی «التنبیه و الاشراف»دا سەبارەت بە نەورۆز دەنووسێ:

«کاتێ کە مولکی ئێرانیگەل نەما و داب و نەریتیان (بە دەس عەرەبەکان) پچڕا و پادشاکانیان نەمان تا یەك لە چواری کەبیسەکان (چوار ساڵ یەك ڕۆژ) حیسابکەن، ڕۆژەکانی ساڵیان گۆڕاو نەورۆزەکەیان لە ماوەی دووسەد و پەنجا ساڵ تا دەورانی موعتەزید نزیك بە دوو مانگ کەوتە دواوە .... موعتەزید دوو مانگ پاشی خست و خستیە سەر مانگە سوریانیەکان(١٧) تا ئیتر نەگۆڕدرێ. نەورۆزی بردە پانزەی حوزەیران و ناونرا نەورۆزی موعتەزیدی. نەورۆزی ئێرانی هەروا دەگەڕا و سەد و بیست ساڵ جارێ مانگی دەکەوتە دواوە.

نەورۆز یەکەمی وەرزی هاوین و میهرەگان یەکەمی وەرزی زستان بوو. (التنبیه.... مەسعوودی وەرگێڕ بە فارسی ئەبولقاسمی پایەندە لاپەڕەکانی ٧ ـ ١٩٦). توێژینەری بە ناوبانگی ئێران

موحەمەد قەزوینی لەسەر وتەکانی بیرونی و مەسعوودی دەڵێ: «بە ڕوون کردنەوەگەلی بیروونی و مەسعوودی کاتی نەورۆز یەکەمی وەرزی هاوین واتە تێك گۆڕانی هاوینە یەکەمی «سەرەتان» بە دوو سێ ڕۆژ کەم و زیادەوە بووە و جەژنی میهرەگان یەکەم ڕۆژی وەرزی زستان بووە (یادداشتگەلی قەزوینی بە تێکۆشانی ئیرەجی ئەفشار ج ٧ ل ٢٩٣)»

ئەبوو ڕەیحانی بیروونی هەر لە ئاسارولباقیەدا لە بەشی جەژنگەلی ئێرانیدا سەبارەت بە نەورۆز دەنووسێ «ئێرانیگەل (پێش ئیسلام) کاتێ سالەکانیان کەبیسە دەکرد لە وەرزەکاندا بە مانگەکانیان نیشانەیان دەکرد جا «فەرەوەردین مانگ هەوەڵی هاوین و تیرمانگ هەوەڵی پاییز و میهر هەوەڵی زستان و دەی مانگ هەوەڵی بەهار بوو.

چون کەبیسەکان پشت گوێخران کاتی نەورۆز تێك چوو. یەکەمی فەروەردین نەورۆزە ئەم ڕۆژە بەرانبەر بوو لەگەڵ هاتنی خۆر بۆ ناو بورجی قرژاڵ (سەرەتان) (کە سەرەتای هاوینە) پاشان لە ڕۆژانی بەهاردا لە جێگای خۆی سەرگەردان ما و کەوتە بەهار کە باران بارین و پشکوتنی دارو جووتبوونی ئاژەلە. ئەوەیە کە پاشان نەورۆزیان بە هۆی پەیدا بوون و ئافراندنی جیهان زانی (اثار ..... ل ٥ ـ ٣٢٤)

ئێستا فەروەردین یەکەم مانگی بەهارە و شەوی یەکەمی ئەم مانگە بووە بە نەورۆز. نەختێ سەرنج بە وتەکانی بیروونی کە مانگی فەروەردین بە یەکەم مانگی هاوین دەناسێنێت بۆمان دەردەکەوێ کە لەگەڵ بیروڕای ئەحمەدی خانیدا یەك دەگرێتەوە. دەزانین لە زەمانی خانیدا واتە سەدەی یانزەی کۆچی نەورۆز چەند سەدە بوو کە لە ڕۆژژمێرەکەی خەییامدا هێنرا بووە یەکەم مانگی بەهار و لەگەڵ جەژنی سەری ساڵ تێکەڵاو کرابوو (لە لاپەڕەکانی داهاتوودا روون دەکرێتەوە) ئەحمەدی خانی لە مەم و زیندا جەژنی نەورۆز و سەری ساڵ وەکوو یەك ناودەبا. خانی جەژنی نەورۆز و سەری ساڵ بە ڕۆژی ئاخری مانگی «ئازەر» دەزانێت کە لەگەڵ وتەکانی بیروونی ڕێك دێتەوە کە دەڵێ فەروەردین یەکەم مانگی هاوینە. کەوا بوو ئەگەر ڕیزی مانگە ئێرانیەکان وەکوو بیروڕای ئەو ریزکەین واتە: فەروەردین ـ توردی بەهەشت ـ خورداد (مانگەکانی هاوین) تیر ـ مورداد ـ شەهریوەر (مانگەکانی پاییز) میهر ـ ئابان ـ ئازەر (مانگەکانی زستان) دیارە ئاخری مانگی ئازەر ئاخری زستان و سەرەتای وەرزی بەهارە کە جەژنی سەری ساڵ و نەورۆزی پاش تەقویمەکەی عومەری خەییامە. خانی دەڵێ:

... وەختێ وەکوو شەهسەواری خاوەر + تەحویل دکرد ماهی ئاوەر

یەعنی کودهاتە بورج سەر ساڵ + قەت کەس نەدما دمەسکەن و ماڵ. (واتە کاتێ کە شاسواری ڕۆژهەڵات یانێ خۆر تەحویل دەبوو لە مانگی ئازەردا یانێ کە خۆر دەهاتە بورجی سەر ساڵ کەس لە ماڵ نەدەمان و دەچوونە دەشت و باخ). لە سەر بناغەی قسەکانی بیروونی و خانی سێ مانگی بەهار دەبن بە دەی ـ بەهمەن و ئەسفەند کە پاش ئەسفەند نەورۆزی ڕاستەقینە، (نەك جەژنی سەری ساڵ) دەستی پێ دەکرد کە سەرەتای وەرزی هاوین بوو. بەڵام پاش ڕۆژژمێرەکەی عومەری خەییام تا ئێستا ئەسفەند بووە بە ئاخر مانگی زستان و ڕۆژی ئاخری ئەسفەند کە شەوی نەورۆز و جەژنی سەری ساڵە. پاش سەر لێشێواوی لەسەر نەورۆز و چەند جار پاش خرانی کە باس کرا، ئاخری عومەری خەییام جەژنی نەورۆزی هێنایە سەری ساڵی ئێستا و لەگەڵ یەك تێکەڵ کران، بەڵام لەو پەڕی وڵاتی ئێران واتە لە کوردستانی باکووردا هێشتا ناوی ئاخر مانگی زستان وەکوو خۆی ئازەر مابووەوە.

بیروونی هەبوونی نەورۆزی لە زەمانی خۆیدا واتە سەدەکانی چوار و پێنجی کۆچی لە سەرەتای وەرزی بەهاردا بە شتێکی نائاسایی و بە بۆنەی پشت گوێ خستنی کەبیسەکان دەزانێ. دیارە چاکسازیەکەی موعتەزید خەلیفەی عەبباسی لە زۆر شوێنی ئێران کاریگەری ئەوتۆی نەبووە و بۆ گرتنی نەورۆز خەڵك لەسەر لێشێواوی‌دا بوون. لە جێگایەکی‌تر بیرونی دەنووسێ: ئێرانی‌گەل بۆ ئەوە سەرەتای ساڵیان یەکەمی شۆرشی هاوینە دانابوو کە دوو شۆرشی هاوینە و زستانە چاکتر لە دوو ئیعتدال (واتە ئیعتدالی بەهارە و ئیعتیدالی پاییزە ڕۆژانی یەکەمی بەهار و پاییز) بە ئامراز (ئامرازی ئەستێرەناسی ئەوزەمانە) و بە چاو ئەندازە دەگیردرێ چون دوو شۆرش هەوەڵی ڕوو هێنانی خۆرە بۆ یەکێ لە دوو قوتبی زەوی و هەروەها هەوەڵی دوور کەوتنەوەی خۆرە لە یەکێ لە دوو قوتبەکان (اثار .... ل ٣٢٩)

ئەوەش بزانین سەر لێشێواوی بەردەوام بوو تا زەمانی سەلجووقیەکان کە ئێران لە ژێر دەسەڵاتی عەرەب بە تەواوی نەجاتی بوو، بەڵام بە تەواوی کەوتە ژێردەست تورکەکانی سەلجووقی. ئەوان لە ٤٢٩ تا ٥٩٠ی کۆچی لە ئێراندا حکوومەتیان کرد و ئیمپراتۆریەکی گەورەیان لە سنوورەکانی چینەوە تا زەریای مەدیتەرانە پێك هێنا و تەنانەت خەلیفەکانی عەبباسیشیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

ئەم وڵاتە مەزنە بە ڕۆژژمێرێکی هەتاوی ڕێك و پێك نیازی بوو. لە زەمانی یەکێ لە شاهانی سەلجووقیدا «جەلالەددین مەلەکشا» (٤٦٥ تا ٤٨٥) دەستوور بە ماتماتیکزان و ئەستێرەناسی

گەورەی ئێرانی عومەری خەییام[18] درا کە تەقویمێکی هەتاوی ڕێکوپێك دروست بکات. ئەو زانا گەورە ڕۆژژمێرێکی وردتر و ڕێکوپێکتر لە تەقویمەکەی «گریگووری» ڕۆمییەکان دروست کرد. خەییام ڕۆژی یەکەمی ئیعتیدالی بەهاری واتە ڕۆژی ٢٠ یان ٢١ی مارس وەکوو «نەورۆز» ناساند و دەستوور بە حاکمانی وڵات درا تا لە هەموو وڵاتانی ژێر دەستدا ڕەچاو بکرێ. بەم جۆرە جەژنی سەری ساڵیش مانگێ پێش خراو لەگەڵ نەورۆز تێکەڵاو کرا. ئێستاش لەو وڵاتگەلەدا کە لە ژێر فەرمانڕەوایی سەلجووقیەکاندا بوو لەوانە کوردستان جگە لە ئێزدیەکان جەژنی سەری ساڵی پێشوویش وەکوو نەورۆز ناساندرا.

لە پێوەندی نێوان توێژینەکانی بیروونی و مەسعوودی و ئەو مێژوونووسانەی پاش ئەوانیش کە لە وتەی ئەوان کەڵکیان وەرگرتووە و پاشان درووست بوونی ساڵژمێری جەلالی خەییام کە یەکەم شەوی ئیعتیدالی بەهاری کرا بە ڕۆژی یەکەمی ساڵ و نەورۆز، دەبێ ڕاستی چی بێ؟ وتەکانی بیروونی و مەسعوودی کە نەورۆز لە سەرەتای هاویندا بەڕێوە دەچوو بە تەواوی دروستە و لە باری باوەڕمەندی نۆلیشەوە کە پاشان باس دەکرێ ڕێکوپێك دێتەوە. لام وایە تێکەڵاویەك بە عەمد ڕووی داوە تا نەریتی جەژنی سەری ساڵ کە یەك مانگ پاش ئیعتیدالی بەهاری بەڕێوە دەچوو لەگەڵ نەورۆز تێکەڵ کرا.

لە ڕاستیشدا بە هۆی پشت گوێ کەوتنی کەبیسەکان نەورۆز لە پێشدا لەگەڵ جەژنی سەری ساڵ تێکەڵاو کرابوو. جگە لە نەورۆز جەژنی سەری ساڵ لە ئێران و کوردستانیش بەڕێوە دەچوو. بزانین جەژنی سەری ساڵ کەی بووە. ساڵی فارس و مادەکان واتە کوردیش کە هۆزی سەرەکی و گەورەی مادە پێش ئیسلام دوو وەرزی هەبوو. لە ئەوێستادا «هەمە» بە پاشگری ئاوەڵناوەوە «هەمەنە»[19] لە هەورامیدا هامن و لە زاراوەکانیتردا هاوینە و لە یەکەم ڕۆژی مانگی دووهەمی بەهارەوە دەستی پێ دەکرد و تا ئاخری یەکەم مانگی پاییز بەردەوام بوو. کەوابوو، جەژنی نەورۆز دوو سەدە پاش ئیسلام بە هۆی لە بەرچاو نەگرتنی کەبیسەکانەوە کەوتە دواوە و تێکەڵاوی جەژنی سەری ساڵ بوو تا خەییام شەوی ئیعتیدالی بەهاری بە یەکەم ڕۆژی ساڵی نوێ ناساند و ئەو دوو جەژنە کە یەکێ لە ڕۆژی یەکەمی هاوین و ئەوی دی لە ڕۆژی یەکەمی مانگی دووهەمی بەهاردا بەڕێوە دەچوو هاتە ڕۆژی یەکەمی ئیعتیدالی بەهاری و بوون بە یەك جەژن. گشت توێژینەرانی ئێرانی سەبارەت بە نەورۆز توشی سەر لێ شێواوی بوونە تەنانەت هەندێ لەوانە قایل بە دوو نەورۆزن یەکێ نەورۆزی گەورە کە بە وتەی مێژوونووسانی کۆن هەوەڵی هاوینە

و یەکێ نەورۆزی چکۆلە، لەوانە نووسەری «تاریخ گردیزی» «ئەبوو سەعید بن مەحموود گردیزی»ە کە نەورۆزی گەورە وەکوو نەورۆزی تایبەت دەناسێنێت (ل ٥٠٨ تاریخ گردیزی). وەرزی دووهەم لە ئەوێستادا «زمە» بە پاشگری «ستانە» و بە قاعیدەی ئەوێستایی دەبێ بە «زمووستانە» (زمە + وو + ستا + نە) بە کوردی سنەو هەورامی و کرماشانی و ئیلامی و لەکی و لوڕی زمسان و بە فارسی زمستان، کرمانجی زڤستان و سۆرانی زستان. ئەم وەرزە لە دووهەم مانگی پاییزەوە بە چەند ڕۆژ زیاد و کەم دەستی پێ دەکرد و تا ئاخری یەکەم مانگی بەهار مانگێ پاش نەورۆزی ئێستا بە چەند ڕۆژ زیاد و کەمەوە دەخایاند و جەژنی سەری سالّی میهرپەرستان بوو کە ئێستاش جەژنی سەری سالّی ئێزدیەکانە. پاییز و بەهار پێش ئیسلام لە نێو میهرپەرستانی ڕۆژاوای ئێراندا هەبووە، بەلاّم لە دەقە زەردەشتیەکاندا ناوی نییە. بەهار وشەیەکی ئارییاییە لە سانسکریتدا بیهار بە مانای ڕەنگاو ڕەنگە و ئەوان ئەمڕۆیش بە بوتخانەکانیان کە پڕە لە زێڕ و زێو و بەردی قیمەتی وەکوو زمڕووت و یاقووت و پیرۆزە کە وەکوو کوێستانی بەهار ڕەنگاو ڕەنگە بیهار دەلّێن.

وشەی پاییزم بۆ ڕوون نەبۆوە، بەلاّم خەزان کە ناوی تری پاییزە لە فارسی و کوردیدا، لە وشەی خەزەلّی کوردی گیراوە و لە کوردیدا بە مانای گەلاّی زەردی دارەکانە. کەوابوو جەژنی سەری سالّ (نەك نەورۆز) لە یەکەم ڕۆژی هاوینی گەورە واتە وەرزی یەکەمی سالّی پێش ئیسلامی هۆزە ئێرانیەکان و دوو مانگ پاش ئەوە واتە شەوی شۆڕشی هاوینە کە ڕۆژی پاش ئەو شەوە درێژترین ڕۆژی سالّە نەورۆز بەڕێوە دەچوو.

پاش ئیسلام بە وتەی مێژوونووسە کۆنەکان بەهۆی هێرشی عەرەب و ڕەواجی ئیسلام و پشتگوێ کەوتنی کە بسیەکان تا زەمانی موعتەزیدی عەباسی نەورۆز دوو مانگ دواکەوتبوو و لەگەلّ جەژنی سەری سالّ تێکەلاّو بوو و پاشان عومەری خەییام ئەم جەژنەی هێنایە ئیعتدالی بەهاری و چون نەورۆزی ڕاستەقینەش تێکەلاّوی جەژنی سەری سالّ ببوو، ئەو ڕۆژەی بە نەورۆز ناساند. بە حاکمانی ولاّت دەستوور درا کە ڕۆژژمێری نوێی هەتاوی لە هەموو لایەك ڕەچاو بکرێ. بەم جۆرە جەژنی سەری سالّ و نەورۆز کرا بە یەك و بە جەژنی «فەرەوەرتەکان»ی زەردەشتی نزیك بووەوە.

جەژنی «میهرەگان»کە ڕۆژی لە دایك بوونی میترایە و لە نووسراوەی بێستوندا «میترەکانە»[٢٠]یە بە وتەی بیرونی و مەسعوودی و هەندێ مێژوونووسی پاش ئەوان شەوی

یەکەمی زستانی ئەمڕۆ کە درێژترین شەوی ساڵە و بەرانبەرە لەگەڵ ٢٢ی دسامبر بەڕێوە دەچوو و ئێستاش وەکوو شەوی «یەلدا» یان شەوی چلە بەڕێوەدەچێ.

چەند سەدە پاش زەردەشت کە خودایانیتری ئاریایی لەوانە میترا هێنرایە نێو ئەوێستاوە زەردەشتیەکان ڕۆژی لە دایك بوونی میترایان هێنایە هەوەڵی زستانی کۆن واتە دووهەم مانگی پاییز و لەگەڵ ڕۆژمێری خۆیان ڕێکیان خست. تەقویمی زەردەشتیەکانیش دوانزە مانگی هەیە کە بە ناوی پیرۆزەکانی خۆیانەوە ناونراوە لەوانە مانگی میهر، یان مانگی میترایە کە لە پێشدا دووهەم مانگی پاییز بوو، بەڵام پاش تەقویمی جەلالی عومەری خەییام کەوتە یەکەم مانگی پاییز. لەم مانگەدا «میهرەگان»ی زەردەشتی بەڕێوە دەچوو. ڕۆژمێری زەردەشتیەکان هەفتەی نییە. هەر مانگێ سی ڕۆژە و هەر ڕۆژێ ناوێکی هەیە. ناوەکان بە ناوی پیرۆزیەکانی زەردەشتییەو ناوی هەر دوانزە مانگەکەیشی تێدایە، لەوانە ڕۆژی شانزەی مانگی میهر هەر ناوی میهرە و لەوەدا «میهرەگان»ی زەردەشتی بەڕێوە دەچوو. میهرپەرستگەلیش جەژنی لە دایك بوونی میهریان لە شەوی «یەلدا»ی ئێستادا دەگرت. یەلدا وشەیەکی سوریانیە بە مانای لە دایك بوون کە میهرپەرستەکان لەوانە کوردەکان لە زەمانی ساسانیەکان و فەرمی بوونی ئاینی زەردەشتیدا بۆ ناوی ئەو شەوە هەڵیان بژاردبوو کە پاشان قسەی لەسەر دەکرێ. ڕۆژی زایینی میترا لە هەوەڵی زستانەوە بوو واتە زستانی ئەمڕۆ بەڵام نەك بە وردی تەقویمی ئەمڕۆ. دەتوانین بڵێین لە دەوروبەری زایینی عیسا مەسیحدا. پاش تەقویمە زۆر وردەکەی خەییام جێگای خوی لە درێژترین شەوی ساڵدا واتە شۆڕشی زستانە (ئینقلابی شەتەوی) داگرت. پاش هاتنی ئیسلام و موسڵمان بوونی هۆزە ئێرانیەکان داب و نەریتی نەورۆز و سێ جەژنەکەی ما بەڵام هۆکارەکانی بەدیهاتنی ئەوانە لە بیری خەڵکدا نەما. جا پاش ئیسلام لێکوڵەرو مێژوونووسان هەرکام بە جۆرێ هۆی گرتنی جەژنی نەورۆزیان لێك داوە، وەکو جەژنی سەرکەوتنی فەرەیدوون[21] بە سەر دەهاك (زەحاك[28] یان بە دابێژی هەڵە زوحاك). یان وەکوو شاهنامەی فیردەوسی بە جەژنی دۆزینەوەی ئاگر لە لایەن «هۆشەنگ»[22] شای ئوستوورەیی ئێران یان لە کوردستاندا بە جەژنی کوشتنی زەحاك بە دەستی کاوە[23] یان بە جەژنی هاتنە سەرکاری جەمشێد شای ئوستوورەیی و... لە قەڵەمدا. ئەمانە گشت پاش ئیسلام نووسراوە و لە ڕاستیدا پێوەندی بە نەورۆزەوە نییە و هەروەها کە ڕوونکرێتەوە نەورۆز و سێ جەژنەکەی دیکە جەژنگەلێکی تۆلی میتراییە. ئەو شتانە کە نەورۆزیان پێوە پێوەندی داوە جگە لە کاوە کە هەندێ لایەنی مێژوویی هەیە گشت ئوستوورەگەلی هەرە کۆنی

ئارییاییە. هەروەها کە هەرکام لە ژمارەی خۆیدا بۆ خوێنەرانی بەڕێز پاش بەشی یەکەم ڕوون دەکرێتەوە بە هیچ کلۆجیك ناتوانێ پێوەندی بە نەورۆزەوە هەبێ. تاکامی وتەکانمان بەوە گەیشت کە نەورۆزی ڕاستەقینە هەوەڵی هاوین بووە و پاشان لەگەڵ جەژنی سەری ساڵی میهر دینەکان و پاشانیش «گاسانبار»[٢٤]ی ئاخری زەردەشتی دوایین کە لە شەوی ئاخری ئەوەدا جەژنی فەرەوەرتەکانیان بەڕێوە دەبرد نزیك کراوە. جەژنی لە دایك بوونی ڕاستەقینەی میترا کە هەر شەوی یەلدایە زەردەشتیەکان بردیانە سەرەتای پاییز واتە شانزەی میهر مانگ، بەڵام شەوی یەلدا کە شەوی یەکەمی وەرزی زستانە لە لایەن هۆزە ئێرانیەکانەوە لەوانە هۆزی کورد هەر بەڕێوە دەچێ. نەریتگەلی شەوی یەلدا یان شەوی چلە کە بە تەواوی میترایيە و باسی دەکەین هەر ئەمڕوش بەڕێوە دەچێ بەڵام خەڵکی کورد و ئێرانی کە موسڵمانن نازانن ئەو داب و نەریتگەلە بۆچی بەڕێوە دەبەن. جەژنی نەورۆزی ڕاستەقینەیش واتە هەوەڵی هاوین ئەوەندە لە نێو خەڵکی ئێراندا بە هێز بوو کە زەردەشتی دوایین نەیتوانی هەڵیپێچێ و تەنانەت پادشاکانی زەردەشتی ساسانیش لەگەڵ خەڵك بەڕێوەیان دەبرد و هەروەها کە بۆ خوێنەرانی بەڕێز ڕوون بۆتەوە پاش هێرشی کارلکەری عەرەب و موسڵمان بوونی هۆزە ئێرانیەکان ڕۆژژمێری ساڵی هەتاوی و سەرپەرشتی دینی نەما و پاش چەند سەدە جەژنی سەری ساڵ و نەورۆز تێکەڵ کراو بوون بە یەك.

ئەم پرسیارەش لە گۆڕێدایە کە ئایا عومەری خەییام لە توێژینەکانی بیرونی و مەسعوودی و... ئاگادار نەبوو و بەرهەمی ئەوانی نەخوێند بوو و نەیدەزانی نەورۆزی ڕاستەقینە لە هەوەڵی هاویندایە؟ گومان لەوەدا نییە کە خەیامی فەیلسووف و هەرە زانا ئەمەی دەزانی بەڵام چەند شت هەیە کە خەییامی بۆ ئەوە ڕاکێشا کە نەورۆز بە ئیعتیدالی بەهاری بناسێنێت:

یەکەم، نەورۆزی ڕاستەقینە کە بە میهرپەرستەکانەوە پێوەندی هەیە ئەوان هەر لە زەمانی ساسانیەکاندا بە توندی سەرکوت دەکران و مەعبەدەکانیان دەرووخا (پاشان بەسەند و بەڵگە ئاماژە دەکرێ) پاش هێرشی عەرەبیش زەردەشتیەکان دەیانتوانی بە «جزیە» لەسەر ئاینی خۆیان بیننەوە، بەڵام میهرپەرستگەل چارەیان موسڵمان بوون یان کوژران بوو. پاش ماوەکانیشان کە نەختێ خۆیان بە ئیسلامەوە لکاند بوو وەکوو مولحید و زەندیق دەکوژران.

دووهەم، دژایەتی زەردەشتی لەگەڵ میهرپەرستی کە لە سەدەی سێهەمی پاش زایین دەستی پێ کردبوو و هێشتا هەر مابوو (پاشان بە بەڵگەی پێویست ئاماژە دەکرێ)

سێهەم: لە بناغەدا ئیلاهییاتی زەردەشتی زۆر لە ئیلاهییاتی ئیسلام دوور نییە. لە شەڕگەلی نێوان میهرپەرستگەلی ڕۆژاوای ئێران لەگەڵ خەلیفەگەلی عەبباسیدا زەردەشتیگەل یارمەتی موسڵمانەکانیان دەدا. وەکوو هاوکاری ئەفشین لەگەڵ مەئموونندا بۆ کوشتنی بابەکی خورەمدین. پاشماوەکانی ئەوان پاش ئیسلام لە لایەن زەردەشتیەکانەوە هەر بە کافر دەناسران. لە لایەن موسڵمانەکانیشەوە بە زەندیق و مولحید دەناسران و کوشتنیان واجب بوو. خەییام بە پێشینە و پاشماوەکانی میهرپەرستی لە ئێراندا ئاشنا نەبوو و لە زەمانی ساسانیەکاندا وەها ناو و نیشانی ئەوان لە مێژوودا سڕا بووەوە کە ئەگەر توێژینی زانایانی ئەورووپایی بەتایبەت لە سەدەی بیستەمدا نەبوایە کە توانیان شوێنەواری فەرهەنگی و مێژوویی مەزنی ئەوان یەکەیەکە بدۆزنەوە و پیشانی بدەن و دڕەندەیی کەلیسای ڤاتیکان سەبارەت بە ڕەشەکوژی میهرپەرستەکانی ئەورووپا و ڕووخاندنی پەرستگەکانیان دەرخەن باسی میهرپەرستی ڕۆژاوای ئێرانیش دەشاردرایەوە هەروا کە لە زەمانی خەییام واتە نۆسەد ساڵ لەمەو پێشدا ناوی نەمابوو.

چوارەم: زێدی خەییام خوەراسانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران هەر لە زەمانی هیخامەنشیەکانەوە زەردەشتی و دژ بە میهردینی بوون.

پێنجەم: لە زەمانی خەییامیشدا نەورۆز بەهۆی پشتگوێ کەوتنی کەبیسەکان زۆرتر لە دوو مانگ دوا کەوتبوو جا ئەگەر خەییام هێنایە ئیعتیدالی بەهارە نزیک بە سێ ڕۆژ دوایخست. هەروا کە وتمان چاکسازیەکەی موعتەزید خەلیفەی عەبباسیش لە هەموو لایەکی ئێراندا پەرەی نەسەند.

چون لە دەقە زەردەشتیەکاندا هیچ ئاماژەیەك بە نەورۆز و سێ جەژنەکەی دیکە (جگە لە میهرەگان کە لە زەردەشتی دواییندا و جێگا ڕاستەقینەکەی گۆڕدراوە) نیە و ئەو چوار جەژنە بناغەی دینی و ئۆلیان هەیە و تەنیا لەم پێوەرەدا پێوەندی نێوان ئەوانە روون دەبێتەوە.

جا سەرنجی نووسەری ئەم پەرتووکە بۆ لای ئاینی میترا ڕاکێشرا کە پاشماوەکانی لە کوردستاندا ئاینەکانی ئێزدی و کاکەیی (ئەهلی حەق، یارسان) و عەلەویەکانی کوردستانی باکوور و هەروەها بە پێی هەندی بەڵگە کە ئاماژەی پێی دەکرێ ئاینی «شەبەك» و تەریقەتەکانی عیرفانی توندڕەو و فەلسەفەی ئیشراقی سوهرەوەردی کوردە. لە توێژین و شرۆڤەی میهرپەرستیدا ئەم شتانە ڕوون کرایەوە کە بە وردی و بە درێژی لەسەری باس دەکرێ.

١ـ شەوی یەلدا واتە شەوی یەکەمی زستان کە درێژترین شەوی ساڵە (و ڕۆژانی پاش ئەو شەوە کەمکەم درێژی ڕۆژەکان تا ئاخر شەوی بەهار زیاد دەکا) ڕۆژی پاش ئەو شەوە ڕۆژی تەجەللای تیشك و ئەوینی خودایە لە زەویدا کە لە بەرد یا هەندێ فیرقەی میهرپەرستی کە پەرستگەکانیان لە ئینگلیس و ئاڵمان و... دۆزراونەتەوە لە سەدەف یان وەکوو ئایینە کوردیەکانیش هەر لە سەدەف دێتە دەرێ. (سەدەف بە کوردی گوێ ماسی پێ دەڵێن کە لە دەریادا دوڕ واتە مرواری لە نێویدا دروست دەبێ)

٢ـ شەوی یەکەمی هاوین واتە نەورۆزی ڕاستەقینە شەوی میعراج واتە سەرکەوتنی میترا تەجەللای خودایە (پاش جێ بە جێ کردنی کارەکانی لە زەویدا) بۆ ئاسمان و جێ گرتنی لە جیهانی نووردا کە سەنبول و ئاماژەکەی «خۆر» و لە فەلەك واتە چەرخی چوارەم چەرخی نیوەڕاستی هەفت ئاسماندایە. ئەم شەوە شەوی پەیمان و بەڵێنە کە لە کوردی و ئایینی کاکەییدا «بەیا بەست»ی پێ دەڵێن. وشەی میترا خۆی بە مانای پەیمان و بەیابەستە لە ئەوێستادا وەکوو «میثرە» (بە «س»ی نووکدەدانی «Mithre» «میث +رە» میث لە ئەوێستا و « میت» لە فارسی هیخامەنشی و سانسکریتدا بە مانای بەڵێندان و پەیمان بەستنە و بە گشتی میثرە یان میترا بە مانای پەیمان و بەیابەست و بەڵێنە. لە نێو ئاریاییە کۆنەکاندا پێش بەدیهاتنی ئایینی میترایی لە ڕۆژاوای ئێران میترا خودای پارێزەری گرێ بەست و پەیمان و بەڵێنە و ئەوانەی وا بەڵێنیان شکاندوە لە شەڕەکاندا تووشی شکستی کردوون. لە ئەوێستاشدا هەر ئەم ڕۆڵەی هەیە و هۆزە ئێرانیەکان هەمیشە سوێندیان بەو خواردووە. وشەی «میترەکانە» لە بەرد نووسراوەی بێستووندا بە کوردی ئەمڕۆ میترەکانێ و میتراکانەیە. وشەی کانێ و کانە لە کوردیدا وەکوو دێلەکانێ و خزخزەکانێ و خلیسکانێ و خلیسکانە بە مانای یاری جۆلانێ و خزینی سەر سەهۆڵ، لە پەهلەوی خوشکی زمانی کوردیدا ویوەکانێ بە مانای بەڕێوەبردنی بووکێنی و زەماوەنە. وشەی «کانە» و «کانێ» و کێنی پاشگری بەڕێوەبردنە جا میترەکانە بە کوردی میهرەکانێ و میهرەکانە کە تەعریب کراوە بە میهرەجان بە مانای بەڕێوەبردنی جەژنی میترا یان جەژنی خودای بەڵێن و پەیمانە. وشەی میترا بە دابێژی کوردی و فارسی ئەمڕۆ «میهر» کە مانای ئەوین و خۆشەویستیشی هەیە. لە میهرپەرستیدا میترا تەجەللای نوور و میهرەبانی خودایە کە بۆ ئافراندن و درێژەی ژیانی گیاو گیانلەبەر و مرۆڤ دێتە سەر زەوی.

لە میهرپەرستی و فەلسەفەی ئیشراق و دینە کوردیەکاندا هەروەها لە عیرفانی توندڕەودا کە باسی دەکەین خودا جیهانی ئافراندووە تا خۆی تێدا تەجەللا بدات. تەنانەت ئەو لە سەردەمگەلێکدا نەختێ لە زات (کە دەتوانی نوێنەری گشت زات بێت) یان بەشێ لە سیفاتی خۆی لە هەندێ مرۆڤدا دەرخات. (بە وردی وەکوو ئاینە کوردیەکان). میترا لە هەیئەتی مرۆڤێکدا بووە. پەیکەرەکانی کە لە پەرستگەکانی میهرپەرستی ئەورووپادا دۆزراونەتەوە وەکوو مرۆڤێکی لاوی هەرە جوانە کە لە بەردیان سەددەفەوە دێتە دەرێ. پاش تەواو بوونی کارەکانی لە زەویدا کە قوربانیکردنی گایە و لە خوێنی ئەو گایە ژیان لەسەر زەویدا پێك دێت و تەنانەت بوونەوەرگەلێکی دژ بە ژیانیش لەو رەحمەت و بەرهەمە کەلك وەردەگرن و ژیان درێژە پەیدا دەکات، میترا بۆ ناوخۆر لە شەوی نەورۆز واتە شەوی پەیمان بەستن لەگەڵ یارانیدا کە پاشان ئاماژەی پێ دەکەین سەردەکەوێ و بە تیشکی خۆی لە خۆرەوە کە نوورو رەحمەتی خودایە یان خودی میترایە بە ژیان لەسەر زەویدا یارمەتی دەگەیەنێ.

٣ـ شتێ کە توێژینەرانی ئاینی میترایی لە ئەورووپا وەکوو «ورماوزن» و «لۆمەل» و کومون و زینێرو.... و ئێرانی وەکوو پووورداود و هاشم رەزی و... و کورد وەکوو بەڕێز خوا لێخۆشبوو تەوفیق وەهبیشی تووشی سەر لێ شێواوی کردووە پەیکەرگەلێکە کە لە ستایشگاکانی میتراییدا وەکوو شێر یان ماریان پەیکەرگەلێکی مرۆڤی هەرە ترسناکە کە زانا ئەورووپاییەکان و بە لاسایی کردنەوەی ئەوان زانا ئێرانیەکان بە پەیکەری «زروان»[٢٥] یا خودای زەمانیان ناساندووە. تەنانەت هەندێ لەو زانایانە کە پاشان باسیان دەکەین بە شك و گومانەوە لەسەر ئەو پەیکەرە ترسناکانە قسە دەکەن. ئەوانە ئەگەر بە وردبینی زۆرترەوە بەو پەیکەرگەلە و بەتایبەت بە «مەلەکە تاوس» یان «تاوسێ مەلەك»ی ئاینە کوردیەکان سەرنجیان دابێت ڕازی ئەو پەیکەرگەلەیان بۆ دەردەکەوت. ئەوەی کە پێ نەگەیشتوون «تەوحید»ێکی هەرە قووڵە کە لە ئاینی میترا و ئاینە کوردیەکاندا بەدی دەکرێ ئەوەش تەوحیدی نێوان لایەنی نوور و رەحمەتی خودا لەگەڵ قەهر و تاریکی ئەودایە. ئەم لایەنی دووهەمە لە ئاینە کوردیەکاندا بە ناوی ئاماژەیی «تاوسێ مەلەك» ناسراوە. (چون ناوی کاکەیی، یارسان و ئەهلی حەقمان هێنا لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بە ڕوانگەی بەڕێز نوورعەلی ئیلاهیش ئاماژە دەکرێ) لە میهرپەرستیدا ویستی خودا وەکوو سککە دوو ڕووی هەیە و هەر دوویش دەتوانن هەم پێکەوە و هەم جیاواز بەدی بێن و وەکوو کەس و وەکوو جەستە (جەستەی مرۆڤ یان گیانلەبەریتر) دەرکەون بەڵام تەنیا یەك ویست و ئیرادەیە. خودی میترا هەم

دەرکەوتنی لایەنی تیشك و بەزەییە و هەم هەر دوو لایەنی ئیرادەی خودایە. ئەمە لە پەیکەرەکاندا ئاشکرایە. پەیکەرگەلی ژمارە ۲۱و ۲۳

میترا پیشان دەدرێ کە مارێك بە دەوریدا پێچراوە و سەری مارەکە لە سەرسەری میترایـە و لـە ناوەڕاستی سنگیدا شێرێکی دڕندە دەرکەوتووە کە تەوحیدی تەواوی لایەنی نوور و ڕەحمەتـی خـودا لەگەڵ قەهر و تاریکی ئەودا پیشان دەدات وەکوو دینە کوردیەکان کە خودا و تاوسی مەلەك هەر دوو دەبن بە یەك شت. ڕۆژی چوار شەمە لە ئاینە کوردیەکاندا ڕۆژێکی پیرۆزە و بە ڕۆژی مەلەکـە تاوس دەژمێردرێ لە گشت گرنگتر ڕۆژی چوارشەمە سووری یان چارشەنبـێ سوورەکە لە ڕوانگەی نووسەری ئەم پەرتووکەوە ڕۆژی عرووجی ئەوە بۆ ناو خۆر. (پەیکەرکانی لە ئـاخری ئـەم کتێبـەدا پیشان دەدرێ).

ڕۆژی «سێزدە بەدەر» ئێسـتاش بـە ڕۆژێکـی «نـەحس» دەژمێـردرێ ئێسـتاش لـە نێـو هـۆزە ئێرانیەکاندا ژمارەی سێزدە بە ژمارەیەکی نەحس ناسراوە کە ڕۆژی دەرکەوتنی لایەنـی تـووڕەیی و تاریکی خودایە و ئاخرین چوارشەمەی ئاخری نزیك بە نـەورۆزیش واتـە چوارشـەمە سـووری یـان کوڵە چوارشەمە ڕۆژی عرووجی ئەوە بۆ ناو خۆر. ڕۆژی سێزدەبەدەر کە ئەمـڕۆ هـۆزە ئێرانیـەکـان لەوانە کورد بەتایبەت لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا بە کۆمەڵ دەچنە باخ و جێگای سەوزەڵانی چۆن ڕۆژی لایەنی غەزەب و تاریکی خودایە خەڵك دەبێ وریا بن کە تووشـی ڕووداوو کارەسـات نـەبن. ئەگەر کەسێ تووشی کارەسات هات دەڵـێن «سـێزدەگـیر»بـوو. چـون تـاریکی و قـین لـە لایـەن زەردەشتیەکانەوە بـە ئـافرێنـراوی ئـەهریمـەن (شـەیتان) و دژ بـە ئـەهوورامـەزدا ناسـراوە بـە میهرپەرستەکانیان دەگوت «دێوپەرست» واتە شەیتانپەرست. پاش ئیسـلام موسـڵمانەکانیش بـە هۆگرانی دینە کوردیەکان شەیتانپەرست دەڵێن کە توانجێکی هەڵە و ناڕەوایە و پاشـان لـەسـەری قسە دەکەین.

زەردەشتیەکان لە زەمانی ساسانیەکاندا بە ڕۆژی چوارشەمەی میهرپەرستەکانیان دەگـوت ڕۆژی دێو و ئەهریمەن پاشان کوردە موسڵمانەکانیش بە چوارشەمەی کاکـەیـی و ئێزدیـان[۲٦] دەگـوت ڕۆژی جنۆکە و شێت لە هەندێ ناوچە کوردنشینەکاندا کە بە تـەواوی موسـڵمانن وەکـوو سـنە و سەقز و کرماشان و... ئەگـەر کـەسـێ کردارێکـی نائاسـایی بکـات پـێ دەڵـێن چـیە مـەگـەڕ چوارشەمەیە. یان دەڵێن شەوی چوارشەمە جەژنی شێتەکانە.

ئەوە کە پاش تەواو بوونی ڕۆژی سێشەمە واتە شەوی چوارشەمە و ڕۆژی چوارشەمە بە ڕۆژی شێتگەل یان جنۆکە (دێوی پێش ئیسلام) ناسراوە پێوەندی ئەو ڕۆژە بەتایبەت چوارشەمە سووری بە «تاوسیٚ مەلەك» یان لایەنی تاریکی و تووڕەیی خوداوە هەیە نەك بە ئەهریمەنی زەردەشتی یان شەیتانی موسڵمانەکانەوە کە پاشان باسی دەکەین. یان نەحسی و شووم بوونیٚ سێزدەبەدەر و ژمارەی سێزدە هەر پەیوەندی بەم مژارەوە هەیە. لە بەشگەلی باکووری کوردستاندا کە لە زەمانی ساسانیەکاندا میهرپەرستی پەرەی سەندبوو و لە بناغەیشدا جێگای پەیدا بوونی ئاینی میهری بوو بە تایبەت کوردستانی باکوور کە پاش ئیسلام میهرپەرستیان لە ژێر ناوی «ئێزدی»دا پاراست و پاشان لە ژێر گوشاری حکوومەتە موسڵمانەکاندا لە بواری زەماندا موسڵمان بوون و لە ژێر گوشاری غەزای موسڵمانەکاندا نەختە نەختە توانەوە و کەمیان کرد و هەندیٚ گۆڕانیان لە پەراوێزگەلی دینەکەیاندا بەدی هێنا چوارشەمە سووری واتە ڕۆژی تاوسیٚ مەلەك لایان زۆر پیرۆزە. لە مەهاباد و ناوچەکانی دەوروبەریدا کە موسڵمانن هێشتا بەم ڕۆژە چوارشەمەی پیرۆز دەڵێن. ئاینی ئێزدی لەگەڵ کاکەییدا چوارچێوەی ئیعتقادیەکەیان یەك شتە و زۆرتر جیاوازی لە ناوی تەجەللاکانی خودادایە کە بە چڕوپڕی باس دەکریٚ.

زانیمان کە شەوی یەلدا ڕۆژی بەدیهاتنی لایەنی تیشك و بەزەیی خودا واتە میترایە. ڕۆژی سێزدەبەدەر ڕۆژی تەجەللای لایەنی قین و تاریکی ئەوە بە بەیانی میهرپەرستەکان ئەهریمەن[٢٧] و دینە کوردیەکان مەلەك تاوس. کە هەر دوو لایەن یەك ویست و گەلاڵەیە کە لە چەندیا دوو و گاهێکیش لە یەك جەستەدا دەردەکەویٚ. چوارشەمە سووریش ڕۆژی عرووجی لایەنی قین و تاریکی خودا واتە ئەهریمەن یان بە ئاماژە مەلەکە تاوسە بۆ ناو خۆر. نەورۆزیش ڕۆژی میعراجی لایەنی تیشك و بەزەیی خودا واتە میترایە بۆ ناو خۆر لە باسەکانی داهاتوودا بە چڕوپڕی لەسەر تەوحید و دەرکەوتنی ئەم دوولایەنە وەکوو یەك کەس قسە دەکەین.

## ڕوونکردنەوەکانی بەشی یەکەم

١ـ سەبارەت بە کاوە و تارێکم لە گۆڤاری «ئایندە» ژمارە ٣٩ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٢دا بە ناوی «باسێك لەسەر ئوستوورەکانی زەحاك و فەرەیدوون و کاوە و ناساندنی سەرچاوەکانی ئوستوورە لە کوردستاندا لە لاپەڕەکانی ٦ تا ٢٢ بڵاو کردەوە. بەداخەوە ئەم وتارە ئەوندە هەڵەی چاپی تێدا بوو کەلام وایە بۆ خوێنەری ئاسایی شیاوی کەڵك وەگرتن نەبوو.

٢ـ زۆر فەتحە واتە «بزوێنی کورتی سەر» ئەوێستایی لە کوردی ئەمڕۆدا گۆڕدراون بە بزوێنی درێژی (ئەلف). کەویە بە مانای سەرۆك بووە بە کاویە. لە زۆربەی زمانەکاندا ئەگەر دوو یا چەند پیتی دەنگدار لە لای یەکەوە بن یەکێکی لە بواری زەماندا دەسوێ ئەوەیە کە کاویە بووە بە کاوە. بۆ گۆڕانی بزوێنی سەر، بە ئەلف سەرنجی ئەمانە خوارەوە بدەن:

| ئەویستایی | کوردی |
|---|---|
| هەم | هاو ـ هام (وەکوو هاوکار) |
| شیەنە | شیان (ناوی گوند بە مانای جێگای نشیمەن گرتن) |
| زروەنە | زروان (خودای زەمان) |
| مەن | مان (رامان واتە تێفکرین) |
| ئێریەنە | ئێران |
| خرەپ | خراپ |
| چثوە رە | چوار |
| وەس | واس هەورامی ـ خواز، زاراوەکانیتری کوردی |
| سەرێتە | ساڵ |
| زەرێتە | زاڵ (پیر ـ باوکی رۆستەم) |
| گەئۆ | گا (و) |
| ئەسمەنە | ئاسمان |
| تەچەرەئوذە | تانجەرۆ (ناوی رووبار) |

. جا، کەویە= کاویە = کاوە.

٣ـ ب ـ ب. ڕاڤەی وشەی کورد. ئایندە ژمارە ٣٤ ل ٦٠، لە دەقە پەهلەویەکاندا کوردانشا وەکوو کورتانشا هاتووە. ب.ب «کارنامەکی ئەرتەخشێری پاپەکان» (کارنامەی ئەردەشێری بابەکان و بەشی هەفتەمی ئەم پەرتووکە

٤ـ بەشی یەکەم و هەرە کۆنی ئەوێستا بە ناوی گاثا بە «س»ی نووك دیانی، وشەی مێ، بە واتای گازە کردن و دەنگ هەڵبڕینە. نێرییەکەی دەبێ بە «گاثە». لە دوو پیت پێکهاتووە «گا + ثا» گا بە مانای دەنگ هەڵبڕین بە پاشگری «ثا»وە بە مانای بە دەنگی بەرز خوێندنە. ئەم بەشە هۆنراوەکانی خودی زەردەشتە کە دەبێ بە دەنگی بەرز بخوێنرێتەوە. پاشگری «ثە» لە کوردیدا بووە بە «زە». وشەگەلی گازە و گیزە ـ قیژە لەم بناغەیە. لە کرمانجیدا دەڵێن گازی واتە بانگ کردن. بە پاشگری «رە»وە لە ئەوێستادا زۆر هەیە لە کوردیدا وشەگەلی، گارە ـ قارە ـ قیرە ـ قیلە ـ قوولە ـ قۆرە و هەروەها بێپاشگر وەکوو «قوو»، «قاو» بە دوو پاشگرەوە وەکوو قرمە و قرپە و گرمە لەم بناغەن. پاش کاریگەری زمانی عەرەبی لە سەر کوردی زۆر پیتی «هـ» و «و» و «ئـ» و «ك» بوون بە ح و ع و ق.

٥ـ تەناسوخ وشەی عەرەبیە واتە مرۆڤ کە مرد رۆحی بۆ تەکامول دەچێتە جەستەی ترەوە. لە گیاوە دەست پێدەکات تا دەگات بە مرۆڤ لە مرۆڤیشدا جەستە بە جەستە دەگەڕێ تا شیاویی ئەوە پەیدا دەکات خۆی بە جیهانی نووری خودایی بگەیەنێت. لە ئاینی کاکەییدا بەمە دەڵێن «دوو نا دوون». ئاینی میهرپەرستی و پاشان ئاینە کوردیەکان بە ناچاری بۆ شاردنەوەی بیروباوەڕەکانیان لە وشەگەلی بێگانەش کەڵکیان وەردەگرت. دوون وشەی تورکیە بە مانای جلوبەرگ و جامە. دیارە دوونادوون زەمانێ هاتۆتە نێو دینە کوردیەکانەوە کە تورك تازە پای کەوتۆتە ڕۆژاوای ئێرانەوە یان وەکوو «ئەتابەك» لە دەرباری خەلیفەکانی عەبباسیدا بوونە.

٦ـ یەلدا وشەی سوریانیە بە مانای لە دایك بوون. ئەمەش وەکوو دوونادوون لەو وشەگەلەیە کە میهرپەرستەکان بۆ شاراوەیی بیروباوەڕیان کەڵکیان لێ وەرگرتووە. مەبەست شەوی لە دایك بوونی میترایە کە درێژترین شەوی ساڵ واتە شەوی یەکەمی وەرزی زستانە. لە کوردی ئەمڕۆدا شەوی (چلە)شی پێ دەڵێن. لە گشت کوردستانی ڕۆژهەڵات و بەشگەلێ لە باکوور و باشووردا بە داب و نەریتی تایبەتەوە بەڕێوە دەچێت.

٧ـ ڕێگوێدا دوو وشەیە «ڕیگ» بە مانای کۆن. «وێدا» بە مانای زانیاری و هۆشیاریە. بناغەی «وێد» یان «وەئێد» هەر دوو لە ئەوێستا و سانسکریتدا بە مانای زانیاری و هۆشیار بوونە. بە پاشگری «ار» لە کوردیدا وەکوو بێدار ماوەتەوە. پاشگری «ار» لە هۆشیاریشدا هەیە. وشەی «وریا» لە کوردیدا تێکەڵ و پێکەڵ کراوی «وێدار»ە (بە دالی موەمەلە). وێداکان چەند بەشن بە بەشی هەرەکۆنی دەڵێن ڕێگ وێدا.

٨ ـ هەنجەمەنی کوردی کە بەداخەوە هەندێ کەس بە لاسایی کردنەوە لە فارسی ئەنجومەن دەڵێن وشەیەکی ئەوێستاییە. لە ئەوێستادا «هەنگەمەنە» لە چوار وشە پێکهاتووە «هەن + گە + مەن +ە» وشەی یەکەم «هەن» (بە نوونی ناو لووتی) لە ئەوێستاییدا وەکوو «هە» و «هەم»یش هاتووە. هەم لە کوردیدا دەڵێن هەم، هەڤ، هاو، وەکوو هاوکار، بەرهەم.... «گەه» هەر ئەوەیە کە لە کوردیدا دەڵێن گەهیشتن یان گەیین. هەر بەو مانا و بە مانای هاتنیش لە ئەوێستادا بە کار چووە. «گەه» وەکوو «گەس» و «جەس»یش لە ئەوێستادا بە کارچووە «مەن» بە مانای تێفکرین و هزرین لە کوردیدا وەکوو «رامان» بە پێشگری «را»وە ماوەتەوە. فەتحەی ئاخر دۆخی چاوگی پێداوە.

«هەنگەمەنە»ی ئەویستایی و هەنجەمەنی کوردی بە وردی بە مانای هاوگەیشتن بۆ تێفکرین یان «بە یەك کۆوە بوون بۆ تێفکرین»ە. نازانم بۆچی هەندێ وشەی ڕەسەنی کوردی لە باشووردا فارسیەکەی بەکار دەبرێ.

٩ـ لە ئەوێستادا «فەرەوەشی» یان «فەرەوەرتە» لە پەهلەویدا فرەوەرت یان «فرەوەهەر» لەگەڵ چوار هێزیتر: «ئوورڤە» بە هەورامی «ئەروا» واتە ڕۆح. گەیە، ئەهوو واتە گیان. بەئووزە (زێی نووك دیانی) بە مانای بۆ و هەست کردن. «دەئێنە» واتە ویژدان و شعوور پێنج هێزی دەروونی مرۆڤە لە ئاینی زەردەشتیدا. بە گوێرەی ئەم ئاینە فەرەوەشی یان فرەوەرتی مردووەکان لە گاسانباری ئاخری زەردەشتیدا (کە شەش سەدە پاش ئیسلام نەورۆزی لێ نزیك کرایەوە) دەگەڕێنەوە بۆ ماڵباتی خۆیان. زەردەشتیەکان بۆ ئەم جەژنە ئاهەنگ و نەریتی تایبەتیان هەبووە و هەیە.

١٠ـ ب ـ ب ژمارە ٩

١١ـ عیشق ئاباد عەرەبی کراوی «ئەشك‌ئاباد»ە کە ماڵباتی شاهی ئەشکانیەکان لەوێوە هەستان پاش هێرشی عەرەب و نەمانی حکومەتی ساسانی لە سەدەی چواری کۆچی بەم لاوە بەرە

بەرە تورکەکانی ئاسیای ناوەندی هاتنە باکووری خوەراسان و ئەو جێگاگەلە کە ئەمڕۆ بە تورکمەنستان و ئوزبەکستان ناسراوە و بەشێ لە قرقیزستان، گشت ئێرانی نشین بوون داگیرکراو وڵاتانی تورکی لێ دروست کرا. تورکەکان لە زەمانی سەلجووقیەکاندا بە تەواوی ئێرانیان داگیر کرد و بەشگەلێ لە ئێران زمانیان گۆڕدرا بە تورکی.

پاشان هێرشیان کردە سەر ڕۆم (ئاسیای بچووك، تورکیای ئەمڕۆ) و زمانی تورکی جێگای زمانی ڕۆمی گرتەوە. ئەشك لە بناغەی «ئەشە»ی ئەوێستایی بە مانای پیرۆزە ناوی «ئەشۆ» لە کوردیدا لەم بناغەیە.

١٢ـ تیر لە ئەوێستادا «تیشترە» بە مانای تیشکخەر، ناوی ئاینی ئەستێرەی گەلاوێژە لە ئاینی زەردەشتیدا. گەلاوێژ لە عەرەبیدا شەعرای یەمانی لە یۆنانیدا «سیریووس»ی پێ دەڵێن. لە زمانی خوارەزمی (خوارەزم وڵاتی ئێرانی‌نشین بووە کە ئەمڕۆ بەشێ لە تورکمەنستانە) لەکۆندا بەم ئەستێرە «غنە وێز» گوتراوە کە لەگەڵ گەلاوێژی کوردیدا هاو بناغەیە. چون کوردان زەردەشتی نەبوونە بەم ئەستێرە یان تیشترە نەگوتووە.

١٣ـ دەئوش (بەسینی نووك ددانی) یان دەتۆش، بە دابێژی ئەمڕۆ «دەی» ناوی مانگی یەکەمی زستانی ئاینی زەردەشتیە. بە مانای ئافرێنەر واتە خودا.

لە بناغەی ئاریایی (دا). لە ئەوێستا و کوردیدا ئەم بناغە چەند مانای هەیە. ١ـ قانوون و دادوەری (داتە)، بە مانای قانوون لە کوردیدا داد بە مانای عەدڵ و قەزاوەت لەم بناغەیە. ٢ـ ئافراندن (داتە، بە مانای ئافرێنراو. لە کوردیدا دەڵێن خوداداد واتە ئافرێنراوی خودا ٣ـ دان و بەخشین (داتە بە مانای دراو، بەخشراو) بەغدا بە قاعیدەی ئەویستایی بەغۆداتە هەر بە مانای خودادادە.

١٤ـ یەزدگرد (دابێژی دروست «یەزێت کەرت» بەزێت (لە کوردیدا دەڵێن ئێزد وەکوو ئێزدی ـ یەزیدی) ناوی ئاخرین شای ساسانیە کە لە زەمانی عومەر (د ـ خ) لە چەند جەنگدا لە عەرەبەکان شکستی خوارد و بۆ باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران هەڵات و لەوێدا بە دەست ئاشەوانێك کوژرا. ڕێکەوتی هاتنە سەرکاری ئەو سەرەتای ڕۆژمێری زەردەشتیەکانە لە زەمانی هێرشی عەرەبەکانەوە تا ئێستا. زەردەشتیەکان وەکوو موسڵمان و مەسیحیەکان سەرەتا ڕۆژژمێریان نەبوو. هەر پادشایەك دەهاتە سەرتەخت ئەورێکەوتەیان دەکرد بە سەرەتای ڕۆژژمێری خۆیان.

١٥ـ مووبەد لە ئەوێستادا مەگووپەتە، واتە سەرۆکی «موغ»ەکان. موغ بە پیاوی ئاینی زەردەشتی و میهرپەرست گوتراوە. لە کوردی ئەمڕۆدا بووە بە «مۆکە» کە ئێستا ناوی چەند گوندە لە ڕۆژهەڵات (لای بۆکان) و باشوور.

١٦ـ مەجووس. یونانی و سوریانی کراوی «مەگوو» و «مەغوو»ی ئەویستاییە بە مانای موغ کە پیاوی ئاینی زەردەشتیە. بە پیاوی ئاینی میهرپەرستیش دەگوترا پاش ئیسلام مەجووس بە زەردەشتیەکان دەگوترا. لە هەندێ فەرهەنگدا مەجووس بە مانای ئاورپەرست هاتووە کە هەڵەیە. چون زەردەشتی لە کاتی نوێژ کردندا ڕوو لە ئاگر دەکات موسڵمانەکان تەوانجی ئاگر پەرستیان پێیان دەدا.

١٧ـ مانگە سوریانیەکان هیشتا لە ئێراقدا بە کار دەبرێ.

١٨ـ عومەری خەیام خەڵکی خوەراسان بوو. بە باوەڕی من ئەم پیاوە هەرەزانیار و مەزنە کە شاعیریشە و چوارینەکانی مامۆستا هەژار کردوویەتی بە کوردی هۆگری ئاینی زەردەشتی بووە. دەزانین لە خوەراسان باکووری ڕۆژهەڵات و پاشان لە فارس و کرمان و سیستان باشووری ئێران هەر لە زەمانی هیخامەنشیەکاندا ئاینی زەردەشتی پەرەی سەندبوو. لە ناوەڕاست و ڕۆژاوا و باکووری ڕۆژاوای ئێران واتە ناوچەی ماد ئاینی میهرپەرستی ڕەواجی بوو. ئەو نەورۆزی هێنایە جێگایەك کە لەگەڵ جەژنی فەرەوەرتەکانی زەردەشتی نزیکە.

١٩ـ پاشگری ئاوەڵناوی «نە» ئێستاش لە کوردیدا زۆر بە کار دەچێت وەکوو دەڵێن ڕکنە، مرخنە، چنگنەو شەرمنە و ...

٢٠ـ میترەکانە دوو وشەیە «میترە + کانە» میترە هەر میترا یان بە دابێژی ئەمڕۆ «میهر»ە. کانە پاشگری بەڕێوەچوون و بەڕێوەبردنە. میترەکانە بە واتای بەڕێوەبردنی نەریتی جەژنی تایبەت بە میترایە. لە نێو میهرپەرستەکاندا جەژنی لە دایکبوونی میترایەکە لە بەردیان سەدەف دەردەکەوێ. بە گوێرەی ئەم ئاینە میهر یەکەم تەجەللای خودایە لە جەستەی مرۆڤ لەسەر زەویدا. کانە لە کوردیدا وەکوو «کانێ» و «کانە» دابێژ دەکرێ.

٢٢ـ هووشەنگ بە دابێژی ئەوێستایی هووشیەنە، یان، هووشیەنەنگە، دوو وشەیە هوو بە مانای چاك. شیە، بە مانای نشیمەن گرتن. نە، نیشانەی ئاوەڵناوە کە باسی کرا بە گشتی بە مانای کەسێکە خاوەنی ئاوڵناوی نشیمەنکەری چاکە. یان ئەوەی کە خانوو و نیشتمانی چاك پێك

دێنی. هووشەنگ لە پادشاگەلی ئوستوورەیی ئارییاییە. دیارە هی زەمانێکە کە ئارییاییەکان پاش سیستەمی ئاژەڵداری و تەرشداری دێتشین بوونە.

٢٣ـ ب. ب ٢١

٢٤ـ گاشانبار (بەسینی نووك ددانی) شەش جەژنی ئاینی زەردەشتیە کە هەرکام لە کاتێکی ساڵدا بەرێوە دەچێت و بە ناوی شەش دانە لە گاساکانەوە ناونراوە. بە گوێرەی ئەم ئاینە خودا جیهان لە شەش کاتی ساڵدا دەئافرێنی. لە گاسانباری ئاخردا کە ئاخری زستانە مرۆڤ دروست دەکا.

٢٥ـ زروان لە ئەوێستادا «زروەنە» (زروە + نە) بە مانای خاوەنی ئاوەڵناوی پیری.

زروە = پیری، پاشگری «نە» باسکرا. خودای زەمانە. لە ئەوێستادا ئافرێنراوی ئەهوورامەزدا خودای مەزن و ئافرێنەری جیهانە. لە زەمانی ساسانیەکاندا زروان پەرستی بووبەیەك دین. ئەم دینە پاش ئیسلام تا چەند سەدە درێژەی هەبوو و بە «دەهریوون» دەناسران. بە گوێرەی ئەم دینە زروان خودای زەمان و تەنیا ئافرینەر، زگی پڕ بوو لە زکیدا لفە دوانەیەك هەبوو. لە زك و زاکەی گومانی کرد. لەم گومانە ئەهریمەن واتە شەیتان بە دیهات. ئەو لفەکەیتر لە زکیدا ئەهوورامەزدا بوو زروان بەڵێنی بە خۆدا کاتی زایینی بەو دوانە ئەوەی کە پێشتر هاتە دەرەوە فەرمانداری جیهان بەو بدات. ئەهریمەن بەمەی زانی و لە کاتی زاییندا زووتر دەر پەڕیە دەرەوە. ئەهریمەن وەکوو کوڕێکی رەش و چەپەڵ بەڵام ئەهوورامەزدا وەکوو کوڕێکی نوورانی و خاوێن بوو. زروان بەڕێوەبەری جیهانی سپارد بە ئەهریمەن بەڵام ماوەی بۆ دانا پاش تەواو بوونی ماوە کە ئەهوورامەزدا سەردەکەوێ و جیهان پڕ دەبێ لە چاکە و ژیانی هەتا هەتایی و تیشك. بە گوێرەی ئەم دینە ئێستا جیهان بە دەس شەیتانەوەیە.

٢٦ـ ئێزدی یان یەزێدی (کە تەعریب کراوە بە یەزیدی، چون پیتی «ێ» لە عەرەبیدا نیە) لە بناغەی «یەزەتە»ی ئەوێستاییە. لە پەهلەوی خوشکی زمانی کوردیدا یەزێت و بە گومانی بەهێزەوە لە کوردی ئەو سەردەمەدا یەزێد.

«یەزەتە»ی ئەوێستایی سێ وشەیە (یەز + ـە + تە) بناغەی یەز بە مانای پەرەستن و ستایشت کردنە. «ـە» پاشگری لکاندنی دوو وشەیە. «تە» پاشگری ئاوەڵناوی بەرکارە. لە هەورامی و زازادا وەکووی خۆی ماوەتەوە وەك دەڵێن شکستە ئاروفتە. یان بووە بە «دە» وەك دەڵێن هاوردە لە سورانیدا بووە بە «توو» و «دوو» وەك دەڵێن. کەوتوو مردوو. لە کرمانجی و کەلەوری و لەکیدا

بووه «تی» وەك دەڵێن کەفتی، مردی. لە سنەیی بن زاراوەی سۆرانیدا بووە بە تگ و دگ وەکوو کەفتگ مردگ.

یەزەته لە ئەوێستاو یەزێت و یەزێد پەهلەوی و کوردی بە مانای پەرستراو و ستایشت کراوە کە مەبەست خودایە. لە ئاینی زەردەشتیدا بە خودایانی ژێردەستی ئەهوورامەزدایان دەگوت نەك بە ئەهوورامەزدا کە ئافرێنەری گشتە. جا بە وانەی کە یەکێ لە یەزەتەکان وەکوو میترایان پەرستایە دەیان گوت یەزێتی کە ئەمڕۆ بووە بە یەزیدی و پاشان ئیزدی.

٢٧ـ ئەهریمەن لە ئەویستادا «ئەنگرە مینوو» یان بە قاعیدە «ئەنگرە مەئینیوو» سێ وشەیە ئەنگرەیان ئەهرە+ مین + وو) ئەنگرە بە دابێژی نوێتر ئەهرە، بە مانای چەپەڵ و پیسە. مین لە ئەویستادا وەکوو مێن و مانیش هاتووە لە بناغەی «مەن» واتە تێفکرین. مان و مین و مێن لەگەڵ پاشکری «وو» بە مانای مەعنا و هزر و بیر و جیهانی مەعنایە لە بەرانبەر جیهانی ماکیدا. ئەنگرە مینوو و بە مانای هزر و رۆحی ناپاکە.

**سەبارەت بە وشەی ئێران:** لە زەمانی مادەکان و هیخامەنشیەکاندا ناوی ئێران نەبوو. لە زەمانی مادەکاندا وڵاتی ئێستای ئێران هەر بە ماد ناو دەبرا. پاش ڕووخانی حکوومەتی ماد و درووست بوونی حکوومەتی هیخامەنشیەکان هێشتا تا سەد ساڵەی حکوومەتی ئەوان ئێران هەرناوی مادبوو. مێژوونووسانی یۆنان لە زەمانی خەشایارشا سێهەمین شای هیخامەنشی کە لە سەدەی پێنجی پێش زایین هێرش دەکاتە سەر یۆنان، ئێران وەکوو ماد ناو دەبەن. لە مێژووی «کتێبی پلوتارخ» (پلوتارخ مێژوونووسی یۆنانیە لە سەدەی یەکەمی پێش زایین ژیاوە. مێژووەکەی سەبارەت بە شەڕگەلی ئێران و یۆنانە لە سەدەی پێنجی پێش زاییندا) لەوەدا نووسیویە: «ئاریستیدیس بە «تیمستوکلس»ی وت، هەرگیز ترس مەخە دڵت ئەگەر ئەتوانی ڕێگە پەیدا کە تا ئەم مادگەلە لە خاکی یۆنان وەدەرنێین» (کتێبی پلۆتارخ. وەرگێڕ ئەحمەد کەسرەوی ل ٦١٥) هەروەها لە لاپەڕەکانی ٧٣ ـ ٩٧ ـ ٩٨ ـ ١٦٥ و ٢٢٠دا هەروەها لە شەڕی ئەسکەندەر دژ بە ئێران سەدەی چواری پێش زایین لە کتێبی دووهەمیدا لاپەڕە ٥٠ ئێران هەر بە ماد ناو دەبات. لەم زەمانەدا ئێران هەم بە ماد و هەم بە پارس دەناسرا. ئێران دابێژە کوردیەکەی دروستە و ئیران فارسی کراوی ئەم وشەیە.

ئێران بۆیەکەم جار «ئەراتسفون» مێژوونووسی سەدەی سێ پێش زایین واتە سەرەتای حکوومەتی ئەشکانیەکان وەکوو یۆنانی کراوەکەی «ئێریانێ» ناوبرا. پاشان ئسترابوون لەوی وەرگرت و بە

کاری برد (ب.ب. جوغرافیای تاریخی ئێران. و ـ بارتولد. وەرگێڕ بە فارسی حەمزە سەردار پـوور ل ٨) دیارە ناوی ئێران بۆ وڵاتی ماد و پارس لە سەرەتای تەشکانیەکانەوە هاتە گۆڕێ. لە ئەوێستادا بە جێگای ژیانی «ئێریە»کان «ئێریەنە» گوتراوە بەڵام نە بە گـوێرەی وڵات و ئیمپـەراتووری ئـەم وشە خۆی سی وشەیە (ئێر + یە + نە) ئێر بە مانای رەسەن و نەجیبە «یە» نیشانەی نیسبەتە لە کوردیدا بووە بە «ی» وەك دەڵێن هەولێری. ئێریە واتە ئێری و بە دابێژی ئەمڕۆ ئـاری و ئاریـایی. «نە» ئاوەڵناوی سیفەتەکە لە ژمارەگەلی پێشوودا باس کرا. بە گشتی ئێریەنە کە ئەمڕۆ بووە بـە ئێران بە مانای جێگایەکەوا هەڵگری ئاریەکانە. لە ئەوێستادا «ئێریـەنەوێجـە یـان بـە قاعیـدە ئێریەنەوەئێجە بە مانای بێج و بناوانی ئاریەکانە واتە ئەو جێگایەی کە ئاریـەکـانی لـێ پـەیـدا بوونە. «وێج» لە کوردیدا هەر بەو چەشنە ماوەتەوە بێج و بنجیش دەگوترێ.

میهرپەرستەکان بۆ ئەوە وەکوو «دێوپەرست» لە زەمانی ساسانیەکاندا تووشی کوشتار لە لایەن زەردەشتیەکانەوە نەبن ئاینەکەیان پڕبوو لە رەمز و ڕاز و ئاماژە و بەیانی سەمبولیك. هێماتی ئەم رەمز و ڕازانە درێژە پێدانی دەوێ. هۆگری خوازیاری ئەم باسە سەرنجی کتێبەکانی، تۆمل ـ وێرماوزن ـ زینێر، بە زمانی ئالمانی و فەرانسەیی یان «ئاینی میهر، میترائیسم ـ هاشمی ڕەزی» بە فارسی بدات. هەرچەند لەو کتێبانەدا سەمبولەکانی زۆربەی نەکراوەتەوە. کردنەوەی ئەو ڕەمزو ڕازانە تێگەیشتنی تەواوی لە ئاینە کوردیەکان دەبێت کە ئەو نووسەرە بەڕێزانە نەیان کردووە. پاشماوەی ئاینی میهری واتە ئاینە کوردیەکانیش پاش ئیسلام لە هێنانی رەمز و سەمبول و ئاماژەی زۆر تەنانەت هێنانی وشەی بێگانە بۆ دەربڕینی بیروباوەڕی خۆیان بە ناچاری کەلکیان وەرگرتووە. لە کاکەییدا وشەکانی ساج نار، سڕ، ڕاز ـ زەردە بام ـ سەدەف ـ دوڕ و... وشەی بیگانە وەکوو «دوونادوون»ی تورکی بە جێگای تەناسوخ، یورت بە جێگای قۆناغ و دوون، مەلەکە تاوس بە جێگای لایەنی قەهر و تاریکی حەق. لە ئێزدیدا وشەی سوریانی وەکوو شەمشە (شەمەش)، تاوسێ مەلەك و «یەلدا» کە هەر سێ لە زەمانی ساسانیەکاندا باو بوو و... هێنراون. ئاینی کوردی میهرپەرستی کە لە کوردستانی باکوورەوە چوو بۆ شام و ڕۆم و ئەورووپا (سەدەکانی دوو و سێی پێش زایین) بیتێرس بە جێگای تاوسی مەلەك وشەی ئاریایی ئەهریمەنیان دەگوت. مەسیحیەت لە سەدەی چواری پاش زایین لە ئەورووپادا بڵاوکرایەوە و میهرپەرستگەل لاواز بوون و کوشتارکران. ئەوان تا سەدەی هەفتی زایینی لە ئەورووپادا دەوامیان هێنا. میهرپەرستی چەند سەدە دینی سەرانسەری ئەورووپا بوو.

دینە کوردیەکانیش ئەمڕۆ بە ناچار پڕن لە رەمز و ڕاز. توێژینەر دەبێ زۆر بە وردی لەو تلستگەلە بە دوای ڕاستیدا بگەڕێ. بۆ وێنە لە سەرەتای ئیلاهییاتی کاکەییدا نووسراوە خودا لە پێشدا لە «دوون» واتە جامەیان جەستەی «یا»دا بوو ئەو لە نێو «سەدەف»ێکدا لە «زەریا» بوو و... بۆ ئەو کەسەی کە ئەم ئیلاهیاتە شرۆڤە دەکات دەبێ لە پێشدا بزانێ، مەبەست لە دوون و یا

و سەدەف و دەریا و... و هەروەها رەمز و ڕازەکانی ئاینی ئێزدی چییە. ئینجـا ڕوون دەبێتـەوە کـە تەوحیدێکی قووڵ کە هەر تاکپەرستی میهردینەکانی پێش ئیسلامە لەم دینگەلەدا هـەیـە. ئـەم سیستەمە ئیعتیقادیە تاکپەرستیە، بە فیکر و هزری کوردانی پـێش زایـین دروسـت کـراوە و تـا ئێستا بە هەندێ گۆڕانکاری لە پەراوێزدا پارێزراوە و بە ئەدەبیاتی قوولەوە نەتەنیا جێگای شانازی کوردانە بەڵکم شوناسی ڕاستەقینەی فەرهەنگی پێش ئیسلامی ئەوانە. لە پاشدا باس لەسەر ئەو سەمبولانە دەکرێ بەڵام لێرەدا بۆ وێنە تەنیا لەو سەمبولگەلە باسی سەمبولی مەلەك تاوس بـە بەیانی کاکەیی، یان «تاوسێ مەلەك» بە وتەی ئێزدیـەکـان دەکرێـت. ئـەوانـەی وەك مامۆسـتا محەمەدئەمین هەورامی لە کتێبـی «کاکەیی» و...دا کە تاوس لـە بناغـەی دێـو، یـان دئـووس و زئووس دەزانن و دێوی کوردی و زئووسی یۆنانی تێکەڵ دەکەن و بیشرۆڤە تەنیا بـە لێـكچـوونی کەمی وشەوە قەناعەت دەکەن، باسە کە ئالۆزاو دەکەن. زئووس لە خودایانی گەورەی هەرە کـۆنی فەرهەنگی یۆنانە و لەگەڵ تاوس مەلەکی کوردان کە ناوی ئاماژەیـی میترایـە پێـوەنـدی نییـە. زئووسی هیند و ئەورووپایی تەنیا لەگەڵ «دێو»ی ئاریایی هاو بناغەن و بەس. دێو لـە وێداکانـدا بە مانای خودایە. هەر ئێستاش لە هیندووستان بە خودای گەورە دەڵێن «مەها دێـو» واتـە دێـو، یان خودای مەزن. زەردەشت لە «گاثا»دا دەڵێ تەنیا خودای تاك ئەهوورامەزدایـە. ئـەو پەرسـتنی دێوەکانی ئاریایی‌تری بە کوفرزانی. لە ئەوێستای دواییندا «دێو» وەکـوو ئـافرێنراوی ئـەهریمـەن (شەیتان) ژمێردرا و لەگەڵ ئەهوورامەزدا کەوتنە شەڕ و پاش ئیسلام بە مانـای شـەیتانیش بـە کار چووە.

مەلەك و تاوس دوو وشەی سوریانین کە دینە کوردیەکان زۆر بە جێگا وەکوو رەمزێك بە جێگای ئەهریمەنی میترایی (نەك ئەهریمەنی زەردەشتی و شەیتانی ئیسلام کە بوونەوەرێکی خراپە کارە) بە کاریان برد. مەلیك لە سوریانی و لە عەرەبیدا بە مانای شایە. لە ئەدەبی کاکەیی و ئێزدیشدا بە خودا «شا»یش دەگوترێ. ئەهلی حەق بە تەجەللاکانی خودا لەسەر زەویدا «سان»[1] و شا دەڵێن. سان وشەی هەورامی ئەوێستاییەکە لەو ژمارەدا لێك دراوەتەوە. وەکوو «سان سەهاك» کە سوڵتان ئەسحاق»ە. سوڵتان هەرشایە یان «شاخوەشین» و...

تاوس هەر ئەو پەلەوەرەیە کە لە ئاینەکانی جـوو و ئیسـلام لـە بەهەشـتدا حـەوا و ئـادەمـی هەڵخەڵەتاند تا لە میوەی ئەو دارە بخۆن (گەنم یا سێو) کـە خـودا لێیـانی بەریـەنـد کـرد بـوو ئەوانیش خواردیان و لە بەهەشت کرانە دەرەوە و کەوتنە سەر زەوی.

تاوس پاشان لە شرۆڤە دینیەکاندا وەکوو «مار» کە هەر شەیتان بووە ناساندرا. ئێستاش مار و تاوس هەر سەمبولی مەلەك تاوسە. تاوس بە حەوای گوت ئەگەر لەو میوە بخۆن تەمەنی هەتا هەتایی پەیدا دەکەن.

فیترەتی مرۆڤ بە پێی ئەو دینگەلەو دینە کوردیەکانیش بۆ گەیشتن بە خودا هان دەدرێ. ئادەم و حەوا خواردیان و وەکوو جەستەی ئەمرۆیان کەوتنە سەرزەوی. جا بزانین ئاکامی ئەم کارە چاك بوو یان خراپ؟ مەبەستی فیترەتی مرۆڤ چیە ئایا باخەکانی بەهەشتە، یان «لیقاءُ الله» کە بە تێکوشان و رەنج بە دەست دێت نە لە ئاسانی بەهەشتدا. «حافیز» شاعیری هەرە بەرزی ئێرانی دەفەرمێ:

«پدرم روضەی رضوان به دو گندم بفروخت    نا خلف باشم اگر من به جوی نفروشم»

واتە باوکم (ئادەم) بەهەشتی بە دوو گەنم فرۆشت منیش نارەسەن بم ئەگەر بە جۆیێ نەیفرۆشم. بە هاتنە دەرەوەی ئادەم لە بەهەشت مرۆڤ دەکەوێتە رێگای تەریقەت و عیرفان تا بە پلەی «فەنافی‌للا» بگات کە پلەیەکی زۆر سەرتر لە بەهەشتە. ئەحمەدی خانی دەفەرموێ: لێ جەننەتی عاشقان جوودایە + میعاد لەقایی کیبریایە. عالیتەری ژباغ رزوان + ناگونجنەوی چوحوور و غیلمان. جا دەبینین ئەوکارەی تاوس هەر ئیرادەی خوا بووە بۆ نەجاتی ئینسان لە مانەوە لە بەهەشتدا، بۆ گەیشتن بە پلەی سەرتر. ئەوەیە کە ناوی ئاماژەیی مەلەك تاوس زۆر بە جێگا هەڵبژێردراوە. ناوی «شەمشە»یش (شەمەش) هەر لە سوریانی گیراوە کە مەبەست خۆرە. ئەم وشە سوریانی‌گەلە بۆ ئەوە بە کاربراون تا زەردەشتیە هاو زمانەکانیان لە مەبەستەکانیان تێ نەگەن.

لە ئاینی میهری و پاشماوەکانی واتە ئاینە کوردیەکان و تەریقەتی عیرفانی وەحدەتی وجوودیدا، هەرچی جگە لە خودا هەیە لاوجوودە واتە نییە، جا ئەوەی کە هەیە یا دەرکەوتووی سفەتەکان یان دەرکەوتووی زاتی خودایە. جیهانی مادیش یان بە وتەی فەیلەسووفی کورد شەهابی سوهرەوەردی «نووری کەسیف» واتە تیشکێ کە جرم و کێشی پەیدا کردووە هەر تەجلای خودایە بەڵام لە پلەیەکی خوارتردا. خودا بە نەختێ لە زات و سفاتی خۆیەوە لە هەرچی شت و لە هەر زەماندا هەیە و دەتوانێ لە هەینەتگەل و لە جەستەگەلیشدا عەینییەت پەیدا کات.

یەکەمین تەجەللای نوور و رەحمەتی ئەو لە جەستەی مرۆڤدا وەکوو میترا بوو. یەکەمین تەجەللای لایەنی قین وتاریکی ئەو لە دینە کوردیەکاندا وەکوو تاوسی مەلەك و لە

ستایشگاکانی میهرپەرستیدا وەکوو پەیکەری شێر و مار و بوونەوەری سامناك پیشان دراوە کە زۆربەی زانایانی ئەورووپایی بە هەڵە وەکوو «زروان»[٣] بۆی دەڕوانن و هەندێکیتریش وەکوو پەیکەری «ئەهریمەن»ی دەزانن بەڵام نەیانتوانیوە بزانن ئەوە لەگەڵ میترایەك شتە کە تەجەللای یەکەمی خودایە. مامۆستا هاشمی ڕەزی لە بەشەکانی سەرەتای کتێبەکەیدا ئەم پەیکەرگەلە وەکوو زروان و ئەهریمەن دەناسێنێت، بەڵام لە بەشگەلی ئاخری کتێبەکەیدا لە سەرباسی زروان یا کرونووس ئەو پەیکەرەی کە سەری وەك شێری هەیە (هەرچەند زروان بە کرونووسەوە پەیوەندی نییە پاشان ڕوونی دەکەینەوە) دەنووسێ: «لە میهرا بە (ستایشتگاگەلی میهرپەرستی)یە جۆربەجۆرەکاندا نەخش و پەیکەرگەلی ترسناك پەیدا بووە و تا ئێستا ئەو جۆرە کە شیاوە بە دروستی نەناسراون (ئاینی میهر، میترائیسم ل ٤٢٤) مامۆستا ڕەزی ڕوانگەی زانایانی ئەورووپایی لە لاپەڕەکانی ٢٥ ـ ٤٢٤ داهێناوە کە هەروا پێشکەشی خوێنەران دەکرێت:

«پرۆفسور زینێر zaenner بۆیە کەم جار دەری بڕی کە ئەمە پەیکەری ئەهریمەنە ئەگەر ئەم ڕوانگە قبووڵ بکرێ دەبێ قبووڵ کەین کە ئەهریمەنیش لە لایەن میهر دینانەوە پەرستراوە. هەڵبەت لە هەندێ پەرستگە میهریەکاندا بەرد نووسراوەگەلێك دۆزراونەتەوە کە پێشکەش بە ئەهریمەن کراون کە لانی کەم لە سێ دانە لەوانە لە ئینگلیس و نەمسا و ڕۆم ئاگەدارین. لەم بەرد و نووسراوانەدا لە ئەهریمەن تکا کراوە تا هێزی شەڕ و خراپە لەسەر ئەوان هەڵگرێ، بەڵام ئەمەش ڕوونە کە میهرپەرستان هەرگیز ئەهریمەن یان شەیتانیان نەپەرستوە» (هەروەها کە ئەمڕۆش ئێزدی و ئەهلی حەق و دینە کوردیەکانیتر شەیتان ناپەرستن) مامۆستا لە درێژەی نووسراوەکەیدا دەڵێ:

«چون لە بناغەی ثئنەوییەت = سەنەوییەت (واتە دوانە پەرستی ئەو دینەی کە دەڵێ دو هێز جیهانی ئافراندووە خودا و شەیتان. شەیتانیش هەروەك خودا قەدیمە و هەتا هەتاییە)دا متمانەیان بووە کە ئەهریمەن سەرەنجام لە نێو دەچێت، میترا شەڕ و خراپە تێك دەشکێنی لەم حاڵەوە لە هەل و مەرجگەلێکدا کە خراپە پەرەی دەسەند بۆ دامرکاندنی ئەهریمەن بەرازیان قوربانی دەکرد.» لێرەدا وا دیارە کە مامۆستا ڕەزی ئەهریمەنی زەڕدەشتیەکانی لە بیردایە کە دەفەرموێ «سەرەنجام لە نێو دەچێت» (و خێر و خۆشی دونیا دەگریتەوە).

لە ئاینە سەنەویەکاندا شەیتان نامرێ و قەدیمە تەنیا لە دنیای نوور و ئافراندەی خودا جوێ دەبێتەوە. لە کوردستاندا دینێك بە ناوی «داسنی» کە لە کتێبی «کتاب الفهرست»ی ئیبن نەدیم

لە سەدەی چواری کۆچی مانگی نزیك بە هەزار و سەد ساڵ لەمەو پێش بە عەرەبی نووسراوە وەکوو «دیصانی = دیسانی» هاتووە و بە زاراوەی کرمانجی دێسنی دەگوترێ. لە بەیتە کوردیەکاندا بە «غەزای داسنیان» واتە شەڕ و کوشتاری ئەوان بۆ موسڵمان بوون زۆر ئاماژە کراوە. لە بەیتی سەیدە واندا باوکی سەیدەوان عەزیزی داسنیە. سالم لە دوو سەد ساڵ لە مەو پێشدا وەکوو کافر ناویان دەبات: فەرەنگ و داسنی و ئەرمەنی و جوو + نوسەیری و دەیلەمی و گەبری بەدخوو.

بە وتەی ئیبنی نەدەیم پێش مانی[٤] واتە پێش سەدەی سێهەمی زایینی بووە و دەڵێ ئەم ئاینە زۆر بە ئاینی «مانی» نزیکە. ئایا داسنی و دێسانی ئیبنی نەدیم هەر یەك ئاینە؟ ئێزدی تاکپەرستیە. بەڵام ئایینی مانی دوانەپەرستیە.

ئەو شتانەی کە لەو نووسراوانەی زینێری ئاڵمانی و رەزی ئێرانی بە دەست دێت ئەمانەن: سەبارەت بەو پەیکەرگەلە ئەم وتەی رەزی دروستە کە «هێشتا بە دروستی نەناسراون» جا ئەبێ ئەمەش قبووڵ کەین کە هێشتا نیوەی ئاینی میترا بە دروستی نەناسراوە. هۆی ئەم نەناسینەش ئەوەیە کە ئاینی میترایان لە سەرچاوەکەی خۆی کە کوردستانە توێژین نەکردووە. مامۆستا رەزی لە روون کردنەوەی ڕوانگەکەی زینێر سەبارەت بە ئەهریمەن، شەیتانی ئیسلام و جوو و زەردەشتی کە هەر سێ ئیلاهییاتێ نزیك بە یەکیان هەیە لە بیریدا بووە، ئەهریمەنی میهرپەرستی کە بە وردی هەر تاوسێ مەلەکی دینە کوردیەکانە بە شێ لە ویست و گەلاڵەی خودایە نەك بوونەوەرێکی شەروور و زیانی خورۆکە لە دڵی مرۆڤەکاندا وەسوەسە دەکات تا بۆ گوناه و کاری خراپ هەڵیان خرێنێ. لە بناغەدا ئەم چەشنە شەیتانە لە میهرپەرستی و ئاینە کوردیەکاندا نییە.

جا ئەگەر وەکوو مامۆستا رەزی لە ڕوانگەی زەردەشتیەوە بۆ ئەهریمەنی میهرپەرستی بڕوانین ئائەوا تووشی هەڵە دەبین. ئەگەر هەندێ کوردی موسڵمان بە باوەڕمەندانی ئاینە کوردیەکان شەیتانپەرستیان دەگوت، ئەوان شەیتانی خۆیان لە بیریاندایە کە بووەنەوەرێکی دژ بە خودا و مرۆڤە کە هیچ کات لە بیر و هزر و رەوشتی ئایینداری دینە کوردیەکاندا نییە.

هاشمی رەزی لەو فەرمایشتگەلەدا دەفەرموێ: «میهرپەرستگەل هیچ کات ئەهریمەنیان نەپەرستووە» ئەی ئەو پەیکەرگەلە و ئەو بەردنووسراوگەلە کە بە ئەهریمەن پێشکەش کراوە چییە؟ هەروا کە فەرموویانە لێ ترساون(؟!) دیارە مامۆستای بەڕێز لە ڕوانگەی ئەوێستاو

زەردەشتیەوە بۆ ئەهریمەن دەروانیٚ. لە زەردەشتیدا جیهانی نوور و پاکی و جوانی و ڕاستی و چاکە ئافرێنراوی ئەهوورامەزدایە و بە سەرۆکایەتی ئەو بەڕێوەوە دەچیٚ. جیهانی تاریکی و ناپاکی و پیری و درۆ و خراپە ئافرێنراوی ئەهریمەنە و بە سەرۆکایەتی ئەو بەڕێوە دەچیٚ و ئەم دوو جیهانە و دوو هێزە تا ئاخری دنیا پێکەوە لە شەڕ دان، بەڵام لە ئاینە کوردیەکان و دیارە لە میهرپەرستیشدا جیهانی نوور و تاریکی و خاسە و خراپە هەر یەك شتەو ئافرێنەر و بەڕێوبەری گشتی هەر خودایە کە نەختیٚ لە زات و سفاتی لە هەینەتگەل و جەستەگەلی جۆراوجۆردا خۆی دەنوێنیٚ و جیهان بەڕێوە دەچیٚ. لەم ئاینگەلەدا ژیان و مردن، نوور و تاریکی و... هەر یەك ویست و گەلاڵەیە. خێر و شەڕ دوو ڕووی سکەی ویستی خودایە، پێویست و پیٚ ویستاوی یەکن.

عەینولقوزاتی هەمەدانی لە عارفان و سۆفیانی گەورەی سەدەی پێنج و شەشی کۆچی دەڵیٚ:

«و کلم الله موسی تکلیما، کەماڵیٚ هەیە. جا کەماڵ هەیە لە ئیبلیسدا... ئەوەی کە سفەتی جبرەئیلی هەیە دەتوانیٚ بە شەرمەوە بۆ جەماڵ و جوانی ئیبلیس بڕوانیٚ». (برگزیدەی اسار عین القضاة به اهتمام محمدکاظم کەدویی ـ یدالله شکیبافر. ل ١٠٦) بەڕاستی جبرەییل بۆ جەماڵ و جوانی کیٚ دەتوانیٚ ئەویش بە شەرم و بە دزیەوە بڕوانیٚ؟

جبرەئیلیێك کە ئەوندە بە خودا نزیکە. دیارە ئەوە هەر تاوس مەلیکی کوردانە. ئەو نووسەرانەی کتێبەکەی عەینولقوزات، لە عەتتار (شاعیر و عاریفی گەورەی سەدەی هەفتەمی کۆچی) و ئەحمەدی غەزالی و مەنسووری هەلاج (لەسەر هەلاج باسمان هەیە) لە گەورەیی و مەقامی ئیبلیسدارستەگەلێکیان هێناوە، بەڵام هیچکام وەکوو عەینولقوزاتی هەمەدانی کە دیارە وەکوو باوەتایەر لەسەر یەکیٚ لە ئاینە کوردیەکان بووە لەسەر ئیبلیس نەینووسیوە. فاکتی زۆر هەیە کە پیشان دەدات هەمەدان کە لە زەمانی ئەردەڵانیەکاندا سنووری کوردستان بووە ناوەندی گەورەی میهرپەرستی بووە. لە زەمانی ساسانیەکاندا هەمەدان یەکیٚ لە شارەکانی پارێزگای ماد بووە کە ئەو زەمانە وەکوو پارێزگای «ماسی یان ماهی» = مایی = مادی دەناسرا کە پێتەختی ئەویٚ دینەوەر نزیك کرماشان لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا بووە. زیانی پارێزگای ئەمڕۆی هەمەدان جگە لە شاری هەمەدان زاراوەی کوردی لەکی (نەك لوڕی) و تورکیە. شاری هەمەدان ئێستا لە ژێرکاریگەری زیانی دەسەڵاتدا فارسی و تورکی قسە دەکەن، بەڵام ئەو زەمانە بە زاراوەی لەکی و هەورامی قسەیان کردووە کە زیانی شیعری «باوەتاهێر»[٥] بووە. باوەتاهیر بە هەڵە لە کوردستانی باشووردا ناسراوە، کونگرەکەشی پڕ بوو لە هەڵە. بڕوانن بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ژمارە. مامۆستا و

چی عەینولقوزات «بەرەکە» بووە. ئەم ناوە هێشتا لە کوردستاندا بەتایبەت لە نێو کاکەییەکاندا وەکوو «براکە» هەر ماوە.

ئەو دوو نووسەرە بەرێزە لە سەرەتای کتێبی بەرهەمەکانی عەینولقوزاتدا سەبارەت بەو متوونە «لە کتێبی، تەمهیداتدا دیارە کە «ئاخرات»ی قبووڵ نییە و بە چەشنی بیروڕای لەسەر حلوول، (چەشنی تەناسوخ کە، رۆح، واتە، روح، ی خودا دەچێتە جەستەگەلێکەوە)ە. دوکتور زەڕوین‌کووب، زانای وتوێژینەری ئێرانی هاوچەرخ لە کتێبی «جستجوهای تصوف»دا دەڵێ: گشت ئەمانە رەنگە لەگەڵ مۆچیارێگەلی، گنووسی (عیرفانی پێش ئیسلام)دا کەوا دیارە لە کۆگای شێخ بەرەکە و یارانی ئەودا بووە پێوەندی هەبێ. سەرچاوەی پێشوول۱۳». (دیارە کە «زەڕوین‌کووب»یش سەرنجی بە دینە کوردیەکان نەداوە.

ئاینی میهرپەرستی و دینە کوردیەکان هەمووشت بە قەدیم و تەجەللای حەق دەزانن عەینولقوزات دەڵێ: «بناغەی قورئان نوورانی بوونیە کە کەلامی خودایەو وەکوو ئەو قەدیمە (واتە قورئان نەئافرێندراوە و وەکوو خودا هەمیشە هەر بووە) ل ۲۷» ئەو دەڵێ خودا نوورە. شەهابی سوهرەوەردی فەیلەسوفی کورد بە خودا دەڵێ «نوورولئەنوار».

عەینولقوزات ئیسلامی قبووڵە وەکوو دینە کوردیەکان کە ئیسلام و دینەکانی‌تریان وەکوو بەشێ لە ویست و گەڵاڵەی کاروباری جیهان لە لایەن خوداوە دەزانن. عەینولقوزات دەیەوێ بە ئایەتگەلی قورئان بیروڕای خۆی لەگەڵ ئیسلامدا نزیك‌کاتەوە تا نەیکوژن بەڵام نەکراو بە تاوانی کافر بوون کوشتیان لە ئایەتگەلی «الله النور السموات و الارض» و «کنت کنزاً مخفیاً فَأحببتُ ان اُعرفَ» زۆر کەڵك وەردەگرێ کە لە ئایەی یەکەم نوور بوونی خودا و لە ئایەی دووهەم دەتوانرێ تەوحیدی دوڕ و سەدەف و دەریا لە ئاینی کاکەییدا بە دەس بێت. لە جێگایەك دەڵێ:

«ئەی مێرخاس ئەو شتەی کە، "قەدیم"ە هەبوونی پێویستی بە خۆیە. ئەو شتەی کە قەدیم نییە و ئافرێنراوە پێویستی هەبوونی بە خۆیەوە نیە جا چۆن دەتوانن هاوبەش بن لە «بوون»دا؟ ل ۱۷۵» ئەو دەیەوێ ئەم عەقیدەی میترایی و دینە کوردیەکان دەرخات کە «حادث» واتە ئافرێنراوو بە دیهاتوو هەبوونی نیە، هەر چی هەیە زاتی خودا و تەجەللاکانی ئەوە. فرە چەشنی ڕواڵەتیە و هەمووشت هەر ئەوە، هەر نوورە.

چون ڕۆژی چوارشەمە سووری و سێزدەبەدەرمان لەگەڵ شەوی یەلدا و نەورۆز لە پێوەندی لەگەڵ یەکدا لێکداوە و لە ئاینە کوردیەکاندا چوارشەمە سووری کە ڕۆژی تەجەللای مەلەك تاوسە و

تاوس مەلەکیش هەر ئەوەیە کە هەندێ لە زانایان بە هەڵە وەکوو ئەهریمەنی زەردەشتیەکان و هەندێ وەکوو زروان بۆی دەروانن و مامۆستا رەزیش فەرموویەتی: «هێشتا ئەو جۆرە کە شیاوە نەناسراوە» چاکترە زۆرتر لەسەر مەلەك تاوس ئەو شتە کە زینێر وەکوو ئەهریمەنی زانیبوو (ئەهریمەن دروستە بەڵام نەك ئەهریمەنی زەردەشتیەکان کە وەکوو شەیتانی ئیسلام و جووە) زۆرتر قسە بکەین.

توێژینەری کورد مامۆستای خوا لێخۆشبوو «رەشید یاسەمی» لە کتێبی فارسی «کرد و پیوستگی نژادی او»، سەبارەت بە ئاینی فەلە لە نێو کورداندا بە گێڕانەوە لە «ئەنسیکلوپودی ئیسلام» لە وشەی کورددا دەنووسێت:

«عیشوویە، یەکیتر لە بانگهێشتکەرانی ئاینی مەسیحی لە، سەمانین نزیك جزیرەی ئیبنی عومەر، کەلیسایەکی داناو دەڵێ لێرەدا پێش لەمە کوردگەل بۆ شەیتان قوربانیان دەکرد. مارسابها، یەکیتر لەو بانگهێشتکەرانە کوردگەلێکی هێنایە سەر ئاینی فەلەکە خۆرپەرست بوون» مامۆستا یاسەمی هیچ بیروڕای دەرنەبڕیوە، بەڵام چەند پرس لەم نووسراوەدا هەیە.

یەکەم، داوەری عیشوویە وەکوو داوەری زینێرە کە هەر دوو شەیتانی دینەکەی خۆیان لە مێشکیاندایە. قوربانی هەر قوربانی کردنی «گا»یە کە شوێنەواری لە وەرزی زستان لە هەوراماندا لەسەر مەرقەدی پیرشالیار[7] و لە ناو ئێزدی و کاکەییدا هەر بەرێوە دەچێ. ئەم قوربانیە بۆ خودایە کە لە ئاینی کۆنی کورددا تەجەللای یەکەمی ئەو مەلەك تاوسە. هەروەها کورد و میهرپەرستان خۆرپەرست نەبوونە، بەڵکو دەڵێن نووری خۆر (نە خودی خور) وەکوو نوورەکانیتر بەخشین و رەحمەتی خودایە کە جێگای میترا یان مەلەك تاوس یان لە ئاینی مەسیحیدا جێگای حەزرەتی عیسا و لە هەندێ ئاینی عەلەوی کوردیدا جێگای حەزرەتی عەلی (د ـ خ)ە. مامۆستا ئەمین زەکیبەگ سەبارەت بە کاکەیی لە کوردستاندا نووسیویە «کاکەیی بڕوایان وایە عەلی بۆ ئاسمان گەڕاوەتەوە و لەگەڵ خۆردا تێکەڵ بووە و بوون بە یەك» پاش ئەمە مامۆستا بە هەڵەدا دەچێ و دەڵێ: «بە ناوگەلی ئیسلامیەوە خۆر دەپەرستن». بە وتەی ئینجیلەکان حەزرەتی عیسا (د ـ خ) بۆ ئاسمانی چوارەم بۆ ناو خۆر عرووجی کردووە و بۆ رێنوێنی خەڵك لە کاتی خۆیدا دێتە خوارەوە. ئایا دەتوانین بڵێین مەسیحیەکان خۆر دەپەرستن؟ خۆر لە دینی میهرپەرستی (میترائیسم) و ئاینە کوردیەکاندا وەکوو گەورەترین سەرچاوەی گەرما و رووناکی و ژیان لە زەویدا پیرۆز و بەرێزە، بەڵام ئیتر خودا نیە. ئەوان قوربانیان بۆ میترا کردووە کە

جێگاکەی لە خۆردایە و میترا هەر میهر (لەسەر وشەی میترا و میهر لە بەشی هەفتەمدا باس کراوە) واتە ئەوین و تیشك و بەزەیی خودایە. لە نێو بابلیەکانی کۆن و میسریەکاندا پەرستنی خۆر سەردەمێك باو بوو بەڵام لە نێو کورداندا هەرگیز نەبووە.

ئەوێستای دواییینیش میترا و خۆری لە یەك جوێ کردۆتەوە و هەرکام لە «یەشت»[8]ەکاندا جیاواز ستایش دەکرێن. خۆر لە ئاینی میترایی و دینە کوردیەکاندا گرنگە بەڵام خودا نیە. چون گرنگە ناوی دەهێنن و ناوی ئاماژەیان بۆدا ناوە. لە ئێزدیدا بە ناوی سوریانی «شەمشە» (شەمەش) و لە کاکەییدا وەکوو «ساج نار» ناوی دێنن. لە فەلسەفەی ئیشراقی سوهرەوەردی کورددا وەکوو «نەیری ئەعزەم» و «هۆرەخش» ناوی براوە (لە ئەوێستادا «هوەرەخشەئێتە» (هوەر + ه + خشەئێ + تە، هوەرواتە خوەر ـ خۆر، خشەئێتە واتە تیشك دەر و درەوشێنەر)

ئەو نووسراوەگەلەی بانگهێشتکەرانی مەسیحی هی سەدەی سێی زایینیە. هەر ئەو سەدە بوو کە ئەردەشێر بۆ فەرمی کردنی ئاینی زەردەشتی هێرشی کردە سەر کوردەکان و لە شەڕی دووهەمدا کوردەکان تێك شکان دیارە بۆ لە ناوبردنی ئاینی کوردەکان بانگێشتکەرە مەسیحیەکانیش لە هەلومەرجی شکست و لاوازی کوردەکان کەڵکیان وەرگرتووە. ئەو نووسراوە دەتوانێ لایەنی بەڕێوەبەری جیهان بە دوو چەشنی تیشك و بەزەیی و قین و تاریکی نیشان بدات. لە لایەکەوە دەڵێ خۆرپەرست بوونە دیارە ستایشتی میترا، یان لایەنی تیشك و بەزیی خودایان کردووە و لە لایەکیترەوە دەڵێن بۆ شەیتان قوربانیان دەکرد کە دیارە بۆ لایەنی قین و تاریکی بەڕێوەبەری هەستی واتە خودا بە ئاماژەی ئەمڕۆ مەلەك تاوسیان کردووە.

مامۆستای ئێرانی «پووروداود» یەکەم وەرگێڕی ئەوێستا بە فارسی لە سەرەتای «وەرگێڕاوەی» کتێبی «ئاینی میترا ی، مارتین وێرماوزن. وەرگێڕ بە فارسی نادر نادرزادە»دا دەنووسێ «لە ئاینی میترادا دوو هێز لە جەنگی بەردەوامدان ئەهوورامەزدا فەرمانرەوای جیهانی نوور و ئەهریمەن فەرمانرەوای جیهانی تاریکی بە سەر ئەوانەوە زروان خودای زەمانە» ئەو هەڵە کە سەرچاوەکەی زاناکانی ئەوروپایین، پەرەی سەندووە بۆ نووسەرانی پاش ئەو کە ئاینی زروانی (کە پاش ئیسلام بە «دەهری»ەکان ناسراون) لەگەڵ ئاینی میترا تێکەڵاو دەکەن. ئەم بەڕێزانە ئەگەر وردبینی زۆریان لەسەر پەیکەرە میتراییەکان کە تەوحیدی میترا و ئەهریمەن پیشان دەدەن وەکوو دینە کوردیەکان کە لەوانەدا تەوحیدی خودا و مەلەك تاوس هەیە تووشی هەڵەی وا نەدەبوون (ئەم پەیکەرانە بەرچاو دەخرێن). پایەبەرز پووروداود زانای ئاینی زەردەشتیە و ئەوەی سەبارەت بە

میترا گوتووە وەکوو قسەکانی مامۆستا رەزی دووپاتی زانایانی ئەوروپاییە. ئەگەر لە کەتێبەکانی میتراییدا ناوی ئەهریمەن هەیە هیچ ناوێ لە «زروان» نیە لە موتابەقەی زروان و «کرونووس»ی یۆنانی کە پاشان باسی دەکەین ئەم هەڵە گەورە هاتۆتە پێشەوە. میتراپەرستی زروانپەرستی نیە. زروانی ئاینێکی جودایە کە لە ڕوونکراوەکانی بەشی پێشوودا باس کراو پاشان وردتریش باس دەکرێ.

مامۆستا رەشید یاسەمی هەڵەی گەورە سەبارەت بە ئێزدیەکان دەکات. ئەو لە کتێبە ناوبراوەکەیدا دەنووسێ: «گۆمانی تێدا نیە کە دینە قەدیمیەکانی بابل و ئاشوور و دینگەلی تازەتر وەکوو جوو و فەلە و ئیسلام تێکەڵاوی ئێزدی بووە ل ١٢٥». گۆمانی تێدا نیە ئەم قسەگەلە تواغجی نارەوایە و توێژینی بەسندە لەسەر ئێزدی و ئاینە پێشوەکاندا نەکراوە چون:

هەروەها کە زۆرێ لە توێژینەرانی ئەوروپایی کە مامۆستا رەزی لە کتێبەکەیدا فاکتگەلێکی زۆری لەوان هێناوە هەروەها پووراود و چەند مامۆستایتر دەریان خستوە تا هەشتا لە سەدی عەقیدەگەل و داب و نەریتی مەسیحی کە لە سەدەی سێ و چواری پاش زایین لە ئەورووپا بڵاوکرایەوە، لە ئاینی میترایی (کە لە سەدەکانی سێهەم و دووهەمی پێش زایین لە کوردستانی باکوورەوە چوو بۆ ڕۆم و بوو بە ئاینی گشتی و فەرمی ئەورووپا) گیراوە. وەکوو جەژنی کریسمەس (کە هەر یەلدا لە دایك بوونی میترایە) و نەریتی نان و شەراب و عەقیدە بە تەجەسسود و حلوول (هەروەها کە زاتی خودا لە جەستەی عیسادا حلوولی کرد و هاتە خوارەوە بۆ نەجاتی مرۆڤ کە پاشان پێ ئاماژە دەکرێ). یان لە دایك بوونی عیسا لە دایکێکی باکیرە واتە شوو نەکردوو (لە دینی میهرپەرستیدا هاتنە خوارەوەکانیتری میترا بە گوێرەی لە دایکبوونی لە دایکێکی شوو نەکردووە وەکوو لە دایك بوونی شاخوەشین و سان سەهاك لە کاکەیی «ئەهلی حەق»دا). نان و شەراب خواردن، جەژنی عرووجی عیسا بۆ ناو خۆر کە تێدا وەکوو نەورۆزی گشت ئێرانیەکان کەوترا جەژنی عرووجی میترایە بۆ ناو خۆر هێلکە رەنگ دەکەن و...) (لە بەشی هەفتەمدا لە سەر هێلکە رەنگ کردن باس دەکرێ)

لەوانە گشت گرنگتر کۆنتر بوونی ئاینی میتراییە کە لە سەدەی سێی و دووی پێش زایینی عیسادا لە ئەورووپادا بڵاوکرایەوە. جا ئەگەر لێك چوون لە ئاینە کوردیەکان و ئاینی مەسیحیدا هەیە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ئەو شتگەلە کە مەسیحی لە ئاینی کۆنی کورد واتە میترایی گرتووە. ئاینی جوو کە ئیلاهیاتەکەی زۆر لە ئیسلام نزیکە جیاوازی هەرە بەرچاوی لەگەڵ میهرپەرستی و

ئاینە کوردیەکان هەیە. ئەگەر هەفت فریشتە لە ئاینی جوودا هەیە ئەوانە هەفت فریشتەی دەستکردی خودان. هەفت مەلەك کە لە ئاینی ئێزدی و هەفتەن لە کاکەییدا لە تەجەللاکانی زاتی خودان کە جیهانی پێ بەڕێوە دەبات. نەختێ لێکچوونی لەگەڵ زەردەشتیدا هەیە. لە زەردەشتی رەسەن واتە لە کاساکاندا «ئەمشا سپەند»[9]ان لەگەڵ «سپەند مێنوو» دەبن بە هەفت، هەفت ئاوەڵناوی ئەهوورامەزدایە کە بەوانە جیهان بەڕێوە دەبات. ئەوانەش سفەتن و لە جەستەدا عەینیەت پەیدا ناکەن و نایەنە سەر زەوی. سەبارەت بە ئاینەکانی بابلی و ئاشووری رەنگە مامۆستا یاسەمی مەبەستی لە چەشنێ خۆرپەرستی بووە و خۆر وەکوو «رەع» وشەمش لە میسر و نیۆچۆمان پەرستراوە و لە بابلدا ستایشتگاگەلی هەرە شکۆداری بۆ دروست کراوە. ئێمە ئەمڕۆ دەزانین کە میهرپەرستی و دینە کوردیەکان خۆرپەرست نین. رەگەزپەرەستی عەرەب ویستوویە بۆ کز و لاوازکردنی فەرهەنگ و زبانی کورد پێشینەی بابلی و ئاشووری کە لەگەڵ عەرەبەکاندا پێشینەی فەرهەنگی هاوبەشیان هەیە بدۆزێتەوە. نالێم دین و فەرهەنگ و نەرینگەلی کورد نالێم نەورۆز و دینە کوردیەکان بەڵکو تەنیا و تەنیا زبانی ئاریایی کوردی کە پاکترین و خاوێنترین زبانی ئارییایی ئاسیایە بۆ رەت کردنی ئەو ڕوانگە بەسندەیە.

لە سنووری چینەوە تا زەریای مەدیتڕانە کە هۆزە ئێرانیەکان هەن هیچ زبانێ ئەوەندەی کوردی بە ئەوێستای زەردەشت نزیك نیە. تەنانەت زبانی پەهلەوی هەزار و هەشتسەد ساڵ لەمە پێشیش وەکوو کوردی گرامێر و وشەگەلی ئەوێستایی کە زبانی مادەکان بووە نەپاراستووە.

هەر چەند ئاینە کوردیەکان، گشت دینەکانیان بە تاییەت ئیسلامیان قبوولە و گشت ئەوانە بۆ بە ئەنجام گەیشتنی ویست و بەرنامەی خودا بە پێویست دەزانن و هەندێ لە کەسایەتیەکانی ئیسلامیان وەکوو حەزرەتی «عەلی» لە کاکەییدا و هەندێکیتر وەکوو شیخە موسڵمانەکان بە مەزهەروڵڵا دەزانن و زۆربەی پەرستیارانی دینە کوردیەکان ناوی ئیسلامیان هەیە، بەڵام هەروەها کە وتمان ئیلاهیاتی ئەم دینگەلە زۆر پێش ئیسلام نووسراوە. هەرچەند ئەدەبی نووسراوەی ئەوان بەتاییەت کاکەیی لە سەدەی دووهەمی کۆچیەوە بە زاراوەکانی هەورامی و ئیزدی بە سۆرانی و کرمانجی ماوەتەوە و هیشتا زۆری بڵاو نەکراونەتەوە بەڵام زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە رەنگدانەوەی ئاینی میهریە، بەڵام بە سەمبول و ناو و ئاماژەگەلێکیترەوە و دیارە لە ئیلاهیاتی ئیسلام وەرنەگیراوە. مامۆستا یاسەمی و هەندێ ئەورووپایی وەکوو «لایار» و «ئسپیۆ» کە لایار، ئیزدی بە پاشماوەی دینی مانی و ئەویتر بە تیکەڵاوێك لە شەریعەتەکانی ئاشووری و زەردەشتی و ئیسلام

دەزانێ ئەمانە لە یەك سەدە پێشدا ڕوانگەی خۆیان نووسیوە کە لەو زەمانەدا ئێزدیگەل جگە لە هەندێ مژارگەلی ڕوالەتی دینەکەیان هیچیان نەدرکاندبوو و تەنانەت پێیان خۆشبوو ئەوان وەك موسڵمان و جوو و مەسیحی بزانن تا لە ڕێژ هەڕەشەی ئەواندا خۆ بپارێزن.

مامۆستا یاسەمی لە ڕۆژهەڵاتناسێکی وردبینتر «هوورتن» ناو دەبات و وتەکەی دەنووسێ: «ئاینی ئێزدی نوورپەرستیە و بناغەکەی دوانەپەرستی ئێرانیگەلی کۆنە کە بە سەرکەوتنی نوور دوایێ دێت. مەلەك تاوس هاوتای ئەهریمەن نیە بەڵکم کەسایەتی پەیداکردنی بناغەی شەڕەکە خۆی درێژەی خێرە بەو مانایە کە شەڕ لە پێداویستیەکانی خێر و ئافرێنراوی «بیلعەرەز» (واتە جەوهەر نیە) جا مەلەك تاوس لە بناغەکانی ئافراندنی خوایە و لە ڕاستیدا خێرە نە شەڕ».

بەشێ یەکەمی وتارەکەی کە دەڵێ سەرچاوەکەی دوانەپەرستی ئێرانیگەلی کۆنە لەگەڵ بەشەکانیتر دژایەتی هەیە. ئەگەر دوانە پەرستیە ئیتر چون شەڕ درێژەی خێرە و لە ڕاستیدا خێرە؟

دەڵێ ئێزدی نوور پەرستیە. ئەگەرمەبەست «نورالانوار»ی فەیلەسووفی کورد سوهرەوەردیە کە پاشان باسی دەکەین و مەبەستی نووری جەوهەریە نەك عەرەزی دروستە. باقی نووسراوەکانی هوورتن سەبارەت بە دینە کوردیەکان دروستە مامۆستا یاسەمی لە ژێر کارتێکردنی هەندێ ڕۆژهەڵاتناسی ئەورووپاییەوە دەڵێ:

«بە لای ئێزدیەکانەوە خودا ئافرێنەری جیهانە بەڵام لە درێژەی ژیانی جیهاندا کاریگەری نیە» ئەم وتە عەقیدەی زروانیەکانە و بە تەواوی سەبارەت بە ئێزدی هەڵەیە، بەڵام پاشان شتی دروستیش سەبارەت بە ئێزدیەکان دەڵێ: «ئێزدیگەل دەڵێن خودا یەکەم تەجەللای (دەرخستنی زاتی خۆی) کە کردی وەکوو مەلەك تاوس بوو. زاتی مەلەك تاوس لەگەڵ زاتی خودا، یەکە هەروەها «شیخ عادی کوڕی مسافیر» لەگەڵ مەلەك تاوس یەك زاتن. پاش مەلەك تاوس بە شەش فریشتەیتر عەقیدەیان هەیە کە پێوەندی دەری خودا و خەڵکن (پەیوەندی دەر دروست نیە) بەڵام مەلەك تاوس هەم فریشتەی یەکەمە و هەم خوایشە» بۆ ئەوە وتمان پێوەندیدەر دروست نیە مەلەك تاوس کە تەجەللای یەکەمە یان بە گوێرەی فەلسەفە «سدوور»ی یەکەمە و خۆی بەرەو خوار تەجەللاگەلیتری هەیە تا دەگا بە شێخ عەدێ، یانی هەمووشت لە نووری جەوهەریەوە بیگرە تا دەگاتە مادەی کێشداری سەرزەوی گشتی تەجەللای زاتی خودایە. هەر ئەم عەقیدە کوردیە بناغەی فەلسفەی مەششائیەکان و فەلسەفەی ئیشراقی سوهرەوەردی کوردە کە باسی دەکەین.

سەر لێ شێواوی نووسەرە ئێرانیەکان زۆرتر لە «ورماوزن»ەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەو، پەیکەرە ترسناکەکانی ستایشتگاکانی میهرپەرستی بە «زروان» دەناسێنێت و دەڵێ میترا وەکوو کوڕ و پەیام هێنەری زروانە. نازانم بۆچی توێژینەرانی ئێرانی ئەم پرسیارگەلیانە بۆ پێش نەهاتووە: لە ئاینی زروانیدا زروان خودای زەمان باوکی ئەهوورامەزدا (خودای ڕۆشنی) و ئەهریمەن (خودای تاریکی) و خۆی لە شەڕ و خراپە دوورە، جا چون دەبێ پەیکەری ترسناکی هەبێ؟ میترا لە کام بەڵگە و نووسراوەدا کوڕی زروانە؟ مەگەر زروان جگە لە ئەهوورامەزدا و ئەهریمەن کوڕی‌تری بووە؟ ئەگەر پەیامهێنەری زروانە بۆچی لە هەزاران شوێنەواری میتراییدا ناوێك لە زروان نیە؟ دەزانین ئەهریمەنی میترائی هەر مەلەك تاوسی کوردیە. هاوناوبوونی ئەهریمەنی میترایی لەگەڵ ئەهریمەنی زەردەشتیەکان و مانەویەکان هۆی‌تری سەر لی‌شێواوی توێژینەرە ئێرانیەکانە کە ئاینی ئەهلی‌پەرستی میترایی و ئاینە کوردیەکان وەکوو دینی مانی بە دوانە پەرستی بزانن.

مەلەك تاوس کە پاشان زۆرتر باس دەکرێت ئاماژەیەکی سەمبولیکە بۆ لایەنی‌تری ویست و ئیرادەی جیهانی خودا. ترس لە توانجی نابەجێی شەیتانپەرستی وای کردووە کە لە لایەن هەندێ لە عەلەویەکانی کوردستانەوە بە شاراوەیی ناوی ببەن و نەریتەکانی ئەنجام بدەن. ئەمڕۆ بەشێ لە کاکەییەکانی کوردستانی ڕۆژهەلات لە شاری «کرند»[10] و «گاوارە» و دیهاتەکانی ناوچەی «قەڵخانی» لە پارێزگای کرماشان بێشاراوەیی ناوی دەبەن و ڕێزی لێ دەگرن بەڵام بەشەکانی‌تر وەکوو «سەهەنە» (صحنە؟!) و «کەنگاوەر»[12] و... وا، نین. بەو ناوچەگەلەدا گەڕاوم و قسەم لەگەڵ خەڵك کردووە بەڵام وا چاکترە لە پێشدا ڕوانگەی بەڕێز جەنابی «نوورعەلی ئیلاهی» گەورەی ئەهلی حەقی سەهەنە و کەنگاوەر و کرماشان بزانین.

بەڕێز مامۆستا «نوورعەلی ئیلاهی» کوڕی جەنابی حاج نیعمەتوڵڵای جەیحوون ئابادی لە کتێبی (ئاسارولحەق) کە بە تێکۆشانی «دوکتور بەهرام ئیلاهی» کۆکراوەتەوە لە لاپەڕە «ج»ی سەرەتا لە وتاری ٦دا دەفەرمێ:

«وشەی ئەهلی حەق بۆ دوو دەستە هاتووە. دەستەی یەکەم خۆیان دوو دەستەن. یەکەم بەشێ لە تایفەی «سان»ن کە سەرسپەردەی، ڕێگای سوڵتان ئەسحاقن و ئێستا کتێبی بورهانولحەق (لە جەنابی نوورعەلی ئیلاهی کە سەرچاوەی ئاسارولحەقە) دەستووری کار و ئاکار و کردەوە دینیەکانیانەو ئەوەی لەو کتێبەدایە بەڕێوەی دەبەن. دەستەی دووهەم پاشماوەی تایفەی سان یان

یارسانن کە خۆیان بە ناوگەلێ وەك، عەلیوڵڵایی ـ نوسەیری ـ شەیتانپەرست و... دەناسێنن و لە باسی ئێمە بە دەرن.

دەستەی دووهەم ئەو بەشە لە ئەهلی حەقی ڕاستەقینەن کە وەك پەپوولە خوازیاری دیداری حەقن چ لە ڕوالەتدا سەرسپەردەی ئەهلی حەق بن یان نەبن». هەروەها لە وتارگەلی ۱۸۵۳ و ۱۷۰٦ و... لەم بارەوە باس کراوە.

بەڕێز و حورمەتی زۆرمەوە بۆ مامۆستا، نووسەر و توێژینەرانێ کە لە سەرکاکەیی یان ئەهلی حەق کاریان کردووە مەبەستیان هەر دوو دەستەی یەکەمن و ئەوانەی دووهەمیش لە دەستەی یەکەم جگە لە ئەوەی کە بە هەڵە بە شەیتان ناسراوە جیاوازی ئەوتۆیان لەگەڵ دەستەی یەکەم نیە. مامۆستایش بۆ خۆی لە کتێبەکەیدا شەیتانی بە «نەفسی ئەممارە»ی مرۆڤ دەناسێنێت نە کەسایەتیەکی سەر بە خۆ وەکوو ئەهریمەنی زەردەشتیەکان یان بوونەوەرێکی جیاواز و سەربەخۆ، و دژ بە مرۆڤ، لەوانە لاپەڕە ٤ بەندی ٢.

لە تەواوی کتێبەکەی ئەم مامۆستادا کە ۷۰۸ لاپەرەیە شەیتان وەکوو بوونەوەرێکی دژ بە مرۆڤ بە هەژمار نەهاتووە. هەروەها لە گشت بەرهەمەکانی باوکی بەڕێزیاندا. لە ژمارە ۲۳۸دا دەفەرمێ... «نەفسی ئەممارە ئامرازی جەستەیە کە لە جەستەدا پێکهاتووە لە نەفسی جیمادی (بێگیان) و نەفسی گیایی و نەفسی گیانەوەری و نەفسی بەشەری» لە بەندی ۸۳۲دا دەڵێ «شەیتان واتە دەرکراو و سەربزێو، شتێکە لە جەستەی خۆماندا. کرمێکە لە ئێسقاندا...» لە وتاری ۸۷۸دا دەفەرمێ: «خەنناس» واتە پیس و نازناوی، ئیبلیس» بە داخەوە دەبێ بڵێم کە نە شتانی دیکەیەو نە جنۆکەیەکە ئێمە گێژ و بێسەرنج کات. هەر، شەینتەنی خۆمانە (شەینـ، واتە شت وتەن واتە جەستە)

لە جێگایەکیتردا وتوویە ئەگەر شەینتەن دەرکەی لە جەستەت «شاهتەن» واتە خودا جێگای دەگرێ». مامۆستا ناوی عەزازیلیش دێنی کە بە هۆی خۆ بە زل زانین و سوجدە نەبردن بۆ ئادەم دەرکرا و باسی تەواو بوو.

لە ژمارە ۱۰٦۸دا دەفەرمێ دەزگای نوور و تاریکی لە یەك جیا نین ئەوان لازم و مەلزووم (پێویست و پێداویستی) یەکن کە لە ئافراندندا هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ یەکدا نیە وەکوو شیرینی و تاڵی».

تا جێگایەك ئەمن دەزانم هیچ ئەهلی حەقێك خۆی بە شەیتانپەرست نـازانێ. مامۆسـتا کـاتی مەحمومیێ: دەزگای نوور و تاریکی لە یەك جیا نین، خۆی دەدان نان بە مەلەکـە تـاوس و بناغـەی دیتە کوردیەکانە.

توێژینەری بەڕێز «نوورەددین مودەڕریسی چەهاردیەی» کتێبـیکی هەیە بە نـاوی «خاکسـار و تحەل حەق» کە بە فارسی لە هەفتاکانی زایینیدا نووسیویە لە ١٩٨٩دا لە چاپی چوارەم دراوە.

نووسەر خۆی دەروێشی تەریقەتی خاکساری لە تەریقەتەکانی ئەهلی حەق (کاکەیی)ە و لە نێـو کاکەییەکاندا ژیاوە و لە لای گەورەگەلی کاکەیی ئێرانەوە دەرسی خوێندووە. سەبارەت بە ئـەهلـی حەق ئەم جۆرە نووسیویە: (ڕستەکانی ناو کەوانەهی خۆمە)

بەشێ لە تایفەگەلی ئەهلی حەق باوەڕیان بە مەلەکە تـاوس یـان شـەیتانە (ڕوونکرایـەوە کـە مەلەکە تاوس شەیتان نیە) گشت تایفەگەلی ئەهلی حەق (ئەوانەیش کە بە شـاراوەییـەوە نـاوی دەبەن) لە لەعنەت کردن و جنێودان بە شەیتان بە توندی خۆ دەپارێزن و ناوی بـە پـیرۆز دەزانـن. ئەوانەی کە هۆگرانی مەلەکە تاوسن (ناوی بە شاراوەیی نابەن) گشت داب و نەریتگەلی کاکەیی بەڕێوە دەبەن و لەگەڵ شەیتان پەرستگەلی نەتەوەکانی دیکە جیاوازیان هەیە. زۆریـان لـە شـاری کرند و دێهاتەکانی دەوروبەری دادەژین. لە ڕۆژنامـەی «کـەیهـان» ڕێکـەوتـی ١١/٧/٥٤ واتـە ١٩٧٤ی زایینیدا نووسراوە کە «مورتەزا شـیروانی» کـە ئێسـتا هـەفتـا سـالەیـە و لـە پێشـدا مامۆستای پاش ناوەندی بووە لەگەڵ شەیتان لە پێوەندیدایە. لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا یەکێ لە مەشایەخی سۆفیە بە ناوی شێخ عادی (شێخ عەدیێ) لە گوندی «باعـدی» لـە دیهاتـەکـانی مووسڵ بناغەی ئاینی یەزیدی دارشت کە لە بناغەدا، ئیزەدی، یە (ئیزەد لە فارسیدا بە مـانـای خودایە). قسەکانی شێخ لە ژێر کاریگەری مانەوی و زەردەشتیدایە (هەر ئەو هەلەگەلە. مانـەوی وەك لە ژمارەکەیدا ڕوون کراوەتەوە دوانەپەرستیە و ئێزدی تاکپەرستیە. شەیتان لە زەردەشتیدا تـا ئاخری دنیا لەگەڵ خودا و مرۆڤدا لە شەڕدایە و مەلەك تاوس لە ئێزدی و کاکەییدا بـەشـێ لـە هێز و ویستی خودایە) ئێزدیگەل دەڵێن مەلەك تاوس شەفیعی بارەگای خودایە. دەڵـێن مـەلـەك تاوس بە شێخ عەدیێ ئیلهامی کردووە مەلەك تاوسیگەل بە هیچ ئاین و بە هیچ کـەسـێك خـراپ ناڵێن و لەعنەتی هیچ کەس و ئاینێك ناکەن و لایان وایە دەبێ یارمەتـی گشت مرۆڤـی جیهـان بدەن چ خاوێن و چاك بێت یان خراپ و زیانی خۆ. کاکەییگەل (کە بە ئاشکرا ناوی مەلەك تاوس دەبەن) دەڵێن ئەو لە جەستەی مرۆڤـدا لـە، داوددا تـەجـەللای کـردووە و پاشـان وەکـوو کـاوەی

ئاسنگەڕ دەرکەوتووە و ڕۆژی شوڕشی کاوە کە لای ئەوان یەکەمی ئەسفەند (ڕەشەمە ئاخر مانگی زستان)ە کە یەکەم ڕۆژی بەهارکوردیە[١٣]. دەڵێن خودا مەلەك تاوسی لە ئاگری عیززەت ئافراند. هەروەها دەڵێن مەلەك تاوس پێش ئافراندنی جیهان حەزرەتی عەلی (د ـ خ) بوو. عەلی نووری موتلەق بوو. چوار فریشتەی نزیك بە خودا لە جەستەی پاکی عەلی بەدیهاتن. جبرەئیل لە دەستی ڕاستی و میکائیل لە دەستی چەپی و ئیسرافیل لە تەوێڵی و ئیزرابیل لە زبانی عەلی بەدیهاتن. مەلەك تاوس لە زاتی عەلی‌دا ئاشکرا بوو (بە پێچەوانەشەوە) مەلەك تاوس هەر دوون (جامەو جەستە)ی عەلیە. دەڵێن ئەگەر مەلەك تاوس نەبوایە دنیا سیستەم و سەقامی نەدەگرت و ئاوەدانی و پێشکەوتنی نەبوو.

ڕایان وایە هەر کەس لە گەورەگەلیان بمرێ ڕۆحی پەیوەست بە مەلەك تاوس دەبێت. لاپەرەکانی ١٧٩ و ١٨٠» لە جێگاگەلی‌تری کتێبەکەی‌دا سەبارەت بە مەلەك تاوس هەر ئەم باسگەلە دووپات کراوەتەوە.

ئەوە دروستە کە گشت تایفەگەلی ئەهلی حەق لە جنێو و خراپ وێژی بە مەلەك‌تاوس دووری دەکەن و ناوی بە پیرۆز دەزانن. دروستە و دیارە کە گشت ئەهلی حەق لە پێشدا بێ‌شاراوەیی ڕێزیان لێ گرتووە کە ئێستا هەندێ لەوانە یان «تەقیە»[١٤] دەکەن یان بە بۆنەی دووری لە تواڵجی شەیتانپەرستی لە سەدان ساڵدا بە ناوێکی دی ڕێزی لێ دەگیردرێ کە لەسەر ئەم ناوە باسی چڕو پڕمان هەیە. ئەو نووسەرە بە هەڵە خراوەتەوە کە دەڵێ ئەو لە جەستەی داوددا ژیاوە، هەر چەند لە ئەهلی حەقدا هەفتەن نووری یەك چران کە خودایە و لە نووری ئەو جوێ نین بەڵام لە کاکەیی‌دا، داود بەرانبەری مەلەك تاوس نیە. ئەوە کە دەڵێ لەگەڵ ئاینگەلی شەیتانپەرستی نەتەوەکانی دیکە جیاوازیان هەیە بە تەواوی دروستە چۆن شەیتان لە ئێزدی و ئەهلی حەقدا سەرچاوەی گوناە و خراپە نیە و بەشێ لە ئیرادەی خودایە کە قین و تاریکیە و تێکەڵاوە لەگەڵ تیشك و بەزەیی‌دا. قین دەتوانێ ڕەحمیش بێ ئەگەر مار مشك نەخوات تۆوی گیا نامێنی ئەگەر شێر لەوڕکەران نەخوات گیا لەسەر زەویدا نامێنێ. ئەگەر شەو نەبێ خۆر هەمووشتێ دەسووتێنێ. ئەگەر لە مەم و زین‌دا «بەکر»ی زبانی خورۆ نەبێ ئەوینی ڕاستەقینەی مەم و زین بە ئاکام ناگات و... ئەوەیە کە لە ئاینە کوردیەکان و پێشینەی ئەوانە واتە لە میهرپەرستی‌دا قووڵترین عیرفانی وەحدەتی وجوودی هەیە واتە هەموو شت ڕەنگدانەوە و کاردانەوەی یەك شتە کە ئەویش خودایە. دڵ و دەروونی تۆیش کە کانگای ئەوینە ئەوی تێدایە. ئەمە لە مەم و زیندا باسی

دەکەین. موحەمــەد ئــەمــین هــەورامــانی لــە کتێبــی «کاکــەیــی ل ١٦»دا لــە زاری گۆڤــاری نوغەتولعەرەب سەبارەت بە کاکەییەکانی «قەلەم حاج» لە مەندەلیدا دەنووسێ: «لــە شــەیتان ڕێز دەگرن و وەکوو یەزیدیەکان تاوس مەلەکی پێ دەڵێن: ئەگەر کەسێ لەعنەتی شـەیتان کـات یان تف کاتە سەر زەوی تووڕە دەبن.... منالەکانیان خەتەنە ناکەن و لێرەدا وەکوو مەسیحی گەلــن (!) لە لاپەرە ١٥دا دەنووسێ عەلی بە خودا دەزانن...»

ئەوەی کە نوورەدین مودەڕیسی سەبارەت بە ڕۆژنامەکە دەڵێ مورتتەزا شیروانی لەگەڵ شـەیتان لە پێوەندیدایە شتێکی ئاسانە.

مەلەك تاوس لە بناغەی نوورەکە تەجەللای خودایە. شیعرگەلێ لە دەفتەرگـەلـی کاکـەیـیدا هەیە کە لەوەدا تاوس ئاماژەیە بۆ خۆر و پەڕی تاوس سەمبولی نووری خۆرە. جا مەلەك تاوس لـە خۆردایە کە لە پێش ئیسلامدا وەکوو میترا یان میهر ناسـراوە. لـە کتێبــی «دیوانەگـەورە» بـە تێکۆشانی سەیید محەمەد حسەینی ئەم شیعرانە لە «باوە نائووسی جاف»ەوە هاتووە.

ناوز، مەرەمۆ (ناوز دەفەرمێ)

| | |
|---|---|
| مــەهــێ چــە بــالان مــەهــێ چــە بــالان | نــاوزم نــە تــاس مــەهــێ چــە بــالان |
| مانگێ لەسەر دایە مانگێ لەسـەر دایـە | مــن نــاوزم لــە تاســی ئــەو مانگــەوا |
| پــەڕوو تاوســان ئــەز کــەردەنم بــەش | تــالانم کــەردەن مورغــانوو حـەبـەش |
| پــەڕی تــاوس مــن بــەشـم کــردووە و | بەوە پەلـەوەرانی تـاریکیم تـالان کـردووە |

(لە ئەدەبی کلاسیکی فارسی و کوردیدا حەبەش گانگای تاریکی و ڕۆم و چین جێگای نوورە)

لە بەیتی دوانراوەدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| خوەرشێدم تــاوس، تاوسـەن چـل نـەخش | تیر تێـژ بـالم بالـدان نـە سـەر تـەخش |

خۆرم تاوسە، تاوسم چل نەخشە (واتە مەلەك تاوس جیلوەگەلی زۆرە) تـیری تێـژ ڕەوم لـەسـەر تەختەوە هەوادا. تیریش مەبەست تیشکی خۆرە. مەلای جزیریش شاعیری سـەدەی دەی کۆچـی لـە شیعرەکانیدا بە جێگای تیشك «گەزمە»ی تورکی کە هەر بە مانای تیرە زۆر بە کار بردووە وەکوو

گەزمەیەك قەوسی شەڤین عاشـیق بـە نیڤـادل کـەفـت

دێ ببـــت دل پـــارە پـــارە ســـینە تـــار و مـــار بـــت

ئەم شیعرانەی باوە نائووس و لە شیعرەکانی‌تری یارسانەکاندا بە رەمز و ئاماژە لە تاوس و پەڕی تاوس قسە کراوە. پەری تاوس واتە نووری خۆر کە لە فەلەك واتە چەرخ یان ئاسمانی مانگدا رەنگدانەوەی هەیە و مانگی پێ رۆشن دەکرێتەوە. بە گوێرەی فەلسەفەی ئیشراق و ئاینی کۆنی کوردان کە لە فەلسفەی شەهابی سوهرەوەردی کوردیش‌دا کاردانەوەی هەیە نووری خۆر لە مانگدا هۆی بە دیهاتنی «رۆحولقودس» یان بە گوێرەی هەندێ سەرچاوە جبرەئیلە کە لە جیهانی ژێر خوی واتە زەوی و مرۆڤ پارێزەری دەکات. لە ئاینی کاکەیی‌دا یەکەم تەجەللای خودا پیر «بنیامین»ە. رۆحوالقودس دوون واتە جامەی پیر بنیامینە. تەجەللای ئەو کەسەیە کە لە فەلەکی خۆردایە هەروا کە نووری خورە، مانگ رۆشن دەکاتەوە، ئەو کەسەیش هەروەها کە وتمان مەلەك تاوسە جا پیر بنیامین دەبێ بە دوونی مەلەك تاوس و لەگەڵ زاتی مەلەك تاوس یەکن. (لەم بارەوە باسی زۆرترمان دەبێت). لە شرۆڤەی بەرهەمەکەی سوهرەوەردیدا روونی دەکەینەوە کە لە فەلسەفەی «مەششایی» یۆنانی‌دا کە یەکەم تەجەللای خودا وەکوو «عەقلی گشتی» ناوبراوە هەر لە ئاینی میترایی گیراوە. لە «موسحیفی رەش»ی ئێزدیگەل‌دا هاتووە: هەفت مەلەك هەرکام لە یەکی لە رۆژەکانی هەفتەدا بەدیهاتن. یەك لەوانە تاوسی فریشتەکانە کە لە یەکەم رۆژی هەفتە واتە «یەکشەمە»دا بەدیهات. وشەی «ساندەی» کە بە مانای رۆژی خورە لە ئینگلیسی و وێنەی ئەوە لە زمانەکانی‌تری ئەوروپایی‌دا، دیارە لە میهرپەرستی گیراوە و ئەمە دەسەلمێنێ کە تاوسێ مەلەك و میترا هەر یەك شتن. هەروا کە وتمان یەکەم سدووری خودا لە ئێزدیدا تاوسێ مەلەکە کە لە کاکەیی‌دا پیر بنیامین کە پاشان دوون (جامە یان جەستە)ی مەلەك تاوسە لە زەویدا. پیر بنیامین وشەش تەنی دیکە لە کاکەیی‌دا و هەروەها هەفت مەلەك لە ئێزدیدا تەنیا ناوەکانیان جیاوازە. هەر هەفت لە هەر دووەدا هەفت نوورن کە لە دابەش‌بوونی یەك نوور کە خودایە پێکهاتوون و لەم بارەوە هیچ جیاوازیەك لە نێوان کاکەیی و ئێزدی‌دا نیە. (هەڵبەت نووری جەوهەری نەك نووری رواڵەتی)

چون میترا و خۆر لە مێژەوە پێوەندیان پێکەوە هەبووە ئێستا لە ئەدەبی فارسی و کوردیدا بە خۆر «میهر»یش دەڵێن.

هەروەها کە لە باسەکانی داهاتوودا زۆرتر دەی‌سەلمێنن ئیتر زۆر نا بە جێیەکە دەڵێن ئێزدی یان کاکەیی لە ئاینی مانی و زەردەشتی و ئیسلام و جوو و... بەدیهاتووە. زۆر رەسەن و روون دیارە کە

پاشماوەی ئایینی میترایین. نەختێ لێکچوون لە نێوان «سپەند مێنوو»ی زەردەشتی، لەگەڵ مەلەك تاوسی ئاینە کوردیەکان هەیە ئەویش هەر ئەوەیە کە سپەند مینوو یەکەم ئافرێنراوی خودا و مەلەك تاوس یەکەم تەجەللای خودایە ئیتر هیچ. لە میترایی و ئێزدی و کاکەییدا قوربانی کردنی «گا» (لە کاکەییدا بە ئاماژەی هەرە جوان کەڵەزەردە «مانگ») هەیە بەڵام لە گاساکاندا قوربانی کردنی گا بە توندی ئیدانە کراوە. لە زەردەشتیدا شەیتان تا ئاخری دنیا لەگەڵ خودا و دەسکردەکانیدا لە شەڕدایە بەڵام ئەم شەیتانە لە میهرپەرستی و ئاینە کوردیەکاندا بێمانایە.

سپەندمێنوو نایەتە سەرزەوی بەڵام میترا بۆ ڕزگارکردنی ژیان لە ئاسمان دیتە سەر زەوی. مەلەك تاوسیش کە وتمان ئاماژەی پاش ئیسلامە بە میترا لە جەستەگەل و ناوگەلێکیتردا دێتە خوارەوە بۆ ڕزگار کردنی مرۆڤ. شەش تەنەکەیتر جگە لە تاوسێ مەلەك هەر بەشگەلێ لە زاتی ئەون لە جەستەگەل و ناوگەلێکیتردا. هەفت نوورن هەڵگیرساو لە یەك نوور واتە نووری خودا.

لە نۆ فەلەك (نۆ ئاسمان)ی ئەستێرەناسی میترایی و فەلسەفەی ئیشراقی سوهرەوەردی و ئاینە کوردیەکاندا (جەنابی نوورعەلی ئیلاهی لە وتاری ١٠٨٧دا بە نۆ ئاسمان ئاماژە دەکات) هەفت فەلەك هی «گەڕوك»ە کانە (ئەستێرەی گەڕۆك ئەوانەن کە جێگایان لە چاو ئەستێرەکانیتر دەگوردرێ. لە ژێرەوە بۆ سەر بریتین لە، مانگ ـ تیر «عەتارد» ـ زوهرە ـ خۆر ـ مریخ ـ موشتەری و زوحەل). ئەمانە لە ئەستێرەکانیتری ئاسمان گرنگترن و لە ئاینی میترایی و ئاینە کوردیەکاندا هەر کام ڕۆژێکی هەفتەیان هەیە. بە وتەی سوهرەوەردی کە پاشان باسی دەکەین لە خوارەوە بۆ سەر نوورانی بوو نیان زۆرتر دەبێ. کم نوورترین ئەوانە کە جیرم و قورسایشی هەیە مانگەکە لە ژێر ئاسمانەکانیترە.

ئەم مژارە ئاماژەیە بە هەفت قۆناغی بڕینی تەکامول و گەیشتن بە پلەی هەفتەم لە ئاینی میتراییدا کە پاش بڕینی ئەو قوناغانە بە مەقامی سیمورغ[١٥] دەگەن. لەوەدا ڕۆحی مرۆڤ لەگەڵ ڕۆحی میترا واتە جیهانی نوور تێکەڵاو دەبێت. پاش ئیسلام ئەمە هاتۆتە نێو عیرفان و تەسەووفی ئیسلامیەوە و قۆناغی هەفتەم ناونراوە «فەنافیللا». لە میترایی و ئاینە کوردیەکاندا ڕۆح کە هەر تیشکی زاتی خودایە بۆ تەکامول دەس بە تەناسوخ واتە گەڕان لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکیتر دەکات هەتا خۆی تێکەڵاوی جیهانی نوور واتە بناغەکەی خۆی دەکاتەوە. «دوانزە بورجی[١٦] ئاسمان (کە لە جەغزی مەنتەقوتولبرووج[١٧] دایە) دوانزە یارمەتیدەری میتران کە لە

مەسیحیدا بوون بە دوانزە، حەواری عیسا (چون عیسایش وەکوو میترا کە رۆحی خودا بوو هەڵگەڕاوە بۆ ناو خور). "لە میتراییدا ناوی دوانزە مانگی ساڵ بە ناوی بورجەکانەوە بوو. میترائیسم، هاشم رەزی ل ١٤٩». (پاش ئیسلام ئەم ناوانە وەرگێڕدرانەوە بە عەرەبی).

لە میهرپەرستیدا ئاسمانی گەڕۆکەکان کە هەفت دانەیە رۆحی هەرکام لەو گەڕوکانە بوڕێوەبەری هەرکام لەو هەفت ئاسمانەن وەکوو دینە کوردیەکان. وتمان ئاسمانەکان نۆ ئاسمانن. نۆهەم ئاسمان جێگای «نووروڵنەنوار» واتە یەکەم دەرکەوتنی خودایە. ئاسمانی هەشتەم تەجەللای ئەوە کە جێگای ئەستێرەگەلی وەستاوە. مرۆڤەکان دەبێ تێکۆشن بە بڕینی هەفت قۆناغ لە هەفت ئاسمانی گەڕوکەکان تێپەڕن و خۆیان بە ئاخرین پلە واتە پلەی هەشتەم کە نزیکی تەواو بە خودایە بگەیەنن و لەگەڵ جیهانی نووری خاویندا تێکەڵاو بن. میهرپەرستەکان لە ستایشتگاکانیاندا سەختی و رەنجی زۆریان دەکێشا. «میترا داوەری دەکرد تا رۆحگەلی پاك و شیاو بتوانن بە جیهانی نوور بگەن. هەر ئەو سەرچاوە ل ١٦٧» رۆحەکان لە پێشدا تەناسوخگەلێکی زۆریان لە گیاوە بۆ گیانەوەر و لە گیانلەبەرەوە بۆ مرۆڤ لە زەوێدا بڕیبوو. رۆحی مرۆڤێ کە بۆ وێنە بە ئاسمانی دووهەم گەیشتبوو دەبوا بۆ گەیشتن بە مەقامی سەرتر بهاتایەتە خوارەوە لە جەستەگەلێکیتردا ژیانی بکردایە. میترا بەزەیی بە رۆحەکاندا هات و عیبادەتگەل و ریازەتگەلی دانا تا رۆح کەمتر ئەم جەستە و ئەو جەستە بکات و زووتر خۆی بە جیهانی نوور بگەیەنێت. میترا یان مەلەك تاوس کە تەجەللای خودایە لە ئاسمانی هەشتەم بۆ رزگاری مرۆڤ هاتە سەرزەوی و پاش بە ئەنجام گەیاندنی کارەکانی چووە ناوەراست ئاسمانەکان واتە ناوەراستی هەفت گەڕۆك کە ئاسمانی چوارەمە و جێگای خۆرە. لە ئەستێرە ناسی میترایی و پاشان ئیسلامیدا دوونهۆم (نە دوو ئاسمان) بە ناوەکانی نهۆمی «ئەسیر»[18] و نهۆمی «زەمەهریر»[19] لە نێوان زەوین و ئاسمانی مانگدا هەیە کە بە نۆ ئاسمانەوە دەبن بە یانزەنهۆم. فەلەکی خۆر بە دوونهۆمی ژێر مانگەوە دەبێ بە فەلەکی شەشەم کە ناوەراستی یانزەیە. وتمان لە هەفت ئاسمانی هەفت گەڕۆکدا هەر یەك لە هەفت تەن کە رۆحی ئەو گەڕوکەیە بوڕێوەبەری دەکەن. لە ناوە راستی گشتیدا فەلەکی خۆر هەیە کە لە گشت گرینگترە و چاوەدێری گشتی دەکات. ئەم فەلەکە واتە خۆر لە میهرپەرستیدا جێگای میترا و لە دینە کوردیەکاندا جێگای مەلەك تاوس و لە مەسیحی (لاسایی کەرەوەی میترایی)دا جێگای حەزرەتی عیسایە لە هەفت قۆناغی عیبادات و سلووکی میهرپەرستیدا قۆناغی چوارەم

ناوی شێرە کە شێر سەمبۆلی خۆر و میترایەکە لە ئاسمانی چوارەمدایە. لە تاینی ئیزدیدا خۆر جێگای تاوسی مەلەکە کە لە فریشتەکانیتر گرینگترە. لە کاکەیی‌دا پیر بنیامین کە دوونی مەلەك تاوسە خاوەنداریەتی ئاسمانی چوارەم یان خۆر دەکات. هەروەها ڕۆژی سێ شەمەیش کە ناوەراستی هەفتەیە تایبەت بەوە (هەفتەی کاکەیی لە شەمەوە دەست پێدەکات).

لە کاکەییدا دەڵێن حەزرەتی عیسا دوونی پیر بنیامینە واتە هەر ڕۆحی خودایی پیر بنیامین لە جەستەی عیسادا بووە. لەم بارەوە خوا لێ خۆشبوو «حاج نیعمەتوڵڵای جەیحوونابادی» پیاوی هەرە گەورەی ئەهلی حەق کە کوڕەکەی «نوورعەلی ئیلاهی» ڕێبەرایەتی ئەهلی حەقی سەهەنە و کرماشانی دەکرد لە کتێبی هۆنراوەی فارسی خۆیدا «شاهنامەی[20] حقیقت. ل ٩٦» دەڵێ:

چنان بود عیسی بە قدرت چنان بسی کرد حی مردە در قبرستان

کە بُد مظهر پیر بنیام راد بدوذات حق بود مهمان بە داد

واتە عیسا وەها هێزیکی هەبوو کە زۆر مردووی لە گۆرستان زیندوو کردەوە کە ئەو پیر بنیامین بوو کە لە جەستەدا دەرکەوتبوو و زاتی خودا لە وجوودی ئەودا میوان بوو. واتە عیسا هەر پیر بنیامین و بەشێ لە زاتی خودا بوو. لە لاپەرە ١٣٣دا دەڵێ کە «ئیمام مەهدی (ئیمامی دوانزەهەمی شیعە)یش لەگەڵ عیسادا دەردەکەوێ هەر پیربنیامینە». ئیتر گومان لەوەدا نەماوە کە پیربنیامین جەستەی دەرکەوتنی مەلەك تاوسە و پیربنیامین لەگەڵ زاتی مەلەك تاوسدا یەکن و مەلەکە تاوسیش کە هەر ئەهریمەنی تاینی میهرپەرستیە بەشێ لە زاتی خودایە.

میترا لە بەرد واتە دڵێ تاریکیەوە دەرکەوتووە. لە ستایشتگایەکی ئاڵمان و هەندێ جێگایتردا لە سەدەف دەردەکەوێ. سەدەف و بەرد ئاماژەیە بە تاریکی پێش جیلوەی خودا. «لە تاینی میتراییدا دەڵێن پاشان میهر لە هاتنی بۆ سەر زەوی لە کچێکی باکیرە و شوو نەکردوو دەزێت. میترائیسم. هاشم ڕەزی» بە وردی وەکوو لە دایك بوونی زات بەشەرەکانی کاکەیی، لەوانە شاخوەشین و سان سەهاك و هەروەها لە دایك بوونی حەزرەتی عەلی لە خانووی کەعبەدا. یان لە دایك بوونی حەزرەتی عیسا. مامۆستا ڕەزی چۆنیەتی لە دایکبوونی شاخوەشینی لە «شاهنامەی حقیقت»ی ناوبراودا کە فارسیە دەرهێناوە و چون ئەو بەرێزە لە پێشدا هێناویەتی بە ناوی ئەوەوە دەیهێنین و پاشان منیش چۆنیەتی زاینی باوە ناوزی پێ زیاد دەکەم.

| | |
|---|---|
| قضـــا روزی آن دخــــتر مــــاه چــــهر | نشســـته بـــه جـــایی کـــه تابیـــد «مهـــر» |
| یکـــــی ژرة از خـــــور بیامــــد دوان | فروشـــد بـــــه کـــــام شــــه بــــانوان |
| بشـــد حاملـــه دخـــتر از رره نـــوور | کـــه آن نـــور از حـــق نمـــودی ظهـــور |
| پـس از چـند مـه گشـت بـارش ثقیـل | پدیـــــدار از آن نـــــور رب جلیـــــل |
| دگـــر در لرســـتان همـــه مـــرد و زن | شـــدند بـــدگمان زان عفیـــف مهـــن |

واته تیشکیك له خۆرەوە هات و به توندی چووه قوڕگی خاتوو جەلالە (دایکی شـاخوەشـین)ەوە. ئەو کچه لەو نووره زگ پڕ بوو. ئەو نووره له خوداوە دەرکەوتبوو. پاش چەند مانگ ئەو کچه بـاری قورس بوو که نووری خودای پایەبەرزی لێوە دیاری دەدا.

له لورستان (جێگای له دایكبوونی شاخوەشین)دا ژن و پیاوان هەموو لەو کچه پاکـه دڵ پـیس بوون.... ل ١٥٦».

نووسـەری شاهنامـەی حەقیقەت له لاپەره ١٧٢دا باسی له دایكبوونی بـاوه نـاوز دەکـات: بـدی مـادرش هم در آن عهد بکر ـ «چو ذات خوشین کاو نمودیم ذکر...»

واته دایکی باوه ناوزیش لەو زەمانەدا هەر کچی باکیرە بوو وەکوو زاتی خوەشین که باسی کرا.

خاتوو «دایراك»یش که دایکی سوڵتان ئەسحاقه هەر له نوور وەکوو شابازیك باری گرت که له سەرەنجام کتێبـێنایینی «یارسان» واته کاکەیی یان ئەهلی حەقدا باس کراوە.

جگه لەو زایینگەلە که به تەواوی لەسەر بیرۆکەی میترایین، ڕۆحی خوەشین لـه خـۆرەوە هـات و ئەو نوورەش نووری خودا بوو واته تەجەللای خودا که بەشی هەرەگرینگی له خۆردایه ئەمەیش به تەواوی عـەقیدەی میهرپەرستیه.

بیرۆکەی‌تری یارسان له قوربانی کردنی «گا» یان «کەڵەشێر» (کەڵەباب) دایـه. (لـه نەخشـی میترایی‌دا پیشان دەدرێ کەڵەشێریش وەکوو گا نیشانەی مـانگه). دەزانین میترا له تاریکی واته له بەرد یان سـەدەف هاته سەرزەوی. گایەکی له بەردەرکی ئەشکەوتێکدادی. گاکەی قوربانی کرد تـا ژیان له زەویدا دەس پێ بکات پاشان تێ دەگەین که ئەو گا هەر خودی میترایه واتـه تـەجـەللای حەق، بۆ ئافراندن و پارێزگاری له ژیان، خۆی قوربانی دەکات. له پێشینەی ئوستوورەیی میترایـی لەوێداکاندا وتمان که میترا بو رزگاری گیانەکان له مانگدا، مانگ که وەکوو گایەك بوو دەکوژێ. دەزانین که تیشکی مـانگ هەر تیشکی خوره جا دەتوانین بڵێین کـه تـەجـەللای ڕۆحـی خـوره لـه

جەستەی مانگدا و هەروەها تەجەللای خودایە لە ڕۆحی خۆردا. دەزانین خاوەن و پارێزگاری ئاسمانی مانگ کە لە سەرەوە بو خوار ئاسمانی هەفتەمی گەڕۆکەکان یان لە زەویدا بۆ ئاسمان چەرخی یەکەمە، لە ئاینی کاکەیی‌دا پیر یادگارە. لەم ئاینەدا ناوی ئاماژەی پیر یادگار «یاری زەردەبام» کە مەبەست مانگە، یەکەم قوربانیشە لە یەکەم «جەم»ی پاش ئافراندندا (جەم کۆڕی عیبادەتی یارسانەکانە) لەو جەمەدا خودا کە لە دوونی «یا» وە تەجەللا دەکات و لە تەجەللاکانی‌تری ئەو جیهان و مرۆڤ بەدی دێت پاش ئەمە لە ژێر خۆر (ساج نار کە بە باوڕی من زەوی و ناوچەی هەورامانە)دا جەمیٚ دەبەستن. یەکەم جار ئەو یەکە لە هەفتەن کە لە زەمانی سان سەهاکدا پیر یادگارە قوربانی دەبیٚ. لەم بارەوە ئەو کەسەی کە لە زەمانی سان سەهاکدا ناوی «خەلیفە عەزیزی سلێمانی» لە سەرەنجامدا دەڵیٚ:

| | |
|---|---|
| نامێم عەزیزی ـ نامێم عەزیزی | مەدی شاهیدی نامێم عەزیزی |
| شام نە دوون یا کەردرەستاخیزی | نەژێر ساجنار میردان کەرد ریزی |
| گیریا دیوان جەم تەمیزی | کەردن «بەیابەست» شەرت شاقیزی |

«یار زەردەبام» چەوگا مەهمیزی ـ کەردشان ئەو «ناچە» پوختە و لەزیزی ......

واتە ناوم عەزیزە .... دەدەم شاهیدی. ناوم عەزیزە شاهم (تەجەلای خودای من) لە دوونی «یا»وە هەڵساو لە ژێر گۆی خۆردامیردانی بەڕیز کرد «دیوان»[21]ی جەمیکی خاوێن گیرا «بەیا بەست» (واتە پەیمانی پاش ئافراندن وەکوو پێش شەرتی بڵاو بوونەوەی تەجەللاکانی لە جیهاندا کە خودا لەگەڵ ئەواندا دەیبەستیٚ) کرا (مانای شاقیزم بۆ ڕوون نەکراوە) یاری زەردەبام (پیر یادگار) لەوێدا وەکوو سەر هەوسار کردیان بە بەشگەلێکی خۆراکی خۆشمەزە و...

هەروا کە هەرکام لە هەفتەنی یارسان خاوەن و بەڕێوەبەرییەکیٚ لە فەلەکی هەفت گەڕۆکەکانن ئەوانە فەلەکی مانگ هی پیر یادگارە. ئەمە بە وردی بیرهێنەری قوربانی کردنی گایە بە دەس میترا کە لە ویداکاندا باسمان کرد کە پاشان لە ئاینی میهرپەرستیدا و پاش ئیسلامیش لە ئاینە کوردیەکاندا ڕەنگی داوەتەوە.

دەزانین تەجەللای خودا لە مرۆڤەکان لە ئاینی یارساندا دو چەشنە یەکەم تەجەللای خودی خودایە کە لە خۆرەوەدێت بەوانە دەڵێن «زات بەشەر» وەکوو عەلی و خوەشین و سەهاك کە وتمان دایکیان بە تیشکی خور زگ پڕ بوون. دووهەم «زات میهمان» کە هەر تەجەللای خودان بەڵام لە مانگەوە دێن کەوتمان بە پێی فەلسەفەی سوهرەوەردی کورد وەکوو فەلەکی ڕۆحولقودس ناسێنراوە

ئەمانە ڕۆحیان وەکوو شاباز (کە ئاماژەیە کە بۆ سیمورغی میهرپەرستی) دێتە سەر زەوی. باوە ناوزکە زات میهمانە (واتە بەشێ تەجەللای حەق لە جەستەی ئەودا میوانە) لە سێ بەیتی سەرەتای پارچە شیعرێکی پەنجا بەیتیدا دەڵێ:

ناوز مەرەمۆ (ناوز دەفەرمێ)

| | |
|---|---|
| چەی ماهوو چا بەرز چەی ماهوو چا بەرز | ناوەزەنانێ چەی ماهوو چا بەرز |
| شاباز یۆنان دەر سەمەن سەر تەرز | پەڕم ڕامنان چەی مەرز پا ئەو مەرز |
| هەر کەس خوەشینەن، ها خوەشینش ئەز | یارم موانۆ مەقام حەق تەرز ... |

واتە لە ئەو مانگەو لە ئەو بەرزەوە (هاتووم) ناوزم لە ئەو مانگ و لەو بەرزەوە (هاتووم)

من یەکەم شابازم سەرتەرزی چیمەن کە پەڕم (نوورم) بەرداوە لە ئەم سنوور، بۆ ئەو سنوور هەر کەس خوەشینە (شاهخوەشین پیش ناوز زات بەشەر بووە) فەرمو خوەشین منم. دۆستی من دەخوێنێتەوە مەقامی حەق بە هەر شێوە. (ئەوەی کە مەقامی خودا دەخوێنیتەوە دەزانێ نووری مانگیش هەر نووری خۆرە و جیاوازیەك لە نێوان خوەشین و ناوزدا نیە).

بۆ یەکەم جار ڕامگەیاندووە کە سوهرەوەردی کورد فەلسەفەکەی لە سەدەی شەشی کۆچیدا لەسەر ئاینە کوردیەکانداڵنا کە ئاینی باو باپیرانی بوو و بە فەرمانی سەلاحەددینی ئەییووبی لە سووریەدا بە توانجی نوورپەرستی لە تەمەنێکی کورتدا کوژرا. دەبوا لە پێشدا ئاماژەم بکردایە کە خۆر و هەفت ئاسمان و نوور و تاریکی و... ئەمانە گشت تەنیا دەس مایەن بۆ دەربڕینی تەوحیدێکی قووڵ کە باسی دەکەین. لە قسەکانی سوهرەوەردی تێ نەگەیشتن و شەهید کرا. ئێستا لە زانکوکانی فەلسەفەی ئیسلامیدا وەکوو فەیلەسووفی ئیسلامی پێوە شانازی دەکرێ.

بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان. وتمان گا (مانگ) کە قوربانی دەکرێ هەر بەشێ لە میترا (نووری خۆر)ە. جا بە گوێرەی ئەم مژارە ئەوە کە لە گۆشتی قوربانی گا، یان کەڵەشێردا دەخورێت لە بناغەدا ئاماژە بەو پێشکەشیگەلەیە کە زاتی حەق لە بوونی خۆی (تەجەللای خۆی) پێشکەشی تۆی کردووەو دەیکات. ئەمەیە ڕازی قوربانی کردن لە دینە کوردیەکان و لە بنەمای ئەوانە واتە دینی میهرپەرستیدا. جا دیارە ئەو توانجەی مەسیحیەکانی ئەورووپا کە وتوویانە میهرپەرستگەل مرۆڤیشیان قوربانی دەکرد نادروستە. قوربانی دەبێ ئاژەڵی گیاخۆر بەتایبەت «گا» بێت. کە گانە بوو دەبێ کەڵەشێر بێت. هەروەها کە لە پەیکەرە میتراییەکاندا ڕوونی دەکەینەوە کەڵەشێریش سەمبۆلی مانگە لە بەشی هەفتەمدا باس دەکرێ. قوربانی دەبێ سەمبۆلی مانگ بێ. دیارە

قوربانی کردنی مرۆڤ بو میترا (مەلەك تاوس) تاوانێکی نامرۆڤانەیە بە میهرپەرستی. مامۆستا هاشمی رەزیش ئەمە بە تاوانج دەزانیٚ بەڵام ڕوونی نەکردۆتەوە بۆچی و لەسەر سەمبولەکانی مانگ و پێوەندی ئەوانە لەگەڵ قوربانی قسەی نەکردووە بەڵام ئەوەی نووسیوە کە ئەم تاوانجە هەڵەیە.

نە قوربانی کردنی گادا میهرپەرستەکان مێژگی گاکە ناخۆن چون بە گوێرەی تەناسوخ رۆحی مرۆڤی پیٚ نەگەیشتوو لە مێژگی گادا دەژی. دەزانین ڕۆح و گیان پێکەوە جیاوازی هەیە. لە کاکەییشدا مێشکی گاکە ناخۆن.

مینورسکی دەنووسیٚ:

«کاکەییەکان» بە شێوەیەکی تایبەت نان و گوشتی کوڵاو بەش دەکەن کە لە ئاینی کۆنە مەسیحیەکان دەچیٚ». مینۆرسکی شارەزایی لە ئاینی میترایی و پێشینەی کۆنتری ئەوە لە کوردستان و ئەورووپادا نیە وەکوو باسەکەی ئەمین زەکی بەگ کە دیگوت بە ناوی ئیسلامیەوە خۆر دەپەرستن. ئەم نووسراوەیشی لە کتێبی فارسی «دەبستانولمەزاهیب» گرتووە هێناویە: «کاکەیی دەڵێن: خۆر ناگەرێت مەگەر عەلی دەستووری پیٚ نەدات فەلەکی چوارەم جێگای خۆر واتە دولدولٚ (ئەسپەکەی حەزرەتی عەلی)ە)». لێرەدا ئاماژەیەکی تەواو بە میهرپەرستی هەیە ئەویش ئەمەیە کە میهر و خۆر جیا لە یەکن ئیتر دیارە کە خۆرپەرستی تاوانجەکی نادروستە.

پێش ئەوە باسەکەمان لەسەر مەلەك تاوس درێژە پیٚ بدەین پێویستە بڵێین خودای تاك نافرێنەری گشت لە ئاینی کاکەییدا پێش ئەوە خۆی دەرخات واتە لە تەجەللای خۆی جیهان بنافرێنی لە دۆخی موتلەقی خۆیدا بوو یەکەم جیلوەی لە «سر»دا ناوی «یا» بوو پاشان لە نێو «دور»دا «ئیلاهـ» بوو لە سەدەف هاتە دەریٚ ناوی خاوەندگار بوو خاوەندگار بەرانبەر میترایەکە دەزانین میترا لە بەرد یان سەدەف هاتە دەریٚ. دەرهاتنی خاوەندگار لە بەرد لە پەخشانەکانی کاکەییدا هەیە. محەمەد ئەمین هەورامانی لە کتێبی «کاکەیی»دا هەندیٚ لەوانیە بیٚشرۆڤە هێناوە. یەکەم پەخشانی لەم بارەوە ئەمەیە:

(ئاو، دەلیا" بەحربی. چەند وەخت دور دەلیابی. بەحرو بەرنەوی. سوڵتان عالەم هەییەتدا وە سەنگ، تۆقیا، رێزەی بەرد بیوە دورد، وە بە دوودسەنگ لەگەرد وە لە هێز گەرد بی وە هەوا)

واتە ئاو وەکوو، زەریا (واتە) بەحر بوو. چەند کات دوڕلە زەریا بوو. بەحر و بەڕ نەبوو سوڵتانی عالەم (خودا) هەییەتیدا لە بەرد، بەرد تەقی، وردەی بەرد بوو بە دووکەڵ و .... (ئەم دیرەتێك شیواوە).

ئەم نووسراوە کە لە بواری زەمانـدا زاراوەکـەی گـۆڕدراوە و هـەروەهـا شـێواوی تـێ کـەوتـووە یادگارێکە لە زایینی میترا لە بەرد لە پێش هاتنی ئیسلام. زایینی میترا لە بەرد یان سەدەف لـە بناغەکانی میهرپەرستیە. لە بەشی هەفتەمدا باسی سەدەف دەکرێ.

لە زات و نووری خودا هەفتەن و هەفتەوانە کە دەبن بە چواردە پێك دێن

وەسـڵ و پـەیـوەنـا ، وەسـڵ و پـەیـوەنـا      هـا زات و نـوورم وەسـڵ پـەیـوەنـا

نوورمـا هـەفتـەوان، زاتم هـەفتـەنـا      زات و نوور جەیـەك چـەشمەو وێم هـەنـا

وەسـڵ و پـەیـوەنـدە، هـا ، زات و نـوورم      وەسڵ و پەیوەندە (واتە زات و نوور) یـەك

نـوورم هـەفتـە وانەیـە و زاتم هـەفتـەنـە      زات و نـوور لـە یـەك چـاوگەی خـۆمن

خودا لە پێشدا لە جیلوەی زاتی خۆی جوبرەئیل کە لە جەستەی مرۆڤ لە زەمانی سـانسـەهاکدا ناوی بنیامینە و لە زەمانی عەلی و باڵووڵ و ناوزوخوەشیندا ناوگەلیتری هەیـە پێـك دێـنی کـە یەکەم و گرینگترین تەجەللای خودایە، پاشان هەر لە جیلوەی زات شەشیتر پێك دێـت کـە بـە بنیامینەوە دەبن بە هەفتەن. هەروەها لە جیلوەی نووری خودا کە هەر زاتی ئەوە، هەفتەوانە پێـك دێن کە ناوەکانیان لە هەر دەورروزەمانەدا هـاتووە و کۆبـەنـدیان دەبـن بـە چـواردە. لـە بەرانبـەر ئەمانەوە کە چواردە سەرچاوەی نوورن، چواردە سەرچاوەی تاریکیش هەیـە کـە وەکـوو سەرچـاوەی نوورەکان دوانیان مێو دوانزەیان نێرن. ناوی ئەم چواردەش لە هەر دەورو زەماندا هاتووە (بـۆ ئـەم ناوانە بڕوانە ل ١٢١ شاهنامەی حەقیقەت)

مانگ فەلەکی ئاخر و نزیك بە زەوی و ڕەنگدراوەی فەلەکی ناوەراست واتە خۆرە. لە خۆردا نوور و میهری خودا و ویست و ئیرادەی ئەو واتە میترا یان وەکوو پاش ئیسلام مەلەك تاوس هەیە کە لە کاردانەوەی گشت ئەمانە لە مـانگـدا خـوێ دەنـوێنی و وەکـوو جبرئیـل یـان ڕۆحولئـەمـین زەوی پارێزگاری دەکات. هەر وەها کە وتمان مانگ و هەفت ئاسمان و جوبرەئیل و... هەموو دەسمایەن بـۆ دەربڕینی ئەم ڕاستیە کە هەرچی هەیە ڕەنگدانەوە و کاردانەوەی زاتی خودایە و جگە لە ئەو هـیچ نیە. باوەتایەری هەمەدانی سەبارەت بەم تەوحیدە بە شیعری هەورامی دەفەرمێ:

بینەکانی ئەمڕۆ تا بارستای هەفدە میلیارد ساڵ خێرایی نوور هێشووگەلی کەشکەشانی دەبینن و پاش ئەوانیشە هەر هەیە و نابینرێ. کەوا بوو جیهان فەلـەك فـەلـەك و نهـۆم نهـۆم نیـە و ئـەم سیستەمە هەرەمەزنە نەناوەراستی هەیە و نە ئاخر. ئەگەر فەلسەفە و دینە کوردیەکـان خۆریـان هێنایە ناوەراستی جیهان بۆ دەربڕینی باوەڕە تەوحیدیـەکـەیـان بـوو. ئـەم بـاوەڕە تـەوحیدیـە بـە ئەستێرەناسی ئەمڕۆ و سەرنج لەسەر «ئەتوم» و هێزە ناوۆکیەکان واتە تـی هـزرین لـە قـوولایی مادەوە تا سیستەمە کەشکەشانیەکانیش هەر قابیلی شرۆڤە کردن و پشت ڕاست کردنە، چون ئەم دەسمایەگەلە کە بەرهەمی زانستی ئەمڕۆیە چاکتر دەتـوانێ تـەوحیـدی جیهـانی سیسـتـەماتیـك دەرخات. هەروا کە وتمان هەفت ئاسمان و مانگ و خۆر و بنیامین و مەلەکـە تـاوس و.... بوونەتـە دەسمایە بۆ دەربڕینی باوەڕگەلی تەوحیدی کورد.

تەنانەت چیرۆکیش بەتایبەت وەکوو مەم و زین و سەیدەوان هـەر دەسمایـە کـراون بـۆ دەربـڕینی باوەڕگەلی تاكپەرستی. لە ناو چیرۆکەکانـدا لـە پێشـدا مـەم و زیـنی ئـەحمـەدی خـانی وەکـوو بیۆێنەترین چیرۆکی دینی و باوەڕمەندی جیهان و پاشـان مـەم و زیـنی فولکلـۆر کـە لـەوانـەدا باوەڕمەندی دینی کوردان بە جوانی تەواو پیشان دراوە باس دەکرێت.

| | |
|---|---|
| یا گێم دورِ دی، هەنی زەریە نەوی یار | یا گێم خوەردی، گیهان پەیدە نەوی |
| من ئژ ئارۆ بە دامان تەزەد دەست | دەگەردوونت پەرِ و پایە نەوی یار |
| لەو جێگایە دورِم دی ئیتر زەریا نەبوو ئەی یار | لە جێگایەك خۆرم دی، جیهان پەیدا |
| من لەو رۆژەدا دسم دایە دامانت | کە ئاسمانت پایە و بنەمایەکی نەبوو |

لەم شیعرە هەرە بەرزەی باوەتایەردا کە موریدی شاخوەشین بووە تەوحیدی قوولی ئاینی کاکەیی و هەر وەها ئێزدیش دەر دەکەوێ. دەزانین دورِ لە (سەدەف)دایە و سەدەفیش لە زەریادا ئەگەرزەریا نەبێ سەدەف نیە و ئەگەر سەدەف نەبێ دورِ نیە. باوەتایەر دەڵێ: لە جێگایەك دورِم دی کە هێشتا زەریایش نەبوو واتە منی مرۆڤ وەکوو تۆزێك لە نووری حەق پێش ئەوەی زەریایەك هەبێ دورِم دەدی و پێش ئەوەی جیهانێ پەیدا بێ خۆرم دەدی یانی منیش وەك هەر بوونەوەرێکیتر پێش تەجەللای خودا لە بوونی ئەودا بووم.

من رۆژێ وەکوو ئەمرۆ دەسەو دامانی تۆ بووم کە هێشتا پایە و بنەمای گەردوونەکانت دانەرِێژرا بوو. لێرەدا نە تەنیا شت و جێگاومەکان هەر یەك شتن بەڵکم زەمانیش پێش و پاشی و ئێستای نیە و هەر یەك شتە جا ئاسمان و گەرِۆك و سەدەف و گشت دەسمایەن بۆ دەربرِینی تاك پەرستیەکی هەرە قووڵ. هەرچی هەیە هەر یارە و تەجەللای یار.

بەم جۆرەیە کە کورد بۆ دەبرینی عەقیدە تەوحیدیەکەی لە زانستی زەمانەو ئەستێرەناسی زەمانی پێشوو کەڵکی وەرگرتووە. پێش ئەستێرەناسی نوێ کە لە زەمانی گالیلە و کوپرنیکەوە دەستی پێ کرد زەوی وەکوو ناوەندی جیهان تەسەوور دەکرا کە بە دەورێدا هەشت ئاسمان (هەفتیگەرِوکەکان و یەکێ ئاسمانی ئەستێرە وەستاوەکان) بوو. سوهرەوەردی کورد و دینە کوردیەکان کردیان بە نۆ ئاسمان و دوو قاتیش لە نێوان مانگ و زەویدا کە دەبن بە یانزە.

خۆریان کرد بە ناوەراستی جیهان واتە شەشەمین لە نێوان یانزەدا. پاش پێنج سەدە ئەستێرەناسی نوێ، پشت راست بوەتەوە کە هەفت ئاسمانی گەرِوکەکان و ئاسمانی ئەستێرە وەستاوەکان و ناوەند بوونی زەوی کە گشت جیهان تا سەدەی شانزەی زایینی وەکوو راستیەکی نەگۆرِ باوەرِیان پێ بوو شتێکی هەڵەیە. سیستەمی خۆر کە زەویش بەشێکی هەرە چکۆلەی ئەوەیە پاژەیەکی زۆر چکۆلە لە کەشکەشانی «رێگای شیری» کە پانتاییەکەی نوور بە سەدهەزار ساڵ دەیبرِی و خۆی پاژەیە کە لە هێشوی کەشکەشانی ناوچەی ئێمە. سەدان میلیون هێشووی کەشکەشانیتر هەیە. دوور

## ڕوون کردنەوەکانی بەشی دووهەم

١ـ «سان» وشەی کوردی هەورامی لە ئەوێستا بەشی گاساکاندا «سانە» دوو وشەیە (سا +نە) «سا» لە بناغەی «سە» بە مانای وتن و فەرمایشت کردنە. بۆ وتن دوو وشەی‌تریش لە ئەوێستادا هەیە «وەچ»، هەورامی «واچ» سوورانی «وێژ» و «بێژ». هەر وەها «دوو» کە لە کوردیدا وەکوو خۆی ماونەتەوە. «سە» لە فارسی هیخامەنشی بەردنووسراوەی بێستووندا هەر «سە» بەلام بەسینی نووك دیانی The دابێژ دەکرا. لە زمانە ئەوروپاییەکاندا لەوانە ئینگلیسی «Say» بە مانای وتن لەگەڵ «سە»ی ئەوێستایی هاوبناغەیە. بەشی دووهەم نیشانەی ناوەڵناوی «نە» لە کوردیدا وەکوو خۆی ماوەتەوە و لە ڕوون کراوەکانی بەشی یەکەمدا باس کرا. وتمان «نە» نیشانەی ناوەڵناوی کارکەرە (فاعیل)ە. سانە بە مانای ئەوەیە کە فەرمایشت دەفەرمێ و فەرمان دەدا. لە گاساکاندا زۆرتر بە مانای ڕێبەری ئاینی هاتووە. لە ئەدەبی کاکەییش‌دا هەر بەم مانا هاتووە وەك دەڵێن «سان سەهاك» واتە سوڵتان ئەسحاق. لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا ناوگەلی جوغرافیایی «کانی سانان» نزیکی مەریوان ـ تاقەوسان واتە تاقی شا لە کرماشان (تاقووسانێ. وشەی هەورامی کە لە کەلهوڕی‌دا گۆڕدراوە بە تاقەوسان). زۆر پیتی سینی کوردی کۆن ئەمڕۆ لە کوردی سنەیی و کرماشانی‌دا بووە بە «ش» وەکوو «مەلەك شان» نزیکی سنە. خودی شاری کرماشان لە پێشدا «کرمان سان» بە «س»دا بێژ کراوە بەڵگە بۆ ئەمە ئەوەیە کە لە سەردەمی ئیسلامدا جوغرافی نووسانی عەرەب تەعریبیان کردووە بە «قرماسین» یان قرمەسین. سێن و سان دوو دابێژە لە یەك وشە. لە ئەوێستاش بەشی گاساکاندا سانە وەکوو سێنگهە هەر بەو مانا هاتوو. «ئەنگهە» و «ە» بە یەك دەگوڕدرێن. وەك لە هەورامی و ئەوێستایی‌دا «نمە» بە مانای نوێژە. لە ئەوێستادا دابێژی‌تری «نمە» «نمەنگهە» ە. جا سانەو سێنە هەر دوو بە مانای فەرمانڕەوایە. پیتی «ێ» و «ا» لە کوردی و ئەوێستایی‌دا دوو دابێژن لە یەك پیت وەك لە کوردیدا «خودا، خودێ» «ماردین، مێردین» «ئێستا، ئیستێ» و... جا کرمان سان کە نوونەکەی بە بۆنەی بزوینی درێژی پێش خوی داکەوتووە بە مانای شای کرمانە کە نازناوی بەهرامی چوارەمی ساسانی بناغەدانەری ئەم شارەیە. وەرگێڕاوەی ئەوە بە فارسی واتە کرمانشاە بە تەواوی دروستە (لە فارسیدا نوونەکە

هێشتا هەر ماوە). سینەکەی لە بواری زەماندا بووە بە «ش» وەك کێوی «توش نەوزەر» لە سنەدا کە لە پێشدا و لە ناو قەبالە کۆنەکاندا «تووس نەووەر»ە. لە ئەوێستادا «تووسوونەئۆتەرە» واتە تووس لە ماڵباتی نەوزەر.

٢ـ وشەی جیهان تەعریب کراوی «گێهان» ی پەهلەوی و کوردیە. لە فارسی‌دا بووە بە «گێهان» گیهان لە هەڵبەستە کوردیەکانی باوەتایەری هەمەدانیدا هەیە:

یا گێم دورِ دی هەنی زەریە نەوی یار ـ یا گێم خوەردی گێهان پەیدە نەوی یار، کە باس کرا. گێهان لە ئەوێستادا «گە ئێسیە» (بەسینی نووك دیانی کە پیتێکی جیاواز لە «س»ە).

٣ـ ب.ب روون کراوەکانی بەشی یەکەم.

٤ـ مانی لە سەدەی سێی زایینی لە زەمانی «شاپوور» شای دووهەمی ساسانی وەکوو پێغەمبەر خۆی ناساند و ئاینێکی دووانەپەرستی هێنا. هۆگری زۆری پەیدا کرد بەڵام لە ڕەشە کوژیەکی مەزندا کوژراو هەندێ لە هۆگرانی بۆ ئاسیای ناوەندی و چین هەڵاتن و لەوێ ئاینەکەی هەندێ پەرەی‌سەند.

کتێبەکانی بە وێنەگەری جوانەوە پێشکەش دەکرد لە گشت گرینگتر کتێبی «ئەرتەنگ» یان بە فارسی ئەمرۆ و «ئەرژەنگ»ە کە نەماوە. تا سەدەی سێ و چواری کۆچیش بە شاراوەیی دەژیان و نووسەرە عەرەبەکان وەکوو ئیبنی نەدیم سەبارەت بەوان شتیان نووسیوە. ئیلاهییاتی ئەو بە کورتی ئەمەیە: ئەهوورامەزدا و ئەهریمەن یەکێ فەرمانرەوای جیهانی ڕۆشنی و ئەوی دی فەرمانرەوای جیهانی تاریکی لە «قەدیم»ەوە جوێ لەیەك دەژیان. تا ئەهریمەن بە بەشێ لە جیهانی ئەهوورامەزدا دەس درێژی کرد. لەو بەشەدا تیشك و تاریکی تێکەڵاو بوون و جیهانی ماکی ئێستای لێ دروست کرا. تۆزقاڵگەلی نوور کە وەکوو ڕۆح و گیانە دەبێ بەڕیازەت و پارێز خۆیان لە تاریکی ڕزگار کەن تا بۆ جیهانی ئەهوورامەزدا بگەڕێنەوە. ئێستا لە جیهانی ماکی‌دا ئەهریمەن واتە شەیتان حاکمە تا زەمانێ کە ئەم تێکەڵاویە دوایی پێ دێت. مانی دینی دوانەپەرستی واتە سەنەوییەتی هێنا. لەگەڵ ئاینە کوردیەکان کە تاكپەرستیە جیاوازی گرینگی هەیە.

٥ـ لە گۆڤاری «تاڤگە» گۆڤاری ناوەندی هەنجەمەنی مەولەوی کوردی سنە لە نەوەدەکاندا و تارێکم نووسیوە کە لەوەدا هەڵەی ئەدەبیە گەورەکانی ئێرانیم وەکوو میهردادی بەهار ـ ئەدیب تووسی ـ موورادی ئەورەنگ و پەروێز ئەزکایی سەبارەت بە واتاکردنی بیست و پێنج بەیتی شێعرە

ڕاستەقینەکانی باوەتاهیرم ئاماژە پێ کرد. ئەم بیست و پێنج بەیتە لە مـوزەخانـەی قوونیـە لـە تورکیا لە لایەن مێژوونووسی ئێرانی «موجتەبا مینەوەی»وە دەرهێنراو و بڵاوکـراوە. دوو بـەیـتی ئەوەیە کە پێشکەش کرا. لێرەدا زۆر بە کورتی بە چەند خاڵی ئەو وتارە ئامـاژە دەکـەم. شـارامی ڕەجەب زادە لە کتێبـی ترانەهای باباتاهر و پژوەشی نو...»دا هێناویەتی

الف) کۆنترین سەرچاوەیەك کە بە باوەتـاهیر ئامـاژەی کـردووە «راحـةالصـدور و آیـة السـرور»ی «ڕاوەندی»ە کە سەدساڵ پاش باوەتاهیر ژیاوە و لەو کتێبەدا ئامـاژە بـە هـەمـدیتنی «تـوغرول» یەکەم شای سەلجووقی لەگەڵ باوەتاهیر دەکات. دیارە باوەتاهیر لە سـاڵی ٤٧٧ی کۆچـیدا زینـدوو بووە و وەکوو سۆفی و عارفێکی گەورە (نەك شاعیر) ناوی هەیە.

ب) پێش ساڵی ٨٤٨ واتە چوار سەدسـاڵ پـاش بـاوەتـاهیر لـە هـیچ تـەزکـەرە و ژیاننامـەی شاعیرگەلدا هیچ ئاماژەیەك بە باوەتاهیری شاعیر نەکراوە. جگە لەو بیست و پێنج بەیتـە کـە دوو پارچە شیعری سێ بەیتی و شەش بەیتی و هەشت چوارینەیە، باقی شیعرەکان ٦٠٠ تا ٩٠٠ سـاڵ پاش شاعیر بەو نیسبەت دراون. بەتایبەت لە سەدەی یازدەی کۆچی لە زەمانی سـەفـەویـەکانـدا چوارینەی نیسبەت دراو بە ئەو زۆر دەبێتەوە. شیعرەکانی باوەتاهیر کراون بە سێ بەشـەوە ئـەلـف: بیست و پێنج بەیتی کون (ئەمانە کە چوارینەیەکی پێشکەش کرا کە هەورامی یان هەورامـی و لەکی تێکەڵاون. لەکیش یەکی لە زاراوە گرینگەکانی کوردیە و بە هەورامی و کەلهوڕی نزیکـە و لەگەڵ لوڕی جیاوازی هەیە).

ب: سی و سێ چوارینە هەن کە هی شاعیرگەلی فارسە کە نەختێ لەهجەکەیان گۆڕیوە و وەکوو شیعری باوەتاهیر لە قەڵەم دراوە.

ج: ٣٤٢ چوارینەی نەناسراو هەیە کە هەر چەند هەندێکی کوردیە و هـەندێکیشـی کـوردی و فارسی تێکەڵاوە زۆر جێگای گومانە.

چون ڕاست کردنەوەی هەڵەکانی ئەو ئەدیبگەلە جێگای زۆر دەگرێ لێرەدا ئاماژەیان پێ ناکەین هیوادارم لە گۆڤارێکدا بەڵاوی کەمەوە.

٦ـ ئەروا کوردی هـەورامـی ـ ئـووروە ئـەوێسـتایی. ڕەوان فارسـی بـە مـانـای ڕۆح. پەهلـەوی «ئووروەن».

٧ـ وتارێکم سەبارەت بە پیرشالیار بۆ دوستێکم هەنـارد. لـەوەدا سـەلماندوومـە کـە پیرشـالیار زەردەشتی نەبووە و لەسەر ئاینی میهرپەرستی بووە کە پاشان بە هەندێ گۆڕان کاری لە پـەراوێزدا

بووبە ئێزدی و کاکەیی. قوربانی کردنی گا لە زەردەشتیدا حەرامە. زەردەشت لە گاساکاندا بە توندی بە گژ ئەم نەریتەدا چووە. هیوادارم ئەو وتارە لە گۆڤارێکدا بڵاوکەمەوە.

٨ ـ یەشت لە ئەوێستادا «یەشتە» بە مانای ئەو وتە گەلەیە کە سفەتی ستایشتیان هەیە. یەشتەکان بەشێ لە ئەوێستای دواییىن کە لەوانەدا پیرۆزەکانی زەردەشتی ستایشت دەکرین. یەشتە (یەز + تە) هەر دوو لە ڕوون کراوەکانی بەشی یەکەمدا باس کراون یەشت بە گشتی بە مانای ستایشتە.

٩ـ لە ئەویستادا «ئە + مێشا + سپێنتا» واتە نەمرانی پیرۆز و پاك ئەو دوو ئەلفە وەکوو کوردی کرمانجی و هەورامی نیشانەی کۆیە. شەش هێز یان سفەتی ئەهوورامەزدان کە بە یارمەتی ئەوانە گێهان دەگەڕێنێت. بە دابێژی ئەوێستایی و ئێستا بریتین لە:

وهوومەنە (بەهمەن). ئەشەوە هیشتە (ئوردی بەهەشت). هەتور وەتات (خورداد). ئەمێرەتات (ئەمورداد ـ مورداد). خشتەترە وەئیری (شەهریوەر). سپێنت ئارمەئیتی (ئەسفەند ـ ئسفەند)

ماناکانیان بەڕێز بریتین لە، هزرو فیکری چاك. چاکترین پیرۆزی و پارسایی. هەر شتی (شموول). بێمەرگی. توان و دەسەڵات. ئارامی و گوێڕایەڵی پیرۆز و پاك

١٠ـ لە ئەوێستادا «کیرنتە (بە، ی، سووك) پیتەختی زەحاکە. ئێستا دەڵێن کرند.

١١ـ گاوارە ناوی ڕەسەنی کوردی مینۆرسکی بە گاوبارەی زانیوە لە فارسیدا کردوویانە بە گەهوارە بە مانای لانك و بێشکە! کرند و گاوارە لە ناوچەی قەڵخانیدان.

١٢ـ سەهەنە وشەی هەورامی (سەد هەنە بە دالی موەمەلە) واتە سەدکانی. لە لای ئەم شارەوە کانی و تاڤگە زۆرە. «سەهەنەدژ» ناوی کۆنی «سنە»یشە. ئەم ناوە «بە لازەری» گەشتیاری عەرەب وەکوو پەهلەویەکەی (سەدخانی) هێناویەتی. (فتوروحولبولدان. یەحیا کوڕی جابری بەلازەری. وەرگێڕ بە فارسی دوکتور موحەمەدی تەوەککول) زۆر مێژوونووس و جوغرافی نووسانی سەردەمی ئیسلام بە شاری «سیسەر» ئاماژەیان کردووە. بەلازەری دەنووسێ لە ١٢ فرسەقی باکووری ڕۆژاوای دینەوەردایە. ئەمن بۆ یەکەم جار جێگای ڕاستەقینەی سیسەرم کە لە جێگای گوندی ئێستای «سیس» نزیکی شاری سنەدا بووە دوزیەوە و لە گۆڤاری «ئاوێنە» ژمارە نۆ ساڵی ١٣٧٠ (١٩٩١) چاپی ئارارندا نووسی. ئەو زەمانەز بیروڕای نازانستیم لە سەر شاری سنە بوو لە بناغەی «سانە»ی هەورامی و ئەوێستاییم دەزانی.

کەنگاوەر، فارسی کراوی کەنگەوەری کوردی هەورامیە. هەروا کە لە ژمارەگەلی پێشوودا وتوومە زۆربەی ناوە جوغرافیاییەکانی نێوان کرماشان و هەمەدان و سنەو هەمەدان هەورامین کەنگەی کوردی و «کەندەك»ی پەهلەوی تەعریب کراوە بە خەندق. بەشی دووهەمی ئەم وشە «وەر» پاشگری هەورامیە وەك لە هەورامان بەشی رۆژهەلاتدا هەمانە پردیوەر، دەریوەر، و تەنگیوەرو... ئەم پاشگرە لە سورانیدا «وار» و «بار» وەك دەڵێن زرێوار زێبار.

١٣ـ بەهار کوردی جەژنێکە کە کوردەکانی «ناو دەروەن» و مایی دەشت لە ناوڕاستی مانگی زستاندا دەیگرن. ئەم رێکەوتە بەرانبەرە لەگەڵ جەژنی پیرشالیار لە گوندی «شارەورامان»دا، چلەی زایینی میترایە.

١٤ـ «تەقیە» لە میهرپەرستی و ئاینە کوردیەکان و شیعەدا هەیە. بە واتای شاردنەوەی هەندێ بیروباوەڕی دینیە تا لە زەبری دوژمن خۆ بپارێزن.

١٥ـ سیمورغ کە لە زمانی ئێمەدا پەلەوەرێکی ئوستوورەییە فارسی کراوی وشەی پەهلەوی «سێن مورڤ»ە. سێن لە ئەوێستادا «سەئێنە»یە. لە کوردیدا شەهێن و لە فارسیدا شاهین لەم بناغەیە. لە کوردیدا وەکوو «سایێن»یش لە وشەی بازێری «سایێن قەلا»دا کە بە فارسی گوردراوە بە شاهین دژ هەیە.

لە بەشی سوهرەوەردیدا زۆرتر باسی دەکەین. سیمورغ کە نیشانەی خۆرە هەفتەمین پلەی برینی بە خودا گەیشتنە لە ئاینی میهرپەرستیدا. ئەم پەلەوەرە وەکوو «شاباز» لە ئەدەبی کاکەییدا زۆر ناوی هاتووە.

١٦ ـ ١٧ـ ئەگەر جێگای هەلاتنی خۆر لە یەکەم رۆژی هاوین و یەکەم رۆژی زستاندا دیاری کەین و وەکوو دووهێڵی مەوازی لە رۆژهەلاتەوە بۆ رۆژاوا دەوری زەوی بداتەوە نەوارێك وەکوو جەغز بە دەست دێت کە پێ دەڵێن دایرەی مەنتەقەتولبرووج. خۆر و مانگ و پێنج ئەستێرەی گەرۆك هەمیشە لەم نەوارەدا هەڵدێن و لە رۆژاوادا دەنیشن. ئەم دایرە کراوە بە دوانزە بەشەوە بە هەرکام دەڵێن بورج. ئەستێرەگەلی ناو هەر بورج بە رواڵەت لە شتێك دەچێ کە بەو شتەوە ناونراون وەك بورجی دووپشك کەوان ـ ماسی ـ بەرخ ـ گا، تەرازوو و....

١٨ و ١٩. ئەم دوو نهۆمە لە نیوان زەوی و ئاسمانی یەکەم واتە ئاسمانی مانگدا بووە. نهۆمی یەکەم بە مانای سارد و سەرما و نهۆمی دووهەم لێرەدا بە مانای گەرمە.

٢٠ـ شاهنامە بە مانای خودا نامەیە. لە ئاینە کوردیەکاندا بە خودا «شا»یش دەڵێن: فیردەوسی شاهنامەکەی خوی لە خودا نامەکانی پەهلەوی وەرگێڕاوەتەوە. شا بە دابێژی هەرەکۆن خشائیسیە (بەسینی نووك دیانی کە زۆر دەگوردری بە «ه») لە بناغەی «خشی» ئەویستانی و «شی» کوردی. بە مانای هێز و توانین. لە ئەوێستادا جگە لە توانین مانای دەسەڵاتیشی هەیە. لە کرمانجی‌دا دەڵێن «ئەز دشێم» واتە من دەتوانم لە پەهەویدا «خشاه» لە کوردیدا شا، هەرخشائیسیەی کۆنە بە واتای شاو خاوەن دەسەلات.

٢١ـ دیوان لێرەدا مەبەست دەرباری شایە. دیوان لە پەهلەویدا «دیپی وان» یان دیویوان لە بناغەدا دوو وشەیە «دیپ یان دیو یان دەڤ یان دیب» وشەی سوومریە کە هاتۆتە نێو زمانی عیلامی پاشان هاتۆتە نیو زمانی ئێرانیەکانەوە. بە مانای نووسینە. دیوان بە دەفتەر و دەزگای حکوومەتی و بە کتێبی شاعیرانیش گوتراوە بە گشتی بەو جێگایە دەڵێن کە نووسراوەی تێدایە. وشەی دەفتر و دەبیر (نووسەر) و دەبستان و دەڤستان (لە کرمانجیدا) و دەبیرستان لەم بناغەیە. سازی ئاینی کوردان «تەنموورە» کە نوونەکەی داکەوتوەو ئەمرۆ دەڵێن تەمموورە لە کوردستانی باکوورە چوو بۆ رۆم (ئەنادۆلی ئێستا) و «نوت» یان بۆ نووسی. چون بە نوتی نووسراوە لێ دەدرا کوردەکان پێیان گوت «دیوان» واتە ئەو سازەی کە بە نوتی نووسراوە لێ دەدرێ. ئەو کەسانەی کە لەمیدیاکاندا دەڵێن دیوان سازێکی تورکیە دەبێ بزانن زۆرتر لە هەزار ساڵ پێش هێرشی تورکان بۆ رۆم و بە تورکی بوونی زمانی رۆمی پاش رووخانی کونستانتینیا (ئەستەنبول) بە دەس تورکەکانی عوسمانی ئەم سازە لە نێو کوردەکاندا هەبووە و لە ستایشتگا میترایی و ئێزدیەکاندا لێ دراوە. موسیقای تورکی ئەمرۆ جگە لە موسیقای عەرەبی و کوردی و ئەوروپایی یان تێکەڵ کراوی ئەمانە شتێکی‌تر نیە. ئارییاییەکان کە کۆچیان کرد بۆ ئێران نووسینیان نەبوو. وشەی «دیپ»یان بۆ نوسین لە عیلامیەکانەوە گرت و بۆ نووسینی سەرپێست بە کاریان هێنا.

چەشنێ نووسینی سەر بەرد هەبوو کە بۆ ئەوە وشەی ئارییایی «نی‌پەش» یان بۆ دانا. پەش بە مانای هەڵ تۆقینە. لە کوردی لەکی و کەلەوری و جافی‌دا دەڵێن «پەشام» واتە ماسین و هەڵ تۆقین. «نی» پێشگرێکە کە مانای پێشگری «دا»ی کوردی هەیە. بە گشتی بە مانای دا کرانەدن بۆ بەرجەستەکردنی وشەیە. «نی‌ڤیس»ی کرمانجی و «نووس»ی زاراوەکانی‌تر لەم بناغە هاتووە. لە پەهلەویدا «نی‌ڤەش» و لە فارسیدا «نقشتەن»ە. نی پەش لە بەرد نووسراوەی بێستووندا هاتووە.

بۆ ئەوە بە مانای ڕاستەقینەی مەلەك تاوس و باوەڕی تەوحیدی کوردان پەی بەرین دەبێ بزانین کە کوردگەل بۆ دەربڕینی باوەڕەکانیان لە زانستگەلی زەمانەی خۆیان و لە چیرۆك کەلکیان وەرگرتووە. ئەم چیرۆك‌گەلە وەکوو بەیت بە دەنگی بەرز خوێنراونەتەوە بۆ ئەمەیە کە پێیان دەگوترێ «چریکە»، ئەو کەسەی کە دەیخوێنێتەوە پێ دەڵێن «چڕگەر». چریکەی مەم و زین واتە فۆنکلۆرەکەی بە هەندێ گۆڕان لە بواری زەماندا هەرماوە و پاش مەم و زینی ئەحمەدی خانی شرۆڤە دەکرێت، خوێنەری بەڕێز تێ دەگات کە ئەم چیرۆکە لە پێش ئیسلام ماوەتەوە و لەسەر باغەی تەوحیدی میترایی (دینی پێش ئیسلامی کوردان) وتراوە. لە وتارێکدا لە گۆڤاری «سروە» ژمارە ٩٢ ڕەشەمەی ١٣٧٢ (١٩٩٣ز) بۆ یەکەم جار لە میترایی بوونی ئەم بەرهەمە قسەم کرد و ئاماژەم بەوە کرد کە ئەحمەدی خانی بەسەرهاتی سوهرەوەردی کورد و «مەنسووری هەلاج»ی لە پێش چاو بووە و لە توانجی نووڕپەرستی و تەکفیر ترساوە و لە هەندێ جێگادا کە ڕوون دەکرێتەوە دەس دەباتە بەر ئاماژە و دەس بە گۆچان ڕویشتن.

ئەم چیرۆکە بە ناوەکەیدا دیارەکەهی زۆر پێش ئیسلام و سەردەمی باوبوونی زمانی ئەوێستاییە. زمانی ئەوێستایی‌دایکی زمانی کوردی و پەهلەویە. ئەمە لە بەرهەمێکی‌ترمدا (وەرگێڕان و شرۆڤەی گاثاکان) داسەلمێنراوە

مەم لە کوردیدا و «مەذەم» لە ئەوێستایی‌دا بە مانای «مەست»ە. مەذە + م، مەذە لە ئەوێستادا بە مانای «مەی» واتە خواردنەوەی مەستی هێنەرە و «م» چەشنێ نیشانەی ئاوەڵناوی بەرکارە. مەذەم واتە مەی لێ دراو، مەست، خەیاڵ.

دەزانین لە کوردیدا پیتی «د» و «ذ» دەسوێ وەکوو «دەلیم و ئەلیم» یان «قەرەداغ» کە خەڵکی ناوچەی سلیمانی و عەرەبەت کردوویانە بە «قەراخ». «زین» لە ئەوێستادا «زینی» یان بە قاعیدەی نووسینی ئەوێستایی «زەئینی» بە مانای «هۆشیار»ە. «ی» ئاخری زینی نیشانەی مێیە و ئەمڕۆ لە کوردی کرمانجی‌دا وەکوو «ێ» بە کار دەچێت و چون باسی زۆر هەڵدەگرێت لێ دەگەڕێین. زینی لە دۆخی نێری‌دا دەبی بە «زینە» یا زەئینە واتە پیاوی هوشیار. زۆر «ی» نیشانەی دۆخی مێ لە کوردی ئەمڕۆدا دابێژ ناکرێ وەکوو وشەی ئەوێستایی «ئافرەتی» یان بە

قاعیدەی نووسینی ئەوێستایی «ئافرەئیتی» کە ئەمڕۆ ئافرەتی لە کوردیدا بووە بە «ئافرەت» بە وردی مانای «موحتەرەمە»ی عەرەبی دەگەیەنێت. لە بناغەی «فری» هیند و ئەورووپایی بە مانای خۆشویستن و دۆست بوونە. بە پێشگری «ئا»وە مانای رێز و ئیحترامی هەیە. ئافرەتی لە دۆخی نێری‌دا دەبێ بە «ئافرەوەنت» واتە پیاوی بەرێز. وشەی «ئافەرین»یش لە کوردی و فارسیدا هەر لەم بناغەیە. جا مەم و زین لە زمانی ئەوێستایی (زبانی مادەکان)دا دەبێ بە «مەهذەم ئووتا زەئینی». «ئووتا» لە پەهلەوی چەند سەدە پێش ئیسلامدا سواوە بە «ئوود» لە کوردی کرمانجی‌دا بە قاعیدەی کوردی، دالەکەی داکەوتووە (وەك مەحموود= مەحموو) و بووە بە «ئوو» لە سۆرانی و زاراوەکانی دیکەدا «وو» وەك دەڵێن «مەم و زین». بە مانای مەم و زین بۆیە کەم جار لە وتاری نوستووڕەناسی کوردی لە گۆڤاری «ئاینده ژمارە ٣٩ ساڵی ٢٠٠٢دا ئاماژەم کردووە.

مەم و زین کە بە مانای مەست و هۆشیارە زۆر بە جێگا هەڵبژێردراوە. لە مەم و زینی فولکلۆردا پیاو و ژنێکی‌تری ئەویندارییەك هەن بە ناوی «بەنگینە» و «ئەستی» کە لە مەم و زینی خانی‌دا «تاژدین و ستی»یە. «بەنگینە و ستی»یش هەردوو ناوی ئەوێستاییە. بەنگینە ناوی پیاوە، لە بناغەی «بەنگهە» لە ئەوێستادا هەیە لە کوردی و فارسی ئەمرۆدا دەڵێن «بەنگ» کە لە گەڵای گیای «شادانە» درووس دەکرێ و دەیکێشن و مرۆڤ گێج و مەنگ دەکا. لە عەرەبیدا بە بەنگ «حەشیش» دەڵێن. جا بەنگینە (بەنگ+ینە) هەر بە مانای مەنگ و مەستە. پاشگری «ینە» لە کوردی ئەمرۆدا زۆرە وەکوو دەڵێن زێرینە ـ دارینە و... «ئەستی» (ئەهـ+تی) دۆخی مێیە بە مانای عەرەبی «مەوجوود» و مەبەستمرۆڤی لەسەرخۆیە. ئەوەی کە وجوودی خۆی هەست دەکا. ئەستی لە سانسکریتیش‌دا هەر ئەم مانای هەیە.

لە دۆخی نێری‌دا دەبێ بە ئەستە (ئەهـ+تە) واتە پیاوی لەسەر خۆو هوشیار. جا «بەنگینەو ستی»ش هەر بە مانای مەست و هۆشیارە کە زۆر بە جێ هەڵبژێردراوە.

**چیرۆکی مەم و زینی ئەحمەدی خانی بە کورتی و شرۆڤەی ئەوە**

لە سەرەتاکاندا لە پێشدا ستایشتی خودایە. ئەم ستایشتانە ٣٦ بەیتە کە خانی تێدا دەڵێ:

... موتلەق تومونید و موستەفا دی | بێ‌شوبەھ مورید و هەم مواردی
نووری تو، دحوسن رووی دڵدار | ناری تو، دقەلبێ عاشقێ زار
شەمعی، نەژقسم نوور و ناری | شەمسی نە عەیان، توپەردەداری

خانی خودا وەکوو ئاگری ئەوین لە دڵدا و جوانی ڕووی ئازیز و وەکوو خۆری شاراوە (بە وتەی سەهرەوەردی «نووری جەوهەری») وەسف دەکات. پاشان پەسن و سپاسی خودایە لە ٥٧ بەیتدا. لەوەدا وەکوو سوهرەوەردی کورد ئاماژەی بە نۆ ئاسمانە:

ئەڤ «نەهـ» سەدەفێد پڕمراری دوڕڕێد سپی شەوێ دتاری

لەم بەیتانەدا باسی «وەحدەتی وجوود» هەیە واتە تەجەللای خودا لە جیهان لە خراپ و چاکدا:

... فیلجوملە چ ئەووەل و چ ئاخر ئەلقیسە چ موئمن و چ کافر

هەر یەك ژتەرا وەبوونە مەزهەر ئەڤ ڕەنگ، دوان تو بوویی موزمەر

واتە ئەی خودا هەوەڵ و ئاخر، باوەڕمەند و کافر هەرکام بوون بە مەزهەری تۆ و ئاوەها تۆ ئەواندا شاردراوەی.

حوسناتەیە زینەتا حەبیبان ڕەشکاتەیە غیرەتا ڕەقیبان

مەیلاتەیە عاشقان دکێشیت دەردێ تەیە دل ژبەر دئێشیت

واتە ئەی خودا جوانی تۆیە زینەتی ڕووی نازاران و ڕق و حەسەدی تۆیە بوەتە غیرەتی بەرهەڵستکارانی عاشقان. ئەوە مەیلی تۆیە عاشقان دەکێشێت و دەردی تۆیە کە دڵی ئەویندار لە بەری دەئێشێت...

شێخی سەنعان کە پەنجا حەجی کردبوو تۆ شێتت کرد بۆ کچی کافر واتە شێخی سەنعان جوانی تۆی لە ڕووی کچی کافرادی و ئەویندار بوو... واتە خودا هەم سەرچاوەی کوفرە هەم ئیمان. خانی لەم سپاسنامەدا بۆ دەربڕینی وەحدەتی وجوود باسی شێوەی تووتی گرتنی هیندیەکان دەکات. ئەوان ئاوێنەیەك کە لە ژێریدا داودایە لە جێگای چینەی تووتی دادەنێن. تووتی وادەزانێ ئاوە و خۆی دەخاتە سەری و دەکەوێتە داو. خانی دەڵێ:

نەقشی تەدبینن ئەو دئاڤێ ناکەن حەزەرێ ژئاڤ و داڤێ

واتە ای خودا تووتیەکان نەقش و سیمای تۆ لە ئاودا دەبینن بویە ناترسن و خۆیان دەخەنە ناوداو (واتە تووتی خۆی کە لە ڕاستیدا کاردانەوەی تۆیە لە ئاودا دەبینێ و خۆی دەخاتە داو).

سەبارەت بە ئیبلیس واتە شەیتان دەڵێ:

وی سوجدە نەکر، ل غەیری مەعبوود گێڕا تەژ بەر، دەرێ خوەمەردوود

واتە شەیتان جگە لە تو سوجدەی لە کەسیتر نەبرد بۆیە تۆ لە دەرگای خۆت دەرت کرد. مەبەست ئەوەیە کە شەیتان نەیتوانی ویست و جوانی خودا لە ئادەمدا ببینێ. جا نەتەنیا ئادەم بەڵکوو هەرچی لە جیهاندایە شیاوی سوجدە بردنە چون مەزهەری زات و سیفاتی خودایە.

پاشان خانی لە ٦٧ بەیتدا پەسنی حەزرەتی موحەمەد (س ـ خ) دەکات. لێرەشدا خانی هەر هۆنراوکانی وەحدەتی وجوودیەو بە جوانی لەم دەسمایە کەڵك وەردەگرێ:

ئەشیا، ب حەسەب دەلیل و بورهان — نابن چو مەگەر «وجووب» و «ئیمکان»

واتە شتگەل بە دلیل و بەڵگە — هیچ نین مەگەر واجیب و مومکین

واجب یەکە زاتی کیبریایە — مومکین پڕە جەمعی ماسیوایە

واتە واجبولوجوود تەنیا خودایە — مومکینولوجوود زۆرە و هەرچی جگە لە

یەعنی ئەوی دێ ببت موبەرهین — حوسناوی بدەرکەفت ژمومکین

واتە ئەوەی کە ئاشکرا دەبێت ئەوەیە کە جوانی خودا لە مومکینگەلدا دەردەکەوێت. مەخلووق و تایبەتمەندیگەلی هەر تەجەللای خودایە لە دینە کوردیەکاندا باسمان کرد...

ئەڤ ئەووەل و ڕووح و عەقل ئەووەل — هەرسێنە ب ئەووەلی موئەووەل....

خانی دەڵی خودا ئەووەڵ بوو پاشان ڕۆح و عەقڵی لێ دەرکەوت بەڵام خودا و ڕۆح و عەقل بە سێ شت مەزانە هەر یەك شتە. لەم شتە تروسکێك دەرکەوت و موحەممەد (د ـ خ) بەدی هات.

هێژا، نە زەمین نە ئەڤ سەمابوو — ئەو سەروەرێ جوملە ئەنبیا بوو

واتە هێشتا نە زەوی و نە ئاسمان بوو کە موحەمەد سەرەوری گشت پێغەمبەران بوو. ئەم بەیتە بیرهێنەرەوەی شیعرە تەوحیدیەکەی باوە تایەرە کە باسمان کرد.

باسی دیکەی سەرەتا داخوازی شیفاعەتە لە حەزرەتی موحەممەد (د ـ خ) لەم شفاعەتخوازیەدا دەڵێ....

کەس نینە ژ کافر و عوساتان — مەزهەر نەبتن ژ بۆ سیفاتان

کافر بوویین ئەم ب ئیسمی قەهار — غەففارە کو ئەم کرن گونەهکار

واته کەس لە کافر و عاسی نیە کە جێگای دەرکەوتنی سیفاتی خودا نەبن. ئەگەر کافرین هەر سیفەتی قەهری خودایە و ئەگەریش گوناهکارین لە سیفەتی بەخشندەیی خوداوە سەرچاوە دەگرێ. لەمە باشتر باسی خودا یان مەلەکە تاوس ناکرێ.

لە سەرەتاکاندا باسی ئازایەتی و ڕۆژ ڕەشی کوردان دەکات چون سەبارەت بەمە زۆر نووسراوە لێ دەگەڕێین. باسی‌تر لە سەرەتاکاندا هۆی هۆنینەوەی پەرتووکەکەی بە کوردی کرمانجیە.

سەبارەت بەمەش زۆر نووسراوە و بەداخەوە هەرکەس لەسەر مەم و زینی خانی نووسیوە تەنیا باسی نەتەوە پەروەری ئەوی هێناوە بەڵام بەداخەوە بەمە ئاماژە نەکراوە کە خانی یەکێ لە بێوێنەترین و جوانترین چیرۆکی عیرفانی فەلسەفی جیهانی بە کوردی داناوە، ئەمەیە ئەوپەڕی خۆشەویستی نەتەوە. دیسان بەداخەوە لە وەرگێڕانی مەم و زین بە زمانگەلی ئورووپێیدا پەیامی عیرفانی و فەلسەفی ئەم چیرۆکە هەست پێ نەکراوە و ئەم چیرۆکەیان تەنیا وەکوو چیرۆکێکی ئەویندارانە زانیوە. فیلمەسینەماییەکەیشی هەروایە.

پێش دەس پێکردنی چیرۆکەکە خانی ساقی نامەیەکی هەرە جوانی هەیە. ئەم مەیگێڕنامە بە تەواوی لەسەر ئاینی میهریە و لەبەشی جام و مانگ و شەراب و هۆمدا دەگەڕینەوە و لەسەری باس دەکەین.

لە دەستپێکی چیرۆکەکە لە ٦٤ بەیتدا پەسنی «میری بۆتان» واتە میر زینەدین دەکات...

پاشان دەڵێ میر زینەدین دوو خوشکی هەبوو:

| | |
|---|---|
| ئەو حوور و پەری پێ بێ بەدەل بوون | لەورا کوژنوور «لەم یە زەل» بوون |

واتە ئەو حۆر و پەریە هاوتایان نەبوو چونکوو لە نووری خودا درووس کرا بوون ....

پاش پەسنی زۆری جوانی ئەو دووە، دەڵێ مرۆڤ دوو جۆر ئەویندارییان هەیە:

| | |
|---|---|
| هن راغبی حوسن لایە زالن | هن تالبی قالبێ بەتالن |
| لاکین هەمیان یەکە یەقین دۆست | فەرقا کو هەیە ژمەغز تا پۆست |

واتە هەندێ مەیلیان لەسەر جوانی تەواو نەهاتووی خودان و هەندێکیش خوازیاری جەستەی هیچ و بە تاڵن بەڵام هەر دوو (جوانی خودا و جەستە) یەکن بەڵام یەکێکی کاکڵی دەوێ و ئەوی دی پێست هەڵدەبژێرێ.

باسی‌تر سەبارەت بە دۆستی مەم و تاجدینە (لە مەم و زینی فولکلوردا «تاژدین» هاتووە کەرەسەنترە) لە قەڵاو کوشکی میردا لاوی ئازا و جوان و بەهێز و پاڵەوان زۆر بوون کە خوازیاری

زین و ستی بوون بەڵام دوو لاوی دیکە هەبوون: تاجدین دگووتنێ، جەوانەك + گـۆدەرزی[٢] زەمانـە پەهلەوانەك

باپیرانی تاجدین لەسەردەفتەرانی دەرباری میربوون و باوکی وەزیر بوو.

تاجدین دووبرای لێهاتووی هەبوو کە ناویان عارف و چەکۆ بوو. (لە مەم و زینی فولکلوردا بـە جێگای عارف «عەرفۆ») هاتووە.

تاجدین دوستێکی زۆر خۆشەویست و بە ئەمەگی هەبوو بە ناوی «مەم» کە بێ یـەك گیانیـان نەبوو. تاجدین کوڕی وەزیر و مەم کوڕی دەبیر واتە نووسـەر و دەفتـەرداری دیـوانی مـیر زینـەدین بوون.

## باسیتر سەبارەت بە جەژنی نەورۆزە و
## لێرەوە چیرۆکەکە دەس پێدەکات:

لە ڕۆژی نەورۆزدا خەڵك بە تەواوی ڕوویان دەکردە دەشت و باخ و چیا. لەو گەشتەدا کوڕ و کچ بە دابی شەریعەت و نەریتی کۆن یەکیان دەدی. ڕۆژی نەورۆز هەموو چوونە دەرەوەی شار بەڵام بە پێچەوانەی نەریت مەم و تاجدین بە جل و بەرگی کچانەوە دەچنە دەرێ تا بتوانن بە چاکی بۆ هەر کەس بڕوانن. ئەوان سەدان لاو و پیرو نێر و مێ و گەورە و بچووك و گەدا و دەولەمەندیان دی کە هەندێ سەرخۆش و خامۆش و هەندێ بە هاوار و دەنگەوە و هەندێ وەکوو شێت و جەرگ بڕاو دەهاتن.

سەریان سوورما. تاجدین پرسی ئەوە چیە؟ مەم گوتی دوو کوڕی هەرە جوانکیلە هەن کە بوون بە کوشندەی خەڵك. لەم قسەدا بوون کە دیان دوو کوڕ وەکوو دوو پەیکەر لە خۆر دەرکەوتن.

ئەو هەر دوو پسەر[4] وەکی دو پەیکەر ـ تا بەندە بە شکلی شاهی ئەختەر (خۆر).

هەر کە دیان دڵ و گیانیان دانا و هزر و عەقڵیان پەڕی. عەشق هات. ئەوەی کە ڕێگای ئاشنایی دەکاتەوە، گیانەکانی جیا لە یەك نەئافراندووە....

دەتگوت ئەو چوار کەسە هەر یەك کەسن. چ جەستە و چ گیان، چ خوازیار و خواستوو بێگومان هەریەکە. خۆشەویستی و قین کە لە دڵ دایە و بە لای ئێمەوە بەدیهاتن و لە نێو چوونیان هەیە بەڵام لە ڕاستیدا هەتا هەتایین: (مەلەك تاوسە).

| | |
|---|---|
| بێشوبەهـ یەکن چ تەن چ ئەرواح | ئەو موتتەحیدن چ جان چ ئەشباح |
| حوببا، ددلان وەکر حەلاوەت | بو غزا ددلان وەکر عەداوەت |
| نیسبەت بەحادسن عەدەمن | لاکین ژحەقیقەتەن «قەدیم»ن |

(لە دینە کوردیەکاندا ئەو شتە کە تەجەللای زاتە ناچار هەتا هەتاییە بەتاییەت ڕۆح و ئەوین و جوانی. گیان نەمرە. لە ڕێگای تەناسوخ واتە دووناددوونەوە کامیل دەبێت و بە زاتی خودا پێوەند دەبێت). خۆشەویستی و قین کە شیرینی و دوژمنی دێنێ، بە لای ئێمەوە بە دیهاتوون و لە ناو چوونیان هەیە بەڵام چون لە خواوەیە قەدیم و هەتا هەتاییە:

| | |
|---|---|
| لەوڕاکوجنوود جانموجەننەد | چێ بوونە د عیلم حەق «موخەللەد» |

کوڕ لە جل و بەرگی کچانە و کچ لە جل و بەرگی کوڕانەدا مات و سەر لێ شێواو و چاو بە فرمێسك ما بوون. لەسەر خۆ نەبوون. نەیانزانی چون مەم لەگەڵ زین و تاجدین لەگەڵ ستی ئەنگوستیلەکانیان پێکەوە گۆڕاوە. خەڵکیتر هاتن. کاتێ جیابوونەوە گەیشت.

ڕۆژی دواتر مەم و تاجدین بە یەك گەیشتن. ماقیان وڕمابوو. سەرنجی یەکیاندا. تاجدین ئەنگوستیلەکەی مەمی دی کە ناوی زینی لێ هەڵکەندراوە. مەمیش ئەنگووستیلەکەی تاجدینی دی کە ناوی ستی لە نقێمەکەیدا بوو.

(خوێنەری بەڕێز پاش شروڤەی ئەم چیرۆکە و فولکلورەکەی بۆی دەردەکەوێ ئەمە چیرۆکێکی بە تەواوی میترایی کوردانی پێش ئیسلامە. هەرچی تێدایە لە ستایشتی خودا و مەحەمەد (د ـ خ)ە وەبیگرە تا چکولەترین پاژەی ئەم چیرۆکە لەسەر بناغەی ئاینی کۆنی کورد و دینە کوردیەکانی ئێستایە. سەرەتای ئەم چیرۆکە لە ڕۆژی نەورۆزدا دەس پێدەکات کە شەوی پێش ئەوە میترا کە کارەکانی تەواو بووە بۆ ناوخۆر سەردەکەوێ. لە پاش ئەوە بەرهەمی ژین لەوانە ئەوین لەسەر زەوی‌دا پێدەگات. میترا لە کوردی و فارسی و پەهلەویدا وەکوو «میهر» دابێژ دەکرێ. دابێژگەلی‌تری هەیە کە باسی دەکەین. میهر ئەمڕۆ بە چەند مانا بە کار دەچیت. بە مانای خۆر، بە مانای خۆشەویستی و ئەوین و لە مێژدا بە مانای دۆستی و پەیمان بستن بە کار چووە. خانی لە مەم و زیندا زۆرتر بە جێگای خۆر و ئەوین بەکاری بردووە. هەر سێ مانا لە تایبەتمەندیگەلی میترایە بەتایبەت ئەوین و خوشەویستی کە لە دینە کوردیەکانیش‌دا لە تەجەللاکانی زاتی خودایە نە سیفات، هەروا کە میترا خوی تەجەللای زاتی خودایە.

میهر و ئەوین چون بناغەکەی زاتی خودایە ئیتر کوڕ و کچ و کافر و موسڵمان‌ناناسێ. ئەوین سەرچاوەی جەماڵ و جەلالی خودایە. کە جوانی و جەماڵی حەق دەرکەوت ئەوین کە جێگای کانگای دڵی مرۆڤە دەبزوێ. ئەمە لە ئاینی میترایی‌یەوە هاتۆتە نێو عیرفان و سۆفیگەری پاش ئیسلام. عاریفگەل و دینە کوردیەکان دەڵێن کاکڵی زاتی حەق لە ناخی مرۆڤدایە. بۆ گەیشتن بە خودا گوێ لە دەنگی دڵی خۆت بگرە. بۆ گەیشتن بە خودا لە ئەویندارییەوە دەس پێ بکە. شەریعەت ڕێگای خەڵکی ساویلکە و پێنەگەیشتووە. ڕێگایەکی دوورە. بە کاکڵ سەرنج بدە نە بە پێست. مەم لەم ڕێگاوە بە خودا واتە سەرچاوەکەی خۆی گەیشت. دیارە کە خانی بە هەڵکەوت ڕۆژی نەورۆزی کە جەژنێکی[٥] بە تەواوی میترایی و کوردیە بۆ ئەویندار بوونی ئەو چوار گیانە

هەڵنەبژاردووە شەوی نەورۆز شەوی ئاخری ئافراندانی خودایە لە جەستەی میترادا کە پاش ئەوە جوانی و ئەوین سەرهەڵدەدات).

ستی و زین هاتنەوە ماڵ. جل و بەرگی کوڕانەیان داکەند و کچانەیان لە بەر کرد.

یەکرەنگییا سیرفا عالەما غەیب     زاهیر دکر ئیتتحاد «لارەیب»

ئەو یەکرەنگی و یەکبوونی تەواوی جیهانی خودایی، یەکبوونی خودای لێ دەردەکەوت (و لە جیگایەك کە کوڕ کچ بوو و کچ کوڕ، جوانی حەق دەرکەوت و ئەوینیش کە کوڕ و کچناناسێ لە سەرچاوەکەیەوە کە دڵی مرۆڤ و کانگای خودایە پەیدا بوو. تروسکەگەلی زاتی خودایە کە دەیانەوێ بە یەکیەتی بگەن).

ستی و زین «دایەن» ێکیان بوو (دایەن ئەو ژنەی جگە لە دایکە کە منداڵ گەورە دەکات).
دایەن زۆر بە ئەزموون و تێگەیشتوو بوو.

زالا فەلەکێ ژبەر زەبوون بوو     وێ ناڤ ژییری «حەیزەروون» بوو

دایەن لە حاڵی وان تێگەیشت. پرسی ئەویندار بوونە؟

ئەمرۆ دوو کچی خەملاو و کەلەگەت سەرتا پا جل و بەرگی هەوریشم لە بەردا ڕازاوە وەکوو خۆر و تیشك دەر وەکوو مانگی ڕووناك کە

ئەڤ هەر دوو وەکی د جام و جەمشێد     ئەڤ هەر دوو مسالی ماه و خورشێد

ئەو دووە وەکوو «جام» و «جەمشێد» ئەو دووە وەکوو مانگ و خۆر بوون. کە دیمان لە هزر و هۆش ئازاد کراین (جەمشێد لە دوایین ئوستوورەگەلی ئێرانیدا، شایەك بوو و جامێکی واتە دەفرێکی خواردنەوەی بووە کە لە ناویدا هەموو ڕووداوەکانی جیهانی دەدی پاشان سەبارەت بە جام و مانگ و جەمشێد و خۆر باس دەکەین). گوستیلەکەیان لەگەڵمان گۆڕیەوە. دایەن گوستیلەکانی هەڵگرت و کازیوە بردی بۆ لای «ڕەممال» (ئەو کەسەیە کە ئامرازێکی بە ناوی «ئوستورلاب» هەیە. هەڵی دەخاتە سەر جەغزێ کە بورجەکانی ئاسمانی تێدا کێشراوە و لە ڕووی ئەوە بە سەر هاتی مرۆڤ دەخوێنێتەوە).

دایەن بە سەرهاتی ڕۆژی نەورۆزی گێڕایەوە بەڵام وتی کورەکانم دوو کچییان دیوە. دوو کلکەوانەکەی پیشان داو وتی خاوەنی ئەمانە بناسێنە. ڕەمال لە ئەنگوستیلەکان ڕوانی و لەگەڵ ئامرازی ئەستێرەناسی تێفکری و...

لێحیـــان و نـــەقی ب پێکڤـــە دیـــتن　　　　تاجـــدین و ســـتی بـــە پێکڤـــە دیـــتن

شـــکلی فـــەرەحێ دگـــەل غـــەمـــێ دی　　　　بـــێپـــەردەوێ زیـــن دگـــەل مـــەمـــێ دی

(لیحیان و نەقی ناوی دوو ئەستێرەن کە ئەگەر لە یەك نزیك بنەوە نیشانەی خۆشبەختیە) واتـە لیحیان و نەقی لەگەڵ یەك و تاجدین و ستێی پێکەوە دی. شادی لەگەڵ خەم و مەمی لەگەڵ زین دی.

(لێرەدا خانی ئاماژە بـە «جـەبـر» دەکـات واتـە بـە سـەرهاتی مـرۆڤ تـا ڕادەیـەکـی زۆر بـە «ئیختیار»ی خۆی نیە. ئەم باوەڕە لە دینی میهری و ئاینە کوردیەکانیشدا هەیە) جوابی دایـەنـی دایەوە، بۆچی وتت دوو کوڕ نەتگوت: ستی و زین. ئەوان ڕۆژی نەورۆز ئەویندارى دوو کـوڕ بوونـە کە ئێستا ئەوانیش کلکەوانەی ئەمانیان لە ئەنگوستدایە.

دایەن وتی ئێستا بڵێ ئەوانە کێن، ڕەممال وتی...

بـــە گـــزاردەیـــەبێـــك ژنەســـل مـــیران　　　　یـــەك ژی ب نەســـەب کـــوڕێ دەبـــیران

ڕەممال وتی خۆت کە بە پزیشـك و دوای دەردەداران بکـەوە، دەچـیتە لای ئـەو دوو نەخۆشـە بـە تایبەت بە ئەنگوستیلەکاندا دەیان دۆزیتەوە.

پیرەژن وەکوو پزیشك بە شارداگەڕا. بردیانە سەر دوو ئەویندارى بێحاڵ. پیرەژن وتی: کەس لامـان نەبێ. کە لەگەڵ تاجـدین و مـەم تـەنیـا مـا وتـی لـە لای زیـن و سـتییەوە هـاتووم ئـەمـەش ئەنگوستیـلەکانیان. بیهۆش کەوتن، هاتنەوە هۆش. دایەن گوتی خەم مەخۆن ئەمـن بـۆ گـەیـینی ئێوە بە یەك تا بتوانم تێ دەکۆشم. ئێوەش ناو و نەسەبی خۆتان بێژن.

تاجدین گوستیلی لە دەس دەرهێناو دای بە دایەن بەڵام مەم وتی دایە مـن بـێ ئـەو گوسـتیلە ناژیم لێم مەستێننەوە.

دایەن بو لای زین و ستی چوو. کە بە سەرهاتی گێڕایەوە:

ئـــاگر تـــەدگـــۆ گەهانـــدە نـــەفتێ　　　　پیـــت ژی دچـــوو ئاسمـــانێ هـــەفـــتێ

عیشـــق ئـــاگرە تـــەن چـــیایێ تـــوورە　　　　دل ئـــەوشـــەجەرا بنـــار و نـــوورە

دەتگوت ئاگرگەیی بە نەوت و گڕی بەرەو ئاسمانی هەفتەم دەچوو. ئەوین ئاگرە و جەستە وەکـوو کێوی توورە (کە گڕی خودای دی و ئاگری گرت) دڵیش ئەوداری بە ئاگر و تیشـکە (کـە مووسـا دی و تەجەللای خودا بوو)

.... له دایەن پاڕانەوە هەستە بڕو بۆ لایـان. بێـژە ئێمـە زۆرتـر لـە ئێـوە خـەمبارین. بـەڵکـوو گەورەگەل و قسەزانانی وڵات بۆ خوازوێنی بنێرن. دایە مزگێنی بە تاجدین و مـەمدا. پـاش چـەند زەمانێ خوازوێنی تاجدین لە ستی لە لایەن چەند وەزیر و زانستیارەوە دەس پێدەکات. میر زینەدین قبوولێ دەکات و ستی لە زەماوندێکی شاهانەدا دەدەن بە تاجدین. بە فەرمانی شا، مەم دەبـێ بـە شوشبین (واتە برازاوا). تا شەوی هەفتەم شەوی پەردە چوونی تاجدین بوو، مەم ئەو جۆرە کـە داب بوو بە چەکەوە لە دەرەوەی ژووری پەردەگا ڕاوەستا بوو. ڕۆژی هەشتەم زەماوەند تەواو بوو.

(لە پاشماوەی چیرۆکەکە ئەم ئاکامە بـە دەس دێـت کـە ئـەوینـی تاجـدین و سـتی لـەم ڕادەدا دەوەستێ).

(لە مـەم و زیندا پێگەی ژن زۆر بەرزە دەڵێ: کوڕ ئاینـەیێ جـەمالێ زاتـن ـ کـچ مـەزهـەرا پەرتەوا سیفاتن. واتە کوڕ وەکوو ئاوینەیەك جوانی زاتی خودا دەنوێنێت و کچ جێگای دەرکـەوتـنی تیشکی سیفاتی خودایە. لە ئاینی کاکەیشیدا هەروایە. پیاو (ئادەم) وەکـوو سەرچـاوەی جیهـانی مینۆکی یان بە ئاماژە «چین» واتە ڕۆژهـەڵات جێگـای دەرکـەوتـنی نـوور و ژن (حـەوا) وەکـوو سەرچاوەی جیهانی مـاکی یان بە ئامـاژە "ماچین"ە. جا جیهانی مەعنا تەجـەللای زات و جیهـانی مـادە تەجـەللای سـیفاتە. زات و سـیفاتیش وەکـوو هـەفتـەن و هـەفتـەوانـە یـەك دەگرنـەوە و سەرچاوەکەیان دەبن بە یەك کە هەر خودایە).

خانی دێتە لای ئەوینی مەم و زینەوە. (لە ئەوینی تاجدین و ستیدا لایەنی شەڕ و دژبەریخـواز واتە لایەنی «ڤین و تاریکی» نەبوو. لە نێوان مەم و زیندا «بەکرۆك» لە مەم و زیـنی فولکلـۆردا بەکر، بەکرە شۆڤارە یان بەکری مەرگەوەڕ هەیە کە ئەوینی مەم و زین بە هـەبـوونی ئـەوەوە پـێ دەگات و کامیل دەبێ. وەکوو وتمان ئەگەر شەیتان نەبوایە ئادەم و حەوا لە بەهەشـت دەمانەونـە و نەدەکەوتنە ڕێگای هەرە بەرزتری «لیقائوڵڵا». جا لایـەنـی ڤـین و تـاریکی حـەق کـە لـە دینـە کوردیەکاندا بە مەلەکەتاوس ناسراوە هەرچەند شەڕ و دژبەری تێدایە بەڵام پێداویسـتی وجـوودە. ئاماژەکرا مەلەکە تاوسی دینە کوردیەکان لە پەرستگەی میهرپەرستەکاندا وەکوو مـار یان شێری ترسنـاك پیشان دراوە و بۆی قوربانی دەکرا هەر ویست و ئیرادەی خودا خۆیەتی. هاتنی «بەکر» لـە نێوان مەم و زینی فولکلۆر و هی ئەحمەدی خانیدا لەسەر ئەم بناغە دانراوە کە شتێکی پـەتـی و خاوێن کوردیە).

خانی سەبارەت بە شەیتانی کردنی بەکر دەڵێ:

ئەو کاتەی خودا کە جیهانی ئافراند لە هەرچی هەیە تا مرۆڤ گشتی جۆراوجۆر و پڕ لە دژبەری ئافراند. ئەم ڕووناکی و تاریکی ـ کوفر و ئیمان ـ سارد و گەرم ـ بەهەشت و دۆژە[7] ـ وشك و تەڕ ـ شا و گەدا ـ بەلەنگاز و دارا ـ ئاگر و ئاو ـ شایی و خەم و... نازانی دژ بە یەکن؟ بۆچی؟ هۆی چیە؟ (خانی دەیەوێ بێئەوەی ناوی مەلەکە تاوس ببات و دەمارگرانی زەمانەکەی هەڵخڕێنی و وەکوو کافر بیکوژن بلێ کە هەبوونی لایەنی قین و تاریکی پێداویستی وجوودە. ئایا دیالەکتیکی هێگل و مارکس دوو فەیلەسووفی گەورەی ئاڵمانی کە لەوەدا دژ بەری، بنچینەی جیهانە لە بەرانبەر دینە کوردیەکانەوە شتێکی تازە و نەگوتراوە؟)

میر زینەدین دەرکەوانێکی بۆ خۆی دانابوو کە گێرە شێوێنی زەمان و فێلەباز بوو. دەڵێن کە زێدی بۆتان بەڵام بنەچەکەی لە «مەرگەوەڕ» مرۆڤێکی پڕ شەڕ و شۆر بوو. (دروستە کە «مەرگەوەڕ» دەشتێکە لە لای «ورمێ» لە ڕۆژهەڵاتدا بەڵام ئەم وشە لە ئەوێستادا «مەهرکو، وەریە» یان بە قاعیدە «مەهرکوو وەئیریە» بە مانای لایەنی مەرگە «مەهرك + وو + وەری +ه». وەکوو «خشەثروو، وەئیریە» کە ئەمڕۆ دەڵێن «شەهریوەر» ناوی مانگی ئێرانیە. مەهرکو، وەئیریە بە قاعیدەی پەهلەوی کە خوشکی زمانی کوردیە دەبێ بە «مەرکەوەر» لە کوردیدا «مەرگەوەر». بە گشتی بەکری مەرگەوەر واتە بەکر لە بناغەی مەرگ و شەڕاشۆیی. مەرگەوەری لای ورمێ لە بناغەی مەرگ لە زاراوەکانیتری کوردیدا مێرگ لە فارسیدا «مەرغ» بە مانای مێرگ و سەوزەڵانیە. لە بەیتی سەیدەواندا کە هەر چیرۆکێکی میترابیە ناویەکێ لە براکان «مەلکەوان» کە گۆڕدراوی «مەهرکەوان» بە قاعیدە ئەوێستایی کە دایکی زمانی کوردیە دەبێ بە «مەهرکووپانە» «مەهرك+ وو+ پا+نە». بنەچەکەی بەکریش مەرگ و تاریکیە وەکوو بنەچەکەی دەهاك یان زەحاك کە وەکوو لە پەرتووکی پەهلەوی «بون دەهیشن»دا هاتووە لە دایکیەوە دەگا بە ئەهریمەن یان شەیتان).

تاجدین بە میری دەگوت ئەم پیسە لە دەرکەت وە دەرنێ، ئەمیر دەیگوت لە حکوومەتی شاهاندا ستەم و داد لەگەڵ یەکن. بەشێ لە کارگەلی ئێمە بە دەس ئەمانە دەگەڕێ. بەکر زۆر قین لە دڵ بوو. لە تاجدین دەترسا و قینی لێی بوو. بە ئەمیری دەگوت تۆزیانت کردووە کچت بە تاجدین داوە بیستم بە مەم بەڵێنی دەدا کە زینی بۆ بخوازێ. میر تووڕە بوو وتی چۆن بە منی نەوت دیارە ئیتر فەرمانم لێ نابات. بەکر وتی ئەو، لاو و خوێندەوار و کوڕ ئازا و لە توخمی شاهانە. ئەگەر بتوانێ

زین بۆ مەم بخوازێ بەرهەڵستت دەبێ و لە تەخت لات دەبا. زینەدین وتی لە دڵما بوو کە زین بۆ مەم مارەکەم بەڵام کەوای لێهات بە ڕۆحی باوکم سوێند دەخۆم کە زین بۆ هیچکەس مارەنەکەم.

تاجدین و ستی بە یەك شاد بوون. مەم لە کونجی تەنیاییدا بێیار و هاودەم ما. زین بە ناڵە و گریان ڕای بوارد، کچانی هاودەمی پێیان گوت کەم بگری. ستی چوەتە ماڵی بەختی خۆی. دە هەستە سەر و ڕووت سەفایێ بدە. خۆت برازێنەوە....

| | |
|---|---|
| دیسان بکە خەمریان قەدەح نۆش | جەعدان ڤەکە کەعبەبت سیەهـ پۆش |

.... زولفی لوول بکەرەوە تا بۆ بە خودا گەیشتن خانووی کەعبە لە داخا رەشپۆش بێت واتە ئەو زوڵفە چاکتر مرۆڤ بۆ لای خودا رادەکێشێت. بە چاوی مەست مەلا مەست کە و شێخەکان بنێرە بۆ بەراز لەوەڕاندن وەکوو شێخی سەنعان بۆ کچە فەلەیەك بوو بە شوانی بەراز...

| | |
|---|---|
| دەستوور بدە ب بسك و خالان | ئاگاه بگێرە ئەهلی حالان |
| دامو رشیدی بێتەریقی هائیم | سەرگەشتە نەبت وەکی بەهائیم |
| ئینکار نەکەت زەلال موتلەق | ئیقرار بکەت بە سوورەتێ حەق |

بفەرموو بە بسك و زوڵف و خاڵ، ئەهلی حاڵ و دڵ ئاگادار کاتەوە تا ئەو شێخە مورشیدە بێتەریقەتەو سەرگەردانە وەکوو کەر و هێستری بارەبەر سەرگەردان نەبێت و بە دیتنی ئەو بسك و خالەوە بکەوێتە سەر تەریقەتی دروست. (واتە تەریقەتگەلی سۆفیگەری و دەرویشی وەکوو جوانی و ئەوینی زوڵف و روخسار کەس بۆ لای خودا هان نادات). تا شێخی مورشید کە بە دوای روناکایی موتلەقدا دەگەڕێ بە ڕوخساری ڕاستەقینەی خودا پەی بەرێت. (زەلال لەو بەیتەدا بە مانای تیشك و نووری بێخەوشە. بە ئەوێستایی «زەرەثرە» لە بناغەی «زەر» واتە بریکەدار بوون. نازانم بۆ هەندێ نووسەر بە لاسایی کردن لە فارسی زوڵاڵ دەنووسن)

زین لەگەڵ خەما جووت بوو... ئەوین ئاگرە و مۆچیاری و پەند بایە... مەمیش لە دووری و ئاواتی ڕوخساری دۆس شێت و سەرلێ شێواو بوو، بێ ئاسوودەیی و خواردن و خەو. دەچووە قەراخ ڕووباری شاری بۆتان و لەگەڵێ دەدوا:

ئەی ڕووبار تو ئەوینداری ئەم شارەی. خۆ دەستت لەملی دایە. ئیتر بۆ هاوار و گازندە دەکەی؟ ...
مەم لەگەڵ بایی سەبا قسە دەکات:

... لە پێشدا بەردەگاکەی ماچکە پاشان پێ بڵێ

| | |
|---|---|
| تۆمەتلەع نوور زولجەلالی | تو مەنبەعێ کەوسەرا زەلالی |
| تو سەردێری نووری خودای | تۆ سەرچاوەی کەوسەری ڕوونـاکی |
| تۆ مەنزەر و مەزهەرا ئیلاهی | ئەم بۆتە گەدا تو پادشاهی |
| تو دیمەن و جێگای دەرکەوتنی خودای | ئیمە بۆ تو گەداین و تو پادشایت... |

هەندێ کات فریاد و گازندەی لەگەڵ دڵی بوو....

... ئەم بولبولی گیانە کە لە لە زیندانی جەستەدایە وەکوو بێژەن (پاڵەوانی ئوستوورەیی کوڕی گێو) تەنیا ماوە، ئینساف نیە ئەی دڵ گیان بە جێ بێڵی (بۆ لای دۆست بچێ) ئەی دڵ بێ چرای گیان مەچۆ. تاریکە و کوێرە ڕێ نازانی. ئەگەر یارت دەوێ لە گیاندایە. بۆ ئەوە تۆ نموونەی زاتی خودای (واتە ئەوینت هەیە) و ئاوێنەی دیمەنی سیفانی، لە گیان جیا مەبەوە جیا بوو نەوەت دەبێتە لە دەرەوەمان و بە جێ هێشتنت دەبێتە لادان.

لە جێی خۆ بە تارۆلەی راستەقینە بی ئەوسا ئاگاداری رازی «مەن عەرف نەفسەهـ مەن عەرفەرەببەهـ» دەبی. هەرچەند تو بۆ لای دۆس چوویی بەڵام دۆستی راستەقینە منم. کاکڵ منم ئەو پێستە. (لێرەدا دڵی مەم بۆ لای گیانی زین کە تروسکەی خودایە لە جەستەدا هان دەدا. ئەو ترووسکە بناغەیە. جوانی زین تەنیا ڕەنگدانەوەی ترووسکەی خودایە).

... خوت بە تاڵی زولف پابەند مەکە و بە کەمانی ئەبرو سەر لێ شێواو مەبە

ئەی ڕەنج کێش ئەگەروا بکەی هەر چەند وەکوو ئیبراهیمی خەلیل بی، ئاگر بۆت نابێتە گوڵزار بەڵکوو جارەگوڵ بۆت دەبێتە ئاگر....

ئەوەی کە دژ بە هەواو هەوەسە هەر ئەوە دەرمانی دەردی تۆیە (واتە دڵ و گیانی زین مەبەستت بێت کە زاتی حەقی تێدایە، نەك جەستەی)

ئەو گشتە ئەو لەگەڵ دڵی قسەی کرد ناچار دڵی، دڵی بۆی سووتا. دووکەڵی گەرمای ڕەشایی دڵی هەڵساو جێگای ڕەشی پڕ کرد. دووکەڵی ڕەش لە دڵی هەستا و مێشك و لووتی پڕ کرد. تاوێنەی خەیاڵ و هزری، تاریك و تێك چوو. هەورێ لە زەوی هەستاو بەرزایی ئاسمانی گرت. لەم هەورە کە لە هەناو هەستابوو بە هەر دوو چاو فرمێسکی خوێنینی دەباری. (خانی سەبارەت بە حاڵی مەم زۆر دەنووسێ)

له فرمێسکی مەمی هەژار قەراخی ڕووبار وەکوو جارەگوڵ و گوڵستانی لێ هات. مەم هەر لەو قەراخ ڕووبارە ماوە و وەکوو بولبولێ لەوێ هێلانەی گرت و بە یەکجاری لەوێ پەڕ و باڵی وەری و خەت و خاڵی ڕوخساری تێکداوەشی. باڵای سنەوبەری چەماوە. ڕووی زەرد هەڵگەڕا. ئاوێنەی ڕوخساری ژەنگی گرت و نەخشی مانی کێشراوی بڕەوی نەما. دیمەنی ئاو و ڕەنگی نەماو لە قسەیدا وەرام و دەنگ نەما.

ژوەلقە رەخێ شەتێ نەخوەش کەت + چل ڕۆژی تەمام شوبهی لەش کەت. لە هەوەلەوە لە قەراخ ڕووبار بە نەخۆشی کەوت و چل ڕۆژی تەواو وەکوو لاشە کەوت (ئەم چل ڕۆژە جێگای سەرنجە باسی دەکەین). عەقڵ و شعووری مرۆڤ و هەست و جووڵە و هێزی حەیوانی لانەما.

(دیارە مەم لە ئەویندارییدا بۆ پێشەوە چووە. تا ئێستا دوو پلەی بڕیوە پلەی یەکەم، سەرەتای ئەوین و ڕوو بەڕوو بوون لەگەڵ تەجەللای زاتی خودا واتە ئەو جوانیە کە دەدا لە ئاوێنەی دڵ و ئەوێن کە هەر تەجەللای زاتە دەبزوێنێ. ئەگەر هەر بەوە بەسندەکەی وەکوو تاجدین و ستی لەو ڕادەدا دەوەستێ و هەروا دەمێنێ.

پلەی دووهەم تێفکرین و «موکاشیفە»یە. بە تێفکرین، وزەگەل و دۆخگەل و مەیلگەل و شتگەلێتریش کە لە ناخی دەروونتدایە هەست پێ دەکەی و دەیدۆزیتەوە. ئەمە کاتێ ڕوو دەدات کە بێسەرنج لە خورد و خەوو نیازگەلی جەستە،لە ڕەنج و سۆز و تاویانەوەدا بیت تا زۆرێك لە تایبەتمەندیگەلی حیوانی لاواز ببنەوە.

خانی ئەمر لێرەدا بە چل ڕۆژ ئاماژە دەکا. ئەم چل ڕۆژ تێفیکرین و موکاشیفە و دوور کەوتنەوە لە سفەتگەلی حەیوانی لە ئاینی میترایییەوە گەیشتووەتە پاش ئیسلام و لە لقەکانی جۆراوجۆری سۆفیگەری و عیرفانیدا وەکوو چلەگرتن و چلەکێشی ماوەتەوە. چل لە ئاینی میهریدا گرینگە. لە ئاینی کاکەییدا پاش هەفتەن و هەفتەوانە «چل تەن» هەیە. لە ناو کورداندا وەکوو شەوی چلە ـ چلە گەورە، چلە بچووك، چلەی هاوین، بەڕێوەبردنی نەریتی چلەی مردوو ـ ئاوی چلە، کە ژنی زەیسان چل ڕۆژ پاش زایینی دەبێ بیکا بە سەر خۆیاو ... ماوەتەوە.

تا ئێستا مەم دوو پلەی لە ئەوینی ڕاستەقینە بڕیوە. وتمان تاجدین و ستی لە پلەی یەکەمدا مانەوە).

میرزینەدین باخێکی هەرە جوانی هەبوو. زین گەورە ئافرەتی بارەگای ئەوین. بەندکراوی ئەویندارێ ... کە میر لەگەڵ خەڵکی شار چوو بۆ ڕاو، شار و گەڕەکی چۆڵ دیهات بۆ باخ... وتی

برژم بیستوومە پەلەوەرێکی بەخت رەش لە باخدا پەشۆکاوی گوڵێکی سوورە. هات کەس نەیزانی. خانی پاش پەسنی باخەکە دەڵێ: هەرچی لە چاکە و خراپە بێهۆنییە ئەگەر پێگەیشتن بێ یان دیەنی یار. ئەم هۆگەلە گشت رەمز و رازن و سەرچاوە لە ویستی خوداوە دەگرن. دڵت پێت دەڵێ هەستە... مەم کە زۆر لاواز و نەخۆش بوو شەوقێ کەوتە دڵی... دڵ ئەوی بۆ باخی میر کێشا... زین هەستێ کەوتە دڵی... مەم هات. لە شادیدا بیهۆش کەوت. مەم هاتە نێو باخ بۆ گوڵان و سونبوڵان دەیڕوانی. زین نەختێ هاتەوە حاڵ. هەرمەمی دی وەکوو سەوڵێك کە زۆر ئاودرابێ بێهۆش، کەوت... مەم هاتە بەرەوە، زین نەختێ هاتە سەر خۆ... ماوەی زۆرێ لاڵ و کپ بۆ یەکیان روانی. پاشان کەوتنە ئاماژە کردن بە دەست... چەند وشەیەکیان گۆڕاوە... خانوویەك لە باخدا بوو. لە هەیوانی خانوەکەدانیشتن .... میر لە ڕاو هاتەوە. لەگەڵ هەندێ سەرباز بە لێدانی سورنا(٨) و کووس٩ و تەپلەوە گەیشتنە باخ. دوو ئەویندار سەرسام مان. میر وتی بەندی ئاسکەکان بکەنەوە، خانووەکە ئامادەکەن... مەم عەباکەی زینی کێشا بووە سەرجەستەی زیندا و شاردبوویەوە. میر هاتە نێو خانووەکەوە و دیکەشتێ لە ژێر چارشێوێکدا کەوتووە. تاجدین و بەکر ترسان. میر وتی کێیت لە ماڵیمندا. مەم وتی ئەی میر منم مەم. ماوەیەکی زۆر نەخۆش بووم. بیستم کە چوویی بۆ ڕاو بێهەتوان هاتمە ئێرە. میر وتی نەچیرت لەم باخەدا چی بوو؟

مەم تێکچوو. وتی مامزێکی چاورەش و... م دی کە لە بەرانبەرمەوە فریشتە١٠یەك بوو هەر تۆ هاتی نەما. تاجدین زانی بە سەرهات چیە وتی میرم ئەوە نەخۆشە و وڕینە دەکات.

تاجدین ترسا مەم بکوژرێ هاتە پێشەوە و لەگەڵ مەم قسەی کرد... زولفەکانی زینی دی کە نەختێکی لە ژێر عەباکەوە دیار بوو. زانی بارودۆخ خراپە بە توندی هاتە دەرەوە. ستی بەرچاو کەوت. وتی خێرا بڕوو خانووەکەمان ئاورتێ بەردە، مەم کەوتوەتە گێژاوی بەلا.... ئاگر بە خێرایی بەرزەوە بوو. دەنگ و هەرا ماڵانی داگرت. ئەمیر و پیاوەکانی لە ئاگر کەوتنەوە ترسان و لە باخ هاتنە دەرەوە. تاجدین هەرچیەکی هەبوو سووتا بەڵام مەم و زین ڕزگاریان بوو.

شاهی ئەوین کە دڵی داگرت بێترس ئاڵای خۆی هەڵدەکا. هێدی هێدی ئەویندارى مەم و زین دەم بە دەم گەڕا. بەکریش بیستی، خۆی گەیاندە ئەمیر و پێ وت... فەرمان بدە مەم بێتە دەربار، هەر دوو بەتەنیایی دانیشن بە کایەی «شەترەنج» تاقی کەرەوە. پاشان لێ بپرسە ئەویندارى کێیت؟

ئەو ڕاستی دەڵێ و پاشان ئەو جۆرە کە دڵت دەخوازێ سزای بدە.

مەم بانگ کرا. میر وتی تاجدین نەیەت... مەم هات... میر وتی بە شەترەنج یەك تاقی کەینەوە هەرکەس بردیەوە هەر چیەکی دەوێ لەویتر بستێنی...

ئەمیر کورێکی لاوی بە ناوی «گورگین» هەبوو کە مەمی زۆر خۆشەویست. ئەو خەبەری بە تاجدین گەیاند. ئەو لەگەڵ دوو براکەی عارف و چەکۆ هاتنە دەربار. مەم سێ جار ئەمیری بردەوە. بەکر، دی کە زین لە دەلاقەی ڕووبەڕووی ئەمیرەوە بۆیان دەڕوانێ. بە ئەمیری وت جێگاتان بگۆڕن. مەم هاتە ڕووبەڕووی دەلاقەکە، سەری لێ شێوا و ئەمیر شەش دەستی لێ بردەوە.... مەم وتی داخوازت چیە؟

وتی دڵدارت کێیە بیستوومە کچێکی ڕەش پێستی خاڵکوتراوی عەرەبە. ئەم توانجەمەمی شێواند.... پاش ماوەیەك: دانی نا بە خۆشەویستی زیندا. ئەمیر تێكچوو، تووڕە بوو دوو سەد پیاو لە جێگا هەستان. تاجدین و دوو براکەی دەنگیان هەڵبڕی: کەس کاری نەبێت ئەمیر خۆی هەرکارێك کە دەیەوێ لەگەڵ مەم بیکات کەس نەیوێرا جووڵە بکات. ئەمیر دەست و پێی مەمی بەست لە قەڵایەکی تاریکدا بەندی کرد.

هەل گرتن و برنە پێش دژدار[11] مەحبووس کرن ل کەلیتا تار

واتە مەمیان هەڵگرت و بردیانە لای قەڵادار و لە قەڵای تاریکدا زیندانی کرا.

(وتمان مەم دوو قۆناخی تێپەڕاند. قۆناخی سێهەم تاقی کردنەوەی ئازاد بوون و ڕاستیە. کاتێ لە ئەوینداری‌دا مەم سەردەکەوێ کە بێهزرین و فکرین، لە ڕاستی ئەوین لانادا. بۆچی لەم چیرۆکە بەهێزەدا تاقی کردنەوەی شەترەنج هاتووە؟ چون شەترەنج نیازی بە تێفکرین و هزرینی زۆرە. کە ئەوین هات، ئەو کاتەی کە مەم زین لە بەرانبەریەوە دەبینێ، ئیتر هزر و بیر نامێنێ و مەم یارییەکە دەدۆڕێنی.

لە عیرفان و ڕێگاکانی بە حەق گەیشتندا ئەوین ڕەسەن و ڕێگای دروستە. مەولەوی بەلخی کە لە قوونیە کوردستانی باکووردا پێگەیشت و عاریف و شاعیرێکی جیهانیە و لە سەدەی هەشتەمی کۆچی‌دا بەرهەمەکانی بە فارسی داناوە دەڵێ:

پای استدلالیون چوبین بُوَد پای چوبین سخت بی تمکین بود

واتە ئەوانەی کە بۆ بە حەق گەیشتن بە هزر و بەڵگە هێنانەوە دەڕۆن پایان وەکوو دارە و پای دارین بۆرۆیشتن مل کەچ نیە و بە ئاکام ناگات. مەم کە فیکر و هزرینی پێ نەما و ڕاستی ئەو لە ڕەسەنایەتی ئەوینی‌دا دەرکەوت سێهەم قۆناغی تێپەڕاند).

مەم خرایە سیاچاڵ. زیندانێکی هەرەتاریك کە بەندیگەلی‌تریش لەوێدا بوون.

﴿لەم جێگا تاریکەدایە کە ئەوینی مەم کامیل دەبێ و دەگاتە قۆناغی چوارم واتە قۆناغی ئاخر کە شرۆڤە دەکرێ. چوار قۆناغ هەڵ دەگەڕێتەوە بۆ دینە کوردیەکان. لەوانەدا جیهان لە چوار شت دروست کراوە. خاك ـ ئاو ـ هەوا ـ ئاگر= نوور یا تیشك ئەمانە لە قورس و کەسیفەوە بور سووك و خاوێن دەس پێدەکا. قۆناخی یەکەمی ئەوینی مەم و زین و تاجدین و ستی خاکە واتە تێکەڵاوی غەریزەگەل و شتگەلی سروشتیە. ئەوینی تاجدین و ستی لەم ڕادەدا، ما. قۆناخی دووهەمی ئەو ئەوینە ئاوە کە لەوەدا تێهزرین بە ناخی دەروون و دۆزینەوەی لایەنەکانی وجوود و ئەوینە کە تێدا دڵ و ئەوین خاوێن دەکرێتەوە. بیهۆنیەکە خانی مەم دەباتە قەراخ چۆم و لەویدا بەم قۆناغەی دەگەیەنێ. قۆناخی سێهەم هەوایە کە لەوەدا کەسافەتی تێ‌فکرین بە دونیا و شتگەلی جگە لە ئەوین نامێنێ و باسمان کرد. قۆناخی چوارەم کە لە گشت خاوێنترە و هیچ قورسایی و کەسافەتی نیە تیشکە کە لەوێدا ئەویندار تێکەڵاوی نووری خودا دەبێ. لە ئاینی کوردی کاکەیی‌دا خودا لە پێشدا بنیامینی لێ جۆێ دەبێتەوە پاشان سێیانی‌تر کە بە بنیامینەوە دەبن بە چوار. بە ئەم چوارە دەڵێن چوار تەن کە هەر کام نوێنەر و بوڕێوەبەری‌یەکی لەو چوار شتەن. چوار تەن لە زەمانی سان سەهاکدا ئەم ناوانە یان هەیە و هەرکام نوێنەری یەکێ لەو چوارەن پیر بنیامین نوێنەری ئاگر نور پیر مووسا، هەوا، داود ئاو و مسەفا خاك. زیندانی تاریکی مەم لەم چیرۆکەدا ئاماژەیەکە بە ستایشتگاگەلی میهرپەرستی کە بە تەواوی تاریکە و لەوێدا مرۆڤ پاش بڕینی قوناغگەلێ بە پلەی ئاخر واتە پلەی «میهر» کە بە «پیر» یان «سیمورغ» یا «پاپە» کە ڕۆحی پاش مردن لەگەڵ نووری میترا تێکەڵاو دەبێت، ناسراوە. یان لە عیرفان و سۆفیگەری پاش ئیسلامدا ناونراون «مورشید» یان «مورشیدی کامیل» یان قوتب. تاریکی ستایشتگای میهری ئاماژە بەوەیشە کە لە تاریکی «خاك» بە نوور دەگەی. وەکوو خزرکە لە زولەماتدا بە ئاوی ژیان گەیشت و ژیانی هەتا هەتایی پەیدا کرد. ئەم باسە لە فەلسەفەی سوهرەوەردی کورددا ڕوون دەکەینەوە. ستایشتگاکانی تاریکی میهری زۆرتر لە ئەشکەوتەکاندا هەڵدەکەندرا وەکوو غاری کرفتوو لە نزیکی سەقز و غاری میهرین لە خورماوای لورستان لە ڕۆژهەڵاتدا و بەتایبەت لە باکووردا کە ناوەندی گەورەی میهرپەرستی بووە، ئەم چەشنە غارگەلە زۆرە. یان لە خشت و بەرد درووس دەکرا بەڵام دەبوایە میچەکەی گومەزی بێت کە ئاماژە بە ئاسمانە. زۆرتر وەکوو هۆڵێکی چوار گۆشە درووس دەکرا کە لە ژۆروویدا پەیکەری میترا هەیە کە خەریکە گایەك بە خەنجەر قوربانی دەکا.

له خوێنی گا که کژ و گیا رووا‌وه و مار و سه‌گ له خوێنی گا که ده‌خۆنه‌وه و دوو پشکیك هێرشی کردۆته سه‌ر گونی گاکه که پێوه‌ی داو بیخه‌سێنێ. مامۆستای ئێرانی هاشمی ره‌زی له کتێبی میرائیسم...دا به‌م جۆره ستایشتگای میهری ده‌ناسێنێت:

«داب‌گه‌لی ستایشتی میترا له ئه‌شکه‌وتگه‌لی سرۆشتی که خۆی ئاماژه و سه‌نبولێکه به‌رێوه ده‌چوو. تێده‌کۆشرا ستایشتگاکه وه‌کوو شێوه‌ی سرۆشتی ئه‌شکه‌وته‌که بێت. له نزیك ئاو دروست ده‌کرا، له ئه‌شکه‌وتگه‌لێ دروست ده‌کرا که چاوکه‌یه‌ك هه‌ر چه‌ند چکۆله ئاوی تێدا بێ، میچه‌که‌ی گومه‌زی دروست ده‌کرا که ئاماژه بۆ ئاسمان بوو... ده‌رگاکه‌ی به چه‌شنێ دروست ده‌کرا که رووناکی نه‌یه‌ته ناو. "ترتوولیان" قه‌شه‌ی کۆنی ئه‌وروپایی، له کتێبه‌که‌یدا ده‌ڵێ: سه‌ر سوورهێنه‌ره که خودای نوور واته میترا له جێگایه‌ك ستایشت ده‌کرێ که به ته‌واوی تاریکه. ماترنووس ناوێك له سه‌ده‌ی چواری زایینی‌دا ده‌نووسێ میهردین‌گه‌ل خودای خۆیان له ئه‌شکه‌وتگه‌لی زۆر تاریك ستایشت ده‌که‌ن وه‌ك بڵێی ده‌خزێنه تاریکی‌گه‌لی شه‌یتانی و له رووناکایی هه‌ڵدێن. کتێبی میترائیسم ل ١٠٤».

مامۆستا ره‌زی ده‌ڵێ تاریکی و غار سه‌نبول و ئاماژه‌یه به‌ڵام نه ئه‌و و نه هیچ میترائیسم ناسی ئه‌وروپایی نه‌یانوتووه ئاماژه به چیه.

دیاره بێ سه‌رنج له دینه کوردینه‌کان به‌تایبه‌ت له مه‌له‌که‌تاوس ناتوانرێ بناغه‌ی ئه‌مه بدۆزرێته‌وه. وتمان له ئاینه کوردیه‌کاندا یه‌که‌م ته‌جه‌للای خودا به شێوه‌ی تاوسی مه‌له‌ك بوو که نوێنه‌ری لایه‌نی تاریکی و قینی خودایه که خۆی له پێدا ویستیه‌کانی هه‌بوونی لایه‌نی‌تر واته رووناکی و میهره و له بناغه‌دا هه‌ر دوو یه‌ك ویست و به‌رێوه‌به‌ریه‌که خودای تاکه. تاریکی پەرستگه میهرییه‌کان و تاریکی زیندانی مه‌م ئاماژه به مه‌له‌که‌تاوسه که نوێنه‌ری تاریکی و قه‌هرێ خودایه. له تاوسی مه‌له‌ك لایه‌نی رووناکی و میهریش ده‌رده‌که‌وێ و له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا ده‌بن به یه‌ك و له نه‌ورۆزدا بۆ ناو خۆر عرووج ده‌کات.

له هه‌شتاکاندا که مه‌م و زینم خوێنده‌وه و دیم له نه‌ورۆزه‌وه ده‌ست پێده‌کات زانیم ئه‌م په‌رتووکه یه‌کێ له شرۆڤه‌کانی شۆناسی ئاینی کۆنی کورده که سوهره‌وه‌ردی کورد کردوویه‌تی به سیسته‌مێکی فه‌لسه‌فی.

قۆناغی چواره‌م بۆ مه‌م که تێکه‌ڵاوی جیهانی تاریکی ده‌بێت سه‌خت و دژواره. وه‌کوو باوه‌ڕمه‌ندی میترایی ده‌بی ره‌نج بکێشێ تا له تاریکی به رووناکی ده‌گات).

(وەکوو پێشوو کاکڵ و کورتەی بە سەرهاتەکان لە وەرگێڕانی هـونراوەکـان دەهێـنین. لـە هـەر جێگایەك پێویست بوو بە هەندێ هۆنراوە ئاماژە دەکرێ و شرۆڤەکان دەخرێتە ناوکەوانە)

(مەم کەوتە بەندیخانەوە. خانی سەبارەت بەو دەڵێ):

میهر و خۆشەویستی گەڕانی فەلەك، لە سەرەتاوە لەگەڵ نەماندایە. قینی ئەو هەتا هەتاییـە و تەواو نابێ ... بەتایبەت لەگەڵ ئەویندارانی خائینە کە لە ئاخرەوە زەلیل و بەنـدکراو لـە زینداندا دەبێ و دەیخەنە چاڵێ وەکوو گۆڕێگی تەنگ و تاریك.

| | |
|---|---|
| روو نشـــــت د ویڤـــــە عابیدانــــــە | زینـــدان لوی بوویـــە «چـــللەخانـــە» |
| ئـەو چـەه لوی بوویـە چـاهی نەخشـەب | ئـــەومــەه کریـا هــیلال یــەك شــەب |

چلەخانە (ئەو جێگایە کە ئیمانداران بۆ خاوێنکردنی دڵیان تا چل ڕۆژ بە خۆراکی زۆر کەمــەوە تەنیا لە خودا بیر دەکەنەوە). (بێ ئەوە بزانی) ئەو چاڵە بۆ ئەو وەکوو چاڵی «نەخشەب»ی لێهـات (لە سەدەی دووی کۆچیدا «ئەلموقەننـەع» لـە ڕۆژهـەڵاتـی ئێـران لـە بـاژێڕی نەخشـەب دژ بـە فەرمانداراانی عەرەب ڕاپەڕی و وتی من لە تەجەللاکانی خودام. مانگێکی دروست کردبوو کە لە چاڵێکەوە هەڵئەهات و تا چوار فرسەق بارستای رووناك دەکردەوە.

پاش چەند ساڵ ڕاپەرین تێك شکا. کاتێ موسڵمانەکان چوونە قەڵاکەی شـوێنەواری نـەمابوو.)

(خانی لە شیعرەکانیدا لە زۆر جێگا دۆخی مێ ڕەعایەت نەکردووە، بە هەڵەی منی مەزانن).

مەم هەموو کات لەگەڵ کوڵی گریان ئەوەی ئەوت بەزین:

... ئەم چاڵە ئەگـەر زۆر تاریکـە، بـەڵام لـە دادگـەری دوور نیـە. دڵ لیلـەوپـەڕە، تـۆ خـۆری (شوبهاندنی میترایی). سۆفیم و سەومەعە (دێر)[14] نشینم و خوازیاری نـووری ڕوخسـاری زیـن... ئاوێنەی ڕۆح (ڕۆح وەکوو ئاوێنە دەتوانێ نوێنەری زات و سیفاتی خودا بێ) ڕۆناکەوە بوو (ژەنگـی نەما). نەفس و دڵ و گیان پێکەوە بە سەفا گەیشتن. ئـەو گۆشەنشـینی ناوچـاڵە، هێشـتا سـاڵی نەخایاند بوو. (بە بۆنەی ئەو ئەوینەوە) گومان لە دڵیدا بوو بە بـێگومـانی. لـە دڵـیدا تیشـك (نووری حەق) دەرکەوت و ڕازگەل بۆی کرانەوە. لە ئاوێنەی دڵیدا تارمایی نـەما و ڕواڵـەت لێـی بوو بە مـەعنا. ئەو پەیکەرە کە خوازیاری ڕواڵەت بوو، بوو بە کایـەکلـەی مـنداڵی ئـەویـنداری. وجوودی ماکی و مینۆکی گشتی بۆی ڕوانگە بوون. دارو بەرد و چارەوا و مرۆڤەکان و گیاو ئـاژەڵ، هەرچی کە بە دڵ لێ دەڕوانی، هەرچی بە خەیاڵیدا دەهات، گشت زینی تێدا دەدی (چون ڕواڵەتی زین تەجەللای سیفات و گیانی تەجەللای زاتی خودایە).

لەو لاوە زین بە ئێشی جیایی بەندکرا. باخ و هەیوان و کۆشك بۆی بوون بە زیندان. لە گیانـدا خەو و ئاسوودەیی و لە جەستەدا هەتوانی نەما... کەوتە یاد کردنەوەی خودا... لە دەستـی ئـازاری ئاسمان دەناڵی ...

خەڵك کە لە ئەم بە سەرهاتە ئاگادار بوون کەوتنە دلە خورپێ و سەر لێ شێواوی. بـەتایـبـەت ستی و تاجدین کەوتنە خۆ. تاجدین وتی: بچین بۆ لای میر زینەدین. عارف وتـی ئـەمـە بـێشـەڕ ناکرێ چاکترە سبەینێ چەك هەڵگرین. یان بە زۆر مەم ئازاد دەکەین یـان دەکـوژرێین. لـە پێشـدا بەکر بکوژین... ڕۆژەوە بوو تاجدین و عارف و چەکۆ لە کەس و کـار گـەردن ئازاییـان خواسـت و ئەسپیان زین کرد. تاجدین لە پیاوانی خۆی کوڕێکی بەم پەیامەوە ناردەلای میر: چوار بـرا پـڕ بـە دڵ لە خزمـەتتدا بووین. ئێستا زۆرتر لە ساڵێکە یەکێ لە ئێمە لە سیا چاڵ دایە مـەم هەرچـەند گوناهکارە بەڵام ئەویندارە و ئەوین «شا»یە. هیوادارین مەم ئازادکەی فکرێ چاك بکـەوە. بـەکـر بنێرە بۆ لامان تا پرسەکانمانی بۆ دەرخەین.... لە لای خەڵکەوە ئاوڕوومان نەماوە و دەمانـەوێ بـۆ «شام» کوچ بکەین. پەیام بە شا گەیشت. بەکر زانی بارودۆخ خراپ دەبێ وتی میر، مەم ببەخشـە. من پێم وتی ئەگەر زین نەدەی بە مەم دەبن بە دوژمنت. بە ڕواڵەت لەگەڵیان ئاشت بـەوە تـا لـە دەرفەتی خۆیدا دەرفەتیان دەبڕی. جـارێ تـووڕەیی خـۆت ئاشـکرامـەکـە. میرقبـووڵی کـرد. بـە هەناردەکەی تاجدینی وت بێژە شکۆی شاهی من لە تاجدینە ئەو پاڵـەوان و ئـەژدیهـای گـەنجـی شایە. قسەکانی دەپەژرێنم... بەکر بە ئەمیری گوت بناغەی خراپە و گەندەڵی مەم و زینن. ئەگـەر ئەمیر فەرمان بدات مەم بە فێڵ و فەنێك لە ناو بەین. بە زین بێژە بچۆ بۆ زیندان و مـەم ببینـە. من ئەوین دەناسم مەم هەر زین ببینێ دەمرێ و مشت و مڕ نامێنێ.

(خانی بۆ خۆی دەڵێ) پادشاگەل زۆر بەیان چاك و خراپ لە یەك جۆێ ناکەنەوە. کەسانی دەور و پشتیان لەوان خراپترن:

«هەییا وەکـوو کـەر نـەبی تـو ئـەلـەق      کـەنگـێ دەبییـە وەزیـر موتلـەق»

هەتاکوو وەك کەرنەبی نابیە وەزیری هەمەکارەی شا.

ئەمیر چووە ناو خانوی ژنانی کوشك و خۆشکی بانك کرد... وتی سزای مەم ئیدی بەسە. من بـۆ ئەوە ساڵێ خستوومەتە زیندان تا ئەوینی ئەو کامیلتر بێ ئەو بەندکراوی تۆیە نە من .... جا:

ئـەی غونچـەی نەوشـکوفتە سـورگول      بشـکێن قـەفـەس و درێنـە بلبـل

(پاش ئیزنی براگەورە کە لە جێگای باوکی بوو زین مرد)

زین کە پڕ ئەوین و ڕاگرتوو لە پەردەی شەرمدا بوو، براکەی ئەو پەردەی هەڵگرت. خوێن لە دەم و لووتیەوە هات. ئەو کە دووسەد برین لە جەرگیدا بوو بە شادیەوە کەوتە حالەتی مردن:

ئەو کاتەی برای ئیزنی داو پەردەی لابرا، زەریای «قولزوم»[15]ی خەم بە هێزی گریان هاتەکوڵ و سەرپۆشی زەریا هەوا درا و لەگەڵ شەپۆلی خوین وەکوو ڕووباری فورات و جەیحوون ڕێکەوت تۆ بڵێی هەزار دارستان هەژیا یان قولپەقولپەی مەی بوو کە لە شووشە دەڕژا... میر لە پێشدا پێدەکەنی بەڵام دڵی سووتا و ئەویش لەگەڵ زین گریا... زین مرد. ژنانی کوشک هاتنە لایان و دەسەو دامێنی میر بوون:

پاکیزە دوڕرا سەدەف ژمەرجان — لایق تو نەبوو بگێری، مەر، جان

واتە ئەو مرواریە پاکەی ناوسەدەفی مەرجان ڕەنگ (سوور) ڕەوا نەبوو تۆ ئاوا، گیانی لێ بستێنی ....

بۆ مردنی زین شیوەن و شەپۆڕ کەوتە ماڵ و باوان و هاوار بە ئاسمانان گەیشت. (خوێنەری بەڕێز دەزانێ کە زین مرد. کەی مرد، ئەو کاتەی کە ئیزنی ئەرێنی براگەورەی بیست بەڵام بە مردنی مەم ئەو زیندوو دەبێتەوە):

ناکاویەکێ لە دەرگاوە هات وتی مەم مرد و تەمەنیدا بە ئێوە... ئەم خەبەرە زینی هەستاند.

زینی مردوو کە مردنی مەمی بە گوێ بیست هەرچەند مرد بوو گیانی تێکەوت. هەستاو لە چوار دەوریدا هزری. دی میر وەکوو باران دەگریت... زین وتی ئەی برا، ئەی هۆی خۆشبەختی مـن. (چون ئیزنی منتدا) تۆ بووی بەهۆی خۆشبەختی من. لە مردنی من بێکەیف مەبە تۆ بە گیانی من ئیزنتدا. گیان مردنی جەستەی بە دەرفەت زانی، چوو بە گیانی مەم پێوەند بوو و لەگەڵ ئەو تێکەڵاو بوو. تا ئەو ساتەی لە دەم تۆوە ئیزنی نەبیست لە زیندانی جەستەدا بەندکراو مابوو. وەکوو مەمی خەمبار و زیندانی بۆ پاراستنی ناوو نامووس بەو چەشنە ڕای دەبوارد و لە جێژوانی من و خۆی (جەستە و زیندانەکەی)دا ماتڵ مابوو. براگیان تو کە بە دڵ ئیزنت دا دەنگت لە جەستەی مندا. جەستەی من قورس بوو و گیانی بێهەتوانم ڕۆیی. دەم و دەس گیان لە جەستە دەرکەوت و تیشکێك لە ڕۆحی مەمی بەرکەوت (واتە لەگەڵ تیشکی ڕۆحی مەم تێکەڵاو بوو):

... جیسمی منی بێتەوا گران بوو — ڕوحامنە ناتەوان ڕەوان بوو

دەرحال ژقالبێ بدەرکەت — شەوقەك ژ ڕوحا «مەم»ی ب بەرکەت.

(وایەکە) هەرچی کە لە «مەکان»دا جێی نە بێتەوە دەبێ لە لامەکاندا بگەڕێ:

ئێوە ئەم سەفەرە (ئەم میعراجە) بە هەڵە مەزانن، گەواهی من دوو فریشتەی سەرشانن:

پاش ئەو پێگەیشتنە ئەو نوور و شەماڵەی جەماڵ (ی خودا واتە ڕۆحی مەم و زین) نەختی وەستان و دڵنیا بوون و کاتێ پێکەوە پشتگەرم بوون، گاهێك دەهاتنە قەراخی زەریای نەبوون و گاهێك دە چوونە سنووری بوونی هەتا هەتایی.

تێکەڵ لەگەڵ یەك لە ناوەندی خاکەوە وەکوو توز بە خۆر گەیشت، بێگومان نە بە پێوەند و حلوول (واتە ڕۆحی خودا پێوەند بێت و بچێتە جەستەی مرۆڤەوە) یان بە جوی بوونەوە و گەڕانەوە (واتە ڕۆحی مرۆڤ بچێتە جەستەی خودا)

وان ڕێ کـــــوبرن ب جانبـــــــێ زات　　　بـــــــاقی کریـــــــان ب زات زەررات

ئەو دوو ڕوحە پێکەوە کە بۆ لای زاتی خودا ڕێیان گرت بە زاتی خودا وەکوو توسقالگەلێك (لە جیهانی نووری حەقدا) هەتا هەتایی کران (وەکوو زاتی خودا چۆن قەدیم و هەتاهەتایە). ئەم وتەی منە بۆ من سەرسوڕهێنەرنیە (بۆ ئێوە سەرسووڕ هێنەرە کە بەم ڕادە لە ئەوین نەگەیشتوون) ئێوەش ئەمە تەنیا بە هونەری[16] من مەزانن.

ئەو شێخەی (مەم) کە منی پڕ بە دڵ موریدم ئەو وەکوو ڕۆحی رەوانە و لە بەرانبەریەوە من وەکوو جەستەی وشك کراوەی بێگیانم

هەرچـــەند لبـــا، وە نـــاڤێ مـــەم بـــوو.　　　لـــێ پادشـــەهەك عـــەلاهـــو مـــەم بـــوو

هەر چەند لە لای ئێوە ناوی مەم بوو بەڵام پادشاهێکی زاڵ بە سەر لایەنەکاندا بوو. ئەو لایەقی «فەرر»ی پادشاهی و قەبوولکراوی دەرگای خودایە دڵی ئەو سارای موقەددەس (جێگایەك کە مووسا دەنگی خودای بیست. وادی ئیمەن) و ڕۆحی ئەو بە نووری حەق ڕووناك کراوە. من (ئەویناری ئەو، بەم ئەوینە پاکەوە و بە جوانی ڕوخسارمەوە کە ڕەنگدانەوەی جوانی خودایە)، ئەو ڕۆحەم هەڵگرت و بردمە تووری سینا (کێوی توور) و چاوی ئەوم (بە نووری خودا) بینا کردەوە. لە جیجاب (جەستە و جیهانی ماکی کە وەکوو پەردەیەك بەرچاوی مرۆڤ بۆ خوا پێ هەست کردن دەگرێت) هێنامە دەرەوە و تۆز قاڵی ڕوحییم بە خۆر گەیاند. (خودا ڕێگای کێوی تووری خستە بەرِ پێی مووسا و چاوی بینا کردەوە، ئەم کارە بۆ مەم ئەوین و جوانی زین کردی. جیاوازی لە نیوانیاندا چیە؟)

کە من بە گیان بۆ لای مەم سەفەرم کرد ئەم گیانە کە ئێستا هەمە لە گیان فروش (خودا) قەرزم کردووە. مەم هەرچەند بە ڕواڵەت «ئەقلعی» (اقلعی ـ واتە بیبڕەوە، بەس کە، ئاماژەیە بە

ئایەی ٤٤ لە سوورەی(١١)ی گوت بەڵام دەم و دەس «ئیرجعی» (بگەڕەوە، ئاماژەیە بە ئایـەی ٥٢٨ لە سوورەی ٨٩: ارجعي الي ربك راضية مرضية)ی گوت. بۆ ئەوە هاتمەوە تـا ئێـوە ڕازی کـەم و... لەگەڵ ئێوەدا ماڵاوایی کەم و ئێوە تەرمەکەم بگۆزنەوە.

دیسـا وەگـەرم ژبـاوە ڕەققـاس          مورتـاز بـبم ب جـەننـەتا خـاس

دیسانیش لای ئێوە بە هەڵپەڕینەوە دەگەڕێمەوە تا لە بەهەشتی تایبـەتـدا بمێنمـەوە (مەبەست بەهەشتی ئەویندارانە کە جیهانی نووری خوداییە نەك بەهەشتی وشکە سۆفی و شتی وا کە بـاخ و کانی و جۆگەلەی هەنگوینە. مەولەوی ئەمر لە تاك بەیتێکدا دەڵێ:

سـیاییم ئـاوەرد سـفیدیم پـی ڕەشـت          هـەفـتم کـەردەوە گـرێمدا لـە هـەشـت

واتە ڕەشی ڕووم لە بەر ئەوینداری، هێنا و ڕووی سپیم پێـرەنگ کـرد هەرچـەند لـە بەرانبـەر خەلکەوە ڕوو ڕەش بووم بەڵام بەم کارە هەفت دەرگـای بەهەشـتم لـە خـۆم کـردەوە و لـە دەرگـای هەشتەم گرێمدا واتە بە ئەوین لە هەفت قۆناغی بەهەشـت تـێ پـەڕیم و بـە دەرگـای هـەشـتەم گەیشتم. لە عیرفان و سۆفیگەریدا بەهەشت، هەشت دەرگای هەیە. لـە ڕێگاگـەلـیترەوە وەکـوو ڕێگای شەریعەت دەچیتە بەهەشت بەڵام ناچیتە پلەی ئاخر، وەکوو خـانی دەڵـێ بـە ئـەوینـداری دەتوانی بە جیهانی نوور بگەی. ئەو هەشت پلەشتیکی میتراییە. لە میترا پەرستیدا هاتووە: میترا تەجەللای حەق کە هاتە سەر زەوی بۆ گیانەکان دڵی سووتا کە بۆ بە سەرچاوەی نوورگەیشتن دەبێ لە جەستەکاندا دوونادوونکەن و ڕەنج بکێشن. لە کاکەییدا دەڵێن ڕوح دەبـێ هـەزار جەسـتە لـە پەنجا هەزار ساڵدا بگەڕی تا خۆی کامیل کات و بە حەق بگات. میترا بە مرۆڤەکانی گوت ئەگەر لە میهرابە (ستایشتگاگەلی میهرپەرستی)ە کاندا هەفت پلە کە هەر پلـە نیشـانەی ئاسمانێکـە ببڕی، کە ئاسمانی هەفت گەڕۆك تەوا بوو دەچیتە ئاسمانی هەشتەم کـە جیهـانی نـووری خوداییـە. وتمان خودا لە پلەی نادیار و بێزەمان و بێمەکانی نۆهەمدایە کە یـەکـەم دەرکـەوتـنی بـووە بـە ئاسمانی هەشتەم. لە ژێر ئاسمانی هەشتەمدا کە ئاسمانی ئەسـتێرە وەسـتاوەکانـە ئاسـمانی هـەفـت گەڕۆك هەیە کە نزیکترین بە زەوی ئاسمانی مانگە. میترا خۆی لە ناوەندی جیهان واتە لە خۆردایە کە چاوەدێری ئەزموون و تاقی کردنەوەی قوتابیانی ستایشتگاکان دەکات و یارمـەتـی دەروونیـان پێ دەگەیەنێت، تا ڕۆحیان کەمتر ئەم جەستە و ئەو جەستە بکات. مەبەستی خانی لـە بەهەشـتی تایبەت و مـەولەوی لە دەرگای هەشـتـەمـی بەهەشـت شـوێنەواری ئـایینی کـۆنی کـوردان واتـە میهرپەرستیە. بە باوەڕی من عیرفان و تەریقەتە سـوفیانەکان بنـەرەتی پـێش ئیسـلامی هـەیـە.

عاریفگەل و تەریقەتگەلی دەروێشی لە هەر دەورو زەماندا ناچار بوون خۆیان بە ئاینی فەرمی و گشتی کۆمەڵ ببەستنەوە و لە زاراوە و پەرتووك و ...ی ئەو دینە بۆ دەربڕینی باوەڕەکانیان کەڵك وەرگرن. لە ئاینی فەرمی مەسیحی ئەورووپادا «گنوستیزم» واتە عیرفانی مەسیحی هەیە. لە زەردەشتی فەرمی زەمانی ساسانیەکاندا میترائیسم هەیە کە پێش ساسانیەکان وەکوو ئاین بوو بەڵام لە زەمانی ئەواندا لە ئێران وەکوو عیرفان و دینی شاراوەی لێهات تەنیا لە کوردستانی باکوور و هەندێ باکووری کوردستانی باشووردا کە هاوسنووری ڕۆم بوون ئازاد بوو. لە کۆمەڵگا ئیسلامیەکاندا بە ناوی عیرفان و تەسەووف و تەریقەتە دەروێشیەکان دەرهات، کە لەم دواییانەدا ڕەسەنایەتیان کەم کراوەتەوە. خانەقا، یان دروستتر «خانەگا»کان هەر پاشماوەی ستایشتگاگەلی میترائیە کە بە دەنگبێژی و هەڵپەڕین و ئامرازی موسیقا بەتایبەت دەف و تەپڵ زیکر دەکەن. لە جەمخانەکانی کاکەیی‌دا جگە لەمانە «تەموور»یش[17] هەیە کە لە کوردستانی باکووردا کراوە بە «دیوان»[18]. بە وردی کوورەی زیکر و سەرو دەست سووڕدان و هەڵپەڕینی بەریەیاخی ... لە دابگەلی ستایشتگاکانی میترائیە. کاتێ میترا پەرستی لە ئەورووپادا بڵاو کرایەوە ئەوان چون خاوەنی موسیقای پێشکەوتووتر بوون ئامرازی پێشکەوتوویان بەکار برد. «ئورگ» لە کەلیساکاندا هەروەها زۆر داب و نەریتی کەلیسا لە میهرپەرستی گیراوە).

زین وەکوو مرۆڤی ئاسایی لێ هاتەوەو (ئەو «انسلاخ، ئینسیلاخی کردبوو واتە گیان لە جەستە بچێتە دەرەوە و بگەڕێتەوە. ئەم کارە مرۆڤگەلی تەواو و کامڵ و پێگەیشتوو دەتوانن بیکەن). وەسیەتی بۆ میر کرد: ئەی شای گیان و دڵ، خوشکت بە گۆڕی ... ئەو ڕۆژە کە مەمم بۆ خۆم برد گشت خەم و ڕەنجم بۆ خۆ هەڵبژارد (لە ستایشتگاگەلی میهریدا بۆ بڕینی هەفت پلە ڕەنج کێشان بۆ قوتابی لە بنەماکانە) «مەنسوور» (ی لە داردراو) بووم. لە وڵاتی خەمدا مەم بو من و ئاسوودەیی بۆ تو خەم بۆ من و شاهی بۆ تو. لە ئاست من ڕامەوستە من بە بەشی خۆ ڕازیم. (زەماوەنم بۆ بگرە): بەزمی شایی و زەوق بگێرە. جوان ڕوخساران مەست کە و پیروکاڵان خۆشحال کە.... خواردن و خواردنەوە ئامادە کە... خوانچەی پڕخواردن بۆ هەژاران دانێ. خواردنەوەگەلی پڕخۆشی لەگەڵ بۆنخوشی تێکەڵاو کە. نیشتنگای شادی بە مرۆڤی لاو و پیر وەکوو زێڕ بدرەوشێت تا لە ئاست من پێکەنن و تێکڕا بێنە هەڵپەرکێ. لەو گۆڤەندەدا «هەستی حەیوانی» ئێمە کەمەوە بێ و وزەی ڕۆحانی ئێمە کامیل بێت.

ماره‌بڕینی من و مه‌م وه‌کوو گۆڤه‌ندی فریشته‌کان بێت... من و مه‌م له سیفاتی مرۆڤ تێ په‌ڕیوین. زه‌ماوه‌نمان وه‌ك گۆڤه‌ندی فریشته‌کانه، زاوا و بووك به‌هه‌شتین. وه‌کوو ئه‌و ڕۆژه ستی‌ت دا به تاجدین، دووکان و بازێڕان بڕازێنه‌وه... وه‌کوو مه‌حمیله‌که‌ی ستی تا بووتێکی زێڕین و ڕه‌نگین وه‌کوو سندووق بێت و سه‌رپۆشه‌که‌ی ته‌لا بێت و په‌رده‌ی سه‌ر تابووته‌که بدره‌وشێته‌وه.. هانا، ئێمه هه‌ر دوو زاواو بووکین. بێ‌قه‌درمان نه‌که‌ی. ئه‌و کاته ده‌چینه نێو گۆڕ خه‌ڵك نه بێژن گۆڤه‌ندی ستی و تاجدین چ خۆش بوو به‌ڵام زین به‌خت ڕه‌ش بوو. با ستی و تاجدین له‌گه‌ڵ ته‌رمه‌که‌مان بن. چلۆن مه‌م شوشبین (برازاوا)ی تاجدین بوو با تاجدینیش شوشبینی مه‌م بێت. هه‌تا ساڵێك خواردن و جل و به‌رگ و کۆتاڵ به هه‌ژاران بده... به‌ندی و دیل به‌رده... له هه‌موو چه‌شنه خێر و چاکه له پاره‌ی خۆت به جێگای جیهازم خه‌رج بکه تا له پێش زاوا شه‌رمه‌سار نه‌بم... ئه‌و کاته‌ی مه‌م ده‌نێژن منیش له‌گه‌ڵ ئه‌ودا بنێژن...

(قسه‌کانی زین پێش وه‌سیه‌ت به ته‌واوی وه‌حده‌تی وجوودی و میترایی کۆنه. گیان تروسکه‌یه‌که له زاتی حه‌ق و له‌گه‌ڵ تروسکه‌کانی‌تردا یه‌کن. کاتێ به که‌ماڵ ده‌گات له جه‌سته و جێگادا ناگونجێ و ده‌بێ بۆ بنه‌ماکه‌ی که زاتی حه‌قه بگه‌ڕێته‌وه. گیانی مه‌م و زین دروسته که له دوو جه‌سته‌دا بووه به‌ڵام له ڕاستیدا یه‌که چون درێژه‌ی ته‌جه‌للای خودایه و له‌گه‌ڵ ئه‌ودایه، ئه‌مه له قسه‌کانی زین له زینداندا که باس ده‌کرێ هاتووه. یه‌ك بوونی گیانه‌کان له‌گه‌ڵ زاتی خودا به‌شێ له بنه‌مای بیروڕای کوردانه که له مه‌م و زیندا ڕه‌نگی داوه‌ته‌وه.

زین له ڕاسپارده‌کانیدا شکۆدارترین زه‌ماوندی له براکه‌ی ده‌وێ، چون وه‌کوو په‌رده چوونی ستی و تاجدین نیه به‌ڵکوو تێکه‌ڵاو بوونی تروسکه‌گه‌لێ له زاتی «نوورولئه‌نوار» و به یه‌ك گه‌یشتنی ڕاسته‌قینه‌یه. هه‌رچه‌ند به یه‌ك گه‌یشتنی وه‌کوو تاجدین و ستی‌یش چاك و پێویسته، به‌ڵام پله و پایه‌ی ئه‌وه وه‌کوو پێگه‌ی شه‌ریعه‌ته له ئاست «حه‌قیقه‌ت»دا، یان پێسته له ئاست کاکڵ‌دا. ستی و تاجدین له پێستدا مانه‌وه. خانی چوار قۆناغی کامیل‌بوونی بڕی. ئه‌وینی مه‌م و زین وه‌کوو چوار عونسوری خاك و ئاو و هه‌وا و ئاگر «نوور» پیشاندرا، لێره‌دا وه‌کوو چواری‌تر پیشانی ده‌دات که له ئاینی کاکه‌یی و ئێزدیدا وه‌کوو: شه‌ریعه‌ت ـ ته‌ریقه‌ت ـ مه‌عریفه‌ت ـ حه‌قیقه‌ت، ڕاگه‌یه‌نراوه. شه‌ریعه‌ت که پله‌ی یه‌که‌مه وه‌کوو عه‌شقی ستی و تاجدین که پێسته. ته‌ریقه‌ت به ئاماژه موکاشیفه‌ی چل ڕۆژه‌ی مه‌م بوو له پاڵ ڕووباره‌که‌دا. مه‌عریفه‌ت به ئاماژه یاری شه‌تره‌نج بوو، تا له تاریکی زینداندا که ئاماژه‌یه به ستایشتگاگه‌لی میهری به پله‌ی چواره‌م واته حه‌قیقه‌ت یان

کاکڵی جیهان گەیشت کە باسی دەکەین. دینە کوردیەکان شەریعەتگەلی دینەکانی‌تر بەو مەرجەی کە ئاینێکی تەوحیدی بێت وەکو ئیسلام ـ مەسیحی ـ جوو و زەردەشتی ڕەت ناکەنەوە. لە ئاینی میهری و کاکەیی‌دا زەردەشت و مووسا و محەمەد، پێغەمبەرانی خودان بەڵام عیسا تەجەللای خودایە. بۆ ئەم بەرزی ڕوانگەیە کە ئاینی میهری لە سەدەی سێ و دووی پێش زایینداد لە ڕۆم و ئەورووپا قبوول کرا. لە باوەڕمەندانی ئەو دینگەلە ڕێز دەگرن بەڵام دەڵێن زۆربەی ئەوانە لە قۆناغی شەریعەتدا ماونەتەوە. لە ناو ئەوا نەشدا کەم کەسێ هەن کە بە قۆناخی تەریقەت و مەعریفەت یان حەقیقەت گەیشتبێتن. کاکەیی و ئێزدیەکان بۆ پیرانی تەریقەتی ئیسلامی ڕێزی تایبەتیان هەیە. دەزانین کە خانی موسڵمانە بەڵام بە ئەمانەت پارێزیەوە چیرۆکی پێش ئیسلامی مەم و زین کە شوێنەواری شۆناسی گەلەکەی تێدایە بە شیعر هۆنیوەتەوە بۆیە دەڵێ:

دا خەلك نەبێژتن کو ئەکراد بێ مەعریفەتن ژ ئەسل و بونیاد

بەڵێ دروستە خانی لەم چیرۆکەدا بە ئەسڵ و بونیاد واتە بنەما و بنچینەی شۆناسی‌گەلی کورد سەرنجی‌داوە تا موسڵمان و جوو و مەسیحی و زەردەشتی نەڵێن کە کوردان فیکر و ئاینی تایبەت بە خۆیان نەبووە. شەهابی سوهرەوەردی کوردیش کە ئەو چوارچێوە عەقیدەتیەی کردووە بە سیستەمێکی فەلسەفی ئاوا مەبەستێکی بووە. زین لە قسەکانیدا وتی دڵی مەم کە سارای موقەددەس بوو و گیانی کە بە نووری خودا گڕی تێ کەوتبوو بردمە کێوی توور و چاوی حەقبینیم بینا کردەوە هەروەها کە خودا مووسای بردە کێوی توور. پەردەی جەستە و جیهانم لە بەرچاوی مەم لابرد و توز قالەیەم گەیاندە خۆر. ئەم کارە کە زین کردی کاری خودایە و لە زیندانی مەمدا جۆرێکی‌تر دەی نوێنێ.

لێرەدا مەبەست هەر ئەو ترووسکەی زاتی خودا واتە گیانی زینە کە لە جوانی واتە سیفاتی ئەودا دەر کەوتووە. ترووسکەی گیانی مەم بە کاریگەری گیانی زین دەگاتە جیهانی نوور واتە جێگای میهر و تیشکی خودا، یان مەقامی میهر یان سیمورغ کە لە سوهرەوەردیدا باس دەکرێ. ئەگەر بە وردی سەرەنج بدەین زین هەر قسەکەی «مەنسووری هەلاج»[۱۹] دەکات کە وتی، من خودام:«انا الحق» و لە لایەن خەڵیفەی عەبباسیەوە لە بەغدا لە سێدارە درا و ماوەیەکی زۆر تەرمەکەی لەسەردار بادەیشەکاندەوە. خانیش لێرەدا زۆر بە پارێز و دەس بە گۆچان دەچێ تا وەکوو سوهرەوەردی و عەینولقوزات و هەلاج و... سەری نەچێتە سەردار. لە هەڵبەستەکانی دواییدا ئەم ترسە بە ئاماژە دەر دەخات کە باسی دەکەین.

هەڵبەت مەبەستی مەنسووری هەلاج ئەوە نیە کە ئەو خودایە. سوهرەوەردی سەبارەت بەو دەڵێ:
تۆ لە نیوە ڕۆژی هاویندا ئاوێنەیەك لە زەوی لە ژێر تیشکی بە هێزی خۆردانێ. تیشکی خۆر ئەوندە کاریگەری لەسەر ئاوێنەکە هەیە کە ئەگەر لێ بپرسێ تۆ کێیت دەڵێ من خۆرم. ئیتر خۆی هەست ناکا.

ئەوین و جوانی تەجەللای زاتی خودایە هەڵبەت نەزاتی بێ‌مەکان و بێ‌زەمان و لایەزالی خودا بەڵکوو تەجەللای ئەو، یان وەکوو مەولەوی کە عیرفانیکی ئەهوەن و میانەڕەوی هەیە دەڵێ سێبەری ئەو. وەك دەڵێ «... مەوجوود هەرتۆنی، ماسیوا سایە». واتە بوون هەر تۆی جگە لە تۆ هەرچی هەیە هەر سیبەری تۆیە و بوونی ڕاستەقینەی نیە. عیرفانی توندڕەو و دینە کوردیەکان ناڵێن سێبەر، دەڵێن تەجەللا واتە خۆ دەرخستن. یان دەرکەوتنی سیفات یان دەرکەوتنی زات).

میر وتی تۆ برۆ مەم ببینە و ئەگەر مردبوو زیندووی کەوە. من پەشیمان بوومەتەوە... زین کە بیستی" ڕابوو خەملی ژیای تا فەرق ـ بوو بەحرێ لە حوسن و گەوهەران غەرق.

دایە و ستی و سەد کچی خزمەتکار دەرکەوتن ... زین وەکوو زوهرەی [20] هەڵپەڕکێکەر بۆ لای مەحرەم بوونی تایبەتترین گۆشەی زیکری ئەوین ڕویشت. ئەو کاتەی کە گەیشتنە «خەڵوەخانە» دەرگای بەندیخانەیان کردەوە... دایەن و ستی هەندێك چوونە پێشەوە. دیان لە قەراخی «زەریا» وە، وەکوو «سەدەف» ئەو نوقمەی زەریای ئەوینی خوێنخۆر «دوڕ»ی گیانی بە خۆڕایی لە دەس داوە. (بو شوبهاندن لە دینە کوردیەکان کەڵك وەرگیراوە. خانی بە مەبەستەوە زەریا و سەدەف و دوڕری هێناوە).

ستی و زین لە بەندیەکانیان پرسی لە کاتی مردندا چۆن بوو؟

| | |
|---|---|
| خەلقێ کو دگەل مەمێ گرفتار | گۆتن کو مەدی ژسەتح دیوار |

ئەو خەڵکە کە لەگەڵ مەمدا زیندانی بوون وتیان لە ڕووی دیوارەکەوە دیان کە:

| | |
|---|---|
| بەرقەك ب عەجەب مەمێ بسەرکەت | شەوقەك ژسەرێ مەمێ بدەرکەت |
| تیشکێکی سەر سووڕهێنەر کەوتەسەری | تیشکێکی‌تریش لەسەریەوە هەستا |
| یەك شوبهەتی ڕۆژوییێك چو هیڤ بوو | یەك شوبهەتی زێڕ و بیێك ژزیڤ بوو |

یەکەمی وەکوو خۆر (زەرد) و ئەوی‌تر وەکوو مانگ (سپی) بوو، یەکێ وەکوو زێڕ و ئەوی دی وەکوو زیو بوو

ئەو شەمس و قەمەر کو موتتەسیل بـوون
دەرحـــال پیکڤـــە موزمـــەحیـــل بـــوون

ئەو مانگ و خۆرە کە پێوەندییـەك بـوون
لـــەو حالـــەدا وەك خۆنـــەمان و پێکـــەوە

گاڤا وەکـوو، پێکڤـە موقتـەبیس بـوون
ئەو هەر دوو ل زەوتێ مونعەکـیس بـوون

ئـەو کاتـەی کـە پێکـەوە تێـكگـیران و
ئەو دوو نـوورە پێکـەوە رەنگیـان دایـەوە

ئـــەو رەنـــگ کریـــان مونیرورەوشـــەن
زیندان ل مـەبوویـە سـەحـن گولشـەن...

وەها ڕووناك بوونەوە کە زیندان وەکوو باخی پڕ لە گوڵ لێمان ڕۆشن کرایەوە.

مەمیش کە ئاگای لە خۆ نەبوو خوێن لە دڵی دلۆپەی دەکرد. ئێ دیدەیێ دل نەبوویێ مەفتووح ـ ئینکار نەکی تەجەللیا رووح. ئەی ئەوەی کە چاوی دڵت نەکراوەتەوە، تەجەللای ڕۆح (کە وەکـوو تیشکی زەرد و سپیە) بە درۆنەخەیتەوە...

هاوبێژی مەمی بەڕێز هەواڵ و هاودەمی مەمی لە زینداندا ئاگادار کردەوە

وی مورشـــیدێ، قـــەنـــج ل وان نـــەزەرکـــر
قەلبـێ وی د قـەلبـــێ وان ئـەســەرکەر

ئەو وەکوو مورشیدێ چاك بویانی ڕوانی و دڵی ئەو لە دڵی بەندیاندا رەنگی دایەوە.

هـــەم خـــەلوەتیـــا مـــەمـــێ گرفتـــار
بـــوو پـــەردەگوشـــایێ یـــار و ئـــەغیـــار

(ئەو کاتەی کە میر بە پێشنیاری بەکر ئیزنی بە خۆشکیداو ئەم ئیزنە لە نەریتی کوردەواریـدا پێویست بوو، مەم و زینیش هەر چاوەڕێی ئەم ئیزنە بوون، زین مرد. گیانی دەم و دەس چوو بۆ لای مەم و پیێگەیشت. پیێگەیشتنی دوو ئەویندارە لە پێش چاو زیندانیان بوو. لە پێشدا تیشـکی زەرد کەوتەسەری مەم. تیشکی زەرد ترووسکەی زاتە واتە گیانی مەم. رەنگدانەوەی زات سیفاتە کە لـە جوانی ئافرەتیشدا بەدی دەکرێ. لێرەدا نووری زەرد گیانی مەمە. دەزانین نووری سپی هـەر نـووری زەردە بەڵام رەنگدانەوەی هەبووە وەك چۆن رەنگدانەوەی تیشکی خۆر لـە مـانگـدا سـپی دەبینـرێ، نووری مـانگ هەر نووری خۆرە بەڵام سپیە، لێرەدا تیشکی سپی گیانی زینـە کـە لـە پـێش چـاو زیندانیەکان تێکەڵاو دەبن و مەم خوێن لە دڵی دەتکێ و دەمرێ. دەبێ ئەوەش بزانین لە ناو گشـت ئارییایەکاندا گیان وەکوو نوورە خانی نەمر بە ئەمانەت پاریزییەوە ئـەم چـیرۆکەی گێـڕاوەتـەوە و نەترساوە چون لە زەمانی ئەودا کەس پێوەندی نێوان جامی هەیڤ و پیری موغانی نەدەزانی تا بـە توانجی کوفر و ئیلحاد بیکوژن).

﴿خوێنەری بەڕێز ئاگادار دەکەمەوە کە لێرەدا ناچار بۆ چەند لاپەرە درێژەی چیرۆکەکە دەبڕین و لەسەر جام واتە پیاڵەی شەراب خواردنەوە و هۆم یان کوردی کرمانجی هەیڤ واتە مانگ و خواردنەوەی مانگ کە پەیامی تیشکی مانگ و خۆری خانی ئاماژەی تەواو بەوەیە هەندێ باس دەکەین. لە پێشدا وتمان کە میترا بۆ پێك هێنان و درێژەی ژیان لە زەویدا مانگ واتە گا کە لە گشت دەقەوێداییی و پەهلەویەکاندا سەنبولی مانگە قوربانی دەکات. دەزانین تیشکی مانگ هەر تیشکی خۆرە جا میترا لە ڕاستیدا خۆی قوربانی دەکا. ئەمە ئاماژە بە تەوحیدێکی قووڵە. لە پیشینەی ئوستوورەیی میترا لە وێداکاندا وتمان کە میترا «سۆما» بە زبانی هیندی ئەمڕۆ واتە مانگ دەکوژێ و گیانەکان وەکوو باران دەرژێنە سەرزەوی.

لە زەویدا لەو بارانە لە پێشدا گیایەك شین دەبێ هەر بە ناوی «سۆما». سۆما هیندیەکان ئیستا بە مانگیش دەڵێن. ئەم وشە لە ریگوێدادا «سەئومە» و لە ئەوێستادا «هەئومە»یە. گۆڕانی «س» بە «ه» لە زبانە ئارییایەکاندا زۆرە وەکوو لە کوردیدا ماسی لە فارسیدا، ماهی. لە سانسکریتدا ماس، لە فارسید ماه واتە مانگ...

لە ئەوێستادا هەئومە هەر بە مانای ئەو گیایە و ئیتر بە مانای مانگ بە کار ناچێت. وتمان کە ئاینی زەردەشتی لەگەڵ میترایی‌دا دژبەری هەبووە. گیای هۆم لە ناو هۆزە ئاریەکاندا وەکوو گیایەکی لێهات کە لە کێوەکانی کوردستان بەتایبەت هەورامان و کرماشان و سنەو مەریواندا زۆرە. میهرپەرستەکان هەئومە لە پەهلەوی‌دا «هۆم» یان، دەهێناو دەیان کوتا و تەخمیریان دەکرد و خواردنەویەك مەستی هێنەریان لێ دروست دەکرد. هەر بە ناوی هەئومەیان هۆم لە داب و نەریتی زیکر و هەڵپەرکێی ئاینی‌دا لە دەس پیری موغان یان مورشیدی کامیل یان «مەقامی میهر» دەسەندرا و دەخورایەوە. ئەمە وەکوو سەنبول و ئاماژەیەك بوو بۆ ڕەنگدانەوەی نووری خودا لە دڵدا وەك ڕەنگدانەوەی نووری خۆر لە مانگدا. پاشان زەردەشتی دوایین ئەمەی وەکوو زۆرنەریتی میترایی موسادیرە کردو لە ئاتەشگاکاندا بە کار دەهێنرا، بەڵام نە بۆ ئەو مەبەستە چون ئاینی کومەڵگای دەرەبەگایەتی ئەوە هەڵ ناگرێ. لە سەرەنجامی کاکەیی‌دا ئەم چوارینە وەکوو شیعری پیرشالیاری هەورامی یەکەم شاعیری کاکەیی سەدەی پێنجی کۆچی هاتووە.

| | |
|---|---|
| هۆمم دەرمانەن، هۆمم دەرمانەن | هۆم پەی گرد دەردێ دار[٢١] و دەرمانەن |
| هۆم مایەی جوانی بەر ئەورامانەن | هۆم مایە و وەشی دەروون زامانەن |

واتە دەرمانم هۆمە، دەرمانم هۆمە، هۆم بۆ گشت دەردێ دەرمانە. هۆم لە کێوەکاندا هەوێنی جوانی هەورامانە و هەوێنی خۆشەوە بوونی دڵی بریندارانە. لە ئەدەبی کوردی و فارسی بەتایبەت لە شیعرەکانی مەحوی و مەولەویدا زۆر ناوی شەراب و پیری مەیخانە و پیری موغان و موغ و موغبەچە و مەیگێڕ و ... هاتووە کە بنەماکەیان هەر ئەو سەنبولە میترایییە.

بۆ کاریگەرینایینی کۆنی کوردان لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا بۆ دیوانی مەولەوی مامۆستا مودەرریس کە نزیك بە چوار سەد رەخنەم لێ ڕاست کردبۆوە سەرەتایەکی تا شەست لاپەڕییم نووسی کە بە داخەوە لە باشوور و ئەورووپادا بلاوگەر ئەو کتێبەی بیسەرەتاکەی من بە ناوی دیوانی مەولەوی ـ حەسەن گۆران ـ محەمەد حیجازی بلاو کردەوە کە لەوەدا ئەو زاراوە گەلمە روون کردۆتەوە.

ئەم زاراوەگەلە وەکوو مەیگێڕ و پیری موغان و... لە پێشدا لە ئەدەبی کوردی کاکەییدا دەرکەوت نەك لە فارسیدا. چەند چوارینە لە سەدەکانی دوو سێ و چواری کۆچی لە سەرەنجامدا هەن کە زۆر پێشتر لەوەی ئەم زاراوەگەلە بێتە نێو ئەدەبی فارسیەوە گوتراوە، ئەوانەی هەڵم پژاردووە لە کتێبی «ناماوەران یارسان. د ـ س ـ سەفیزادە» دەرم هێناوە. مانا کردنەکانی لە خۆمە.

ئەم چوارینە بە ناوی «باوە گەرچەك»ی هەورامی سەدەی چوارەمەوە هاتووە:

| | |
|---|---|
| پیاڵەم پڕەن، پیاڵەم پڕن | وێم مەست و تا نە پیاڵەم پڕن |
| مەستیم وە مەیل ئەو خاوەن دوورەن | مەیخانەم نە دڵ شارەکەی سڕەن |

پیاڵە واتە دەفری مەیەکەم پڕە. پیاڵە یان جام ئاماژە بە دڵە کە لە بەرانبەر «مەی» واتە تیشکی خوداوە پڕدەبێ خۆم مەس و پیاڵەیشم پڕە. مەستیم بە مەیلی خاوەنی دوور واتە خاوەندگارە و مەیخانەکەم لە نێو شاری سڕدایە (سڕ، ڕاز لە ئەدەبی کاکەییدا وشەیەکە بۆ دەربڕینی تیشك و تاریکی هەر دوو، واتە بنەمای ئافراندن).

«دایە تەورێز»ی هەورامی شاعیریتری کاکەیی سەدەی چواری کۆچی دەڵێ

| | |
|---|---|
| ڕازەن پیاڵەم ڕازەن پیاڵەم | سەرسامم نە بەزم ڕازەن پیاڵەم |
| بادەی پیاڵەم یاوا وەناڵەم | پەوکە ناڵەکەم بەرز بی نەعاڵەم |

پیاڵەم واتە دڵم تیشکی خودای تێدایە. بۆیە زۆر سەرمەستم لەم بەزمەدا، چون نوور لە پیاڵەمدایە. ئەوەی وا لە پیاڵەمدایە کاری کردە سەر ناڵەم بۆیە ناڵەکەم لە جیهاندا بەرز بۆتەوە بە واتایەکی‌تر کە نووری حەق لە دڵمدایە جیهان ڕەنگدانەوەی دەنگی منە. وەکوو ڕەنگی زەرد و سپییەکەی خانی، بە بەیانێکی‌تر خانی دەڵێ هەم زین مەمە و هەم مەم زینە. تیشک هەر یەك تیشکە تەنیا ڕەنگدانەوەی زۆرە،

مەلای جەزیری دەفەرموێ:

گەرچی هەردایم ژمیهرێ نەینەکا دل بەدەرە من

وەك هیلالی سوبح تێم ئەز، جارنان بم ناپەدید.

واتە گەرچی هەمیشە بە ئەوین ئاوێنەی دڵی من وەکوو مانگی شەوی چواردەیە بەڵام جارجار کە میهر و ئەوین لە من کەم دەکاتەوە وەك هیلالی ئاخری مانگ گوم دەبم. شوبهاندنی دڵ بە مانگ و نووری مانگ بە ئەوین کە لە خۆرەوە دەیگرێ لەسەر بنەمای ئاینی میهری و دینە کوردیەکانە. هەروەها دەفەرموێ:

پیری موغان ژ شیشەیێ، دا، مەسەفینەکی مەیێ - شوکری خودێ کوقولرمەك من ژ خوەڕا قەبالە کر.

موغ، لە ئەوێستادا «مەگوو» کە لە زمانی یۆنانی‌دا کراوە بە مەگووس و پاشان تەعریب کراوە بە «مەجووس». لە پەهلەویدا «مەغوو پەت». بە سەرۆکی موغەکان وتراوە. مەغووپەت لە فارسی ئێستادا دەڵێن «مووبەد». موغ لە پێش ئیسلامدا بە پیاوی ئاینی میهری و زەردەشتی هەر دوو گوتراوە. لە زەردەشتی‌دا پیری موغان نیە. پیری موغان واتە مورشیدی کامیل یان مرۆڤی کامیل یان مەقامی میهر کە لە عیرفانی پاش ئیسلامیدا پێ دەڵێن قوتب[٢٢] کەسێکە کە هەفت پلەی لە ستایشتگاکانی میهریدا بڕیوە و خواردنەوەی هۆم (هەیڤ= مانگ) لە ستایشتگاکاندا دەدا بە باوەڕمەندانی میهری. واتە پیری موغان لە شووشەوە پڕ بە پاپۆڕێ مەی پێدام. سپاس بۆ خودا کە لەو شووشە، زەریایەك مەی بۆم قەبالە کرا.

هەروەها دەرفەرموێ:

وەرین جاما هیلالی‌دا، ژعەکسێ ماهێ نەو بینی ... ئـەی مـەیگێـڕ لـە پیالـەی هیلالـی کـە تیشکی مانگی نوێی تێدا دەبینی بۆم تێکە.

یان دەفەرموێ: میسلی مەهی نەو گەرتە دەڤێتن مەببینی ـ مێژە بکە جامێ تو دبینی چ کەسم ئەز.

واتە وەکوو مانگی نوێی لاواز ئەگەر ئەتەوێ من ببینی بڕوانە بۆ جامەکەت ئەوسا دەزانی مـن کێم. جام واتە دەفری مەی خواردنەوە، یان پیالەمەبەست دڵیشە. دڵ وەکوو جام و مـانگ جێگـای ڕەنگدانەوەی نووری خودایە. جزیری دەڵێ گەرەگتە من بناسی بۆ جامی پڕ لـە شـەرابەکـەت یـان دڵی پڕ لە نوورەکەت بڕوانە. دیسـان جزیـری بـۆ شـوبهاندن لـە زاراوەگـەلـی میترایـی و دینـە کوردیەکان کەڵك وەر دەگرێ، دەڵێ:

گوەدە ئاوازی نەیێ وەختێ سەما، تێن موغبەچە + فەهمی ڕازێ گەردکی چاوا، دنالن چەنـگ و ساز.

بە دەنگی شمشاڵ گوێ گرە ئەوکاتەی لەو دەنگە «موغبەچە»کان دێنە هەڵپەڕین، ئەگەر ئەتەوێ لە ڕاز و ڕەمزتێ بگەی بزانە چلۆن چەقەنەو ئامرازی‌تری موسیقا دەناڵن. موغبەچـە واتـە مـوغی چکولە ـ موغی منداڵ. مەبەست ئەو گەنجانە کە قوتابی ستایشتگاگەلـی میهـرین و لـە پلـەی خواردان. ئەوانە هەر کە هاتنـە ستایشـتگاوە لـە نفووسـی پـیری موغانـەوە تیشـکی خـودا لـە ڕوخسارییاندا دیاری دەدا. هەندێ نووسەر بە کوڕی جوانکیلەی مـەیگێـر لـەمـەی فروشـیەکانـدا مانایان کردووە کە هەڵەیە.

مەی هاتە فینجانـا سـەدەف، کـەس دی ڤـەخـۆت ئـیرۆ ب خـەف؟

سـاقی ب چـەنـگ و نـای و دەف فـەرفووریـا مـەهتـابدا

واتە مەی ڕژایە نیو پیالەی سپی وەك سەدەف، ئایا کەس هەیە بە دزییەوە بخواتـەوە؟ نـا، چـون مەیگێڕ لەگەڵ دەنگی چەقەنە و شمشاڵ و دەف، جامی فەرفووری مانگەشەوی‌دا.

فەرفووری واتە «فەغفوور»[٢٤]ی. فەعفوور نازناوی پادشای چینە کە جامی خواردنەوەی تایبەتـی هەبووە. لە لایەکی‌ترەوە چین واتە ڕۆژهـەلات سـەنبـولێکی عیرفانیـە بـە مانـای کانگـای نـوور. فەرفووری مەهتاب واتە جامی پڕ کراو لە مانگە شەو، جامی پـڕ لـە نـووری مـانگ کـە پـیری موغان یان موغبەچە دەیدات، هەر جامی هەیڤ یان هەئومەی ستایشتگاگەلـی میهرپەرستیە.

ئەم وشە و ڕێکەوەندگەلە لە ناخی فەرهەنگ و کەلەپووری کوردیدا بووە کە مەلای جزیری و خانی و شاعیرانی کاکەیی و ئیزدی و لوڕگەلی عەلەوی و... کەڵکیان لێ وەرگرتووە. لە کوردی زازادا بە خودا دەڵێن «هۆما» و «هووما». هووما، هەر هەئومەی ئەوێستاییە کە لە کوردیدا بووە بە هەیڤ واتە مانگ. هووما بە مانای خودا هی سەردەمی هۆم پەرستیە کە ماوەتەوە.

یان دەفەرمێ:

موغبەچەیێن مەیفرۆش هەر سەحەرێ تێن سەما + بادەخوران نۆش نۆش مانە، ل دەورێ جەما.

موغبەچەکانی مەیگێڕ واتە قوتابی پلەی خوارووی ستایشتگاگەلی میهرپەرستی لە کازیوە پێش تیشك هەڵدانی خۆر دێنە هەڵپەرکێ. مەی خۆرانیش بە دەورەوە وەکوو کۆمەڵ لەگەڵ نۆشانۆش[٢٥] وتن بە یەك ماونەتەوە.

.. گۆتە مە دورِ دانەیێ ئەم ژتە و تۆژمەیی

لەوب حەقیقەت یەکین مەسنەلە بێشوبهە ما

ئەو دورِە تاقانە واتە ئەو موغبەچە پێمی گوت ئێمە لە توێن و تۆ لە ئێمەی بۆیە بەڕاستی یەکین و ئەم پرسە گومانی تێدا نەماوە جا:

دامە ب دەستی سڕی جام ژهرەنگێ دورِی

جەزبەگەها حال و دل پڕ شەوەشاندن هەما

بە دەستی نهێنی (سِر، یان ڕاز لە ئەدەبی کاکەیی‌دا ئاماژە بە جیهانی مەلەکە تاوسە لێرشدا ئەو مانا دەگەیەنێ) واتە بە دەستی مەلەك تاوسانەوە جامێکی لە ڕەنگی «دورِ» (واتە، تەجەللای خودا لە دورِ لە ئەدەبی کاکەیی‌دا)، پێدام. بەوە جێگای جەزبەو حاڵی دڵی بە زۆری تێك شێواند.

بادە مەنۆشی ژدەست، چوومە ژ خۆ مامە مەست

قەترە ب بەحرێ گها بەحرب عەینی خوەما

لە دەستی ئەو مەیەکەم نۆشی لەسەر خۆ چووم و مەست مام، دڵۆپ بەزەریا گەیشت و زەریا بێگۆڕان وەکوو خۆی ما.

جا پێم وایە خوێنەری بەڕێز هەستی بەوە کردووە کە موغبەچە ئێدی وەکوو مامۆستا هەژار موکریانی لە دیوانەکەی مەلادا مانای کردووە، «مناڵی دەم ڕووت و مەیگێڕی مەیخانەکان» نیە بەڵکوو سەنبولێکە کە پاش ئیسلام لە ئەدەبی سوفیە موسلمانەکان و دینە کوردیەکاندا ئەو

کەسەیە کە نەفەس و جەزبەی پیری موغانی پێ گەیشتووە. نووری حەق لەوێدا بۆ بڕینی قۆناخگەلی تەکامول بزوێنراوە. ئەوەیە کە جوانە و سەرمەستی ڕاستەقینە نەمەستی خواردنەوەی ئەلکولی دەخاتە دڵی سۆفی و عاریفەوە.

... جان و دلێ من ئەوە حورر وەشێ من ئەوە + پادشەهێ من ئەوە ئەز، ل دەرێ وی گەدا.

ئەو موغبەچە گیان و دڵمە جوانی وەك حۆری بەهەشتیمە ـ پادشامە من لە درگای ئەودا سواڵ کەرم

یـــار کـــودی ئـــەم گـــەدا دەســـت ب دەســـتێ مـــەدا

ئـــەم ب ســـەمـــایی بـــرین رەقـــس و ســـەمـــاژی وەمـــا

یار واتە ئەو موغبەچە کەمنی وەکوو داماو دی دەستی دادەستمەوە و بردمیە کۆڕی هەڵپەرکێوە واتە هەلپەرکێیەکی ئاینی و عیرفانی. بە چوونی من بۆ نـاو کـوڕی هـەڵپـەرکێ ئـەو سـەمـا و هەڵپەرکێیە وەکوو خوی مایەوە و هیچ زیادی نەکرد وەك چۆن لە پیش‌دا وتمان دڵـۆپ بـە زەریـا گەیشت بەلام زەریا هەر ئەوە بوو کە بوو. ئەمە ئاماژە بە تەوحیدێکی قووڵی ئاینە کوردیـەکانـە.

لە بەیتی ئاخردا دەڵێ: وەحدەتی موتلەق مەلا نوورە د قەلبان جەلا ـ زۆر دوێ مەسـئلە ئـەهلـی دلان شوبهە ما

ئەی مەلا یەکبوونی بێ‌چەند و چۆنی پاژەگەلی جیهان، نوورە و ژەنگ لابەری دڵە بەلام شتێکی سانا نیە و زۆرکەس لەم پرسەدا کەوتنە گومانەوە.

لە غەزەلێکی‌تردا هەر سەبارەت بە جام و مەی دەڵێ:

ئـــەووەڵ کویـــار دامـــە، یـــەك زەررەیـــەك عینایـــەت

قســـمـەت مـــەخـــەمر و جامـــە دەدەفتـــەرا هیدایـــەت

فەیزا عولوومی حیکمەت جا ما سەدەف کو گێڕا ـ مەژ دەستێ موغبەچان گرت ب موسحیف و ب ئایەت.

یەکەمجار کە یار واتە تەجەللای زاتی خودا نەختێك سەرنجی داین ئیتر بەشمان خواردنەو و جامـە لە دەرفتەری ڕێنوێنی ڕاستەقینەدا. فەیزی زانستەکانی فەلسەفـە (حیکمـەت پـاش ئیسلام بـە فەلسەفە دەگوترا) لە لایەن خوداوە وابوو کە بۆمان جامی سـەدەفی گێـڕا کـە دوڕی تێدایـە ئـەو جامە کە ئێمە لە دەس موغبەچەکان گرتمان وەك موسحیف و ئایەگەلی قورئان گرتمان. بـاس لـە

خواردنەوەی ئەلکولی و کوڕی جوانکیلەی مەیگێڕنیە وەکوو هەژار دەڵێ. باس خوداناسی هەرە قوولە، کە مەلا لە زاراوەگەلی دینە کوردیەکان وەکوو سەدەف و دوڕ و موغبەچە و... کەڵك وەر دەگرێ. جا زۆر ڕوونە کە مەبەست لەمەی ڕەنگدانەوەی نووری خودایە و مەبەست لە جام دڵە کە لە شیعرەکانی دایە تەوریز و...دا ڕووغان کردەوە و ئەم شوبهاندنە هەل دەگەڕێتەوە بۆ سەئۆمەی وێداکان و هەئۆمەی ئەوێستا و هەیڤی کرمانجی کە لە ستایشتگاگەلی میهریدا وەکوو خواردنەوەی مانگ واتە ڕەنگدانەوەی تیشکی خۆر یان تەجەللای خودا لە دڵدا دەخورایەوە. لە بەیتی چواردا دەڵێ

عاریف هەتا نەنۆشیێ ژدەست مەیفرۆشیێ + غائیب نەبووژ هۆشیێ، پەیدا نەکر ویلایەت.

واتە عارفی خواناس هەتا لە دەستی مەیفرۆش جامێکی نەنۆشی و لەسەر خۆ نەچوو نەیتوانی جێگەداری خودا بێت لە زەویدا.... لە بەیتی ٨دا دەڵێت:

جاما د دەستیێ شاهید ژەنگیێ ژ دل دەشووتن + پیری موغان ژرەندان وەهوەدکر ریوایەت

واتە جامی مەی لە دەستی شاهیدی حاڵ و جەزبە، ژەنگ لە ئاوێنەی دڵ پاك دەكاتەوە. ئەمە پیری موغان لە زار پیاو چاکانەوە دەیگێڕاوە.. لەم چەشنە شیعرانە لە دیوانی مەلای جزیریدا زۆرە. مامۆستا هەژاری نەمر کە کۆی کردۆتەوە و بە سۆرانی مانای کردووە و ڕەنجی زۆری لە سەرکێشاوە لە زۆر جێگا پەیامەکەی شاعیری وەر نەگرتووە. بەڕاستی بۆ ماناکردنی تەواوی شیعرەکانی مەلای جزیری چەند زانا پێویستە.

مەلا خۆی دەڵێ کە مەبەست لەمەی شەرابی ترێ نیە:

دامن سرۆش(٢٦) وەرمەی بنۆش زەوق و خرۆش لەو چووم ژهۆش

ژوێ عیشوەیا یار بوو خوویا ئەونە ژمەیا ئەنگوور بوو

واتە بە دڵ پەیامی پێگەیاندم وەرەمەی بنۆشە. خۆشی و دەنگم بەرز بۆوە و لەو مەیە لەسەر خۆ چووم. بەم نازە کە کردی، یار واتە تەجەللای خودا ئاشکرا بوو. ئەو لەسەر خۆ چوون و مەستیە، هی شەرابی ترێ واتە خواردنەوەی ئەلکولی نەبوو....)

بزانین خانی سەبارەت بە مەی و جام چی دەڵێت. چەند بەیت لە ساقی نامەکەی هەڵ دەبژێرین:

ساقی بکە جام ئاسمانی      راحا وەکوو رووح جاودانی..

مەیگێڕ، تێکەناو جامی ئاسمانی(مانگ) شادیەك وەکوو گیانی هەتا هەتایی

ساقی تو برێژە جام مینا      ئاقا کو دکەت زەمیر بینا...

ساقی برێژە نێو جامی شووشەیی بێرەنگ (دڵ) ئەو خواردنەوەی کە چاوی دەروون دەکاتەوە

مومکین کو ژ فەیز بێنهایەت      یەك قەترە ببت ل من عینایەت...

رەنگە لە فەیزی بێسنووری خودا لەو مەیە قەترەیێك بە من بدرێ.

یەعنی بگەهێتە جانی شەوقەکەك      هەتتا بگەهێتە قەلب زەوقەك...

یانێ بە دڵۆپێك لەومەیە نوورێك بکەوێتە گیان و تا خۆشی و مەستیەك بکەوێتە دڵ و

تەسفییەی دل ببت مە حاسل      هەڤدەنگ ببم دگەل عەنادل

بەو مەیە، خاوێن کردنەوەی دڵ بۆم بە دەس بێت و لەگەڵ بولبولان دەنگم بەرز کەمەوە

بشکۆژ بپشکڤن ژخاران      خوونرێژ ببن دەمێ هەزاران....

تا بەو جامە مەیە خونچە لە دڕکان بپشکوێ و لە دەنووکی بولبولان لە بەر خوێندنی زۆر خوێن بڕژێت.

بەد حاڵ ببم سەران بدەردەم      بێقال ژباتنێ خەبەر دەم...

من مەست و بێهۆش بکەوم و سەرومێشکم بە دەرچێت، جا بێ قسە لە جیهانی دەروون خەبەر دەم

دا کەشف ببن ژمن کەرامات      مەشهوود ببن ل من مەقامات

تا بەو جامە کەرامات لە من دەربکەوێ و مەقامگەل و قۆناغگەل بە من ببینن

بــێدەنــگ ژ غــوور دل ب ئاهــەنــگ    سـەدرەنـگ سـەدا بـدەم وەکـی چـەنـگ

بێدەنگ و ئاواز لە دەمەوە لە کوورانی دڵمەوە بە ئاواز وەکوو چەقەنە سەد چەشنە سەدام لێ دەرکەوێت

سـازا دلـی کـول، ب زێـر و بـەم بـت    سـازەنـدەیـی عیشـق زیـن و مـەم بـت...

بەو مەیە، سازی دڵی بە کوڵ نزم و بەرز بێتەوە و بتوانێ ژەنیاری ئەوینی زین و مەم بێت (ئـەم گشتە تایبەتمەندیە هی کام مەی و مەیگێڕە؟ دیارە هەرمەی و مـەیگێڕەکـەی مـەلای جزیریـیـە. مەیگێڕ پیری موغان یان موغبەچەیە. مەی ئەوین واتە نووری تەجەللای خوداو جامیش دڵـە. ئەم شوبهاندنگەلە پاشماوەی زاراوەگەلی میترایییە کە تیشکی خۆر و مانگ و خواردنەوەی هەئومە یان هەیڤە.

وتارەکەمان سەبارەت بە نووری زەرد و سپی کە لە تەوقی سەری مەمەوە هـەسـتا و مـەم مـرد درێژەی کێشا، بە کورتی دوو پاتی کەینەوە: نووری زەرد ئاماژە بوو بـە تـەجـەللای زات و نـووری سپی تەجەللای سیفات وەکوو ڕەنگدانەوەی تیشکی زەردی خۆر لە مانگدا کە ڕەنگـی سـپیە یـان مەی کە تیشکی خۆرە جامی مانگ پڕ دەکات و دەبێ بە مانگی ڕووناکی شـەوی چـواردە وەکـوو مورشید و پیری موغان کە جامی خواردنەوەی هەئومە، یان هۆم یان هەیڤ دەدات بە موریـدان و بە نووری حەق دڵیان پڕ لە مەستی و خۆشی و تیشك دەکات.

چۆنیەتی مردنی مەم لە زار زیندانیەکانەوە تەواو بوو). دایەن و سـتی چـوونە پێشـەوە وتیـان مەمۆ، هەستە زین هات، بێگۆمان گیانی تۆیە ئەوا هات ... هەرچی گوڵاویان لێ پژاند و دەمـار و دڵیان بزواند هیچ جووڵەیەکیان لە جەستەی مەم بە دی نەکرد بەڵام دیان دووکەڵێ لەسـەریەوە هەڵسا (وەك بڵێی دووکەل چاوەڕێیە تا ببێت بە گڕو تیشك یان جەستە گیانی تێکەوێتەوە).

زین هاتە پێشەوە وەکوو مانگی چواردەیەك کە خەرمانەی دابێت. حیجابی لە ڕۆخسار هەڵگرت وەکوو خۆرێ

دێتە سەر مانگی لاوازی یەك شەوە بە ئاشکرایی بە مەمی گوت:

زینێ وە هەگۆتەوی بەدیهی ـ قوم یا جەسـەدەن نوفیختـوفیهی «قـم یـا جسداً نفخـت فیـە» (هەستە نەی جەستە. فووم تێکرد). ئاماژەیە بە ئایەتـی ۲۹ لـە سـوورەی ۱٥ی قورئـانی پـیرۆز «فاذا سویتە نفخت فیە من روحی فقعولە ساجدین» واتـە ئـەو کاتـەی کـە گلـەکـەی ئـادەمـم

ڕێکوپێك کرد فووم تێکرد واته له بوونی خۆمم کرده جەستەیەوە و وتم بە فریشتەکان کڕنۆشی بۆ بەرن. (ئایا زین خودایە کە مردوو زیندوو دەکاتەوە و لەگەڵی بە ئایەت قسە دەکات؟ نا، ئەوە ئەوین و جوانیە کە لە تەجەللاکانی خودایە. تەجەللاکانی ئەوێش جوێ لە زات و سیفاتی ئەو نیە. تو دەتوانی بە ئەوین و جوانیپەرستی زووتر لە عیبادات بە ئەو بگەی. ڕێگایەکە کە میترایش بۆ قوتابیانی ستایشتگاکانی میهرپەرستی داینا بوو. خودایش بۆ توی داناوە. ئەمەیە ناخی قوتابخانەی خوداناسی کوردی).

شەوقا خەبەرێدوێ شەپالێ + بەربوویە سەرێ دوێ شەمالێ

شەوقی قسەکانی ئەم شۆخ و شەنگە، گڕی بەردایە دووکەڵی مۆمی جەستەی مەم.

ئەو دووکەڵە لە شادیدا داگیرسا و لە جەستەدا ئاگر کەوتەوە، ئەو گۆشەنشینەی زیندان هەستا بە هەڵوێستی تەواف (ی ڕووی زین). (مەگەرزین کێیە تەواف بکرێ؟)

لە پێشدا دەم و دەس تەسدیقی کرد (واتە مەقامی زینی بە دروست و ڕاستەقینە بوون پشت ڕاست کردەوە) وەك بە ئاوی زەمزەم دەس نوێژ تازەکاتەوە،

ئەوەڵ ئەوی کرب سیدق دەردەم تەجدید و زووب ئاب زەمزەم

وەستال موسەللە و مەقامێ وی جوبهە گەهاندە ئیستلامێ

(وەك) لەسەر جێنوێژ وەستاو سوجدەی کرد (وەك فریشتەکان چۆن لەبەر ئادەم کڕنۆشیان کرد کە لە بوونی زاتی خودا لە جەستەیدا بوو) یەك دوو تەوافی لە دەور بەیت (ی حەرەم) داکرد (حاجیگەل بۆ تەوافی خانووی کەعبە بە ئاوی زەمزەم دەس نوێژ دەگرن و پاشان تەواف دەکەن. مەم کە لە پێش مردندا یەك جار تەوافی کردبوو دەسنوێژی تازە کردەوە و یەك دوو جار بە دەوری زیندا گەڕا (خانووی کەعبە خودای تیدایە و جەستەی زین تەجەللای خودا واتە ئەوین و جوانی تێدایە) پاشان چەند قسەیان لەگەڵ یەك کرد:

پەروانەیی گۆ تو خوەش دەلیلی شەمعێ وەهەگۆ تو خوەش «خەلیلی»...

پەپوولە (مەم) وتی تو ڕێ نوێنی چاکی. شەم وای وت: تو خۆش خەلیلی واتە وەکوو ئیبراهیم کەوتیتە ئاگرەوە بەڵام بە جێگای سووتان بە خودا گەیشتی... (بە وردی وەکوو ئیبراهیم، ئەو بە پێغەمبەری و مەم بە ئەویینداری)

پەپوولە وتی تۆ جوانی وەکوو حۆر (کە جوانی زاتی خودات تێدایە) شەم وتی تو نووری زاتی خودای...

دایەن و ستی و کچانی خزمەتکار و بەندیەکان لە وت و ویژ و بۆن و بەرامەی ئەوانە سەرمەست بوون.

وتیان بە مەم ئەوا ئێمە هاتووین تا تو وەکوو قەیسی عامری واتە مەجنوون شێت نەبی. ئەگەر زین هۆی شێتی تۆیە و میر هۆی لاکەفتەیی تۆیە ئەوا زین لەگەڵ تۆدا قسە دەکات و میریش دڵی بۆت سووتاوە.

گیانت هەرزان لە دەست مەدە... هزر و بیرت بخە کار. کۆت و زنجیرمان لێت هەڵگرت و هەڵسە بچینەکن میر ئەو خاوەن دڵی بە رەحمە و تۆی بەخشیوە....

مەم کە ئەم مۆچیاریانەی بیست وتی: من ناچمە لای هیچ پادشایەك. نامە دیلی دیل. ئەوانە میر و وەزیری ناراستەقینەن.... میرێك کە مردنی هەبێت میر نیە و لە تەخت لاچوونی هەبێت ئەوە دیلە....

(میر) ئەو کەسەیە کە ئاوینەی جوانی دروست کردووە و تیری خۆی بە زوڵف و خاڵی ڕۆخساری جوان دەوەشێنی و

فانووس بەدەن کری موتەلا تێدا ژمراکری تەجەللا

فانووسی جەستەی زیرکاری کردوەو لە ناویدا وەکوو «من» تەجەللای کردووە. (من و توو ئەو، نیە. هەمووشت ئەو و تەجەللای ئەوە).

ئەوەیە میر و حەکیمی خاوەن بەرزی کە لاچوون و گۆڕانکاری و کەم بوونەوەی بۆ نیە...

خودا بۆ مرۆڤ بە ژنانی جوان و کوڕانی جوان باخی بەهەشتی ڕازاندۆتەوە (بەلام)

لێ جەننەتی عاشیقان جودایە میعاد لە قایی کیبریایە

بەڵام بەهەشتی ئەویندارا جیاوازە ئەویش ژوان لەگەڵ دیداری مەقامی گەورەیی خودا دایە (کە)

عالیترەوی ژباغ رزوان ناگونجنەوی چو حوور و غیلمان

لە باغی بەهەشت بەرزتر و لەوێدا هیچ حۆر و غیلمان ناگونجێ...

شەهباز ژقەید مەرکەزا فەرش پەروازکر و گەهیشتە زولعەرش

شاباز لە بەندی ناوەندی زەویەوە هەڵفڕی و گەیشتە ئاسمانی عەرشی خودا.

(شاباز لە کاکەیی و عیرفانی کوردیدا سەمبولی ئەو مورشیدەیە کە بە پلەی ئاخر گەیشتووە. لە عیرفانی ئیسلامیدا بە قوتب ناو دەبرێ. لە میترایی‌دا سیمورغە کە هەندێ باس کرا و لە بەشی سوهرەوەردیدا بە چرو‌پری باس دەکرێ. لە میترایی و لە دینە کوردیەکان وەکوو ئێزدی و کاکەیی و عەلەوی‌دا شاباز پاش مردن بۆ خۆر دەچێت و تێکەڵاوی تەجەللای یەکەمی خودا واتە مەلەکەتاوس دەبێت. شاباز ئێستا پەلەوەرێکە لە باز گەورەتر و ژێر باڵی سپیە و لە هەڵۆ چکولەتر و نەختێ لەواشە گەورەترە و زۆر توندڕەوە. ئەم سەمبولە لە فەلسەفەی سوهرەوەردی کورددا وەکوو سیمورغ ناسراوە کە باسی دەکەین.

لە کتێبی کاکەیی «شاهنامەی حەقیقەت»ی جەیحوونابادی‌دا بە سەرهاتێ وەکوو مردنی مەمی تێدایە: لە پێشدا «عابدین جاف» کە یەکێ کە هەفت سەرداری ئاینی کاکەییە لە دوژمنانی سان سەهاك بوو و هەموو کارێکی دژ بە «یارسان» دەکرد. باوك و سێ برا گەورەی لەسەر ئاینی کاکەیی بوون بەڵام خۆی دژ بەوان بوو. تا باوکی سکاڵای بردە لای سان سەهاك.

سان سەهاك وتی خەم مەخۆ عابدین پیاوێکی گەورەیە. لە قوتابخانەدا تیشکی حەق تەجەللای پێ کرد و وەکوو خۆی لێ هاتەوە.

لە خۆ بێخەبەر ما. بۆ هەرچی دەیڕوانی خودای دەدی، شێت و سەرسام ما... سەرمەست هات بۆ «پردیوەر» بۆ لای سان سەهاك... یارانی سەهاك دییان سەرمەستی خودایە. وتی بم بەن بۆ لای سان سەهاك.

«شەریفە» دەرگاوانی سەهاك بوو کە حاڵی عابدین دی لیێ پرسی... وتی جگە لە سەهاك کەس نابینم. بردی بۆ لای سان سەهاك. کەوتە کرنۆش و زمان ماڵین بە خاکی ئاستانەی سەهاکدا و خاوێنی دڵی خۆی پیشاندا.

سەهاك هەر هاتە قسە عابدین بیستی و مرد. گیانی بە تەواوی دەرچوو. سەهاك فەرمووی تەرمەکەی بێنن بۆ خەڵوەخانە و عەباکەم بکیشین بە سەریدا. شاعیر بە دڵی خۆی دەڵێ، ئەی دڵ وەکوو عابدین بمرە ئەگەر مەست و ئەویندارى حەق بی. ئەگەر لەو کاتەدا بمری گیانت پێوەند بە زاتی حەق دەبێ. تا نەمری پێوەند نابی.

عابدین چون لەو حالەدا مرد دەنگی تەجەللای خودا واتە سان سەهاکی بیست مرد، پاش نەختێ رۆحی لە بەهەشتدا ما. کە بە ئەمری خودا گیانی هاتەوە لەشی و زیندوو بووەوە (ئینسلاخ) چاوی کردەوە تەجەللای جەماڵی خودای لە سان سەهاکدا دی. جیاوازی مەم و عابدین

لەمەدایە کە مەم تەجەللای جەماڵی خودای لە ڕۆخساری زینـدا بـەدیکـرد. بـەڵام عابـدین لـە ڕۆخساری سولڵتان ئەسحاقی بەرزەنجیدا و کەوتە کرنۆش عابدین هەتوانی دینی جـەماڵی حـەقـی نەبوو تا هەفت جار مرد و زیندوو بۆوە. بۆ جاریٚ هەفتەم سان سەهاك فەرمووی جامیٚ شەرابی بۆ بێنن (وەکوو پیری موغان کە خواردنەوەی هۆم دەدا بە موریدان). جامیٚ شەرابی بدەنی تـا ڕۆحـی ئارام بگریٚ و جەماڵی حەق بە چاکی ببینیٚ. دیارە هەفت جار مردن ئاماژەیە بە هەفـت قۆنـاغی برینی ڕێگای حەق لە ستایشتگاگەلی میهریدا کە لەگەڵ ڕەنج و سەخلەت تێکـەڵاوە. لـە پلـەی هەفتەمدا ڕۆح بە نووری حەق واتە جامی هەئومـە، یان هۆم یان هەیـڤ دەحـەسـێتەوە. هـەر ئـەو جامـەیە کە خانی و جزیری و مەولەوی و مەحوی و... ناوی لیٚ دەبەن.

وتمان کە میترا بۆ مرۆڤ کە ئەو گشتە دوونادوونە دەکات دڵی سووتاو قۆناغگەلی هەفت پلەیی لە ستایشتگا تاریکەکاندا پیشاندا. ئەم قۆناغگەلە لەگەڵ ریـازەت و ڕەنـج تێکـەڵاوە. مامۆسـتا هاشمی ڕەزی بە هەندیٚ لەم قۆناغگەلە لە کتێبە ناوبراوەکەیدا ئامـاژەی کـردووە. لـەوانـە پلـەی پێنجەم، دەفەرمیٚ: «چاوگەلی مورید دەبەستن

رووتی دەکەنەوە. لە جێگاگەلی ترس هێنەرەوە دەیبەن و گوشارگەلی جەستەیـی سـەختی پـیٚ دەدەن پاش ئەو ڕەنج و گوشارگەلە خواردنەوەیەکی پیٚ دەدەن کە لەسـەر خـۆ دەچـیٚ». هـەڵبـەت گشت ئەم سەختیگەلە ئاماژەیی و سەمبولیکە. لەسەر خۆ چوون ئاماژە بە مردنە کە پـاش ئـەوە بە قۆناغی شەشەم دەگەن کە ناوی قۆناغی خۆرە...

مـەم چاوی حەقبینی بوو، دووبارە بە فەرمانی زین کە تەجەللای خودایە زیندوو کرایەوە و پـاش قسە لەگەڵ زین ئیتر بە جەستەی مردووەوە نەیدەتوانی بمێنی).

کە گیانی مـەم لە زیندانی جەستەدا جودا بۆوەو گریان و شیوەن لە شاری بۆتـان هـەسـتا، لـە جێگایەك تاجدین و بەکر بە هەڵکەوت یەکیان دی.

تاجدین: دەم و دەس بەکری کوشت.

کاتیٚ کە گەیشتە سەربرادەرەکەی و نوورێکی لە چـرادانەدی تـاج لـەسـەر و پـەڕەی دەفتـەری بەخشینی مـەمی لە دەستدا فڕیٚدا و خۆی خستە سەرتەرمی مـەم،

دیـن[28] بـوو ژ تـەحـەسـسـورا برایـیٚ          هەرچـی کـوددی وی ئـەژدەهـایی[29]

لە خەمی براداشیت بوو و هەموو شتیٚ بە ئەژدیها دەهاتە پێش چاوی. وەکوو شێتی لێهات هەر کەسیٚ دەهاتە لای دەیەویست بیکوژیٚ. ناچار وتیان بە میر. میرهـات و دەس و پـای تاجـدینی بـە

زنجیر بەست. کە تەرمی مەمیان هێنا تاجدین بە هاوارەوە زنجیری پساند و وەکوو ئـەژدەهایـەك لـە ئەشکەوتەوە دەرکەوێ هاتە سەر تەرم. تا بووتەکەی مەمی بەرز کردەوە و نایە سەر سەری. خـەڵك بە هاوارەوە بە دوای کەوتن. ژنان و کچانی شار قژیان بڵاو[30] کردەوە و بۆ مەم رەشپۆش بوون[31] و بە ئاوازەوە شینیان دەگێڕا. زین بە باڵای شەنگەوە هەستایە سەرپێ:

وەکوو ئەستێرەی زوهرە (لە ئەدەبی کوردی و فارسیدا زوهرە یان ناهید ئەسـتێرەی مۆسـیقا لـێ دەر و هەڵپەرکێ کەری ئاسمانە) بە هەڵپەرکێ چووە پێش تەرمەکەوە. چەمەری گێڕان بە تـەپڵـی رەشەوە کە وەکوو هەور دەیگرماند، بە کوڵمی خوێنینەوە دەگریان وەك لە مێرگی پڕ گولەوە باران ببارێت. کاتێ چوونە گۆڕستان دییان مردوویەکیان لەسەر دوو دار هێناو وەکوو تۆپیوبێ خستیانە سەرزەوی. پرسیان ئەمە کێیە وتیان بەکرە تاجدین کوشتوویەتی و دونیا بە کوشتنی ئەو شادە.

زین کە ئەمەی بیست بە میر و تاجدینی گوت دەرحەق بەم گەندەڵە دوژمـنی مـەکـەن خـودای ئافرێنەری جیهان ئەو ڕۆژەی کە ئەوینیدا بە ئەویندارانِ قینەوەریشیدا بە بەرهەڵستکاران.

مـەوجـوود کـرن دەمـا ژ مـەعـدووم ئـەم پێکڤـە لازمـین دمـەلـزووم

(ئەو کاتەی) کە لە هیچ جیهانی بەدیهێنا ئێمە (مەم و زین و بەکـر) پێویـسـت و پێداویسـتی یەکین ئیمە وەکوو گوڵ و ئەو دڕك، ئێمە گەنج و ئەو مارە. گوڵ بە تیژیدڕك دەپـارێزرێن و گـەنـج (خەزینەی زێڕ و زیوی لە ژێر خاك شاردراوە) مارەبیپارێزێ. ئەگەر لە پێشدا ئـەو لـەگـەڵ ئێمـە خراپەی کرد بەڵام لە ئاخرەوە بوو بە چاکە (و پێگەیشتنی ئەوینی ئێمە). لە ڕواڵەتدا بەرهەڵستی ئێمە بوو بەڵام لە ناوەرۆکدا دۆستی ئێمە بوو (ئەمە هەر دژایەتیە لە بنەمای بووندا کە ئامـاژەی پێ کرا) جا لە گۆرستانی ئێمەدا بینێژن. (لەباسی مەلەکەتاوسدا وتمان ویست و گەلالـەی حـەق وەکوو سککە دوو ڕووی هەیە و ڕووی دووهەمی لە ستایشتگاگەلی میهریدا وەکوو پەیکەرگەلـی ترس هێنەر بەتایبەت شێر پیشان دراوە. ب.ب. وێنەکان. ئەم دوو لایەنە لە دینە کوردیەکاندا لـە شتێك یا لە جەستەیێکدا دیاری دەدا).

قـەت مومکینـە تـاب و ئابگینـە ئـەڤ ڕەنگـە نەکـەت قـەبـوول کینـە؟

ئایا دەبێ ئاوینە ڕەشی و قین نەنوێنی. (تەنیا ئەویندارانی ڕاستەقینە وا بیر دەکەنەو و بۆ خـاس و خراپ میهریان هەیە).

تەرمی مەم نێژرا

مەم وەکوو دوڕ سپاردیانە گەنج و بەکر وەکوو مار لە خوار مەمەوە نێژرا. زین هات و وەکوو سەوڵ سێبەری خستە سەر گۆڕەکەی مەم. وەکوو شمشاڵ دەناڵی... بە ئاهەنگی گریانیەوە هەر نۆ ئاسمان دەنگیان لێ دەهات. گشت چین وتوێژی بۆتان پێکەوە هاواریان دەگەییە ئاسمان.

زین لەسەر گوڕی مەم دانیشت. لەگەڵ ئەو قسەی کرد: ئەی خاوەنی جەستە و گیانم من باخ و تو باخەوانی، باخەکەت بێخاوەنە. بێتۆ من بۆچی هەم... ڕۆخسار و زوڵف و خاڵ چاکترە بە تالان بدەم. چاکە دار خورمای لەشم لەرزەی مەرگدایگرێ تا خورماکانی داوەرێ.

خاك و خۆڵ بەسەردا کەم بسکان هەڵکەنم. بەڵام نا، چون ڕەنگە تۆ ڕازی نەبیت نەختێ لە جوانی من کەم بێتەوە... چاکترە هەروا ئەمانەتی تۆ پێشکەشی خوداکەم... ئامێزی بۆ گوڕی مەم کردەوە و گیانی دەرچوو. وەکوو شەمێ بگوژێتەوە، جەستەی بە مەزار و گیانی بە خودا سپارد...

سێ شەو و سێ ڕۆژ دەنگ و هاوار دەگەیشتە ئاسمانی عەرشی خودا تا زین ئەو جۆرە کە وەسیەتی کردبوو بە داب و ئاین ڕێ خرا.

... ئەو دوو گەوەهرە لە سندووقێکدا وەکوو خۆر و مانگ لە بورجێکدا مانەوە:

بێئەوە بارستا لە نێوانیاندا بێت لە پاڵ یەك نێژران و بە یەك سپێردران

پاشان دەرگای سندووقی مەم و زینیان کردەوە میر وتی هانێ ئەوە مەعشووق بۆ تۆ سێ جار بە وتنی «مەرحەبا» وە سەدا لە جەستەی مەمەوە هات

هەمیان کو بهیست سرێ تەحقیق        بیلجوملەکرن ب عیشق تەسدیق...

گشت ئەوانەی کە سرِی جیهانی ڕاستیان بیست تێکرا ڕاستی ئەوینیان تەسدیق کرد...

بە خاك و خاشاك (ماڵ و خۆشیگەلی دونیا) پیس نەبوون ئەمەیە شوێنەواری ئەوینی پاك و خاوێن و بێبەهرەمەندی لە لەش و تینوو چوونە دەرگای حەق: خانی پاش ئەمە دەڵێ

سوێند بە خودا ژیانی خۆشیان بە ئەوینەوە ڕابوارد و خۆش پێکەوە مردن، ئافەرینی خودا.

خانی پاش ئەم مردنە پیرۆزە بۆ خۆی نزادەکات:

یارەب بە جوانی جەمالت[٣٢] و بە ئەڤینی جەلالت[(٣٣)] بە شیرینی ئەوینداران و بە قینەوەری بەرهەڵستی ئەوان .... بە مەم و ئەوینی ئەو بە خەمی زین سوێندت دەدەم:

وەختێ کو جودا دکی ژجانی        بێبەهرەنەکی ژ عیشق «خانی»

ئەو کاتەی کە گیانی خانی لە جەستەی جوێ دەکەیتەوە لە عیشق بێبەهرەی نەکەی

یەعنی ژ وەلایەتا موحەممەد        مەحرووم نەکی تو یارەب «ئەحمەد»

واته لە دەسەڵاتی شەریعەتی محەمەد (د.خ)دا ئەحمەدی خانی بێبەهرە نەکەی.

حیکمەت ئەوەیە لە خانووی ئەم دنیادا تەنانەت ئەو کاتەیش کە مەم و زین و بەکر مردن و چوون بۆ جیهانی دیکە بنچینە و خدەی خۆیان دەردەخەن. لەسەر گۆڕی مەم و زین دوو نەمام سەوز بوون یەکێ سەوڵ و یەکێ سنەوبەر کە سەریان هەڵدا، لقەکانیان وەك دەست لە گەردن کەوتنە سەریەك. لەو لاوە لەسەر گۆڕی بەکرداریێکی «کەنیر»، کە داریێکی هەرەدڕکینە سەوز بوو. ئەم دارە پەلی هاویشت و خۆی گەیاندەداری مەم و زین و پەلی خستە سەریان. ئەگەر تو چل ساڵ گیای «بێسان مار» بە هەنگوین تاودێریکەی، لە بەرخۆرپەرزەردەیکەی و گوڵاوی لێ بپژێنی و لە دەوریدا شەکر بڕژێنی و وەك هیندیان خزمەتیکەی جگە لە میوەی تاڵ هیچی لەبەر ناچنی.

چیرۆك ویژ وتی پیرێکی (واتە مورشیدێکی) دلۆڤان و ئەویندار کە قسەی وەکوو ڕووناکی ڕاستەقینەی بەیانان بوو، کاتێ دەچووە جەزەبەو حاڵ گیانی لە جەستەدا نەدەما (ئینسلاخ) و نهێنیگەلی لێدیاری دەدا و...

... وتی، لە خەون و ئیلهامدا بووم کە چوومە باخی بەهەشت. دوو هەزار حوور و غیلمانم دی کە گشت بە ئالاوە لە دەور کۆشکیك کە لە دوڕی شاهانە دروست کرابوو ڕاوەستابوون. یەکێك وەکوو بەکرم دی کە تانج و «بن پەڕ»ی لەسەر نابوو (نەم زانی مانای بنپەڕچییە) گۆچانیکی خێزەران (گوچانی پادشاکان لە قامیشێکی قەڵەو و سەخت و سووکە) بە دەستیەوە بوو. نەمزانی کێیە. وتم ئەی خاوەن پلە و مەقام تو خاوەنی ئەم کوشکەیت یان پەردەداری؟

گۆ شەیخ توما نزانی کێمە؟ ئەز ئەو بەکرۆکی قاپووچیمە

وتی ئەی پیر تۆ مەگەڕ نازانی کێم من ئەو بەکرۆکەی دەرکەوانم (لە مەم و زینی فولکلوریشدا بە کرۆك هاتووە)

ئەز موشتەرکێ مەمێ و زینم لەو لێرەهە ئاستان نشینم

من هاو بەشم لە ئەوینی مەم و زیندا بۆ ئەوەیە لێرە لە بەر دەرگای ئەم کۆشکەدام

لێرە باوەڕ پێکراو و داراییم هەیە و لەم کوشکەشدا بەشم هەیە

ئەو کۆشکە هەشت نهۆمی هەیە. نهۆمی یەکەم هی منە (ئاماژەیە بەهەشت ئاسمان کە ئاسمانی هەشتەم لە میهرپەرستیدا جیهانی نووری خودایەو مەم و زین لە نهۆمی هەشتەمدان)

پێم وت ئەی ئاخر بە خەیر[٣٤] بۆم ڕوونی کەوە تێ بگەم. دروستە بەخشندەیی خودا بۆ گشتە بەڵام بۆ چ خەیرێ (کام کاری چاك) ئەم مەقامەیان پێ دای؟ وتی ئەی پیر تۆ هێشتا نەبوویی بە

عاریف (خوداناس) بەڵام تەنیا لە دونیا تیٚگەیشتووی. من ئەگەر بە وتە و ڕواڵەت بەرهەڵستی مەم و زین بووم بەڵام بە تیٚ ڕوانینی ڕاستەقینە دوستی وان بووم. (وەکوو شەیتان کە بە خەڵەتاندن ئادەم و حەوای لە بەهەشت هێنایە دەریٚ و لە ڕاستیدا نەجاتی دان). من ئەوانم لە خۆشیەکانی ژیان کێشا پاشەوە و بە ڕەنج و ئێشان (وەکوو قۆناخەکانی ستایشتگاکانی میهرپەرستی) ڕاهێنران... من بەهەشتێکی تەواوم دا بە ئەوان، لەو بەهەشتە خشتێکیان‌دا بە من (واتە باخ و کۆشکی بەهەشت وەکوو خشتێکە بە لای بەهەشتی ئەویندارانەوە). شێخ وتی ئەی گوناهکاری ئاخر خەیر، تاجدین کە تۆی کوشت چی لیٚ هات؟ وتی خودا بەخشی و کرا بە بەهەشتی و نەچووە دۆژەوە... ئەو بۆ دامەزرانی جیهان و ئاسوودەیی خەڵك منی کوشت. بە ڕواڵەت ئەگەر کاری خراپی کرد بەڵام لە ناخی جیهانەوە ئەو خراپە[٣٥] بوو بە ئاسایشتی خەڵك

یەك عەدلە ل سوورەتی جەفایێ　　　　یەك قەهرە ل کیسوەتی وەفایێ

عەدلێ واتە دادگەری کیسوەت واتە جل و بەرگ

لیٚ پەردەکەشیٚ ڕمووز و حیکمەت　　　　بیٚسیر نەکر ئەو کنووز قیسمەت...

بەڵام نهێنکەری ڕاز و حیکمەتگەل بیٚ ئەوەی ڕەمز و ڕازی تێدا نەبیٚ ئەو گەنجگەلیە دابەش نەکردووە.

ئەوەی چاکە و چاکە دەزانیٚ ئیتر جگە لە چاکی چ نازانیٚ، هەرچی ئازاریان بدەی ئەوان بە دڵ لە گەڵت وەفا دەکەن، ئەمە هیمەتی تایبەتی ئەویندارانە و پلە و پایەی ڕێگای ڕاستکارانە،

سەبارەت بە نووسینی چیروکی مەم و زین دەڵێت:

خانی کوژ جام عیشق دین بوو　　　　ئەو شۆرە شەراب پیٚ شرین بوو

خانی شیت و (مەستی) جامی عەشق، ئەو شۆڕ شەرابەی (چیرۆکی مەم و زین) لا شیرین بوو....

ئەوەی کە دەڵێن بایە ئەگەر چاك گویٚی بۆ ڕاگری دەنگی شمشاڵە. ئەم شمشاڵە (ئەم هۆنراوەی مەم زینە) نە حەڵاڵە و نە حەرام. «پەردە»ی نیە بەڵام بیٚمەقام نەخوێندراوە... بەڵام مەبەست ئەو لەم وتووێژگەلە و ئەم چیرۆکە:

زاهیر کرنا جەمال عیشقە　　　　سابت کرنا کەمال عیشقە

عیشق ئاینەیی خودا نمایە　　　　خورشێد سیفەت خودان زیبایە

واتە مەبەست نواندنی جوانی ئەوین و سەلماندنی کامیل‌بوونی ئەوینە ـ ئەوین وەکوو ئاوێنەیەك خودا پیشان دەدات و وەکوو خۆر خاوەن تیشکە. گێج و گوم مەبە ئەوین ڕاستیە. گەوهەری جوان و کیمیایە (ئەگەر لە مسی بدەی دەبێ بەزێڕ) قەدری بزانە زۆر زۆر بە قیمەتە... بەلام زۆربەی خەلك نەزانن و لە گیانی خۆ تێ ناگەن.

ئەمانە دوو دەستەن. هەندێکیان گەوهەری ژیانیان کە ئەوینە بو ڕابواردنی خۆشی دنیا خەرج دەکەن و هەندێکیش بۆ بە دەس هێنانی بەهەشت بە فیڕۆی دەدەن:

ئەو هەر دوو جەلەب دبن زیانکار          مەحرووم دبن ژزەوق دیدار

واتە ئەو دوو چەپەلکارە زیان‌کارن و لە خۆشی دیداری حەق وەلا دەنرێن. چ ئەوانەی کە بۆ دونیا تێ دەکۆشن چ ئەوانەی کە بۆ بەهەشت هەوڵ دەدەن.

(خانی پاش تەواوبوونی چیرۆك کە بە ئەمانەت پارێزییەوە کردویە بە هەلبەست و شیعر «زوربەی ئەم مەم و زینە شیعر واتە هەوێنی شاعیرانەی بەهێزی تیدایە هەندیکیشی هەلبەستە». باسێکی ئایندارى هەیە تێیدا دەلێ: ساقی ئەم جیهانە خەونە یان خەیالٚ؟ (نا وا نیە) ئەم جیهانە بە تاڵ و خەیالٚ نیە لە پێشدا ژیانە و ناکامی نەمانە. وجوودێکی بێ‌وجوودە بەلام بەداخەوە هەتاهەتایی نیە. پاژەگەلی ژیان لە جوانی‌دا هاوبەشن بەلام زووش لە یەك جوێ دەبنەوە... چەرخی ئاسمانەکان وەکوو ئاشن و هەر دەگەڕێن. دەخڵ و دانی مرۆڤە لە ژێر زەوی پڕ لە تارد (وردە ئێسقان). دانە (مرۆڤ) پەیتا پەیتا دەڕژێتە ئەم ئاشەو دەهاڕدرێ (ڕاستەقینەی مەرگ کە وەکوو ڕاستەقینەی ژیانە) ئەمە کەوڵ بە کەوڵ دوو پات دەبێتەوە. گشت مردوو و زیندوو لە ژیان و مەرگدان جگە لە گیانی پاك نیهاد و خۆش ڕەوش. کێلگەڕ ئەمانە بە تایبەتی دەچێنێت. ئەمانە هەتا نەڕزن (نەمرن) شین و خاوێن نابنەوە. دانەکان کاتێ ببن بەهێشوو دەبێ بکوترێ. ئەو مرۆڤانە دەبێ ڕەنج بکێشن، وەکوو هازیە، چی بەکار دێت لە لاشەدا دەمێنی و چی خراپە دەبێ بڕێژرێ.... بە هەرحاڵ عارەقی مەی ژیان کە دڵۆپێنرا و قابیلی دەروونان هات و توانی ڕەنگدانەوەی نووری گیان بێت... دەتوانێ وەکوو باران کە گیاو میوە پێ دەگەیەنی میوەی گیان بە کەماڵ بگەیەنێ تا ئەو گیانە دەبێتە جێگای دەرکەوتنی تیشکی جوانی حەق. ئەو گیانە دەم و دەس خۆشەویستی خودا دەبێت و ناوی ئەو سەرنجی چاکان ڕادەکێشێت. ئەمانە وەکوو دار خورما لق و پۆیان کەمە (واتە ماڵی دنیایان کەمە) هەروەها زۆرکەمیشن بەلام ئەم گیانە تایبەتانە دەبێ ڕاهێنرێن. گاهێ (لە پێشدا) بە خۆری شەرع بسووتێن و گاهێ بە مانگە شەوی پارێز کردن

لە خراپە و خۆشی ئەم دنیا داگیرسێن، بەم حاڵەوەتا لە بەرزی مەقام و پلـە و پایـە، دانەکـەون و نەکەونە خاکی چارە رەشییەوە، ناتوانن بکەونە ڕێگای «تەریقەت» و پاشـان ڕێگـای حـەقیقـەت. دیسان ناتەواوە و ڕاهێنەری پێویستە:

هـەتتـا نـە بـدەسـتێ پیرمـەی خـوەر    ئـەو هـل کـەلـتن دخـومێ تـەکبـەڕ

واتە ئەگەر بە دەستی پیری مەیخانە (مورشیدی کامیل) لە هوومەی گەورەی مەیدا نـەکوڵێ و ئەو کاتە کە کوڵاو لە هوومەی گەورەی شەراب هاتە دەرەوە واتە لە رەوشتەکانی سیفاتەوە بپێـوی هەتا تەجەللاکانی (زات)، یان لە گەرمی جوانی و جەماڵەوە گـەیشـت بـە شـەوکەتـی جـەلال، گەرمی ئەو تەجەللاگەل و ئەو ئاگر و وزەگەلە، وەکوو تۆزی (بێبایەخی) لێ کردو لەو تـۆزەیـش بۆق هەستا و تۆزی وردیش بو سەرهەڵچوو، ئەوسا دەچێتە پلەوپایەی تەجرید (واتـە دابـڕان لـە هەموو کەس و هەموو شت) ئەو کاتە کە جەوهەر (واتە بنەما) لە عەرەز (واتە ڕواڵەت و لـق و پۆ) جوێ بۆوە دووبارە بۆ کولێنێکی دیکە دەچێتە بۆتەوە (بۆتە دەفرێکی چکۆلەیە کە زێڕ و شتی وای تێدا دەتوێننەوە) بەڵام بۆتە هەرچەند تەنگ و چکۆلەیە (وەکوو سیا چاڵەکـەی مـەم) بـەڵام وەکوو سارایەکـی خۆشـە کـە دڵـی ئـەوانـەی تێـدا دەکرێتـەوە... ئەگـەر هێشـتا نـەختاڵێ لـە (هەستکردنی) خۆی تێدا مابێ بەکار نایەت. (دەبێ خۆی لـە بـیر چـووبێتەوە و هـەمـوو هـزر و فیکری هەر خودا بێت (وەکوو ئاوێنەکەی سوهرەوەردی کە باسمان کرد) چون بێ‌ئەوێنی شا (خودا) کەس ناچێتە ڕێگای خوداوە. تا خۆی «فانی» نەکات بە «بەقا»ی حەق ناگات.

فانی بوون بۆی بەقایەو بەقابۆی دەبێتە لەقا (لەقائوڵڵا).. (خانی نـزا دەکـات کـە خـودا ئـەم پلەوپایەی پێ ببەخشێ). بەڵام ئەگەر خودا موقەددەری نەکردبێت کەنگێ بۆ ئێمە ڕوودەدات.

ئەگەر موقەددەر نەبێت عابید تەنیا بە یەك دوو ڕوویی لا دەخرێ و گوناهکار تەنیا بە یەك نـزا پاك دەبێتەوە.

جا بۆ خەڵکی ساکار باشە لە پێشدا خودا بە حەق بناسێ پاشان لێی بترسێ و چۆنیەتـی دیـنی لە زانایان بپرسێ و چۆن دەڵێن وا بکات و خۆ بداتە دەستی دلۆڤانی خوداوە بەڵکوو ببـەخشـرێن. (بەڵام خەڵکی ئەوینداری ڕاستەقینە وانین)

(خانی لە دوایین هۆنراوەکانی مەم و زیندا واتە دوایی نامەکەیدا لەگەڵ خۆی قسە دەکات)

ئـــەی ڕاکــــیی واقیعـــی پیـــادە    ئـەی عاشـیقی سـەفحـەیـی د سـادە

ئەی سواری ڕاستەقینە بەڵام پیا سەکەر، ئەی عاشقی پەڕەی ساکار و نـە نووسـراوی پـەرتووك. ئەی شاعیری جامی مەی و بەخت ڕەش، ئەی ساحیری سیحرباز... ئـەی قـەڵـەمـی سـەرتراشـراوی بەدرەنگ. ئیتر بە سیەتی. کەم پەرتووکی خۆشرەنگ و ئاڵ و واڵا بە ناوی خـەت و خـاڵان بکـەوە و ئەو خاڵ و زوڵفانە بە «ب» و «د» ناوزڕاو کە ((«ب» و «د») واتە «بەد» بە مانای «خراپ»ە).

ئەوەی وەکوو خەت (تووکی ناسکی سەر لێوو لاجانگی کچ و ژن و گەنج) نەختێ تارمایی هەیە بەڵام لە نەرمی و ناسکی دوور نیە. ئەگەر دیت وەکوو خەتی مەشقی تەواو بوو یان وەکـوو خـەتی «نەسخ و سولس» بەرچاوە، ئەو نووسەری پەڕەی جوانیە، دەبێ خۆی وەکـوو دڵبـەڕانی بـێ‌تـووك، خەت بە ڕوویەوە نەبێ (مەبەست ئەوەیە کە نووسەر دەبێ فێڵ و کەڵەك لە کاریدا نەبێ «سـولس و نەسخ» دوو جۆر خەتن). (ئەگینا)، خەت لە ڕۆخساری وەکوو مانگدا زۆر جوانـە. ئـەی قـەڵـەم تۆش (بەس خەت بە سەفحەی سپیدا بنووسە) تەواوی کە و درێـژەی پـێ مـەدە. هەرچەند قسـە وەکوو دوڕ بێت ئەگەر درێژی کەیتەوە ناخۆشە. نابینی جەواهیر زۆر بە قیمەتن هێ ئەوەیە کەمـن. زۆر قسەی هەڵە و سەهو و تاوان و... لە بیر چوون و کۆبەندی ناپەسەندی سەرکێشـی و گوناهـت نووسی (خانی بە چەشنێ بۆ داهاتوو! تۆبە دەکات) ئیتر بە سەمەنووسە، هەمووت شەکەت کـرد. کەس نیە ئافەرینت پێ بێژی (تەنانەت لە سێدارەت نەدەن زۆر باشە). ئـەی بـێ‌ئـەدەبـی خراپـی بەشەرم، ئەی سەرکێشی ستەمکار و سیاکار زۆر جار سەرتم بڕی (واتە سـەری قـەڵـەم کـە پـاش نووسینی زۆر بێ‌کەڵك دەبوو نەختێکیان لێ دەبڕی هەروەها زۆر کەس لەسەر نووسین سەربڕان) بۆ ئەوە خەتی تاوانت دەنووسی. هەندێ جار سەرتم دەتاشی بۆ ئەوەی بۆ گوناح تێ‌دەکۆشای تۆ وەکـوو خانی جنێوت دەدا و وەکوو مانی (کافر) وێنە گەریت دەکرد (خوێنەری بەڕێز بزانن لێـرەدا خـانی زۆر ناوی سەربڕین و سەرتاشین و جنێو و کوفر دێنی. دەیەوێ ترسی خۆی بۆ خوێنەر دەرخات کـە ئەگەری ئەوە هەیە وەکوو سوهرەوەردی و هەلاج و... لە سێدارە بدرێ و یان بە کـافری بـزانن یـان لانی کەم دوژمێنی پێ‌بدرێ و سەری بتاشن. ئەم قسانە کە دەیکات بۆ دەرچوون لە ژێر شیری مەلا قشریەکانە) ئەی قەڵەم زۆر بە سەرگەرمی و گوناه تێك ئالای. تۆبـە لـە هـەڵـە و سـەهو بکـە «مـەشغوول بەسە ب لەعب و لەهوان ـ تەوبا خوە بکەژ، خەتا و سەهوان. (خانی لـە پێشـدا بـە ئاماژە ڕوونی دەکاتەوە کە تۆبە کردن لە ترسی سەرتاشین و سێدارەیە ئەگینا هۆی تۆبە چیە)

جـــا ڕەك وەرەســـەر تـــەریق تـــەوبـــە هنـــدێ نەگەهیشـــتیەتـــە نەوبـــە

وەرە سەر ڕێگای تۆبە هەتاکوو نۆبەت نەگەیشتووە (نۆبەی چی؟ نۆبەی لە سێدارەدران؟!)

شیعرەکانی ئاخری مەم و زین وەکوو تۆ بە نامەیە. بە هەندێ لە بەیتەکانی ئاماژە دەکرێ.

... ئەی خامەیێ سەر تەراشیێ بە دەرەنگ     بەس نامەیی خوەش قوماش و خوەش

ڕوو ڕەشکە بناڤێ خەتتو خالان     بەدنام بکە ب بێ و دالان

سەهوو غەلەت و خەتا و نیسیان     مەجموعەیی ناپەسەند عیسیان

تەحریرکرن تە بێ تەئەممول     کێ دێ بکەتن ژتە تەحەممول؟...

ئەی بێ ئەدەبا خەراب بێعار     گوستاخ و ستەمگەرا سییەهکار

هندێ کوسەرێ تە من قەلەم کر     ئەو چەند تە، خەتێ خەتا ڕەقەم کر

هندێ کوسەرێ تەمن تراشی     ئەو چەند تەکر گونە تەلاشی

فەحاشی تەکر ژ ڕەنگێ خانی     نەققاشی تەکر مسالێ مانی...

مەشغوول بەسە ب لەعب و لەهوان     «تەوبا» خوە بکەژ خەتا و سەهوان

گۆ: «ئەحمەد» ئەگەر تونە خەبیسی     هەرچی تو دگوو من ئەو نویسی...

ما، نەی بخوەتشتەکی دبێژت؟     خامە بخوەرشحەکی درێژت؟

یا ڕەب تو دزانی خانییێ ژار     «تشبیه بە خامە یا گرفتار»!

قەلیی وی ددەست تەدایە نەلحەق (بە فریای     دەستی وی ددەست خوەنینە موتلەق

گاڤا کولوی تە، سەرقەلەم کر     هەرچی تە ئیرادە کر ڕەقەم کر

ئەو گەر عەلەم و وەگەر قەلەم بوو     پەیوستە ددەست تە سەرقەلەم بوو

نەفع و زەرەرێ خوە ئەو نزانت     یا قەنج ژبۆ خوەڕا چ زانت

(قەلەم جواب دەداتەوە):

وتی ئەی ئەحمەد ئەگەر تو باشی ئەوەی تو وتت من نووسیم. ئەی پیس ئاکار باش دەزانی ئەوەی تۆ وتت من نووسیم. من لە زەلکاودا قامیشێك بووم تو منت بڕی و لە دۆستان جویێت کردمەوە... تو لە باخی ئەویندا دەگەڕای و دڵی منت (وەك شمشاڵ) بەداخی ئەوین کون دەکرد. تۆ فووت کردە جەستەی من و گیانت پێدا و لە من هاوار و ناڵە بەرزەوە دەبوو. دەنگی من لە فووی تۆیە و من کە نەیەکی خامۆش بووم تۆ بەزمی خۆشیت بە من دەگێڕا... ئەی خودا تۆ دەزانی خانی هەژار وەکوو پێنووسی لە داوکەوتوو دڵی داوەتە دەستت بە فریای بگە. دەسی لە دەس خۆیدا نیە لە دەست تۆدایە. هەرچی تۆ ویستت ئەو نووسی. ئەگەر نەختێ ئازادی لە وتندا هەبوو ئەویشی دایە دەس تۆ... ئەو سوود و زیانی خۆی نازانێ و نازانێ چی خاسە بۆ خۆی بیکات گشت ویستی تۆ بوو و ... مەبەستی ئەویش هەر تۆ بووی

خەتتی تەیە سەر نقشت و سەرمەشق          سێ ساڵە خەتی خەتا دکەت مەشق

ئەی خودا خەتی تۆیە بەسەرهات و سەرنووسراو کە ئەو سێ ساڵە بە هەڵە مەشقی نووسین دەکات

لە ڕێکەوتی هەزار و شەست و یەکدا لە جیهانی غەیبەوە جوێ کرایەوە ئیستا تەمەنی کەیشتووەتە چل و چوار ساڵ لەم ماوەدا لە کاری خراپ موڵك و ماڵی زۆرە بەڵام لە کاری چاکە سککە پوولێکی بێبایەخیشی نیە.

هەوەڵ کە تو لە (غەزەلی)ی ژیان «مەتلەع»ی مەشقت پێدا لە ئاخرەوە حوسنی «مەقتەعی» پێ بدە.

(غەزەڵ پارچە شیعرێکی جوانیپەرستی ئەویندارانەیە کە بە بەیتی یەکەمی دەڵێن مەتلەع و بە بەیتی ئاخری دەڵێن مەقتەع، بە چاك و جوان تەواوکردنی شیعرەکە «حوسنی مەقتەع» دەڵێن):

ئەووەڵ کوتەدا ژعیشق مەتلەع          ئاخر بدەوی تو حوسن مەقتەع.

بەو بەیتە مەم و زینی ئەحمەدی خانی دوایی هات. ویستم سەبارەت بە خانی شتێك بنووسم بەڵام نەمتوانی. زۆر پەڕەم نووسی و دڕیم. بەڕاستی بێوێنەترین چیرۆکی جیهان بە بێوێنەترین شیعر هۆنراوەتەوە. ئەم بەرهەمە بە دنیا نەناسراوە. گەورەترین شاعیرگەل دەبێ لە باری ئەدەبی ئەم

بەرهەمە لێ بکۆڵنەوە. لایەنگەلی بۆ لێ کۆڵینەوە زۆرە وەکوو لایەنەکانی فەلسەفی ـ عیرفانی ـ ئاینی ـ زانستی ـ ئەستێرەناسی و پێگەی ژن لە کۆمەڵگای کوردەواری رەسەندا و.. بۆ هەرکام لە مانەتیمێکی توێژینەر پێویستە. ئەگەر ئەم توێژینە بکری کورد لە لووتکەی ئەدەب و فەلسەفەی جیهاندا دەوەستێ. ئەو توێژینە کارێکی ئاکادمیکە و بە تەنیا بۆ یەك یا چەند هۆگر ناکرێت. ئەگەر بۆ ئەم کارە گەلاڵەیەك هەبوو، بەتایبەت لە زانستگاکانی باشووردا نووسەری ئەم پەرتووکە بۆ هەر هەوڵ و تێکۆشانێ ئامادەیە.

### ڕوونکراوەکانی بەشی سێهەم

١ـ بە دابێژی خەڵکی ناوچە «جەزراو» کە دروستترە. جزیر عەرەبی کراوە. پێم وابێ لە بناغەدا جەرزاو یان گەرزاو بووە. کە بە بونەی پیتی «ج»ە وە جێگای «ر» و «ز»ێکە گوڕاوە. جەرزا و بە قاعیدەی ئەوێستایی دەبێ بە «جەرزوو ئاپە» (جەرز+ وو+ ئاپ+ ە) بە جێگایەك دەڵێن کە تافگە یان سەراوەکە یان کانیەکەی دەڕژێتە خوارەوە. لە ڕۆژهەڵاتدا دوو شار و گوندمان هەیە بە ناوی «هەرسین» (لە کرماشان و نزیك سنە) کە ئاوی سەراوکەیان دەڕژێتە خوارەوە. سەراوەکەی هەرسینی کرماشان بە ناوبانگە. هەرس لە هەورامی و ئەویستاییدا بە مانای فرمێسك و داڕژانە. لە ئەوێستادا جەرز و گەرز (پیتی «ر» بزرۆکەی هەیە) بە مانای فرمێسك داڕژاندنە. دەقێکی پەهلەوی کە زۆرتر لە هەفت سەدە پاش ئیسلام نووسراوە لەوەدا جزیرە وەکوو «گەزیرەك» هاتووە کە قابلی باوەڕنیەو هەر پەهلەوی کراوی جەزیرەی عەرەبیە.

٢ـ بوەتان بە دابێژی ئەمرۆ بووتان (هەروا کە «سوهر» بووە بە سوور). لە پەهلەویدا بەم باژێڕە بوختان. (بوخت + ان) بە جێگایەك گوتراوە کە ڕزگار کرابێ (ان پاشگری جێگا و مەکانە) لە پەهلەویدا بووخت بە مانای نەجات دراوە لە بناغەی «بووخ» لە کوردیدا «بووژ» و بووژاندن لەگەڵ ئەوەی پەهلەوی هاوبناغەن.

٣ـ گەئودەرزە («ر» بزرۆکەی هەیە). دوو وشەیە: گەئو واتە «گا» دەرزە واتە بینەر لە بناغەی «دەرس»ی ئەویستایی بە مانای بینینە. وشەی «درشت»ی کوردی لە ئەوێستادا «دەرشتە» بە مانای بەرچاو و گەورە لەم بناغەیە. گەئودەرزە بە دابێژی ئێستای کوردی گۆدەرز و بە فارسی ئێستا گوودەرز بە مانای ئەو کەسەیە کە وەکوو گا دەبینێت یان جەستەی وەکوو گا درشت و بەرچاوە. گۆدەرز پاڵەوانی ئوستوورەیی ئاریایی کوڕی «تووسە»یە.

٤ـ پسەر بە مانای کوڕ فارسیە. لە ئەوێستادا پووثرَ (بە سینی نوك ددانی Puthre) لە پەهلەوی خۆشکی زمانی کوردیدا پۆس لە کوردی کرمانجیدا «پس» وەك دەڵێن پسمام.

٥ـ جەژن لە کوردیدا لە بناغەی «یەز»ی ئەوێستایی دروست کراوە بە مانای پەرستن و ستایشت. «ی» و «ج» بە یەك دەگۆڕدرین و کوو لە هەورامی و ئەویستاییدا «یۆ» زاراوەکانیتری کوردی «جۆ». یووسف، جووزف و .... لە ئەوێستادا یەسنە (لە بناغەی یەز). لە کوردیدا جەژن لە فارسیدا جەشن بە مانای ستایشتە. جەژن بەو کاتەی گوتراوە کە لە ڕۆژی تایبەتدا خەڵك بۆ

ستایشت کۆ دەبوونەوە. چون لەگەڵ شادمانی تێکەڵ بووە ئەمڕۆ خەڵك کە موسڵمان بوونە نەریتی شادمانیەکەی بە جێ دێنن و بە مانای شادمانی بە کاری دەبەن.

٦ـ کوردی شیبا. پەهلەوی شیپاك فارسی شیوا لە بناغەدا ناوی مارێکی هەرە جوان و خۆش خەت و خاڵە. پاش ئیسلام بە مانای جوان بە کار براوە. شیوا لە فارسیدا مانای گەیێنەریش بەکار دەچێ وەك دەڵێن بە شیوایی قسە دەکات واتە بە چەشنێ قسە دەکات کە تەواوی مەبەست دەگەیەنێ لەو بەیتەی خانیدا مانای جوانی هەیە.

٧ـ دۆژە، کوردیە. ئەویستایی «دوژەنگهە» «نگهـ» و «ه» هەر دوو وەکوو یەك لە ئەوێستادا بەکار دەچێ لە هەورامی و ئەوێستاییدا «نمە» یانێ نوێژ. لە ئەوێستادا «نمەنگهە»یش هاتووە. یان ئەهوو بە مانای دۆخ و حاڵەت وەکوو ئەنگهوویش هاتووە جا دۆژەی کوردی و «دوژەنگهـ» و «دوشەنگهوو»ی ئەوێستایی هەر یەك شتە. دوژ و دوش لە ئەوێستادا بە مانای خراپە. «دژ»ی کوردی بە مانای بەرهەڵست لەم بناغەیە. ئەنگهە لە ئەوێستادا بە مانای دۆخ و جێگایە. دوژەنگهە بە مانای دۆخ و جێگای خراپ لە بەرانبەردا «وەهیشتەنگهوو» بە مانای چاکترین دۆخ و جێگا لە کوردیدا بووە بە بەهەشت. لە پەهلەویدا دوژەنگهە بووە بە «دۆژەخوو» کە دۆزەخی کوردی و «دووزەخ»ی فارسی لەم وشە گیراوە. ئەنگهەی ئەوێستایی لە ناوە جوغرافیاییەکانی کوردیدا وەکوو «هەنگ» ماوەتەوە وەکوو ئاریهەنگ نزیکی سنە بە مانای جێگای ئاو «وەرمەهەنگ» نزیکی کامیاران بە مانای جێگای خەوتن و پشوودانی ناوڕێگا. وەرم بە هەورامی واتە خەو. هەنگمەتانە بە مانای جێگای مادەکان لە بەرد نووسراوەی بێستوون کە لە سەرەتای سەدەی پێنجی پێش زایین نووسراوە وشەیەکی کوردیە کە ئێستا دەڵێن هەمەدان کە پێتەختی مادەکان بووە. بە پێی ئاینی زەردەشتی. مرۆڤ کە مرد بە پێی هزر و کرداری دەچێتە خراپترین یان چاکترین دۆخ. ئەوەی کە لە گشت چاکترە پێ دەڵێن «گەروودمانە» و لە ئەوێستای نوێدا «گەروونمانە». گەروودمانە سێ وشەیە (گەر+ وو+ دمانە) «گەر» بە مانای گۆرانی و ئاوازە لە بناغەی «گا» بە مانای دەنگ هەڵبڕین لە ژمارەی «گاسا»دا باسمان کرد. «وو» نیشانەی ئیزافەیە. لە هەورامیشدا بە کار دەچی وەك دەڵێن «ماڵوومنی» واتە ماڵی من. «دمانە» و «نمانە» بە مانای ماڵە. هێشتا لە کوردی زازادا وەکوو ئەوێستایی کۆن بە ماڵ دەڵێن «دمانە» (ب.ب هەنبانە بۆرینەی هەژار) نمانە لە ناوە جوغرافیاییەکاندا ماوەتەوە وەکوو ئاڵمانە نزیکی مەریوان کە لە بناغەدا «ئارنمانە»یە کە لە لێکدرانی پیتی «ر» و «ن» لامی قەڵەو پێکهاتووە.

بەگشتی گەڕوودمانە بە مانای ماڵێکە کە لەویدا گورانی و موسیقا هەیە کە مەبەست جیهانی ئەهورامەزداییە.

مان لە پەهلەویدا کورت کراوەی «دمان»ە لە کوردی ئیستادا دەڵێن ماڵ. ماڵ و مان لە کوردی و پەهلەویدا بە مانای کەسان واتە باوا و باوك و دایەگەورە و دایك مندااڵن و پێوەندیگەلی ئەوانەیە نەك خانوو یان خانە. خانوو لەگەڵ ماڵ جیاوازی هەیە. خانوو بە ژوور و حەوشە و دیوار و... دەگوترێ. خانوو لە بناغەی «خا»ی ئەوێستایی بە مانای دیوار چنینە. خانوو لە پەهلەویدا «خانە» تاوڵناوە بە مانای بەدیوار هەڵچنراو. دەوروبەری کانی بە بەرد هەڵدەچنرا و لە ئەوێستادا پێ دەڵێن «خانیە» لە پەهلەویدا «خانیە» کوردی «کانی» کوردی لەکی کێنی. هەورامی هانە کە گشتی پاشماوەی «خانیە»ی ئەوێستاییە.

٨ ـ سوڕنا. لە بناغەدا «سوورنا» دوو وشەیە سوور بە مانای زەماوەن و شادمانی «نا» و «نێ» لە کوردیدا و «نەی» لە فارسیدا بە مانای قامیش وزەلە. سوورنا واتە ئەو نایە کە لە جەژنگەلدا لێ دەدرێ، لە بەرانبەردا «کەڕەنا» ئەو نایەیەکە لە شەڕدا لێ دەدرا. «کار» و «کەر» بە مانای جەنگە. کەر کردن لە کرمانجی بە مانای بڕین لە پێشدا بە مانای کوشت و بڕ و جەنگ بەکار براوە. «کارە» لە بەرد نووسراوەی بێستووندا بە مانای جێگای شەڕ و سەربازخانەیە. دوو گوندی «قار» و قەرەیان لە سنە یەکەمی پێش پەرەسەندنی «ق» لە کوردیدا «کار» و دووهەمی کەرەیان بووە. لە پارێزگای فارس لە ئێران و ئەفغانستاندا کارەیان هەبوونە کە لەگەڵ قەرەیانی سنەدا هاو بناغەن. هەروەها گوندی قاڕنا لە «نەغەدێ» هەر «کارنا» (کار + نا) لە دۆخی مێدایە.

٩ـ کووس. لە کوردی و فارسیدا بە تەپڵێکی گەورە دەڵێن کە لەسەر پشتی وشتر دایان دەنا لە کاتی شەڕدا لەگەڵ کەڕەنا لێیان دەدا

١٠ـ فریشتە، کوردی، پەهلەوی فریشتەك. فارسی فرشتە (دوو پیتی یەکەم برزۆکەی هەیە) بە مانای هەناردراوە. فرێ کرن لە کرمانجیدا لەگەڵ فریشتە هاو بناغەیە. فریشتە لە کوردی و فارسی ئەمڕۆدا بە «مەلەك»ی عەرەبی مانا کراوە. فریشتەگەل بوونەوەرگەلێکی خەیاڵی وەکوو کچێکی هەرە جوان کە دوو باڵی پێوەیە لە نەخشەکانی تاقەوسانی کرماشاندا هەیە. پەری لە ئەوێستادا وەکوو «پەئیریکا» بوونەوەرێکی ئەهریمەنیە. کاك «میهردادی ئیزەدی نووسەری کتێبی «چەردە باسێك لە بارەی کوردانەوە» کە کاك ئەمین شوان کردوویەتی بە کوردی و لە سلێمانی

چاپخانەی سەردەم لە ۲۰۰۷دا چاپ کراوە. ئاینە کوردیەکان بە ئاینی فریشتەکان لە قەڵەم دەدات کە دروس نیە. هەفتەن و هەفتەوانە و چل تەن و... فریشتە نین بەڵکوو تەجەللاکانی خودان.

۱۱ ـ ۱۲ـ دژ، کەلێت یا کەلات لە بناغەی کەری کوردی و «گەر»ی ئەویستایی و کوردی بە مانای کیوە. کەلات دوو وشەیە کەلا + تە. پاش پەرسەندنی لام لە پاش خولی ئەوێستاییدا هەندی «ر» بووە بەڵام «کەر» بە مانای کێو بووە بە «کەل». کەلاتە جێگایەکە کە سفەتی کێوی بێ واتە قەڵا ـ کەڵای کوردی تەعریب کراوە بە قەلعە. کەڵاتە و قەڵاتێ و کەلێت و کەلات بە مانای قەڵایە. «گەر» لە ئەوێستادا بە مانای کێو هیشتا لە کرمانجیدا بە کار دەبرێ. «دژ» بە مانای قەڵایە لە هەورامیدا «دشە»یە وەکوو ناوی دوو گوندی دشە و نۆدشە لای پاوە. لە سۆرانیدا دژ ـ دزە ـ دزێ و دێزە وەکوو سنەدژ (شاری سنە) و گوندی دزە نزیك ورمێ. لە پەهلەویدا «دیزەك».

۱۳ـ لە ئاینی میترایی‌دا گوڵی لیلەوپەر لە فارسیدا نیلووفەر کە لە نێو ئاودا دەڕوێ و زۆر بۆن خوشە سەنبولی میترایە لیلەوپەرەکانی دەورتاقە گەورەکەی تاقەوسان هەروەها خواجەنشینەکانی شاری سنە (ب.ب وێنەکان) ئاماژە بە میترایە. پێوەندی ئەمانە پێکەوە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا هەرماوە.

خانی دەڵێ:

نیلووفەر ناز پەروەری کەر ئەو ژێتە ل میهرموشتەری کەر

میهر لێرەدا مانای خۆری هەیە. واتە ئەی خودا، نیلووفەر کە جوانی دەنواند و نازی دەکرد ئەویش تۆ خوا زیاری میهرت کرد.

وەفایی مەهابادی دەڵێ:

ئاو و تاوی ڕووتە مایەی سۆزش و گریانی من

گا غەریق و گا حەریقی میهری ڕووت وەك نیلووفەر

یان: شەعشەعەی خورشید نیهان بوو لاڵ و کەڕ بوو نیلوفەر

مات و خامۆش ما وەفایی وەك سەحەرگاهان چراغ

یان: بلا بەو ڕۆژە نیلووفەر بسووتێ

بە مەرگی من سەری زوڵفت وەلا بە

مەبەست لە ڕۆژ خۆرە. خۆر و میهر ئەوندە لە یەك نزیکن کە پاش ئیسلام ناوی‌تری خۆر میهرە.

١٤ـ دێر وشەی ڕەسەنی کوردیە. لە فارسیدا دەڵێن دەیر. دێر لە بناغەی «دەر»ی ئەوێستایی واتە دڕین.

دێر بە جێگای دڕاو دەڵێن کە مەبەست ئەشکەوت و غارە کە ستایشتگای میهرپەرستەکان بوو. ئیستا بە کەلیسا و ستایشتگای مەسیحیەکانیش دەڵێن. پێش عیسای مەسیح دێرەکانی کوردستان ستایشتگای میهری بوونە. ئاینی فەلە پاش سەدەی سێ زایینی لە کوردستاندا بڵاو کرایەوە. لەگەڵ دێر بە مانای دڕەنگ، پەهلەوی «دێرەنگ» جیاوازی هەیە.

١٥ـ زەریایەکی گەورەی ئوستوورەییە. هەندێ زانا لایان وایە زەریای «کەسپێن»ە کە پاش ئیسلام تەعریب کرا بە «قەزوین» ئیستا زەریای مازندران و زەریای خەزەر دەڵێن.

١٦ـ هونەر، لە ئەوێستادا «هوونەرە» (هوو+ نەرە) هوو بە مانای چاك نەرە، واتە پیاو، نێر. هوونەرە واتە مێرخاس و پیاو ئازاو ئەوەی کە فەن و هونەری جەنگ چاك دەزانێت. لە پەهلەوی و فارسی کۆنیشدا هەر ئەم مانای هەیە بەڵام ئیستا کورت کراوەتەوە و لە فارسی و کوردیدا لە بەرانبەر «ئارت»ی ئینگلیسیەوە بەکار دەچێت و مانای‌تری پەیدا کردووە.

١٧ ـ ١٨ ـ لە ژمارەکانی پێشوودا باس کراون. تەموور و دیوان

١٩ـ لەسەر مەنسووری هەلاج لەم پەرتووکەدا هەندێ باس کراوە.

٢٠ـ زوهرە ناوی‌تری ناهیدە چون لە نێوان خۆر و مانگدایە تەنیا سوبح و ئێوارە دەبینرێ. ئەم ئەستێرە لە ئەدەبی فارسی و کوردی بە مۆسیقا ژەن و هەڵپەرکێ‌کەری ئاسمان ناسراوە. لە یۆنانیدا «ڤێنووس»ی پێ دەڵێن. لە ئەستێرەناسی کۆندا لە فەلەکی سێهەمدایە.

٢١ـ دارو، دەرمان. هە دوو لە بناغەی «دەر»ی ئەوێستایی بە مانای دەرمان کردنە.

٢٢ـ قوتب وشەی عەرەبیە. ئەستێرەی قوتبی یان «جودەی» هەمیشە لە خالێکی باکووردایە و لە جێگای خۆی نابزوێ، بە ڕوالەت تەواوی ئەستێرەکان بە دەوری زەویدا دەگەڕێن بەڵام ئەو ئەستێرە لە جێگای خۆی ناجوێ وەکوو شتێك گشت ئاسمانەکان بە دەور ئەم ئەستێرەدا دەگەڕێن.

لە کوردی سنە و کرماشاندا بەم ئەستێرە دەڵێن (مێخ) واتە وەکوو بزماری کوتراو لە جێگای خۆ نابزوێ. مورشیدی کامڵ کە پاش مردنی دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی نووری میترایی یان مەلەکەتاوس لە زەویدا وەکوو ئەستێرەی مێخە. ئەم شتە میترایيە پاش ئیسلام هاتۆتە نێو ئەدەبی عیرفانی ئیسلامی فارسی و عەرەبیەوە و وەرگێڕدراوەتەوە بە قوتب.

٢٣ـ مێزه به کرمانجی واته سەرنج وەکوو دەڵێن مێزەکە واته سەرنج بدە، بنواڕە. لە پەهلەوی خوشکی زمانی کوردیدا مێنـزده (نوونی ناولووتی) (مێن + زه) هەر بەو مانایە. لە بناغەی مێن ـ مان ـ مەن، هەر سێ لە ئەوێستادا بە مانای ڕامان و تێفکرین بە پاشگری «زده» یان «زه»وه به مانای سەرنجه.

٢٤ـ فەرفوور، واته فەغفوور، نازناوی شاکانی چین بووە. ئەم نازناوه ئێرانیەو وەرگێڕاوەی وشەیەکی چینیه بە مانای کوڕی خودا. شاکانی چین خویان بە کوڕی خودا دەزانی، لە بناغەدا «بەغ پوور»ه. بەغ بە مانای خودا لە وشەی بەغدادا هەیە. ئەم شارە دیارە لە زەمانی ئەشکانیەکاندا کە میهرپەستی ڕەواجی بووە دروست کراوە. پوور بە مانای کوڕە لە ئەوێستادا پوسره. لە پەهلەویدا «پۆس» لە کرمانجی‌دا «پس».

٢٥ـ نۆش. لە ئەوێستادا «ئەنەئۆشه» واته، بێ‌مەرگ، بژی.نۆش لە ئەویستادا بە مانای مەرگه. بۆ مەرگ وشەیتریش لە ئەوێستادا هەیە: «مەهرك».

٢٦ـ کوردی و پەهلەوی سرۆش، فارسی سرووش. ئەمڕۆ بە مانای ئیلهام و پەیام و وەحیە لە ئەویستادا «سرەئوشه» (سرەئۆ +شه). «شه» نیشانەی کارکەرە. ناوی فریشتەیەکە کە ئیلهامی خودا دەگەیەنێت. سرەئۆ لە ئەوێستادا بە مانای سرەوتن، سروە و پەیام و ئیلهام و گوێ ڕایەڵی و پەیام بیستنه. سروە و سرەوتنی کوردی لەم بناغەیە.

٢٧ـ وامیق و عەزرا وەکوو لەیلی و مەجنوون و شیرین و فەرهاد، دوو ئەویندارى یەکن کە بە سەرهاتیان بە فارسی هۆنراوەتەوە.

٢٨ـ «دین» کورتکراوەی «دێونه» «دێو+نه» ئەوەی کە سفەتی دێوی گرتووه واته شێت. دێوانه.

٢٩ـ ئەژدەها. یان ئەژدیها. بە قاعیدە ئەوێستایی «ئەژی دەهە» واته ماری گەزندە. «ئەژی دەهەکە» ئەوەیە کە ئەمڕۆ دەڵێن دەهاك یان زەحاك. ئێستا بە مارێکی هەرە گەورە دەڵێن کە دەتوانێ مرۆڤ لووش کات. ئەژی لە ئەوێستادا بە مانای مارە. لە کوردی کەلهوڕیدا ئەزیە و لە کرمانجی‌دا ئەزیا و هەزیه بە مانای مارە «مار» وشەی ئاماژەیه بە قاعیدەی ئەوێستایی «مارە» لە بناغەی «مر» واته مردن، بە مانای کوشندەیه. ئەو شتانەی کە لێ ترساون ناوی ئاماژەیان بۆ داناوە. ئێستا لە سنەدا بە جنۆکە دەڵێن «ئەوانگەل» یان داپیرۆ شك و دووپشك (کلك لەسەر پشت) و... ناوی ئاماژەیین.

٣٠ـ لەچك فڕێدان و قژبڵاو کردنەوە لە پرسە و شین گێڕیدا هێشتا لە کوردستاندا باوە.

٣١ـ ڕەش سەنبولی مەلەکە تاوسە.

٣٢ـ ٣٣ـ خودا لە میهرپەرستی و دینە کوردیەکاندا دوو جۆر تەجەللای هەیە. تەجەللای زات و تەجەللای سیفات. لە عیرفاندا بووە بە تەجەللای جەماڵ و جەلال. لە ئەدەبی عیرفانی و کوردی و فارسیدا یەکەمی بە جوانی ڕۆخسار و دووهەمی بە زولفی ڕەش شوبهێنراوە. لەسەری زۆرتر باس دەکرێ.

٣٤ـ خەیر کە خانی هێناویەتی وشەی عەرەبی بە مانای کاری چاك لەگەڵ «خێر»ی کوردی جیاوازی هەیە. لە پەهلەوّی خوشکی زمانی کوردیدا «هێر» بە مانای سوود و فایدەیە. ئەم وشە لە فارسیدا نەماوە بۆ وێنە لە کوردیدا دەڵێن، بێخێرە، واتە سوودی نیە. نابێ خێر و خەیر تێکەڵاوی یەك کەین.

٣٥ـ «خراپ» لە ئەویستاییدا دایکی زمانی کوردی و پەهلەوی «خرەپ» وەکوو کوردیەکەی بە مانای دژ بە چاکەیە لە فارسیدا لەگەڵ «خەراب»ی عەرەبی بە مانای کاول و ویران تێکەڵاو بووە. لێرەشدا نابێ خراپ و خەراب تێکەڵاوی یەك کەین.

٣٦ـ فەڕ لە ئەوێستادا «خوەرنە» («ر» بزرۆکەی هەیە). خوەر +نە. خوەر واتە خۆر، لەسەر پاشگری «نە» باسکرا. واتە شتێك کە ئاوڵناوی خۆری هەیە مەبەست هێزێکە کە خودا دەیخاتە جەستە و گیانی مرۆڤگەلێکی تایبەتەوە. بە پێی ئەم هێزە مرۆڤ تایبەتمەندیگەلێکی نائاسایی پەیدا دەکات. خوەرینەه (فەڕ) لە میهرپەرستیەوە وەرگیراوە و چوەتە نێو ئەوێستای دواییینییەوە. لە پەهلەوی و فارسیشدا هەر «فەڕ» دەڵێن. لە پەهلەویدا وەکوو «فەرن»یش هاتووە.

مەم و زینی فولکلوریش وەکوو بەرهەمەکەی خانی کورت دەکەینەوەو لە هێنانی پەراوێز و درێژە پێدان خۆ دەپارێزین. لە زۆر جێگادا چڕگەر وەکوو خانی بە شێعر و پەراوێزی جوان و جوانکاری وردەوە چیرۆکەکە دەڕازێنێتەوە بەڵام وەکوو بەرهەمەکەی خانی کارمان بەوانە نیە. کاکڵ و ناوەرۆك و پیامگەلی ئەم چیرۆکە چیە ئەوە دەهێنین.

مەم و زینی فەلکلۆر لەگەڵ بەرهەمەکەی خانی لێکچوون و جیاوازیشی هەیە کە خوێنەری بەڕێز خۆی تێی دەگات.

ئەوەی خانی، لە پێشدا هەر فولکلۆر بووە کە کردوویەتی بە هۆنراوەی عەرووزی. بە باوەڕی من مەم و زین زۆر پێش ئیسلام و چەند سەدە پێش زایینی عیسا کاتی سەرهەڵدانی تاینی میهرپەرستی درووس کراوە، سەردەمێ کە هێشتا زمانی ئەوێستایی لە ناو مادەکاندا بە پەهلەوی و کوردی نەگۆڕاوە پێکهاتووە. ئەمە بە وشەگەلی هەرە کۆنی مەم و زین و ستی و بەنگینەدا دیارە کە لەسەری باس کرا.

فولکلۆری ئەم چیرۆکە لە بواری زەماندا گۆڕانکاری زۆری بە سەردا هاتووە. بە باوەڕی من مەم و زین وەکوو خەج و سیامەند لە کوردستانی باکوور ڕەنگە هەر لە ناوچەی جزیر و بوتان بە زاراوەی کرمانجی پێك هاتووە. وەکوو شیرین و فەرهاد کە لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا دروس کراوە. مەم و زین کە هاتوەتە ناو سۆرانی زمانەکان گوڕانکاری و تێکەڵاوی بەسەردا هاتووە.

**فولكلۆری ئەم چیرۆكە:**

زۆرتر لە سێسەد ساڵ پاش خانی لە ناو سۆرانی زمانەكاندا بە ناوێكی‌تـر (مـەمـی ئـالان)ەوە تووشی تێكەڵاوی بووە بەم حاڵەوە هێشتا هەندێ لە شوناسی ئۆلی و باوەڕمەندی كوردانی تێدایە.

لە ئێراندا ئەم چیرۆكە لە ١٩٦٠ی زایینی‌دا لە لایەن تێكۆشەری بـەڕێز كـاك «عوبـەیـدوڵڵای ئەییوبیان» لە زانستگەی «تەبریز»دا لە چاپ درا. ئەم چیرۆكە لـە پێشـدا «پروفیسـۆر ئوسـكار مان» كوردناسی ئاڵمانی لە ١٩٠٣ كە چریكەگەلی كوردی كۆ دەكردەوە، لە «كاك رەحمان بەكر» لە مەهاباد بە زاراوەی موكری بیستوویەو بە ئەلفبێی ئالمانی نووسیویەتەوە بەڕێز ئەییوبیانیش لە ئەلفبێی ئاڵمانیەوە هێناویەتە سەر ڕێنووسی كوردی. جگە لە سـەرەتا چـیرۆكەكـە بـوەتـە ٢٤٠ لاپەڕەكە نیوەی كوردیە و نیوەی‌تری وەرگێڕدراوە فارسیەكەیەتی. واتە ١٢٠ لاپەڕەیە كە ٥ لاپەڕەی سەرەتاكەی پەخشانە و پاشماوەكەی وەكوو بەیتەكە بە دەنگ و ئاوازەوە دەخوێنرێتەوە.

مەم و زینی فولكلۆری كرمانجی وەدەس نەكەوت. لە بەرهەمەكـەی بـەڕێز ئـەییوبیـان كـەڵـك وەردەگرین.

وەكوو مەم و زینیەكەی خانی مانای هەڵبەستەكان بە كورتی دەهێنرێت و لە ناوكەوانەدا لایەنە ئۆلی و عیرفانیەكەی و ڕوانگەكانی خۆم دەنووسم:

برایم پاشای یەمەن كوڕی نەبوو (لە هەندێ جێگا چرگەر كاك رەحمان بەكر بە جێگای یـەمـەن دەڵێ ئێران یان ڕۆژهەڵات) هەستان بڕون بۆ ماڵی خودا تا كوڕیان بداتێ. دوانـزە مـەنـزل ڕۆیـین خودا رەحمی بەوان كرد (سەرنج بدەنە سەر ژمارەی ئوستوورەیی و پاشان ئایینی ١٢، وەكـوو دوانـزە حەواری عیسا، دوانزە بورجی ئاسمان و...) خودا كاتێ بەوان بەزەیی دێت كە دوانزە مەنزڵ ڕویشـتن نە كەمتر نە زۆرتر (دیارە ئاماژە بە دوانزە بورجی ئاسمانەكە لە ستایشتگاگەلی میهریدا لـەسـەر ڕووی پەیكەری میترا كێشراوە یان ئاماژەی پێ كراوە. لەسەر چـۆنیەتـی بورجـەكـانی ئاسمـان لـە ژمارەی تایبەتی بەشی پێشوودا ڕوون كردنەوەمان هەیە. هەفت گەرۆكی ئاسمان لـە خانـە خانـەی ئەم بورجگەلەدا دەگەڕێن) خودا رەحمی بەوان كردو «وەیسولقەرەنـی ماهیـدەشـت»[1]ی نـاردەلای ئەوان (لە نێوان كامیاران و كرماشان لە ڕۆژهەڵاتدا پـاش نـاوەدەروەن دەشـتێك هـەیـە كـە لـە

باکوورەوە تا شاری کرماشان و ڕۆژاوای باکوورەوە تا شاری ئیسلاماباد «هاروونئاوا»ی پێشوو کێشراوە. لە نزیك ناو دەروەن چیایەك هەیە. لە لووتکەی چیا کە خەڵك لایان وایە وەیسولقەرنی ماهیدەشت لەوێ نێژراوە. لەو چیرۆکەدا وەیسولقەرنی کە خودا دەینێرێتە لای برایم پاشا و وەزیرەکەی بەڕاستی کێیە. لە پێشدا وەیس[٢] ناوێکی کوردی و ئێرانیە. بڕوانن بۆ روون کردنەوەکەی. ئەو وەیسە لە بەرهەمە عیرفانیەکاندا مەقامی بەرزی پێ دراوە. دەڵێن بە خەون پێغەمبەری دی و موسڵمان بوو و هەر لە یەمەندا مرد. ئەی وەیسولقەرنی مایی[٣] دەشت کێیە. دیارە لە پیرانی میهرپەرستیە کە پاش مردن لە لووتکەی کێو نێژراوە. لە شارگەلی کوردستاندا کەمە لە لووتکەی کێوێ کە پیرو مەرقەدی بەرێزی تێدا نەبێ «ئەوانە گشت پیرگەلی میترایی بوونە کە پاش ئیسلام حورمەتیان هەر ماوە و پاشان ناوی ئیسلامیان گرتووە ئەگینا گۆڕی موسلمان کەی نراوەتە لووتکەی کێو؟ جا خودا، یەکێ لەو پیرگەلە کە مەقامی میهر یان سیمورغی هەیە و لە فەلسەفەی سوهرەوەردیدا لە سەری باس دەکەین بۆ لای ئەوانی هەناردووە).

خەوتبوون کە وەیس هاتە لای ئەوان. سێوێکی نا ژوور سەریان (لە خەونەدا پیانی گوت) دەس نوێژ بگرن و سێوەکە لەگەڵ ژنەکانیان بکەنە دوو لەتەوە هەرکام لەتێکی بخۆن، خودا بە هەرکام کوڕێك دەدا. دەبێ یەك ناوی مەم و یەك بەنگینە بێت (وتمان لە مەم و زینی خانیدا ئەم دوو ناوە بە مانای مەست و گێژە) و دەبێ بیان خەنە ژێر دەست مامۆستا وانەیان پێ بڵێ. (هەرچەند ئەم سێوە لە چیرۆکگەلی کوردیتریشدا هەیە و لەگەڵ مەم و زین تێکەڵاوە، بەڵام هەر مەبەستی میهرپەرستی تێدایە. ئەم دوو منداڵە نوتفەی ژن و پیاو واتە مرۆڤیان نیە. میوەی ئەو دارە کە لە بەهەشتدا لە ئادەم و حەوا بەربەند کرابوو سێو بووە. زۆربەی عاریفە موسڵمانەکان دەڵێن سێو بووە. هەندێ لە مەلاکان دەڵێن سێو و هەندێ دەڵێن گەنم بووە. لە ئاینی مەسیحی و جوودا دەڵێن سێو بووە. بە وتەی مەشایەخ و تەریقەتە عیرفانیەکان ئەوە میوەی داری «مەعریفەت»ە. مەعریفەت بە خۆ و بە خودا. خودا بە ئادەم و حەوای فەرموو لە میوەی ئەو دارە مەخۆن. دیارە هەر سێو دروستە و گەنم داری نیە. جا ئەو سیوە هەر ئەوەیە کە مەلەکە تاوسی خۆمان کە وتمان لەگەڵ شەیتانی ئیسلام و جوو و... جیاوازە، دایە دەرخواردی ئادەم و حەوا و بوو بە هۆی ڕزگاری و تەکامولی ئەوان. وەیسولقەرەنی ئەم چیرۆکە مەلەکە تاوسە لە جەستەی مرۆڤدا تا مرۆڤ بکەوێتە ڕێگای ئەوین و مەعریفەت. لە ئاینی میهرپەرستیدا و لە ئەوێستای دواییشدا کە لە میهرپەرستی گرتوویەتی هێز و وزەیەك هەیە کە پێ دەڵێن «فەڕ»[٤] (ڕوونکراوەکەی بخوێننەوە).

ئەو فەڕەنفووسی خودایی تێدایە کە خودا بە هەندێ کەسی دەدات، یان لە ڕێگای پیر و مورشیدەوە بە مرۆڤ دەگات. ئەم هێزە کە بەشێکی هەر ئەوینە مرۆڤ ڕوو بە چاکە و خودا هان دەدات وەکوو مەم و دەیکات بە خاوەن کەرامات. ئادەم و حەوا تا ئەو سێوەیان نەخوارد مرۆڤ نەکەوتە ڕێگای ئەوین و خوداناسی واتە مەعریفەتی ئەویندارانە. ئەوەیە کە سێو نیشانەی فەڕ و ئەوینە و لە کوردستاندا، ئەمڕۆ زۆرتر لە گوندەکاندا پێشکەش کردنی سێو بە خۆشەویست هێشتا هەر باوە. لە زەماوەندەکانی کوردستاندا زاوا بۆ بووك کە سواری ئەسپ کرابوو و دیواخی[٥] سووری بوو سێوی دەخست.

جا دابی پێشکەش کردنی سێو بەتایبەت سێوی سوور دابێکی کۆنی میهرپەرستیە و بە گومانی بە هێز بە سەرهاتی ئادەم و حەوا، لە پێشداهی میهرپەرستی بووە. ئەو فەر و ئەوینە لە ڕێگای سێوەوە بە مەم و بەنگینە دەگات. ئەوەش بزانین کەسایەتی زین لە مەم و زینی فولکلۆردا وەکوو ئەوەی خانی بە هێز نیە. لام وایە بە کاریگەرینایینەکانی کورد پاش میهرپەرستیدا وای لێ هاتووە).

برایم پاشاو وەزیر، کە لە خەوهەستان و سێوەکانیان دی خەونەکەیان بیر هاتەوە و بەرەو ماڵ پاش گەز بوونەوە. سیوەکانیان لەگەڵ ژنەکانیان خوارد و هەرکام بوون بە خاوەن کوڕێك. کوڕی شا، ناونرا مەم و کوڕی وەزیر بەنگینە. دوو ساڵ بۆ شیردان بە دایەن و سێ ساڵیش بە لەلەدران. (لەلە، پیاوگەلێکن کە لە بەرانبەر مزدەوە خزمەتی مناڵ دەکەن). دوو ساڵ سوارکاری فێرکران. (ئەمە حەوت ساڵ. ئەم حەوت ساڵە نیشانەی چیە پاشان باسی دەکەین). کە حەفت ساڵی یەکەم تێپەر بوو شا فەرمانیدا بۆ ماوەی حەفت ساڵ بیانخەنە ژێرخانێکی هەرە تاریکەوە. هیچ نەبینن و مامۆستا بچێتە تاریکخانەوە، وانەیان پێ بڵێ. حەفت ساڵ تێپەر بوو لە ئاخری حەفت ساڵەوە ڕۆژێك بۆ خواردن «سەرو پێ» یان بۆ هێنان. کە خواردیان بە ئیسقانەکان یارییان دەکرد.

ئیسقانێکیان بەرز فرێدا، دای لە شووشەیەك شکاو و نووری خۆر هاتە ناوەوە. وتیان خودا، ئەوە خوایە ئەوا خودا هات. تیشکی خۆریان لە باوەش دەگرت. بەڵام شتێك نەدەهاتە دەستیانەوە (لە دەقەکەدا لێرە بە جێگای تیشك، «تیژکە» هاتووە کە پاشان لە فەلسەفەی سوهرەوەردیدا باسی دەکەین «هەر ئامێزیان لە تیژکەی زەردەهێنا بۆیان نەدەگیرا»). مامۆستا هاتەوە وتیان مامۆستا خودا هاتۆتە نێومانەوە. مامۆستا وتی نە ڕۆڵە ئەوە خودای نیە ئەوە تیشکی خۆرە یان لە شەودا مانگەشەوەو تیشکی مانگە (خوێنەری بەڕێز دەزانێ کە کاتێ دەڵێن نووری خودا مەبەست لەم

نووره كه چاوی ئێمه هەستی پێدەكات نیه بەڵكم پەردەگەلێك پێش لە ئەم نوورەیەكە بیزەمـان و بیمەكانه و سوهرەوەردی پیێ دەڵێ نووری جەوهەری. ئەم نووره كه ژیانمان ڕووناك دەكاتەوە تـەنیـا بیزەمانه «ئەنەشتەین» لە «نیسبییەتی تایبەت»دا دەڵێ ئەگەر مرۆڤێك بتوانێ بە خێرایی نـوور بڕوا ئەگەر چەند میلیارد ساڵیش بڕوات یەك چركە بە تەمەنـی زیـاد نابێـت. تـۆز قالـەی نـوور «فوتون»ی پێ دەڵێن كه دەیان میلیون جار لە میكرون چكولەترە. ئێستا دوزراوەتەوە كـە فوتـون خۆی لە تاڵگەلی وزە دروست بووە واته چەندان میلیارد «تاڵەوزە» بە چەشنێكی تایبەت پێكـەوە حەلقە دەبن و دەبنە فوتون لە نووكی دەرزیەكدا [19](١٠) واته دە میلیارد میلیارد ئه توم هـەیـە. تاڵێكی وزە لە ناو یەك ئەتومدا وەكوو باریكە دارێكە كە ناو سیستەمی خۆردا. سیستەمـی خـۆر واته خۆر و نۆگەڕۆكەكەی یان لە خۆرەوە تا مەداری پولوتو چەندە دووره باریكە دارێك لەو نـاوەدا دەبێ چەند بنوێنی؟ ئایا «تاڵەوزە» كه ئەوندە ورده مەكانی هەیە. سەلمێنراوە كە ناوكی ئـەتـوم و ئیلیكترونەكانیش هەر لە تاله وزە دروست كراون. ئەگەر ئیلیكترۆن دە میلیارد میلیـار تالـەوزەی زۆرتری كێشا، وەكوو فوتونێ دەیداتە دەرەوە. ئەمـەیە نووری كارەبا و...

بە گۆمانی بەهێز پەردەگەلی پێش «تالەوزە»یش هەیە كە پەی پێ نەبراوە. جا بـۆ سـەلمانـدنی تەوحیدی میهرپەرستی و دینه كوردیەكان چ لە ئاسمانەوە دەس پێ كەیـن چ لـە قـوولانی مـادەوە جیاوازی نیه، هەر بە خودا دەگەین وەك چون لە تاریكیەوە واته لە مـادەوە بـە نـوور واتـه خـودا دەگەی. دیاره كه نوور لێرەدا سەمبول و ئاماژەیە. چەشنێ خوداناسی ماتریالیستیه كه لە ئـاین و فەلسەفەكانیتردا نیه. وەك هەندێ لە لقەكانی فەلسەفە و سۆفیگەری مەسیحی و... كـە دەڵـێن «مادە» پیس و چەپەڵە بەلام لە دینه كوردیەكانـدا وا نیـە و ئـەم جیهانـەش وەك ئـەوان دەڵـێن جیهانی «كەون و فەساد» نیە، ڕەسەنه و هەر دیاردەی دەركەوتنی خودایـە. «سیسـتەماتیـك» و هەر سیستەمێ بەڕێوەبەریی گەڕەكه. بەڕێوەچوو لە زاتی بەڕێوەبەر جوێ نیه. هەر تەجەللای ئەوە. هەست و دەركی ئەم ڕاستیه قوولایی تەوحیدی ئاینی میهری و دینه كوردیەكانە. بە گوێرەی دینه كوردیەكان جیهان لە سەرێكەوە بیزەمان و بیمەكانه لەسـەریتـرەوە مـاده و قورسـاییەیـان بـە ئاماژە نوورو تاركیيه. بو گەیشتن بە نوور دەبێ لە تاریكیەوە دەس پێ بكەی):

(لە هەفت ساڵی دووهەمدا مەم و بەنگینه لە تاریكخانەدان تا لە ئاخری هەفـت سـاڵەوە بـە «هەڵكەوت» نووریان لێ دەردەكەوێ. پاش هەفـت سـاڵ ئامـاژەیـە بـە بڕینی هـەفـت پلـە لـە

ستایشتگاگەلی تاریکی میهرپەرستیدا بەو جێگا گەیشتوون کە ئەوینی ڕاستەقینە واتـە نـوور و تەجللای خودا لە دڵیاندا ببزوێت).

مەم دەڵێت بڕوینە دەرەوە مامۆستا دەڵێ، پەلە مەکەن زۆر لە گـەڵتـان ڕەنجـم داوە (مامۆسـتا ئاماژە بە پیر و مورشیدە). چوە لای برایم پاشا. بە سەرهات دەگێڕێتەوە و دەڵێ هەچ کارێ دەتەوێ بیکە بەڵام ڕەنجی من بە فیڕۆ نەچێت.

پاشا نامەی بۆ میر مەم نووسی و مۆری کرد. مامۆسـتا دای بە مەم. نامەکـەی خوێنـدەوە ڕازی نەبوو. وتی مامۆستا من تەنیا بۆ هاتنە دەرەوە هەفت ڕۆژیتر سەبـر دەکـەم. (ئـەم هـەفـت ڕۆژە هەفتی سێهەمە. (مامۆستا پاش ئەم هەفت ڕۆژە) نامەیەکیتری دایە دەست مەم تێدا نووسرا بوو دەبێ هەفت مانگیتر لە تاریکخانە بمێنێتەوە تا کۆشـکی «بـەڵـەك» تـان بـۆ درووس کـەم کـە خشتێکی لە زێڕ و خشتێکی لە زیوە. میرمەم تێك چوو بەڵام مامۆستا وتی دەبـێ «ڕەنجـی» ئـەم هەفت مانگەیش بکێشن.... (هەفتی چوارم، چوار هەفت کە نیشـانەکانی لـە ئـایینی کاکـەیـیدا هەفتەن و هەفتەوانە و هەفت سەردار و «هەفت قوڵتاس»ە[6] وتمان چوار هەفت لە کاکەییدا واتە ٢٨ سەرچاوەی نوور و لە بەرانبەر ٢٨ سەرچاوەی تاریکیەوە کە ناویان هاتووە من لێـرەدا لـە نـاو بردنیان خۆ دەپارێزم بە خودی تەجەللای خودا واتە خاوەندگار یا عەلی یا خوەشین یان سـەهاکەوە دەبن بە ٢٩ کە کۆبەندی شەوان و ڕۆژانی مانگە. ئەو چوارە خۆیان هەم لایەنی ڕوونـاکی (ڕۆژ) و هەم لایەنی تاریکی واتە شەون).

هەفتی چوارەم تەواو بوو لەم هەفت مانگەدا کۆشك درووس کرابوو و کاکە مەم نیشتە کۆشکی بەلەك، تا مانگێ دەنگ و باس نەبوو تا: «خالق هەر ئەتۆی بە تـەنـێ+ سـێ پـەری دێنـە ڕووی وەتەنێ+ سەیرانان دەکەن لەسەر کوشکی کاکە مەمێ+ کوڕی برایم پاشای یەمەنێ».

«خالق هەر ئەتۆی لەسەرە+ سێ پەری لە ئاسمانی حەوتەمین بەسـتوویانە لـەنگـەرە+ لـەسـەر کۆشکی کاکە مەم هەڵدەنیشن ئەم بەر ئەو بەرە».

«خوشکی گەورە لە خوشکان پرسیە. خوشکی نێوەنجـی وای گۆتیـە. هـەر لـە عـەرشـێ هـەتـا کورسیە. هەر لە گای هەتا ماسیە هەموو دونیام پشکنیە ـ هیچ کەسم نەدیوە لە گـوێن جـوانی کاکە مەمێیە».

خوشکی گەورە وتی بە خوشکانە+ خوشکی ئەزت ببم بـە قوربانـە+ ئـەمـن جـارێکی دەگـەڵ پەریان چوومەراوی چل شەو و چل ڕۆژانە+ لە پەریان هەڵبڕام لە منی کردە کرێـوە و بارانـە. ڕێـم

سەردەر نەکرد کەتمە شاری «جزیر و بۆتانە». لە سەر کۆشکی یای زینی دەبووم میوانە. (یای ویایە لە کوردیدا، بە زارۆچکەی سنەیی «ئایە» بە مانای خاتوون و گەورە ژنە. تەواوی بەیتەکە لەم چەشنە هۆنراوەگەلەیە کە چرگەر بە دەنگ بێژییەوە دەی خوێنێ) سێ پەری هاتنە سەرکوشکی کاکە مەم خوشکی گەورە وتی ئێمە وینەی جوانی کاکە مەممان لە دونیا نەدیوە. نێوەنجی وتی لەگەڵ پەریانیتر چۆم بۆ ڕاوی چل شەو و ڕۆژ. لە باران و کڕیوەدا لە پەریان، بڕام کەوتمە شاری جزیر و بۆتان. وەکوو کۆترەشینە لەسەر پەنجەرەیەك هەڵنیشتم لە کۆشکی یایە زین. کە یای زینم دی وتم مەگەر ئەمە هاوتای کاکە مەم بێت. خوشکی چکۆلە وتی بێن کاکە مەم هەڵگرین و بیبەینە جزیر و بۆتان. لە پاڵ یەك دایان بنێین بزانین «کاکە مەم زەریفترە یان یای زین زێدە جوانە». ئەویتر وتی دروست نیە کاکە مەم هەڵگرین چون پیاو بۆ ماڵی ژن نابەن. کاکە مەم لە «سێوی بەهەشتی» دروست کراوە... بچین یای زین بۆ کۆشکی مەم بهێنین. هاتنە جزیر و بوتان خوشکی چکۆلە یای زینی بێهۆش کرد و ڕازاندیانەو و لە پێخەفیان پێچاو هەڵفڕین و بردیان بۆ یەمەن و لە کۆشکی ئەبلەقدا هاتنە خوارەوە. لە کونی پەنجەرە چوونە ناوەوە و زینیان لە لای کاکە مەم پاڵ خست، خۆیان وەکوو سێ کۆتر چوونە سەر دەلاقەکان. وتیان لە نووستندا نازانین کامیان جوانترە چاکترە ڕایان چلەکێنین. یەکەجار زینیان لە خەو هەستاند کە شەرم نەکات. زین سەری سووڕما... هاواری کرد ئەی لاوی گێژ و شێت لە لای من چی دەکەی و بە مستێ دەمی میرمەمی پڕ کرد لە خوێن. مەم بانگی کرد بەنگینە ئافتاومسین بێنە. بەنگینە وتی چ بووە مەم وتی هیچ چنگم کەوت لە کەپۆم نەختێ خوێنی لێ تکاوە. ئافتاومسینم ناوی بیبەرەوە.... جوانی زین کار دەکاتە سەر مەم (کە لە پێشدا بۆ ئەوینی ڕاستەقینە ڕاهێنرا بوو). بە زین دەڵێ تۆ خزمەتکارەکانت بانگکە... زین بانگ دەکات مەلەك ڕێحان بۆ من ڕوو بەند و چرا بێنە... ئەسمەر.. گوڵەندام... جوابێ نەبوو... یای زینیش ئەویندارى کاکە مەم دەبێت. خۆیان بە یەك دەناسێنن. لە کۆشك و دیوانی باوکی خۆیان بۆ یەك دەگێڕنەوە. بە فانۆسێکەوە لەو شەوەدا دەوروبەری کۆشکی بەڵەك گەڕان. زین سەری سووڕما... دەسیان بە وتەگەلی ئەویندارانە کرد... بە یەك بەڵێنیاندا... بە قورئان بۆ یەك سوێندیان خوارد. مەم بەڵێنیدا بە دوای زیندا بچێ بۆ شاری جزیر. ئەنگوستیلە و دەسرەیان گۆڕاوە... (بەیتە کە زۆر غینایی و جوانە بەداخەوە باسەکەمان درێژ دەکاتەوە). پەریان نزایان کرد و ئەوان لەسەر خۆ چوون. زینیان هێناوە کۆشکەکەی خۆی. مەم هەستا لە خەو، کاتی دەست نوێژ ئەنگوستیلەی زینی لە دەس خۆیدا دی... مەم نەخۆش

کەوت. برایم پاشا پزیشکانی بانگ کرد... چارە نەبوو.... مەم گوتی ژنم دەوێ نە لە میسر و نە شامیٚ. تەنیا یای زین کچی میر زینەدین (لە خانیدا خوشکی ئەوە) میری بۆتان لە شاری جزیر. برایم پاشا وتی ئاوەها شارێ لە جیهاندا نیە. وزیریان هێنا. وەکیلیان هێنا. وتیان نا، نیە پیرە وەزیریکیان هێنا لە مەبەستی شاتێنەگەیشت وتی بەڵێ لە ڕۆژاوادا شاری جزیری بوتان هەیە (دەزانین یەمەن لە باشووری کوردستانە کە ئیراق و عەرەبستان لە نێوانیاندایە نە ڕۆژاوا. ڕۆژاوای بۆتان دەبێ بە ڕۆم و شام) برایم پاشا تووڕە بوو بە پیرەوەزیری گوت مەگەر خۆم نەمدەزانی؟... نەیدەویست کچی شایەکی ژێردەستی خۆی بۆ کوڕی خۆی بخوازێ مەم وتی دەڕۆم... کەوتنە چارە. لە چل دەروازەی شاری یەمەندا لە بەر هەر دەرگا چل کچی ڕازاوەو جوانیان دانا بەلکو مەم یەکێکیان پەسەند کات... نەیکرد ... وتیان دوانزە هەزار سەرباز دەخەینە تەکیان لە هەر مەنزڵێکدا هەزار بگەڕێنەوە. پاش دوانزە مەنزڵ کە سەرباز نەما مەم و بەنگینە دەگەڕینەوە. (لێرەشدا دوانزە مەنزل واتە قۆناغ هاتووە کە مەم دەبێ بیپێوێ تا بە تەنیایی واتە بە «خۆی» دەگات. لە هەموو ببڕێت لە باب و کوشك و لەشکر و... ببڕێت و تەنیا بۆ دەنگی دڵی خۆی گوێ ڕاگرێ، ئەوی ڕاست و هەتا هەتاییە لەوێدایە. ئەو بە پێوانی هەر قۆناخ سووکتر دەبێتەوە ئەگەر لە بیرمان مابێ وتمان دوانزە بورجی ئاسمان دوانزە یاوەری میتران. دوانزە بورج لە ئاسمانی هەشتەم واتە ئاسمانی ئەستێرە وەستاوەکانە کە ئەگەر ئەویش بپێوێ بە جیهانی خودایی دەگات. جیهانی خودایی لێرەدا بە تێکەڵاو بوونی گیانی مەم و زین شوبهێنراوە)

لەو لاوە زین کە گوستیلەکەی مەمی لە دەستیدا دی مەلەك ڕێحانی لە خەو هەستاند و چوون بۆماڵی خوشکی «ئەستی» (لە خانیدا «ستی») کە ژنی «قەرە تاژدین»[٧] بوو، لە خانیدا تاجدین، بە باوەڕی من لە بناغەدا «تاژدین»[(٧)]ە بڕوانن بۆ روون کردنەوەکەی. پێشگری قەرە وشەی تورکیەکە ماناکەی «ڕەش»ە.ڕەش لە ئاینی میترایی و ئێزدیدا زۆر پیرۆزە و سەمبولی مەلەك تاوسە. ئێزدیگەل بە کتێبی پیروزی خۆیان دەڵێن موسحیفی ڕەش. پشتوێنی ڕەش تایبەتی میهردینەکان و دینە کوردیەکانە. پشتوێنی سپی تایبەتی زەردەشتیەکان بووە. جل و بەرگی ڕەش بۆ زاوا لە ئەورووپا و ڕەش نیشانەی تازیە تباری لەوێ پاشماوەی میهرپەرستیە کە لە بەشی ئاخردا لەگەڵ ڕەنگی سوور باسی دەکەین. لە بەرانبەرەوە جلی سپی بۆ بووك کە نیشانەی ئەو لایەنەکەی تری خودایە هەر لەسەر باوەڕی میهرپەرستیە. زاواو بووك کە بە یەك دەگەن پێوەندی دوو لایەنی ویست و گەلاڵەی خوداییە جا بۆ بە جێگای ڕەش وتراوە «قەرە»؟ ئەمە پاشماوەی دوو سێ سەدە

پاش ئیسلامه که میهرپەرستی شاراوە بووە و بۆ شاردنی مەبەستەکانیـان وشـەی بێگانـە وەکـوو سوریانی و تورکیان بەکار دەبرد. لەو سەردەمەدا کەس نەیدەزانی زمانی تورکی بەشی زۆری ئێران و ڕۆمدا گیر دەکات). بە سەرهاتیان بۆ ئەستی گێڕاوە. ئەستی کە زۆر ئاوزمەنـد بـوو وتـی مـەم سوێندی خواردووە، دێت. من لە قەراخ چۆمی جزیردا چل خزمەتکاری خۆم وەکوو جل شۆردا دەنێم و دوو پیاوی کێڵگەر بۆ کشت و کاڵ دادەنێم هەرکە مەم و بەنگینە هاتن بیانهێنن بۆ ماڵی من.

رەیحانە خزمەتکاری زین کە کچی «کا بەکر» بوو دەیەویست میوانی میزینەدین لە پێشدا بێتە میوانی ئەوان. (بەکر لێرەشدا ئاوێنەی خراپە و چەپەڵیە). مەم دوای بڕینی دوانزە مەنزل (کە بـە حیسابی ئەمڕۆ و ٣١٨ کیلۆمیترە هەر مەنزل شەش فرسەق. فرسەق ٦٠٠٠ گەزە هـەر گـەز ١٠٦ سانتیمەترە هەر فرسەق دەبێتە ٦٣٦٠ مەتر. هەر مەنـزڵ پێـنج فرسـەق، هـەر مـەنـزل دەبێتـە ٣١٨٠٠ مەتر واتە ٣٢ کیلۆمەتر دوانزە بەرانبەری کەیتەوە با رستای بۆتان تا کـەرکووکیش نیـە چ بگا بە یەمەن. دیارە تێکەڵاویەك ڕووی داوە مەبەست لە یەمەن یان شامەیان ئێران کە چرگەر یەك جار بە جێگای یەمەن ناوی ئێران دەبات. بۆتـان یـان بـە پەهلـەوی بوختـان پـێش ئیسـلام هەمیشە بەشێك لە ئێران بووە. بڕینی ئەم دوانزە مەنزڵە لەگەڵ خەم و رەنج تێکەڵاوە. ئـەوەی کـە شایانی باسە پاش بڕینی مەنزڵەکان لەسەر داخوازی مەم ئیتر پێوەندی ئاغا و نۆکەری لـە نێـوان مەم و بەنگینەدا نامێنی و دەبن بە برا و یـاوەری یـەکـدی. لـە میترایـی و دینـە کوردیـەکانـدا باوەڕمەندی بە «یاری» و «سفرەی یاری» هەیە، «لە میهرپەرستیشدا یـاری هـەیـە. میترائیسـم، هاشم رەزی» ئیتر لەم دینگەلەدا ئاغا و کۆیلەیەتی نیە، ئەوەیە کە دینە کوردیـەکـان و «خـوەرم دینی» کە باسی دەکەین قەت نەبوون بە دینی دەسەڵات. یان ئەگەر بوون وەکـوو قرمـەتیـەکـانی بەحرەین درێژ خایەن نەبوو و تێك شکان).

هەزار سەربازی ئاخر گەڕانەوە، نزیکی شاری جزیر بوونەوە. مەم و بەنگینە ڕێگایان نـەدەزانـی. شەو، غەوسولئەعزەمی بەغدا لە سیمای پیرە مێردێکدا ڕێگای بەوان پیشاندا (هەمیشەیەکی لە پەراوێزەکانی دینی ئیسلام بە ئاکتۆرەکانی ئەم چیرۆکە سێو دەدات یان ڕێگا پیشان دەدات.

هیچکات کەسێ وەکوو چوار خەلیفە و ئیمامەکان و تەنانەت خودی پێغەمبـەری ئیسـلام (د.ـ خ) نین. زۆرتر مەشایەخی تەریقەتن نە پیاوانی شەریعەت. ئەی ئەوانە لەم چیرۆکانەدا چکارەن بـۆ ناویان نیە؟). ڕۆژ وەیسولقەرنی ماهیدەشت (وەیس وەك لە ڕوون کراوەکەدا هەیە هەر ناوی کوردی و ئێرانیە. حەزرەتی غەوسیش هەر ئێرانیە واتە عەبدولقادری گێلانی کە بە تەعریب و هەڵە بووە

به جەیلانی و گەیلانی). هاتە یارمەتیدانیان و ڕێنوێنی کردنیان. گەیشتنە ناو شاری جزیرە ویستیان بە سپاردەی رەیحانە بچنە ماڵی بەکر بەڵام بە «هەڵکەوت» بەکر لە ماڵدا نەبوو... چوونە ماڵی ئەستی... ئەستی وتی کوڕی شای ئێران میوانمە بچنە شوێن تاژدین (لێرەدا یەمەن وەکوو ئێران ناوبراوە لە جێگایەکی‌تردا جزیر لە ڕۆژاوای یەمەندایە. لە ڕاستی‌دا جزیر لە ڕۆژاوای ئێراندایە نەك یەمەن دیارە لەم چیرۆکە کوردیەدا تێکەڵاوی ڕوویداوە و ئێران کراوە بە یەمەن).

مەلەك ڕێحان لە باوکی (کا بەکر) زیز دەبێ. بەکر سوێند دەخوات نەهێڵی مەم و زین بە یەك بگەن. کوڕانی دوو پادشای دیکە بە ناوەکانی «چەکۆ» و «عەرفۆ» (لە مەم و زینی خانیدا برای تاجدینن) بۆخوازوێنی زین هاتبوون. ئەوان لە دەرباری زینەدیندا بوون کە بەکر لە مێشکی‌دا خەریکی پیلان دانان بوو. بە ژمارەیەك زۆر ژنی خراپکار پارەیدا لە کاتێ کە مەم لە ماڵی تاجدینەوە هات بۆ دەرباری میر زینەدین سەر و ڕوویان بڕنن و بێژن زین نەخۆشی «خۆرە» (واتە گولی یان جوزام)ی گرتووە. هاوار بکەن و خاك بڕێژن بە سەر خۆیاندا و بڵێن زین خۆرەی پیا چووە و دەیانەوێ لە شار بێکەنە دەرەوە.

مەم و بەنگینە دەیانەوێ بچن بۆ دەرباری زینەدین و دەنگ و هاوار و قوڕ پێوانی ژنان دەبیسن. مەم باوەڕ دەکات کە زین خۆرەی گرتووە.

کاتێ ئەستی دەنێری بە دوای تاژدیندا کە بێتەوە ماڵێ، کە هات پێ دەڵێ کوڕی پادشای ئێران میوانمانە (دیسانەوە یەمەن بە ئێران هەڵگەڕایە و بەڕاستی ئایا ئەمانە هەڵەی چەرگەر کاك رەحمان بەکرە؟ ئەگەر هەڵە نەبێت، یەك گریمانە دێتە گۆڕێ. ئەویش ئەوەیە کە هەر بەڕاستی لە پێشدا ئێران بووە و گۆڕدراوە بە یەمەن.

هۆی ئەوە بووە کە پاش ئیسلام لە ئێراندا حکوومەتی ئێرانی وەکوو پێش ئیسلام نەما. لە پێشدا بۆ چەند سەدە ئێران لە ژێر دەستی عەرەبەکاندا بوو. لە سەدەی چوار بەو لاوە هۆزە تورکەکان شاڵاویان هێنایە سەر ئێران و حکوومەتەکانی ئێرانی لە سەدەی چوار بەو لاوە بوو بە حکوومەتی تورکانی غەزنەوی و سەلجووقی و پاشان حکوومەتی موغولەکان و پاش ئەوان تاتارەکان. پاش تاتارەکان سەفەویەکان هاتن هەر چەند بەرە چەڵەك کورد بوون «ب.ب اسلام در ایران. پترۆشوفسکی» بەڵام زمانیان گۆڕدرا بووە سەر تورکی و بە توندیش دوژمنی کورد بوون.

پاش سەفەویەکان نادر شاهات کە لە هۆزی «ئەفشاری تورك بوو. بۆ ماوەیەکی زۆر کەم حکوومەتێکی لاوازی کورد و لوڕ بە ناوی زەند» واتە کەریمخانی زەند دروست بوو کە بە دەس

تورکمانەکانی قەجەر ڕووخاو حکومەتی تورکمانەکانی قەجەر تـا سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمـی زاییینی خایاند. ئەو حکوومەتگەلە گشت دوژمنی کورد بوون. جکوومەتی ڕۆمیش کە بـە دەسـت تورکان لە نێو چوو و زمانی خەڵکی ڕۆمیش گەڕایە سـەر تـورکی و کـەم و زۆر دوژمنایـەتیـان لەگەڵ کورد هەبوو، ڕەنگە بۆ ئەوە ئێران کراوە بە یەمەن. و نەکراوە بە ڕۆم یـان شـام کـە وەکـوو وڵاتی سەربە خۆ نەبووە جا وێژەرانی چیرۆکەکە ویستوویانە وڵاتێك هـەڵبـژێرن کـە دوژمنایـەتـی لەگەڵ کورد نەبێ بۆ ئەمە میسر و یەمەن دەمێنێتەوە. لەو دووە یەمەن هەڵبژێردراوە). بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی وەکوو بەڵێن درابوو تاژدین وعەرفۆ و چەکۆ و مەم و بەنگین چوون بۆ دەربـار. بـەکـر سیخوڕگەلی دانا بزانێ چی دەبێ.... میر کە شیاوی مەمی لە ڕوخساریدا دیتبوو وتـی یـای زیـنم لەگەڵ جێگا و هەرچی کە هەیەتی پێشکەشی کوڕی برایم پاشام کرد. مەم کە لە جێگای سـەرەوە بەرانبەر زینەدیندا دانرابوو بیری کردەوە کە ئەگەر زین قبووڵکـەم دەڵـێن پیـاوێکی بێهـەسـت و غیرەتە و کچی خۆرە پیا چووی قبووڵ کرد. جوابی دایەوە قبووڵم کرد بەڵام بە خۆتم دایەوە. عـەرفۆ و چەکۆ خۆشحاڵ بوون. سێ جار ئەم قسە دوو پات کرایەوە بەڵام مەم جوابی هەر ئەوە بوو. بـەکـر خێرا خۆی گەیاندە کن زین و جنێوی زۆری بە مەمدا. زین تێکچوو ویستی کە مەم ببینێ و بەڵێنی بێنێتەوە بیر. تاژدین بە مەم و عەرفو و چەکۆی گوت زین هەر کام لە ئێـوەی ویسـت ئـەوانـیتـر یارمەتی بدەن. هەر سێ داواکار قبووڵیان کرد... پاشان عەرفۆ و چەکۆ زانیان کە مەم و زیـن لـە پێشدا هاو پەیمان بوونە جا بوونە لایەنگری مەم...

مەم و زین لە پیلانی بەکر تێگەیشتن. مەم چوو بۆ لای زین دەسـتیـان بـە قسـەی ئـەویندارانـە لەگەڵ یەك کرد.... میر زینەدین ناردی بە دوای مەمدا. ئەو لەگەڵ سێ دۆسـتەکـەی، بـەنگینـە و چەکۆ و عەرفۆ چوون بۆ دەربار میر وتی مەم وەرە یاری تەختە نەرد[٨] بکەیـن (لـە مـەم و زیـنی خانیدا بە جێگای تەختە نەرد واتە «تاوڵە» شەترەنجە. دەزانین کە شەترەنج نیازی بە تێفکرینی زۆر هەیە. بەڵام تەختە نەرد زۆرتر نیـازی بـە بـەخـت و شانسـە. لـە شـەترەنج[٩]دا هـزر و ویسـت و «ئیختیار»ی مرۆڤ لایەنی بەهێزە بەڵام لە تەختە نەرددا بەخـت و شـانس گـرینگترە و چـۆنیەتـی درێژەی یارییەکە «جەبر» واتە چۆنیەتی درێژە پێدانی یارییەکە بـە ویسـتی مـرۆڤ نیـە. سـەرنج بدەنە روون کراوەکەی. مەم چەند دەستی بردەوە. بەکروتی جێگاتان بگۆڕن وەکوو ئەوەی خانی مـەم کە کەوتە بەرانبەر زین چەند دەستی دوڕاند. میر وتـی وەرە یـاری شـیعر بـە شـیعر بکـەیـن لـە موشاعیرەدا میر بە ئەوینی مەم سووکایەتی کرد. تاژدین مـەمی بردەوە مـاڵ.... زیـن بـۆ مـەمـی

نووسی کاکەم (باوکم) دەچێتە ڕاو. نەخۆشم بێرە لام... ژوانمان دیواخانەکەی کۆشکی میر بێت. مەم نەخۆش بوو. وتی ناتوانم خۆم لەسەر زین ڕاگرم.... میر هات بۆ سەردانی مەم و بۆ ڕاو دەنگی کرد... ئەسپ بۆ مەم زین کرا. ئەستی بە چاروادارانی سپارد زینەکەی مەم شل دابەستن. مەم سوار بوو پاش چەند هەنگاو لە ئەسپەکە داکەوت. میر، مەمی بۆ ڕاو نەبرد. ناردی بە دوای بەکردا. بەکر وتی ئەسپەکەم شەل بووە ناتوانم بێم پاشان بە دواتدا دێم. بەکریش نەچوو بۆ ڕاو و سیخوڕی لەم لاو لادانا کە چاوەدێری مەم بکەن. میر چوو بۆ ڕاو.... مەم و زینی هاتن بۆ دیواخانەی میر دەستیان بە قسەگەلی ئەویندارانە کرد. بەنگینەیان نارد تا هەواڵی هاتنەوەی میریان پێ بدات.

... مەم و زین لە خەوێکی خۆشدا بوون کە بەنگینە بەخێرایی هات و وتی میر هاتەوە. ئەوان دووبارە خەوتنەوە. میر گەیشتە دەروازەی شار دەهەستن... میر گەیشتە دەرگای دیواخانە... میر هاتە ناو. مەم هەستا. کەڵپۆسێکی هەبوو خستی بە سەر زیندا... میر وتی حاڵت چۆنە کاکە مەم؟ ڕاو پیرۆز ئەمیر. زین لە ژێر پێستەکەوە کەزیەی دەرخست و پێشانی تاژدینیدا. تاژدین بە یەکێ لە پیاوەکانی گوت برۆ ماڵەکەم ئاور تێ بەردە. ئاگر بەرزەوە بوو گەیشتە نزیکی دیواخانە. میر و پیاوەکانی هاتنە دەرەوە. کاکە مەم لە زین ماڵاوایی کرد و ڕۆیی بەڵام دەسرەکەی زین کە لە لای بوو داکەوت. بەکر هەڵی گرت... مەم زانی کە بەکر شۆڤاریان دەکات. وتی دەبێ بەکری مەرگەوەر بکوژم (سەبارەت بە مەرگەوەر باس کراوە)... ئەوەی تاژدین هەبووی سووتا. میر وتی دەبی نەریتی «باربوو» بۆ تاژدین ئەنجام بدرێت (بو ئەم نەرێتە کاك ئەییوبیان لە ژێر نووسدا وتوویە... دابێگی زۆر پەسند و زیندووە. ئەوەی کە ژن دەهێنێ یان تازە دەچێتە دێیەکەوە کەسانی دیکە شت و مەکی بۆ دەنێرن...).

میر وتی من ژوورێك بە گشت پیداویستیەکانیەوە دەدەم، هۆ بەکر تۆ چی دەدەی؟ بەکر وتی هیچ قوربان ئەوەی کە بە ئەنقەست ماڵی خۆی گر تێ بەردەدات نابێ هیچی بدەیتێ. میر وتی چۆن. بەکر هەموو شتێکی گێڕایەوە. میر بیری کردەوە دەبی جۆری مەم بکوژم کە تاژدین و چەکۆ و عەرفۆ نەزانن. بەکر وتی ئەوان بێ مەم بینێرە بۆ جەنگی وڵاتێ کە باجیان نەداوە کاتێ کە چوون بەنهێنی دەی خەینە سیاچاڵەوە.... ئەو سێ کەسە چوون بۆ جەنگ. میر و بەکر بە زینیان گوت مەم چووە بۆ جەنگ... مەم خرایە سیاچاڵەوە... مەم لە پێشدا توولە تاژیەکی پەیدا کردبوو. کە مەم نەما، زین خۆراکی پێ‌دەدا.

تووله تاژیش دەیبردە کونی سیاچالەکەوە و دەیدا بە مەم. زیـن ڕۆژێ کـەوتـە دوای تاژیـەکـە و گەیشتە سیاچاڵ و بەسەرهاتەکەی زانی. لەگەڵ مەم قسەی کرد مەم وتی چل ڕۆژە لە سیاچـاڵدام. لەم کاتەدا لەشکر بە سەرکەوتنەوە هەڵگرایەوە. زین خێرا چوو بۆ لای تاژدین و بەسـەرهاتەکـەی پێ گوت... دێن بۆ سەر سیاچاڵ. زین پەلکەی وەکوو گوریس شـۆڕ دەکاتـەوە سیاچـاڵ. مـەم بـەو پەلکەوە دێتە دەرەوە (ئەمە وەکوو چیرۆکی ڕوودابەو زاڵ باوکی ڕۆسـەمـە کـە ئـەویشـە چـیرۆکی میترایيە). مەم چاوی نابینـێ و زۆر نەخۆشە.

گەردن ئازایی دەخوازێ و دەمرێ. (جگە لە ژمارەی چل کە لێرەدا ژمارەی ڕۆژانی زیندانی مەمە ئیتر نیشانەیەك لە بیر و باوەڕەکانی کورد لە زیندانی مەمدا نەماوە. دیارە ئـەو مـەم و زینـە کـە خانی لە ڕووی ئەوە هۆنراوەکانی داناوە ڕەسەنتر بووە). .. کاکە مەمیان لە جزیری بۆ تانـدا ناشـت بەنگین جل و بەرگی خۆ و بە تەواوی ئەسپەکەی شـین دەکـات (شـین لـە نـاو میهـر دینـەکانـدا نیشانەی ئازیەتباری[10] بووە. ئێستاش ئەو نەریتە لە کوردستاندا هەر مـاوە. مێـزەر و پشـتوێنی هەورامیەکان کە بە دەست دەچنرێ دوو جۆرە. یەکەم تێکـەڵاوی سـپی و سـوور کـە بـۆ شـایی و زەماوەند بووە دووهەم سپی و شین کە بۆ ئازیەتباری بووە. ئێستاش کە هەر بەو دوو ڕەنگە دەچنرێ شوێنەواری ئەم نەریتگەلەیە. (ب.ب ژمارە ١٠)

بەنگین بۆ یەمەن گەڕایەوە و بەسەرهات دەگێڕێتەوە... لەشکری برایم پاشا دەگاتە نزیـك شـاری جزیر. زینەدین و بەکر دەکەونە خۆ. زین ئازاد دەکەن بچێتە سـەرگۆڕی مـەم. لـەوێـدا دەمـرێ... زینەدین و بەکر دەڵێن گۆڕی بۆ هەڵکەنن لە هەچـکوێ کـولنگ و پـاچ دەدەن بـە سـەر زەویـدا هەڵناکەنرێ تا دەگەنە لای گۆڕەکەی مەم. لە لای گۆڕەکەی مەمەوە زەوی هەڵدەکەنـرێ و لـە لای مەمەوە دەی نێژن. بە ناژتنی زین دەنگێکی ترس هێنەر لە گۆڕی مەمـەوە هـەسـتا و بـەکروتـی خوشکی تۆ بە مردنیش دەسمان لێ هەڵناگرێ. میر کە پەشیمان ببووەوە فـەرمانیدا هـەر لـەوێـدا بەکر بکوژن. بەکر هەڵاتە نێوان گۆڕەکەی مەم و زین هەر لەوێدا کوشتیان خـوێنی بـەکـر ڕژایـە نێوان گۆڕی مەم و زین و لەو خوێنەداری «زی» سەوز بوو. (مامۆستا ئەیوبیان سەبارەت بـە زی نووسیانە «دارێکی دڕکاوی کێویە کە «دڕووی مەم و زینان»یشی پێ دەڵێن.

کاری مەم و زین تەواو بوو. عەرفۆ خۆی نایەگڵ («گڵ پیوان» دابێکە بۆ ئازیەتباری) چەکۆیش خۆی لە خومدا کێشا (خوم یا هورمە ئەو دەفـرە گڵینـە گـەورەیـە کـە ڕەنگـرێژان ڕەنگـی تێـدا دەگرنەوە. مەبەست ڕەنگی شینە. ئەم ڕەنگە لە هەندێ جێگای کوردستاندا بە ڕەنگی کەسك یـان

سەوز دەڵێن. بەڵام مەبەست ڕەنگی ئاسمان و نەختێ لەوە دێزترە)... خەبەر بە برایم پاشا درا کە زینیش مرد وتی سبەینی شاری جزیر کاول دەکەم. بەنگینە کرا بە سەرداری لەشکر. هاتنە نێو شار ڕوویان کردە ماڵی بەکر و زینەدین و گشت ئەوانەیان کوشت (ئەم کوشتارە لە مەم و زینی خانی و بەگشتی لە فەرهەنگی کورد لەوانە ئاینی میترایی و دینە کوردیەکاندا نیە و شتێکی دواییە. ئەو خۆشەویستی و میهرەبانیە کە لە ئاینی مەسیحیدا هەیە وەك زۆر شتی دیکە لە میهرپەرستی کوردان وەرگیراوە).

ئەستی وتی میرم، مەم و زین و شوێنەواری ماڵە بابم نەمان. برایم پاشا دەستی خستە ئەستۆی و کردی بە کچی خۆی و چوونە سەر گۆڕی مەم و زین. لەگەڵ لەشکردا بانگ و هەرای گریانیان بەرز کردەوە...

برایم پاشا دوو چاوی کوێر بوو... میر وتی بە ئەستی ئەوە شاری جزیرم بە قرەتاژدیندا گەڕایەوە بۆ یەمەن و بەنگینە کرا بە پادشای یەمەن.

(خوێنەری بەڕێز سەرنجی ئەوەی داوە کە بەشەکانی سەرەتای ئەم چیرۆکە بە تەواوی میهری و لە ژێر کاریگەری بە هێزی دینە کوردیەکاندایە بەڵام پاش ئەوەی کە مەم دەچێتە شاری جزیر گۆڕانکاری و تێکەڵاوی زۆر دەبێ و وەکوو ئەوەی خانی ڕەسەنایەتی نەماوە).

## ڕوون کردنەوەکانی بەشی چوارەم

١ ـ٢ ـ «وەیسولقەرەنی» لە بناغەدا خەڵکی یەمەنە و گۆڕیشی هەر لە وێدایە. جا لە ماهیدەشتی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا چ دەکا؟ ئەویش لە لووتکەی کێو. لە کوردستانی باکووریشدا هەیە.

«ئەولیای چەلەبی» کە نزیك بە چوارسەد ساڵ لەمەو پێش واتە ١٠٦٢ی کۆچی دەستی بە گەشتیاری لە کوردستانی باکوورەوە بۆ «تەورێز»ی ئازەربایجان کردووە لە میافارقینەوە ڕوو بە باکوور دەچێتە شارو قەڵای «خرۆ». لەوێوە دەچێتە «جالندەر» و نووسیویە، ڕۆژی دوایی لەگەڵ هەموو لەشکر لە ڕێگایەکی بەردەڵانەوە تێ پەڕین و گەیشتینە گۆڕی وەیسولقەرەنی.

چەلەبی کە سەری سووڕ ماوە دەڵێ ئەمە گۆڕی ئەو نیە گۆڕی ئەو لە یەمەندایە. ڕەنگە ئەمە گۆڕی سوڵتان وەیسە کە لە نەوەکانی عەبباسیگەلە... «سیاحەتنامەی ئەولیای چەلەبی وەرگێڕ فارۆق کەیخەسرەوی»

لە گشت کوردستاندا لووتکەی کێوگەلی زۆر هەیە کە پێش ئیسلام ستایشتگا بوون و پاش ئیسلام بە ناوێکی ئیسلامیەوە بەرێز ماونەتەوە. لەوانە لە شاری سنە لووتکەی «سولتان سیراجوددین» کە ٢٩٠٠ میتر لە ئاست زەریابەرزە ـ سوڵتان سەهاو «ئەسحاو؟» کە ٢٦٠٠ بەرزە. «یۆسۆسیا» و دوو لووتکە «سا» و «سەیی» لە کێوی عاشقاندا بە بەرزایی ٢٥٠٠ میتر و... دەزانین هیچکات گۆڕی موسڵمان نابەنە لووتکەی هەرە بەرز. هەندێ کەس دەڵێن ئەمانە سەحابەی پێغەمبەر (د ـ خ) بوون کە لەوێدا کوژراون. دیارە شەڕی عەرەبی موسڵمان و خەڵکی خۆجەیی لە لووتکەی هەرە بەرزدا نەبووە. ئەم ناوە ئیسلامیگەلە پاشان دروس کراون. وەکوو مەرقەدی حەزرەتی عەلی لە «مەزار شەریف»ی ئەفغانستاندا کە گشت ئەفغانستانیەکان باوەڕیان پێیە. لە ڕاستیدا مەرقەدی عەلی لە نەجەفدایە. پاش توێژین دەرکەوت کە لە کاتی هێرشی عەرەبدا ئەو مەرقەدە جێگای پەرستگەیەکی هەرە پیرۆزی بوودایی بووە کە پاشان بەو ناوی ئیسلامیەوە بەرێز ماوەتەوە. وەیسولقەرنی ماهیدەشت و ئەوەی کوردستانی باکوور بێگومان ستایشتگای میهرپەرستی پێش ئیسلامە. بۆ ئەوە دەڵێم میهرپەرستی چون زۆرتر نازناوی باوە و پیرو سان (کە پاشان گۆڕدراوە بە سولتان) یان هەیە.

لە سنە و کرماشان، سەراو، واتە کانی گەورە و پڕ ئاومان بە نـاوی «خـزری زینـدوو» و «خـزر ئەلیاس» هەیە کە ئاشکرایە مەعبەدی پێش ئیسلام بە گومانی بـەهێز «ئـەناهیتـا» بـووە کـە ژخوودای بەرێزی ئاوە «ئەن + ئاهی+ تا» ئەن یان «ئەنە» لە ئەوێستادا واتە «نـە». ئـاهی، واتـە تێکەڵ کردن، تا، دابێژی دۆخی مێ »تە«یەکە پاشگری ئاوڵناوە لـە ڕوون کـراوەکـانی پێشـوودا، باسمان کرد و وتمان لە شکستە و.... دا هەیە. بە گشتی واتە «تێکەڵ نەکراو» یان ڕوون و زەلاڵ. لە پێشدا نازناوی ڕووبارێکی ئوستووڕەیی بووە کە پاشان بووە بە ناوی ژخوای پارێزەری ئاو. «ئاهیتە» لە دۆخی نێریدا، لە کوردی سنەیی و کرماشانی و ئیلامی و هەورامیدا بووە بە «ئاوێتـە» واتـە تێکەڵ کراو. لە ئیزدیدا وەکوو خزرئەلیاس ڕێزی تایبەتی هەیە.

«وەیس»: لە زەمانی خەسرەو ئەنەوشیروانی ساسانی (هـەفتـاد هـەشـتاد سـاڵ پـێش هێرشـی موسڵمانەکان بۆ سەر ئێران لە زەمانی عومـەر کوڕی خەتتاب)دا سـەردارێکی ئێرانـی بـە نـاوی «وەهرەز» خەڵکی نەهاوەند کە ئێستا زمانیان کوردی لەکیە، یـەمـەنـی داگـیر کـرد و بـوو بـە فەرمانرەوای ئەوێ. وەهرەز و لەشکرەکەی لەوێ مانەوە و بۆ ئێران نەگەڕانەوە. بەم بۆنەوە هـەنـدێ فەرهەنگی ئێرانی لە زمان و بیر و باوەڕ لە یەمەندا دزەی کرد لەوانە ناوی وەیس و وەیسەیە. پەرە سەندنی شیعەیش لە یەمەندا بۆ ئەم مژارە دەگەڕێتەوە.

لە ئەوێستادا «وەئێسەکە» لە پەهلەویدا «وەیسـەك» لـە کوردیـدا «وەیسـە» و لـە فارسـیدا «وەیسە» و «وەیس». لە ئەوێستادا تووسە، پاڵەوانی ئەوێستایی نـزای وایـە لـە شـەڕدا کـوڕانی وەیسە، پیران و هوومـان و پیسلم تێك شکێنێ. لە شەڕێکدا هەر سێ کوڕی وەیسە بە دەس گـۆدەرز و ڕۆسەم و بێژەن دەکوژرێن. ڕەنگە وەیسولقەرەنی یەمەنی هەر لە نەوەی ئێرانیەکـان بـووبێ و لـە دۆخێکی عیرفانی ئێرانیدا بووە.

٣ـ مـاییدەشت: «مـای» واتە ماد. ماییدەشت واتە دەشتی مـادی. دال لـە کوردیـدا دەسـوێ و دەبێ بە دالی موهمەلە کە تایبەتی کوردیە. بۆ دالی موهمەلە لەئەلفبێی کوردیدا نیشانە نیـە. هەورامی و گەڕووسی و خەڵکی لای سنە کە ئەم پیتە زۆر دابێژ دەکـەن بـۆ نووسـینی لـە «د»ی موهمەلە کەڵك وەردەگرن.

دابێـژی ئـەم پیتـە جۆرێکـە کـە دەتـەوێ «د» دابێژکـەی زمـان بـە تـەواوی نانووسـێ بـە مەخرەجیدالەوە. ئەم پیتە لە سەردەمی ئیسلامدا دابێژ کراوە و عەرەب لە نووسیندا کردوویەتـی بە «هـ» و بە جێگای ماد دەڵێن «ماه» وەکوو ماهەین واتە دوو ماد، مادی بەسرەو مـادی کووفـە

مەبەست دوو شاری کوردستان بوو، کە باجەکەیان بۆ فەرمانڕەوای کووفە و بەسرە براوە. دالی موهمەلە لە بواری زەماندا دەسویٚ بە «ی» یان «و» یان بە تەواوی دابێژ ناکریٚ، باسێکی درێژی زماننانسیە و لیٚ دەگەڕێین.

٤ـ کوردی و فارسی «فەڕ» پەهلەوی «فەڕ»، «خەرە» لە ئەوێستادا «خوەرنـە» «خـوەر+نـە» خوەر و هوەر بە مانای خۆر. نە، نیشانەی ئاوەڵناوە کە باس کرا. لە بناغەدا واتە ئەوشتەی کە سفەتی خۆری هەیە. چون وشەکە لە خۆر گیراوە، دیارە کە ئەم شتە زەردەشتی وەکوو زۆر شتیتر لە ئاینی میهرپەرستی گرتووە و تێکەڵاوی ئەوێستای دواییـنی کردووە.

٥ـ هێشتا لە نێو عەشایەر و دێهاتەکاندا دیواخی سوور بە سەری بووکدا دەکێشن لە هەندیٚ جێگای کوردستان بە زەماوەند دەڵێن سوور. سوور کە لە کڵاوەکەی سوهرەوەردیدا باسی دەکەین لە میهرپەرستیدا نیشانەی جەژن و شادیە. لە سەر جل و بەرگی سپی و سووری بووك لە بەشی ئاخردا باس دەکەین.

٦ـ قوڵتاس بە دابێژی کۆن کورتەش لە زمانی کۆنی کورد واتە ئەوێستاییدا «ل» و «ڵ» نیـە. پاش پەرەسەندنی «ل» لە مادی میانەدا (پەهلەوی و کوردی پێش ئیسلام) هەندیٚ «ر» بوون بەلام و هەندیٚ «ڕ» و «ر» لەگەڵ پیتێکیتر لە کوردیدا بووە بە «ڵ» وەك «ور»ی ئەوێستایی لە هەورامیدا بووە بە ول و لە سۆرانیدا گوڵ. مەرز، بوە بە ماڵ (ماڵین). دەرتە بووە بە داڵ (دڕندە) سەرتە بووە بە ساڵ و...

کورتەش بووە بە کوڵتاش. پاش ئیسلام کە پیتی «ق»ی عەرەبی پەرەی سەندووە بووە بە قوڵتاش و قوڵتاس. کورتە و کورت لە زەمانی ساسانیەکاندا بە کورد گوتراوە (ب.ب گۆڤاری ئایندەی ژمارە ٣٤ی سلیمانی وتاری ئەم نووسەرە: ڕاڤەی وشەی کورد) «ش» نیشانەی سیفەتی کارکەرە کە سوواوە بە «س» بە گشتی قوڵتاس بە مانای کێونشینە.

٧ـ تاژدین دوو وشەیە «تاژ +دین». لە پەهلەوی خوشکی زمانی کوردیدا «تاچ» لە ئەویستاییدا «تەچ» بە مانای هەرە توندو تیژ ڕویشتنە. لە کوردیدا بە سەگی ڕاو کە توند هەلدیٚ دەڵێن تاژی و تانجی. کە «ژ» لە زاراوەیەکدا بیٚ بە «ج» دەنگ نەختیٚ دەکەویتە ناو لووت و نوونی ویقایە دەگریٚ و تاژی دەبیٚ بە تانجی. تاژدین بە کەسیٚ دەڵێن کە بە توندی بۆ لای دین دەڕوا. دین، لە ئەوێستای دواییـنی بەتایبەت لە بەشی «وی دێودات»دا هەر بە مانای دینـە. لە سوریانی و عەرەبیشدا ئەم وشە هەیە. ڕەنگە سوریانی و عەرەبی لە کوردی کۆنیان گرتبیٚ. بە

قاعیدەی ئەوێستایی «تەچەرۆذة» یان بە قاعیدە «تەچەرۆذة» هەر ئەوەیە کە لە کوردیدا دەڵێن تاڵەجەرۆ. لە پەهلەویدا دەبێ بە «تاچەرۆد». کوردی «ڕۆ» پەهلەوی رۆد ئەویستایی «رەئوذة» بە مانای ڕووبارە. تاڵەجەرۆ واتە ڕووباری توندڕەو. «رۆد»ی پەهلەوی لە کوردیدا «د» کەی سوواوە و بووە بەڕۆ. وەك چۆمی «گاوەڕۆ» نزیکی سنە بە مانای چۆمی گا.

٨ ـ٩ ـ «تەختە نەرد» بە کوردی باشوور «تاوڵە» چون لەسەر هەڵکەوت و قەزاو قەدەرە یارییەکی دروستکراوەی میهرپەرستیە. جەعبەیەکە وەکوو کتێب دەکرێتەوە دوو کەس یاری پێ دەکەن. لای هەر یاریکەر دوانزە خانوو هەیە کە نیشانەی دوانزە بورجی ئاسمانە. دوو موکەعەبی چکۆلە هەیە کە لە شەش رووەکانیان خاڵ وەکوو یەك تا شەش خاڵ هەڵ کەندراوە کە «تاس» و لە باشووردا «زار»ی پێ دەڵێن ئەم دوو زارە نیشانەی مانگ و خۆرە. یاریکەران ئەودوو تاسە هەڵدەهاوێن. بە پێی خاڵەکانی ئەو دوو تاسە هەرچی هەبوو بە مۆرەکانیان لە باشووردا «پوول» کە بۆ هەر یاریکەر پانزە پوولە یاری دەکەن. بە پێچەوانەی شەترەنج کە بردن یان دۆڕاندن بە ڕادەی هوشیاری و هزرینی یاری کەرانە لەم یارییەدا بە شانس و بەختەوە پێوەندە.

شەترەنج عەرەبی کراوی «چیترەنگهە»ی سانسکریتە کە بە قاعیدەی ئەوێستایی دەبێ بە «چثوەرەنگهە» واتە چوار دۆخ، مەبەست چوارریزی شەڕکەر لەم یارییەدایە. سەبارەت بە «ئەنگهە» باس کرا. Cithwer لە ئەوێستادا بە مانای چوارە.

١٠ـ لە هەموو نەخشە میترایییەکان لە پەرستگەکانی میهرپەرستیدا پەیکەری میترا هەیە کە خەریکە گا دەکوژێ. لە لای ڕاستیەوە لاوێك هەیە کە شەماڵەی داگیرساوێکی هەڵگرتووە. دیمەنی خۆشحاڵ و بە پێکەنینەوەیە ئەمە نیشانەی سپێدە و هەڵ هاتنی خۆرە. ئەم پەیکەرە رەنگی سوور کراوە. لە لای چەپی میتراوە لاوێکیتر شەماڵەی داگیرساوی سەرە و خوار گرتووە کە نیشانەی ئێوارە و نیشتنی خۆرە. دیمەنی خەمۆکی هەیە و بە نیشانەی خەم و کەسەر رەنگی شین کراوە. شین بە مانای گریان و شیوەنیشە. مەبەست لە شین رەنگی دێژە لە رەشەوە تا رەنگی ئاسمانی دێز. هەندێ زاروچکەی سۆرانی وەکوو موکری کە بە کەسك دەڵێن شین، شیاوی لێکۆڵینەوەیە.

**به سەرهاتی سوهرەوەردی**

**شاری سوهرەوەرد کوێیە؟**

«ئیبنی حووقەل» گەشتیار و جوغرافی زانی عەرەب گەشتەکەی لە ساڵی ٣٣١ی کۆچی بەرانبەر بە ٩٤١ی زایینی دەس پێدەکات. لە بەشی هەفتەمی سەفەرنامەکەیدا (سوورەتولئەرز) کە بە عەرەبی نووسراوە سوهرەوەرد وەکوو یەکێ لە شارەکانی «جبال» دەناسێنێت و لە ناساندنی شارەکاندا سەبارەت بە سوهرەوەرد دەڵێ: ئەم شارە وەکوو شارەزوورە و هەر بەو پانتاییەیە. شارێکی پڕ خێر و پڕ بەرهەمە و خەڵکی ئەوێ زۆربەی کوردن. لە پێشوودا لەسەر ئایینی «خواریج[1]» بوون. هەندێکیان کۆچیان کرد و هەندێکیان بەهۆی نیشتمان پەرستییەوە لەوێ ماونەتەوە. هەر دوو باژێڕ (سوهرەوەرد و شارەزوور) شوورایەکی سەخت و پتەویان هەیە. ئیبنی حووقەل پاش ناساندنی شارەکانی کەرەج (ئەم کەرەجە لە نێوان پارێزگاکانی کرماشان و لوڕستاندایە و لەگەڵ کەرەجی نزیکی تاران جیاوازی هەیە. هەندێ لە جوغرافی نووسان «کەرە» یان نووسیوە) و برووجرد و نەهاوەند و ڕۆذاور و حەلوان[2] و سەیمەرە و سیروان و سوهرەوەرد و شارەزوور و قەزوین و قۆم و کاشان دەنووسێ ئەم جێگاگەلە جگە لە هەمەدان تا ڕەی و لەوێ هەتا قۆم کە دەشت و ڕاستاییە ئەوانیتر کوێستانگەلی سەختە. لە شارەزوورەوە تا ئامێد و لە ناو ئازەربایجان و جزیرە و ناحیەکانی مووسڵ بە درێژایی :٣ تا ٤٠ فرسەق یەك زەمینی بێ کێو و ڕاست نابینی خەڵکی ئەم کێوگەلە کوردەکانی حەمیدیە و لاریە و هەزبانیە و پاشماوەیان لە کوردەکانی شارەزوور و سوهرەوەردن. (سەفەرنامەی ئیبنی حووقەل، «ئێران دەرسوورە تولئەرز، وەرگێڕ بە فارسی «دوکتور جەعفەر، شعار» لاپەرەکانی ١١١ تا ١١٤)

ئەبوو ئەسحاق ئیبراهیم ئیستەخری، کۆچی دوایی لە ساڵی ٣٤٦ی کۆچی، ٩٥٧ی زایینی گەشتیار و جواغرافی نووسی ئێرانی کە بەرهەمەکانی بە عەرەبی نووسیوە، لە کتێبی دووهەمیدا «ئەلمەسالیك وەلمەمالیك» لە بەشی ناوچەکانی جبال (کوێستان) سەبارەت بە شارەزوور و سوهرەوەرد هەر دوو پێکەوە نووسیویە: شارەزوور شارێکی چکولەیە لەویدا کوردان دەسەڵاتیان هەیە هەر وەها سوهرەوەرد. ئەم دوو شارە لە دەست کوردگەلدایە (ل ١٦٥ مەسەلیك وەلمەمالیك وەرگێڕ بە فارسی «ئیرەج ئەفشاری»). هەر وەها سەبارەت بە ڕێگای سوهرەوەرد

دەنووسێ: ئەگەر بتەوێ لە هەمەدانەوە بە ڕێگای سوهرەوەرددا بچی بۆ زەنگان (ئێستا دەڵێن زەنجان) سی و چەند فرسەق دەبێ (فرسەق نەختێ زۆرتر لە شەش کیلۆمەترە) «ئەبولقاسم بن ئەحمەد جەیهانی «گەشتیار و جوغرافی نووسی ئێرانی لە سەرەتاکانی سەدەی چواری کۆچی واتە سەدەی دەی زایینیدا ژیاوە و بەرهەمەکانی بە عەرەبی نووسیوە. لە کتێبی «ئەشکالولعالەم»دا پاش شارەکانی کەرەج و برووجرد و نەهاوەند و ڕوذاوەر (رۆذ بە مانای ڕووبارە) و حەڵوان. سەبارەت بە سوهرەوەرد نووسیویە: سوهرەوەرد شارێکی چکۆلەیە. زۆربەی خەڵکی ئەو شارە کوردن. فەرمانرەواکانی هەمیشە کورد بوونە. (ئەشکالولعالەم. وەرگێڕ بە فارسی عەبدوسسەلام کاتیب. بە تێکۆشانی فەیرۆز مەنسووری).

لسترەنج میژووناسی بە ناوبانگی ئینگلیسی (١٩٣٣ـ ١٨٥٤) سەردەمێك لە ئێراندا ژیاوە. لە کتێبی «ولاتانی ڕۆژهەلاتی خەلافەت»دا سەبارەت بە سوهرەوەرد نووسیویە: لە ڕۆژاوای سوڵتانیە سجاس یان سیجاس و سوهرەوەرد دوو شارۆچکەی نزیك بە یەك بوون کە تا زەمانی حەمدوڵلای مستەوفی (نووسەری تاریخی گوزیدە و نوزهەتولقلووب لە سەدەی هەشتی کوچیدا) هەندێ ئاوەدان بوو بەلام ئێستا هەر دوو وێران بووە (پاشان وتەکانی ئیبنی حوقەلی هێناوە). حەمدوڵلای مستەوفی دەڵێ لە پێشدا سوهرەوەرد و سەجاس دوو شار بوون کە لە هێرشی مەغۆلدا وێران کراون و ئێستا بە قەدەر دوو گوند ماونەتەوە. سیجاس لە پێنج فرسەقی ڕۆژاوای سوڵتانیەدا بووە و سەد و چەند گوندی هەبووە کە لە هەموودا موغۆلەکان نیشتەجێ کراون...».

مامۆستا هاشمی رەزی لە کتێبی حیکمەتی خوسرەوانی لاپەرەی ١٩دا نووسیویە: حەمدوڵلای مستەوفی لە کتێبی نوزهەتولقلووبدا سەبارەت بە سوهرەوەرد نووسیویە: زمانی خەڵکی ئەوێ پەهلەویە». بەلام ئەمن ئەو کتیبەم بە تەواوی خوێندەوە و شتی وای تێدا نەبوو. ئەم کتیبە بە تێکۆشان و ڕاست کردنەوە و پەراوێز نووسی زانا و ئێراننناسی بەڕێز دوکتور موحەمەدی دەبیر سیاقی لە بلاوگەی حەدیس لە ١٣٨١ (٢٠٠٢ زایی)دا چاپ کراوە لەم کتێبەدا لە لاپەرەکانی ١٠٦ و ١٠٧دا سەبارەت بە سجاس و سوهرەوەرد بەم جۆرە هاتووە: «لە پێشدا دوو شار بوون کە لە هێرشی مەغۆلدا وێران کران و بە قەدەر دو گوندیان لێ ماوەتەوە. «جرروود» و «ئیجرورد» لە گرێداوەکانیە. لە باشووری سوڵتانیەوە ڕۆژێك ڕێگایە. ولاتێکی سارد سێرە بەرهەمی هەندێ دانەوێڵە و میوەیە. زورتر لە سەد گوندی هەیە و زۆربەیان ئێستا (سەدەی هەشتی کۆچی) موغۆلنشینە. گۆڕی ئەرغوون خانی موغۆل لە کێوی سجاسدایە... خەڵکەکەی حەنەفین.

لەوڕگەی چاکی تێدایە. باجی حکوومەت لەویٚ دوو «توومان»ە. ئەمە گشت ئەوەیە کە لەو کتێبەدا سەبارەت بە سجاس و سوهرەوەرد نووسراوە و ئیتر لەم کتێبەدا سەبارەت بەو دوو شارە هیچ نەنووسراوە و سەبارەت بە زمانی خەڵکی ئەویٚ هیچ باس نەکراوە. نازانم ئەو هەڵە زەق و نالەبارەی مامۆستا چۆن پەیدا بووە.

پێم وابیٚ ئەو بەڕێزە سوهرەوەردی لەگەڵ مهراغە و چەند شاریتر کە زمانیان وەکوو پەهلەوی نووسراوە تێکەڵاو کردووە. یان.... !!

سوهرەوەرد ئەمڕۆکە، یەکیٚ لە گوندەکانی بەخش (ناحیە)ی «قەیدار»ی شارستان (قەزا)ی زەنجانە. عەلی ئەکبەری دێهخودا لە لوغەت نامەکەی دانووسیویە «... ئەم ناوچە ۲۵ گوندی چکۆلەو گەورەی هەیە. لە پێشدا سوهرەوەرد شارێکی چکۆلە بووە».

ئەگەر لە سنەوە ڕوو بە باکوور بو دیواندەرە ڕێکەوی، دە کیلۆ مەتری دەمێنی بۆ دیواندەرە بە لای ڕۆژهەڵاتدا لاکەیتەوە پاش بڕینی نزیك بە شەست کیلۆمەتر دەگەیت بە شاری «بیجاڕ» کە ڕۆژهەڵاتیترین شاری کوردنشینە و سەر بە پارێزگای کوردستانە و ناوەندی کوردەکانی «گەڕوسی»[۳]یە. شارۆچکەو گوندەکانی بیجاڕ لە لای ڕۆژهەڵاتەوە هاو سنووری پارێزگای تورکنشینی زەنجانە. سوهرەوەرد لەم سنوورەدایە و ئەمڕۆکە خراوەتە سەر پارێزگاری زەنجان. خەڵکەکەی سوهرەوەرد ئێستا کورد و تورك تێکەڵاون. لە سەدەی هەفتی کۆچیدا بە دەس موغولەکان کاول کرا و ئیتر وەکوو شار نەیتوانی پشت ڕاست کاتەوە. دێهخودا لە بەشی سجاسدا نووسیویە «سوەرەورد و سجاس لە پێشدا دوو شار بوون کە لە هێرشی موغولدا کاول کران. دیەخودا هەندیٚ سەرچاوی‌تری بۆ سوهرەوەرد و سجاس ناساندووە:

جەهانگوشای جووەینی ـ شەددولئەزار ـ ئەخبارودەولەتوسسەلجووقیە ـ تاریخ غازانی و حەبیبوسیسەر.

**مانای سوهرەوەرد**

سوهرەوەرد، (سوهر+ ە+ وەرد) سوهر لە ئەوێستادا «سوخرە» لە پەهلەویدا سـوخر، و سـوهر. لە کوردی زازا و هەندێ زارۆچکەی کرمانجیدا، سوهر، لە زاراوەکانیتری کوردیدا «سوور» هەر بە مانای رەنگی سوورە. بزوێنی سەری «ە» چەشنێ نیشانەی ئاوەڵناوە وەك دەڵێن سـوورەگول. «زەرد» وشەی رەسەنی کوردی و ئەوێستاییە بە مانای زەوی نەرم و شێف کراو. مامۆستا هـەژار بـە زەوی دوو جار کێڵدراو مانای کردووە.

لە ناوچەی سەقز و بانە و بۆکاندا وشەی «شینازەرد»مان هەیە بە زەویەك دەڵێن کـە بـە هـۆی نەرمی خاکەکەیەوە سەوزەڵاتی و ڕووەکی زۆری بێت. وشەی زەرد لە ئەوێستادا کە دایکـی زمـانی کوردیە «زەردە» («ر» بزرۆکەی هەیە) بە مانای زەوی نەرم هاتووە، لە بەرانبەر ئەم وشەوە وشـەی خرووژدی هەیە کە بە مـانای سەختـە. زەردە دوو جـار لـە ئـەوێستا لـە بـەشـی «وی دێـودات» (وەندیداد) وەکوو «زەردەسمـە» (زەردە+ زمـە) هـاتووە (وەندیـداد، ۸،۷، ۱۵، ٤٧) «زمـە» لـە هەورامیدا زەمی و لە زارەوەکانیتردا «زەوی» هەر بە مانای زەوییە. «زەردەزمەی» ئـەوێستا بـە مانای زەوی نەرمە. «خرووژدی زمە» بە مانای زەوی رەقە کە کێڵـدرانی زۆر سـەختـە. سـەرداری مەزنی کورد لە زەمانی ئەشکانیەکاندا «سوخران» یان «سوهران»ە. هـۆز و ناوچـەی سـۆران لـە کوردستانی باشووردا لە ناوی ئەو سەردارە وەرگیاوە. لە سوهراندا پیتی «ە» سـوواوە و بـووە بـە «سۆران»، وەکوو لە پەهلەویدا «مـوهر» لـە کوردیـدا «مـۆر»، عـەرەبی «شـوهرەت» کـوردی «شۆرەت»، لە پەهلەویدا «دوخت» لە کوردی کەلهوڕی و کرمانجیدا «دۆت» (وەکوو دۆتمـام). لـە پەهلەویدا بووختان و بوهتان و لە کوردیدا «بۆتان» شاری بە نـاو بـانگی کوردسـتان. نووسـەری شەرەفنامە، شەرەفەدین بەدلیسی لە مێژووەکەیدا وەکوو دابێژی چوارسەد ساڵ لەمـەو پـێش بـە جێگای سۆران «سوهران»ی نووسیوە. لە «توحفەی موزەففەرییە»ی «ئوسکارمان» کە مامۆسـتا هەژار کردوویەتی بە کوردی لە بەشی «قەڵای دمدم»دا سۆران وەکوو سوهران نووسراوە و...

دیارە لەو سەردەمگەلەدا کوردان بە سۆران، سوهرانیان وتووە. ئەم ناوە لـە سـوخران سـەرداری کوردی ئەشکانی گیاوە و پاشان بووە بە سوهران وەکوو بوختـان کـە بـووە بـە بوهتـان و بۆتـان، سوخرانیش بووە بە سوهران و سۆران لە سەر مانای گۆرانیش قسە دەکەین.

**به سەر هارتی سوهرەوەردی:** لە پێشدا دەبێ بزانین سوهرەوەرد وەکوو شارەزوور زانای زۆری لێ کەوتۆتەوە. «سێ کەس وەکوو سوهرەوەردی ناسراون یەکەم «ئەبوو نەجیب زیاتوددین عەبدولقاهیری سوهرەوەردی کوڕی عەبدوڵلا، عاریف و خوداناسی گەورە لە سەر سپاردەکانی ئەحمەدی غەززالییە و کتێبی زۆری پێ نیسبەت دراوە. دووهەم ئەبوو حەفس شەهابوددین عومەری سوهرەوەردی کە برازای ئەبوونەجیبە و چەند کتێبی هەیە لەوانە عەواریف ـ رەشەفوننەسائیح ـ ئەعلاموتتەقی و ئەعلامولهودا. ئەم زانا بناغەدانەری تەریقەتی سوهرەوەردیە، یە. «ئەم رەوتە سۆفیانە لە ئێراندا گەشەی زۆری سەند بەڵام ئێستا باوەڕمەندانی لە هیند و پاکستانداندن. لوغەتنامەی دێهخودا.»

بەڵام سوهرەوەردی فەیلەسووفی کورد لە باسی ئێمەدا یەحیا کوڕی حەبەش کوڕی ئەمیرەك (عەرەبی کراوی میهرەك)ە. نازناوەکانی شەهابوودین، شێخی ئیشراق، شێخی کوژراو و شێخی شەهیدە. نازناویتری ئەبولفتوحە. بە گشتی بە شەهابوددینی سوهرەوەردی دەناسرێ.

لەم بەرهەمە کوردیەدا بە سوهرەوەردی و شەهابی سوهرەوەردی ناوی دەبرێ. لە تەمەنی ٣٦ یان ٣٨ساڵیدا بە تواغی نووریەرستی و دژایەتی لەگەڵ ئیسلامدا بە فەرمانی سەلاحەدین ئەییووبی لە ساڵی ٥٨٦ی کۆچی، لە حەلەبدا کوژرا.

چاكترین بە سەرهاتی سوهرەوەردی شەمسەدینی شارەزووری (شەمسەددین محەمەد کوڕی مەحموودی شارەزووری) نووسیویە. شەمسەددین شارەزووری لە ٦٨٦ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە. ئەو لە کتێبی «نوزهەتولئەرواح ورەوزەتولئەفراح، یان، تاریخولحوکەما»دا بەسەرهاتی ١٢٨ حەکیم و فەیلەسووفی هێناوە و بە سەرهاتێکی باشی سوهرەوەردی نووسیوە. مامۆستا هاشمی رەزی سەبارەت بە شەمسەددین شارەزووری دەنووسێ «ئەم نووسەرە خۆی لە حیکمەت و فەلسەفەدا خاوەن بیروڕا بووە و لایەنگری ڕوانگە و فەلسەفەی سوهرەوەردی و لەگەڵ ئەو خزمایەتی هەبووە. دوو کتێبی ئەویشی بە ناوەکانی تەلویحات و حیکمەتولئیشراقی شرۆڤە کردووە. شەمسەدین شارە زووری دوو کتێبیتریشی بە ناوەکانی الشجرة الاهیة في علوم الحقایق الربانیة، و الرموز و الامثال اللاهیة، هەیە. حکمت خسروانی، ل ٢٣» (ئەو شرۆڤەگەلە چون پێوەندی بە کوردەوە هەیە لەگەڵ حیکمەتولئیشراقی سوهرەوەردی دەبێ بە کوردی وەرگێردرێتەوە).

«تاریخولحوکەما، یان، نوزهەتولئەرواح»ی شارەزووری کە بە عەرەبی نووسرا بۆ یەکەم جار لە لایەن «مەقسود عەلی تەبریزی»وە بە فەرمانی پادشای هێند «جەهانگیر گوورەکانی»وە لە

١٠١١ی كۆچی واته چوار سەد و بیست ساڵ پێش بە فارسی وەرگێڕدراوە و لە ساڵی ٢٠٠٥ی زایینیدا بە تێکۆشانی «موحەمەد تەقی دانش پەژووە» و «محەمەد سەروەر مەولایی»ەوە لە تاران لە چاپ درا. من بە سەرهاتەکەی سوهرەوەردی لەم کتێبە وەردەگێڕمەوە. لە پێشدا بەمەش ئاماژە بکرێ کە شارەزووری و سوهرەوەردی هەر دوو کوردو بە باوەڕی من لەسەر بیروڕای ئاینە کوردیەکان بوونە. فەلسەفەکەی سوهرەوەردی کە هەندێ باسی دەکەین و خزمایەتی ئەو دوو زانا و باوەڕمەندی شارەزووری بە فەلسەفەی سوهرەوەردی ئەمە دەسەلمێنێ.

وەرگێڕاوەکەی مەقسوود عەلی تەبریزی کە زۆرتر لە ٤٢٠ ساڵ لە مەو پێش کراوە سەردەمی نزم بوونەوە و لار و لەوێری پەخشانی فارسیە و وشەی عەرەبی زۆر سەختی تیدایە.

**شارەزووری دەنووسێ:**

پیر (شیخ)ی بڵندپایە و فەیلەسووفی گرانسەنگ، زانای خودایی و ئیلاهییات زان یان خاوەن وزەی خودایی (متألە) رۆحانی، سەییدی دنیا، زانستوەری کامڵ، شەهابی مرۆڤ و دین، زانای ڕازەکانی بە باوەڕی ڕاست، هەنارده (برید)ی جیهانی پاکی و تیشك، «شەهابوددین ئەبولفتووح یەحیا کوڕی ئەمیرەك (ئەمیرەك عەرەبی کراوی «میهرەك»ی کوردی و «مهرەك»ی فارسیە). سوهرەوەردی، ڕوّح‌الله ڕمسە و قدس نفسە، تاکی زەمان و تەنیای ڕۆژگاران بوو. لە حیکمەتی زەوقی و بەحسی (ئەو فەلسەفەی کە هەم بە هرز و فیکر و هەم بە زەوق و دڵ و ئیشراق بە دەست دێت)دا دەسەڵاتی تەواوی هەبوو. حیکمەتی زەوقی ئەو گەواهی کەسایەتی تاکی (تفرد) ئەوە لەو پیشەدا. هەر کەس زانینی ڕێگای خوداناسی بگرێتە بەرو ئەسپە تەوسنی[٤] نەفسی لە مەیدانی هزرگەلی پێوەندیدار لەگەڵ یەك و تێکۆشانی بەرزدا ڕاهێنا بێت لە حاڵێکدا تەرك‌کەری دنیا و نەفسی خۆی بێت و لە کارگەلی جیهانی تاریکی لا بدات و بە تێکۆشانی بەرزەوە بینینی جیهانی ڕۆحانی بوێت، ئەگەر لەم حالەدا بگرسێتەوە و بە خێرایی بڕوات بۆ بینینی ئەو شتگەلەی کە تێکەڵاویان لە ماددەدا نیە و پەردەگەلی وەهم و خەیاڵ لادات تا لە ناسینی نەفسی خۆیدا سەر کەوێت و ڕوانینی ورد و ڕامانی هەبێ لە عەقڵی خۆی و خودای خۆی، پاشان ئەگەر تێگەیشتوو بێ لە قسەکانی ئەو (مەبەست بەتێنی قورئانە چون بە باوەڕی من هەم شارەزووری و هەم سوهرەوەردی باتنی بوونە لەسەری باس دەکەین) لەو کاتەدا دەزانێ کە لە موکاشیفاتی خودایی و بینینی بە گیان و روح (نەك بە چاو) نیشانەیەك هەیە لە نیشانەکانی خودا. زەریایەکە کە ئیدی

مەلەوانانی جیهانی ڕەنگاو ڕەنگ بە بنی ناگەن و نایناسن مەگەر ئەوانە لەو ڕێگادا خاوەن هەڵوێستی بە هێزن.

بەڵام حیکمەتی بەحسی، بەڕاستی ئەو بناغەکەی پڕ بە هێز دارشت و ئەرکانەکەی بە مەعناکانی دروست و نەرم و دڵ بزوێن و وشەگەلی کورت لێکداوە، بە چەشنێ کە زیادەیەك بە هزردا نایەت بۆ تەواوکردنی، وەکوو گەوەهری تاقانە سەلماندنی بەتایبەت لە کتێبی«مەشاریع» و «موتاریحات»دا، کە لەوەدا بەحسەکانی فەیلەسووفگەلی پێشین و پاشینی تەکمیل کردووە. بناغەگەل و قاعیدەگەلی مەشائیەکانی تێکداوە و ڕوانگە و باوەڕمەندی ئەوانەی کە دروستە تەواو و بەهێز کردووە. زۆربەی باس و ڕخنە و پارادوکس و پرسیارگەل، لە دەس کەوتەکانی هزری دروست و سروشتی ڕاستی پڕ لە شاراوەگەلی زانستی بە هێزی ئەوە. ئەمانە گەواهن لەسەر دەسەڵاتی ئەو لە فەلسەفەی بەحسی و زانستگەلی فەرمیدا.

بزانە کە تێگەیشتن لە قسەو ناسینی ڕەمزوڕازەکانی بۆ ئەو کەسانە کە ئەم ڕەمزوڕازگەلە نا ناسن لە ئەو پەڕی دژواریدایە (سوهرەوەردی وەکوو ئاینە کوردیەکان ناچار بووە باوەڕەکانی بەڕەمزوڕاز بگێڕێتەوە) چون ئەو لە سەر بناغەگەلی کەشفی (موکاشیفە) و زانستی زەوقیە، ئەوەی کە ئەم بناغەگەلەی هەروا کە هەیە نەزانێ ناتوانێ لە لق و پۆگەلی تێ بگات. هەرکەس پێشی هەوساری نەفسی لە خواستنەکانی دنیا و قیامەت نەکێشی زمانی گیانی شیرینی قسەکانی ئەو ناچێژێ. بە کورتی، تێگەیشتنی قسەکانی ئەو و کتێب و ڕەمزوڕازەکانی، زانستی پێویستە و زۆربەی زانستوەران و فەیلەسووفگەل لەمە ئاگەدارنین مەگەر بە دەگمەن لە هەرزەمانیکدایەکێ دەرکەوێ.

بۆ ناسینی حەق و نەفس بەڕاستی من زۆر دیاران گەڕام و جێگام پشکنی. کەسم نەدی لەوانە بە تەواوی بزانێت چ بگات بە ناسینی رادەگەل و ڕاستیگەلێك کە زۆر پاکتر و بەرزتر و لەتیفتر و سەفادارتر لە نەفسە. لەم بوارەدا لە تێگەیشتنی وتەکانی ئەو ناتەوان بوون. تانەوتوانجیان لێ دەدا و قسەکانیان بەگاڵتە دەزانی. هەندێ لە زانایانی هاو چەرخی کە ناسراو بوون بە خەڵکیان دەگوت کە فەلسەفەکەی ئەو بناغەیەکی نیە. نازانم ئەگەر فەلسەفەی ئەو بناغەی نیە هیکێ هەیەتی؟

ئەمانە دەبێ ببووردرێن لە نەزانینی باسەکانی ئەو چون سەخت و دژوارە. منیش لە سەرەتای لاویدا وەکوو ئەوان بیرم دەکردەوە تا کە ئەوینی دابڕان لە دنیای مادی بە سەرمدا زاڵ بوو. دەستم

به سەفەر کرد. یارمەتی و بەخشینی قودسی بە هانامەوە هات و ناسینی نەفسی بۆ مـن ئاسـان کردەوە. لەم حالەدا ڕێگای کردنەوەی ڕەمزوڕازو قسەکانی بۆم ئاشکرا بوو و بە خێرایی لە گشت ڕاز و شاراوەییەکانی تێگەیشتم. جا لە ڕوانگەی حەق و ئینسافەوە بۆ تـوانج لێـدەران ڕوانـیم، زانـیم ئەمانە بە جێگای کاکڵ بە پێست و بە جێگای دانە بە کا، ڕازی بوونە.ئـەوەی کـە لـە حیکمـەت فێر بوون ناسینی جەستە و مادە و هەندێ ڕواڵەتە، ئەمانە لە مەترسیدان. دیـارە کـە جەسـتە و مادەشیان ئەو چەشنە کە هەیە نەناسیوە و بەڕواڵەتێك لە مەعنا سازاون منیش لەو کاتـەوە کـە ئەو بەسترا (زیندانیکـراو کـوژرا) تـا ئێسـتا کـەسم نـەدیوە و نەناسـیوە کـە لـە قسـەکـان و مەبەستەکانی ئەو تێگەیشتبێ.

ئەم حەکیمە خوداییە زانستەکانی هەرە پیرۆزی خودایی و ڕازەکانی هەرەمـەزنـی ڕەببـانی کـە، زانستوەران لە ڕاگراتنیاندا ڕەمزگەلیان پێك هێنا بوو و پێغەمبەران ئاماژەگەلیان پێ کردبوو بـە تەواوی ناسی بوو. سەلمێنەری ئەمە کتێبـی حیکمەتولئیشراقە کـە هیچـکـەس نـەیتوانیوە پـێش بڕکێی لەگەڵدا بکات و لەمە و بە دواوەش لە ئەو پەڕی بە هێزی دایە، بۆ ئەمەیـە کـە نازنـاوی «موئەیید بیلمەلەکووت»ی پێدرا (ئەم نازناوە مەلیك زاهیر کوڕی سەلاحەدینی ئەییوبی پێیدا).
کەس لەم کتێبە تێ ناگا مەگەر ڕاست هزران و ڕاست کرداران.

بۆ هیچکەس لە فەیلەسووفان و زانستوەران و ئەولیا ئاسان نەبوو ئـەوەی کـە بـۆ پـیری مـەزن ئاسان کراوە، لە پتەو کردنی بناغەی هەر دوو حیکمەت (زوقی و بەحسی)، بەڵکوو بـۆ هـەنـدێ تەنیا کەشف واتە حیکمەتی زەوقی بە دەس هاتووە و زۆربەیان حیکمـەتـی بـەحسـییان وە لانـاوە وەکوو بایزیدی بەستامی و مەنسووری هەلاج و وێنەی تری ئەمانە. بەڵام باوەڕمەندی حیکمـەتـی بەحسی ڕاستەقینەش بێ ئەوەی کە ڕەشەبای گومان بکەوێتە باخیەوە ئەو حەکیمانەی کـە تـەنیـا بەمە، بەسندەیان کردووە بۆیان ئاسان نەکراوەتەوە ( گشتیان جێگای گومانن بەوەی کە بە ئـەوەی ڕاستیە گەیشتبێتن). ئەگەر دەتەوێ حیکمـەت (فـەلسـەفـە) فێـر بـبی و هـەتـوانی فێربـوونی پەیداکەی، بۆشایی دڵت کە ئاوێنەی تیشکەکانی پیرۆزی خوداییە، لە ژەنگی وێنەگەلـی بێگانـە پاك کەرەوە، خاوێن و باسەفا بە گشت بوونتەوە لە دونیای مادی بێ دەرەوە، وەکوو مـارێ کـە لـە کاژدێتە دەرەوە، هیوا هەیە کە خودای سوبحان پلەت بەرزکاتەوە و بتگەیەنی بە ناسینی نـەفس و حیکمەت. بە شێخ شەهابیان دەگوت «خالیقولبەرایا» بۆ ئەوەیکە شتگەلی سەرسوڕهێنەری لـێ دەر دەکەوت. دەڵێن پیاوێك لە خەوندا شێخ پێ گوت ئەم نازناوە بەمن مەدەن.

· له منداڵیەوە بۆ خوێندن کەوتە گەڕان تاله «مهراغه»دا له خزمەت «موجەددینی جیلی»دا دەستی بە خوێندن کرد. پاشان چوو بۆ ئەسفەهان. وام زانیوە کە ئەو کتێبی «بەسایر»ی سەهلان ساوی بۆ زەهیری فارسی خوێندەوە، خودا دەزانێ. لە کتێبەکا نیدا دیارە کە سەبارەت بە، بەسایر بیری زۆر کردۆتەوە. بەم لاولازۆر دەگەڕا. لەگەڵ عاریف و سۆفێگەل هەڵس و کەوت و وت و وێژی بوو و بۆ ناسینی فیکرو نەفس کەڵکی زەردەگرت تا ئەمە کە بە سەربەخۆیی گەیشت. پاشان بە ریازەت و خەڵوەگرتنی نەفس و فیکری خۆی خەریك بوو تا بەو پەڕی تێگەیشتن و پێگەی فەیلەسووفان گەیشت. ئەمە بوو بە سەرهاتی شێخ لە حیکمەتی زەوقی و بەحسیدا (شارەزووری سەبارەت بە حیکمەتی بەحسی ئەو جۆرە کە لە حیکمەتولئیشراقدا هاتووە شتی زۆری نەگوتوە) بەڵام لە حیکمەتی کردەوەدا لە سەرەتای فەلسەفەوە تا ئێستا یەکەم کەسە. وەکوو قەڵەندەران دەژیا و ریازەتگەلی هەرەسەختی دەگرت بەچەشنێ کە هیچ لە خەڵکی زەمانە توانی ئەوتۆیان نەبوو. لە هەفتەدا یەك جار رۆژووی دەشکاند و خۆراکی زۆرتر لە پەنجا درەم نەبوو. ئەگەر لە ناو حەکیماندا بگەڕێیت لەو زاهیدتر و زاناتر هیچ دەس ناخەی. سەرنجی بە دنیا و بەدەس هێنانی ئارەزوو نەبوو. دەربەسی خواردن و خواردنەوە نەبوو و بە هەموو شت قەناعەتی بوو. بۆ قسەگەلی شەریف و سەرۆکایەتی و مەقام بەرزی، گوێی شل نەدەکرد. هەندێ جاران کڵاوێکی سووری درێژی لە سەر دەنا.(ئەم کڵاوە نیشانەی میهرپەرستیە. وەکوو گومەزەکانی لالەش و جیگا پیرۆزەکانی کاکەییە. ئەم کڵاوە پاش شکستی میهرپەرستی و پەرەسەندنی ئایینی مەسیحی لە ئەورووپادا وەکوو کڵاوی «بابە نۆئیل» لە شەوی زاینی میترادا کە کراوە بە زایینی مەسیح و ئاماژەیەکە بە هاتنەوەی میترا لە ئاسمانی چوارەمدا هەرماوەتەوە بەڵام نەختێ لە سەرووی کڵاوەکە چەمیوەتەوە. لە عیبادەتگاکانی میهری ئەورووپا و کوردستانی باکووردا هەر لە سەر پەیکەری میترادا هەیە، بەتایبەت پەیکەری سەری گەورەی میترا لە نەمروود داغ لە کوردستانی باکووردایە هەیە.) هەندێ جار سیپاڵی سۆفیانی لە بەردەکرد و وەکوو ئەوان خەرقەی دەپۆشی. عیبادەتگەلی برسیەتی و بێداری و هزر و رامان لە جیهانی خودایی بوو(واتە سەرنجی لە عیبادەتگەلی رواڵەتی وەکوو نوێژو رووژوو حەج و شتیوانە بوو) زۆرکەم سەرنجی لە خەڵك و دابی ئامووشۆ بوو. زۆرتر لەگەڵ خۆی خەریك بوو. سەما (سماع) و نەغمەگەلی موسیقای زۆر خۆش دەویست (دەزانین سەما و مۆسیقا لە بناغەکانی دینە کوردیەکانە) خاوەن کەرامات و ئایات بوو. هەندێ لە مەلاکان کە بەهرە و حەزێکیان لە زانستی راستەقینە نەبوو دەیان گوت عیلمی «سیمیا» دەزانێ (گۆشت

جەواتەی پیر شالیار بۆ ـ هۆشت جەکیاستەی زانای سیمیار بۆ. دیوانی پیرشالیار ...) و لایان وابووکە قسەکانی شیخ خودان خورافە و وڕینەیە و ناشارەزایە لەگەڵ زاناکانی جیهانی دابڕان لە دونیادا (التجرید). جیهانی دابڕان لە دونیا مەقامێکە وەکوو مەقامی مەنسووری هەلاج و بایزیدی بەستامی کە لەو پێگەدا دەتوانن هەروێنەیەك کە دەیانەوێ بەدی بێنن. منیش ماوەیەك بۆ ئەو پێگەڕامان و هزرم هەبوو هەتا خودا بە ناسینی ئەو پیگەیە یارمەتی دام ئەمە لە رازەکانی خوداییە و دەرخستنی ئەوانە رەوانیە، ئەگینا لەم بارە شەوە هەندێ لە حاڵەتەکانی ئەوم دەردەخست. شیخ خودا پاکی بە گیانی ببەخشێ گەشت و سەفەری لە شارەکاند زۆر بوو. دەیەویست هاو بڕوایەك پەیداکات بەڵام نەیتوانی وەها کە لە پەرتووکی موتاریحاتدا دەڵێ" بەڕاستی تەمەنم بە سی‌ساڵ گەیشت و زۆربەی لە سەفەردا بووم بو دۆزینەوەی کەسێك کە تێگەشتوو بێت لە زانستەکاندا یان کەسێك کە توێژینی لە مانەدا بێت بەڵام نەم دۆزیەوە. ئەم شێخە مەزنە لەو پەڕی دابڕان لە دونیادا بوو و ڕوانگە و تێکۆشانی بۆ دونیا نەبوو. هەندێ جار لە دیاربەکر و جارێك لە ڕۆم و جارێکی‌تر لە شامدا بوو.

هۆی کوژرانی ئەو جۆرە کە بە من گەیشتووە ئەمەیە: چوون لە ڕۆم (ڕۆم مەبەستی شاری دیاربەکر و ماردینە) هاتە حەڵەب بە هەڵکەوت لەگەڵ مەلیك زاهیر کوڕی سەلاحەدینی ئەیبوبیدا کە فەرمانرەوای میسر و یەمەن و شام بوو بە یەك گەیشتن. مەلیك شێخی زۆر خۆش دەویست و باوەڕی پێ بوو. مەلاکانی حەڵەب لە دەوری شێخ کۆ دەبوونەوە و قسەکانیان دەبیست. ئەو لە قسەکانیدا تیشکی دەخستە سەر باوەڕەکانی فەیلەسوفەکان و قسەگەلی دژ بەوانی ڕەد دەکردەوە. لەو کاتەدا بە هێزی ڕۆحولقودس (وتمان لە دینە کوردیەکاندا رەنگدانەوەی مەلەکە تاوسە لە مانگدا. تیشکی مانگ هەر تیشکی خۆرە)، شتگەلی سەرسووڕ هێنەری لە قسەکانیدا ئاشکرا دەکرد. مەلاکان تەکفیریان کرد و بۆ کوشتنی ئەو هەڵوێستیان گرت. دەیان گوت خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ لە حاڵێکدا وانە بوو.

خودا حەسوود، زیانکار و بەدبەخت کات. مەلیك زاهیریان بۆ کوشتنی ئەو هەڵخڕاند بەڵام مەلیك سوهرەوەردی خوش دەویست و بە قسەیانی نەکرد. بۆ سەلاحەددین نامەیان نووسی کە ئەگەر ئەم کابرا بمێنی دین و دونیا دەشێوێنێ و گەندەڵی دەکات. سەلاحەددین بۆ کوڕەکەی نامەی نووسی دەبێ بیکوژێ. ئەو بە قسەی باوکی نەکرد و نەیکوشت. دووبارە مەلاکان نامەیان نووسی (هەندێ بە سەرهات نووس دەڵێن چەند مەلای حەڵەب چوون بۆ لای سەلاحەدین و حوکمی

کوشتنی ئەویان هێنا) سەلاحەدین نووسیەوە ئەگەر نەیکوژی فەرمانڕەوایی حەلەبت لێ دەستێنمەوە. بۆ چونیەتی کوشتنی ئەو چەند باسم بیستووە. هەندێ دەڵێن خستیانە بەندیخانەوە و خواردن و خواردنەوەیان لێ بڕی تا مرد. هەندێ دەڵێن ئەو خۆی لە بەندیخانەدا هیچی نەخوارد تا بە سەر چاوەکەی خۆی گەیشت. هەندێ دەڵێن لە بەندیخانە خنکاندیان. هەندێ دەڵێن بە شیر کوشتیان و هەندێکیتر دەڵێن لە دیواری قەڵاوە فڕێیاندایە خوارێ و سوتاندیان. پاش کوشتنی، حەزرەتی ڕەسولیان لە خەوندا دی کە ئیسکەکانی کۆ دەکاتەوەو دەڵێ ئەمە ئێسکەکانی شەهابوددینە.

لە نێوان ئەوو «فەخرەدینی ماردین»دا دۆستی و هاوبیروڕایی بوو (ماردین بە دابێژیتر مێردین واتە میهردین کە نزیکی شنگارە لە پێشدا ناوەندی گەورەی ئێزدی بووە). فەخرەدین ماردینی بە هەواڵەکانی دەگوت ئەم لاوە چ خاوێن و سزاواری ستایشتە. من وەکوو ئەوم نەدیوە لە ئازایی و سەر نەترسی و قسە ڕاسی و ناوداری ئەو دەترسم ڕەنگە بیکوژن. لە ماردین هاتەوە حەلەب لە وتووێژ لەگەڵ فەقیهەکاندا سەردەکەوت و ئەوان نەیاندەتوانی بەرانبەرکێی بکەن. ئەوانیش قینیان زۆرتر و زۆرتر دەبوو. مەلیک زاهیر دانیشتنی پێك هێنا و گەورەگەل و زاناگەلی لە دەوری کۆ کردەوە. شێخ قسەی زۆری کرد. زاناگەل جوابیان نەبوو و بێدەنگ مان. زانایی ئەو بۆ مەلیك زاهیر ئاشکار بوو و قەدر و حورمەتی زیدەتر و بە مەلیك زاهیر نزیکتر بۆوە. لای مەلیك زاهیر بوو بە خاوەنی پلەو پایە و سەرنجی مەلیك لە ناو زانایاندا تەنیا بە ئەو بوو. ئەمەش بوو بە هۆی پەرەسەندنی خرابوێژی زۆرتری فەقیهەکان. دانیشتنگەلیان بۆ بە کافر زانینی پێك هێنا. کەسیان بۆ دیمەشق لای سەلاحەدین هەناردووتیان ئەگەر ئەم پیاوە بمێنێ باوەڕی مەلەك زاهیر دەشێوێنێ. ئەگەر ئازادی کات بۆ هەر جێگایەك بڕوا بیرو بڕوای خەلکی ئەوێ خراپ دەکات. سەلاحەدین کەسی بو لای زاهیر هەناردو وتی دەس خەتی زانایانی ئایینی حەلەب بە من گەیشتووە. ئەو لاوە دەبێ بکوژرێ. بیکوژە و ئازادی مەکە بە هەر چەشنێ کە دەیزانی. شێخ کە لە حوکمەکەی سەلاحەدین ئاگەدار بوو وتی لە ماڵدا زیندانیم کەن و خواردن و خواردنەوەم پێ مەدەن تا بە خودا سەرچاوەی گشت دەگەم. هەروا کرا. پاشان مەلێك زاهیر لەوانەی وا بوون بەهۆی کوشتنی سوهرەوەردی تۆڵەی سەندەوە. ئەوانەی زیندانی کرد و موڵك و ماڵی لێ ئەستاندن. تەمەنی ئەو لە کاتی کوژراندا لە لایەن زۆربەی وێژەرانەوە ٣٨ ساڵ بووە. هەندێك ٥٠ ساڵیان وتووە (زۆربەی بە سەرەات نووسان ٣٦ و ٣٨ ساڵیان نووسیوە و پەنجا ساڵ دروست نیە)

باڵای نە بەرزو نە کورت بوو. ڕیشی تەنك و سوور بوو. گەشت و سەفەرەکانی بە پیاسە بوو.

ئەگەر لە کەراماتی قسە بکەم قسە زۆرەو نەزانان بە درۆی دەخەنەوە. لە ساڵی ٥٨٦ی کۆچی‌دا کوژرا. لە سەر ئاینـزای شافیعی بوو (ئـەمـە ڕواڵـەتـی کـەسـایەتـی ئـەوە و لـەسـەر ئـاین و فەلسەفەکەی باس دەکەین. شارەزووریش کە دەڵێ شافیعی بوو وەکوو خانی نەمر خۆی لە تەکفیر و شیری فەقیهەکان دەدزێتەوە تا نەڵێن لە کافر داکۆکی دەکات) لە قاعیدەکانی فیقهـ و حەدیس و بناغەکان فام و وریایی زۆری بوو. بەم جۆرە بە من گەیشتووە کە سەبارەت بە فەخـری ڕازی لـە ئەو دەپرسن. دەڵێ هزری ئەو نەکوژاوەتەوە. سەبارەت بە ئەو لە فەخری ڕازی دەپرسن دەڵـێ هـزری ئەو لە ئەو پەڕی وریایی و دەروونی وەك ئاگر هەڵگرساوەیە. وتیان تۆ زانـاتری یـان ئـەبووعـەلی سینا (ئەبووعەلی سینا جگە لە پزیشکی لە فەلسەفەی مەششـایی و شـرۆڤەی ئـەوەدا دەسـتی هەرە باڵای هەبووە) دەڵێ لە حیکمەتی بەحسی‌دا یەکین بەڵام لە گەشت و زەوقدا مـن لەو زانـاترم. کتێبـی زۆری هەیە (شارەزووری ٤٥ بەرهەمی سوهرەوەردی ناو دەبـات کـە زۆربـەی بـە عـەرەبی زمانی نووسینی ئەو زەمانە نووسیوە و هەندێ پەرتووکیشی بە فارسیە. لە فارسیەکانی ئەمن لەم بەرهەمەدا «ئاوەزی سوور»م وەرگێڕاوە و شرۆڤە کردووە. بەڵام گرینگترین بەرهەمی کـە دەبـێ بـە کوردی وەرگێڕدرێتەوە حیکمەتولئیشراقە. فەلسەفەی ئیشراق لەسەر بناغەی دینە کوردیەکانـە و بێ‌بەرهەمەکانی سوهرەوەردی کورد، لە فەلسەفەدا هیچمان نیە. بۆ کورت کردنەوەی باسە کە لە ناوبردنی کتێبەکانی خۆ دەپارێزین).

شێخ شیعریشی بە عەرەبی و فارسی داناوە. لە قسەکانی سـوهرەوەردی ئـەمـانـەن (شـارەزووری یانزە لاپەرەی لە قسەکانی سوهرەوەردی هێناوە. چون لەم بەرهەمەدا لە باوەڕەکـانی سـوهرەوەردی قسە دەکرێ بە پێویستی نازانم باسەکە درێژ کەینەوە).

هەندێ لە مێژوونووسان و بە سەرهات نووسانی‌تر بە شەهابی سوهرەوەردی ئامـاژەیـان کـردووە ئەمن هەندێ کۆ کراوەم بوو بەڵام کاتێ «لوغەت‌نامە»ی فارسی خـوا لێخۆشـبوو دێهخـودام دی گشتم وەلانا. ئەم پیاوە زانا و تێکۆشەرە زەمانێ بە سەرهاتی سوهرەوەردی کۆ دەکردەوە کـە گشـت سەرچاوەکان دەس‌نووسی کۆن بوونە و لە چاپ نەدرابوون و لە کتێبخانەکانی ئێران و ئەورووپا بە دەستی خستبوو. دێهخودا لە بەرهەمەکەی شارەزووری کەمتر کەڵکی وەرگرتووە.

لێرەدا بەو کۆکراوانەی مامۆستا ئاماژە دەکەین: (ڕستەکانی ناو کەوانە هێ منە)

ئەبولفەتح شەهابوددین یەحیا کوڕی حەبەش کوڕی ئەمیرەك سوهرەوەردی، کوژراو یـان شـەهید ناسراو بە شێخی ئیشراق. ئەبولعەبباس ئەحمەد کوڕی ئەبی ئەسـیبەعـە خـەزرەجی لـە کتێبـی «تەبە قاتولئەتیببا» دا دەڵێ ناوی عومەر بوو بەڵام «ئیبنی خوللەکان» دەڵێ ئـەوە ڕاسـت نیـە، ناوی یەحیا کوڕی حەبەشە...

نووسەری تەبەقاتولئەتیببا دەڵێ: ئەو تاکی زەمانی خۆی لە زانسـتی حیکمـەت، زاڵ بـە سـەر زانستگەلی فەلسەفە و ڕووناك لە بناغەکانی فیقهدا بوو... زانستی ئەو لـە عـەقڵی زۆرتـر بـوو (مەبەستی ئەوەیە بوێر و ڕاستوێژ بوو و وەکوو ئەوانیتر هەلپەرست نەبوو) لـە سـاڵی ٥٨٦ لـە تەمەنی ٣٦ ساڵیدا کوژرا. هەندێ دەڵێن شارەزا لە عیلمی کیمیادا بوو (دیارە ئەو نووسـەرە بـە جێگای سیمیاکە نەیزانیوە چیە کیمیای نووسیوە لەسەر وشەی سیمیا باس دەکـرێ). یـەکـێ لـە فەقیهەکانی عەجەم (ئێرانی و کورد) دەگێڕێتەوە لەگەڵ سوهرەوەردی لە دیمەشـق هاتینـە دەرەوە چون گەیشتینە گوندی «قابوون» ڕانەمەڕێکمان دی کە تورکمانێك شوانی بـوو. وتمـان مـەڕێك بکڕین تا لە ڕێگادا بیخۆین. شێخ وتی من دە درهەمم هەیە بیبەن و بیکڕن. کڕیمان چون هەنـدێ دوورکەوتینەوە دۆستی تورکمانەکە هات و وتی نایدەم هەزران کڕیوتانە. ئەوە بدەنەوە تا مـەڕێکی چکۆلەترتان پێ بدەم. بە شێخمان گوت. وتی ئێوە پەزەکە ببەن تا مـن ئـەو ڕازیکـەم. شـێخ بـە نەرمی لەگەڵ تورکمانەکە قسەی دەکرد و ڕازی نەدەبوو. بە شوێنماندا هات و باڵی چەپی شـێخی گرت و کێشای. دیمان تەوای دەستی شێخ لە شانی جوێ بۆوە و خـوێن بـەرەوە بـوو. دەسـتی شـێخ وەکوو دارێك لە دەستی تورکمانەکەدا ما. دەستەکەی داخست و هەڵات. شێخ دەستەکەی هەڵگرت نایەوە جێگای خۆی و لەگەڵمان ڕێ کەوت.

ئیبنی خوللەکان دەڵێ لەم چەشنە ڕووداوگەلە زۆر لە شێخ دەگێڕنەوە. کتێبگەلی زۆر نووسـیوە لەوانە (کوڕی خوللەکان ناوی چەندین کتێب دەبات کە بۆ درێژ نەبوونی باسەکە ناویان نـاهێنین. هەروەها هەندێ لە قسە عەرەبیەکانی سوهرەوەردی و قەسیدەیەکی نوزدە بەیتی و دوو شیعری دوو بەیتی و چوار بەیتی عەرەبی ئەوی هێناوە کە نەمتوانی بە کوردی وەری گێڕمەوە و دێهخوداش بە فارسی وەری نەگێڕاوەتەوە). ئیبنی خوللەکان لە درێـژەی قسـەکـانیدا دەڵـێ... لـەسـەر ئـاینزای شافیعی بوو و نازناوی «ئەلموئەییدبیلمولك» یان پێدا بوو (زاهیر کوڕی سەلاحەدین پێی دابـوو). توانجی بێباوەڕی (بە ئیسلام) یان لێ دەدا. لـە شـوێن زانسـتوەرانی کـۆن دەچـوو و وا ناوبـانگی دەرکرد بوو. (دیارە ئیبنی خوللەکان بناغەی فیکری ئەوی کە ئاینە کوردیەکانە نەدەزانـی) چـون

خراپەی باوەڕی دەرکەوت مەلاگەلێ وەکوو شێخ زینوددین و مەجدوددین کوڕانی حەمید لە کوشتنیدا پێداگری زۆریان کرد. شێخ سەیفوددین ئامێدی (ئامێدی ناوی کۆنی دیار بەکرە. لە وشەی مادەوە گیراوە لە قوڕ نووسراوەکانی ئاشووریدا ماد وەکوو «ئامادای» هاتووە. سوهرەوەردی لەگەڵ ئامیدی کە ئەویش کورد بووە دوستایەتی زۆری هەبووە).

دەڵێ: من سوهرەوەردیم لە حەلەب دی. وتی من سەرتاسەری زەوی داگیر دەکەم. وتم لە کوێوە دەزانی؟ وتی لە خەوندا دیم ئاوی زەریام هەڵ لووشی. وتم رەنگە مەبەست ناوبانگی تۆ بێ لە جیهاندا. ئەو لە باوەڕی هەڵ نەگەڕایەوە (لە ئەنجامدا باوەڕی دروست دونیا دەگرێتەوە).

ئیبنی خوللەکان لە درێژەدا دەنووسێ ئەو زانستی زۆر بەڵام عەقڵی کەم بوو (!) دەڵێن لە رۆژانی کوژرانیدا ئەم بەیتەی دەخوێند: ئەراقەدەمی، ئەراقە، دەمی. وەهانە، دەمی، فەها نەدەمی «اری قدمی، اراق دمی، وهان دمی فها ندمی» لە ساڵی ٥٨٧ لە قەڵای حەلەب لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا خنکێندرا. من زۆر ساڵ لە حەلەبدا ژیام. خەڵکی ئەوی رایان لە سەر سوهرەوەردی جیاواز بوو. هەندێ بە زەندیق و بێدینیان دەزانی. هەندێ دیانگوت خاوەنی کەرامات و لە چاکان بوو.

قازی بەهائوددین ناسراو بە ئیبنی شەداد، لە سەرەتاکانی کتێبی سیرەی سەلاحەددین لە پەسنی ئەودا زۆر دەنووسێ و دەڵێ: بە کوڕەکەی فەرمانیدا تا لاوی ناسراو بە سوهرەوەردی بکوژێ. پاش کوژران جەستەی چەند رۆژ لە حەلەبدا بە دارەوە ئاوێزان بوو.

«یاقووت حەمەوی» لە کتێبی «موعجەمولئودەبا»دا شیعرێکی عەرەبی هەفت بەیتی سوهرەوەردی هێناوە (بو درێژ نەبوونەوەی باس و وەرگێڕانی دژوار نایەێنن)

**دیسان ئیبنی خوللەکان سەبارەت بە سوهرەوەردی دەنووسێ:**

... سوهرەوەردی دۆسایەتی فەخرەدینی ماردینی هەڵبژارد و ماوەیەك لای ئەو مایەوە. ماردینی خۆش دەویست و ستایشتی دەکرد... لە ساڵی ٥٧٩دا هاتە حەلەب و لە وانەخانەی «حەلاویە» نیشتەجێ بوو و لە، وانەی، شەریف ئیفتیخاروددیندا حازر دەبوو. لەگەڵ سوختەکانی[٧] ئەو و فەقیهەکانیتردا وتووێژی دەکرد و گشتی دەبەزاند. مەلیك زاهیر پێگەی زانستی ئەوی ناسی و قەدری زۆری لێ گرت .... تا بۆ مەلیك ناسر (سەلاحەدین) نامەگەل نووسراو ... فەقیهەکان فتواگەلیان بۆ کوشتنی نووسی.... تا لە زیندانداندا خنکێندرا. تەمەنی نزیك بە چل ساڵ لە ٥٨٧دا کوژرا. مەلیك زاهیریش تۆڵەی ئەستاندەوە.

(دیهخودا پاشان هەندێ لە بە سەرهاتی سوهرەوەردی لە شارەزووری هێناوە کە من بە تەواوی پێشکەشم کرد. یەك چوارینەی فارسیش لە سوهرەوەردی هێناوە دەڵێ): ئەم چوارینەی سوهرەوەردی لە تەزکەرەکاندا بە ناو بانگە:

هان تا سەرڕشتەی خرد گم نکنی ــ خودا را ز برای نیك و بد گم نکنی

رهرو توئی و راه توئی منزل تو ــ هش دار کە راه، خود بە خود گم نکنی

واتە هانا، تا سەری ڕێسراوەی ئاوەز ون نەکەی (و) خۆت بۆ چاکە و خراپە ون نەکەی (چون) ڕێرەو و ڕێگا و ئاکامی ڕێگا هەر خۆتی هۆشیار بە کە ڕێگا لە خۆڕا ون نەکەی. (دیهخودا لە ئاخری باسەکەی سوهرەوەردیدا نووسیوە):

ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی فەرانسی «هانری کەربن» پەرتووکی «مەجموعەت فی الحیکمەتول ئیلاهییە»ی سوهرەوەردی لەگەڵ سەرەتایەکی زانستوەرانەدا بە فەرانسە وەرگێڕاوەتەوە و لە ئەستەمبووڵدا لە چاپی داوە. توێژینگەلێکیشی لە وەرگێڕانی بە سەرهات و بەرهەمەکانی ئەودا لە دوو وتاردا نووسیوە. یەکەم «پێوەندی ئیشراق و فەلسەفەی ئێرانی کۆن» دووهەم «سوهرەوەردی حەلەب» لە یەکەمی‌دا سەبارەت بە سەر چاوەکانی سوهرەوەردی و حیکمەتی ئیشراق دوواوە و پێوەندی لەگەڵ فەلسەفەی ئێرانی کۆن هێناوە. (هانری کەر بن چون دینە کوردیەکانی نەناسیوە لە سەرچاوەکانی سوهرەوەردیدا هەڵەی گەورەی کردووە. ئەم هەڵە گەورە لە کتێبی حیکمەتی خوسرەوانی هاشمی رەزی‌دا کاردانەوەی بەرچاوە، بەداخەوە نووسەری کوردیش بێ‌توێژینەوەی پێویست دوای ئەو قسانە دەکەون و مێدیا کوردیەکانیش دوای ئەوان. دەیانەوێ هەمووشتێ بە زەردەشتیەوە بچەسپێنن. ئەمن بۆ لێکدانەوەی ئاینی پیرۆزی زەردەشتی زمانی ئەوێستایی و پەهلەوی بە سەخلەت فێر بوومە و گشت ئاسەوارگەلی زەردەشتیم بە زمانی یەکەمین و شرۆڤەکانی ئەوێستایی زانانی ئەورووپی و ئەمریکی و ئێرانیم لێکداوەتەوە و تێگەیشتووم کە ئەو ئاینە جیاوازی هەرە گرینگ و زۆری لەگەڵ دینە کوردیەکان و فەلسەفەی سوهرەوەردی و پەیامەکەی مەم و زین و نەریتە کوردیەکان هەیە. پێوەندی ئەمانە لەگەڵ میهرپەرستی‌دا زۆر ئاشکارە. تەنیا پێوەندی زەردەشتی لەگەڵ کورددا ئەوەیە کە ئەوێستا بە زمانی «ماد» پاش ڕاوەدوو نانی زەردەشت بۆ ئەو پەری ڕۆژهەڵاتی ماد نووسراوە و کورد هۆزی هەرە مەزن و گرینگی مادە. لە کارنامەی ئەردەشێری بابەکاندا کورد وەکوو ماد ناسراوە کە پێ ئاماژە دەکرێ. زمانێك کە ئەوێستای پێ نووسراوە دایکی زمانی کوردیە. پەهلەوی ئەشکانی و کوردی

وەکوو دوو خوشك لە گۆڕانکاری زمانی ئەوێستایی بەدیهاتوون. پەهلەوی باشووری ڕۆژاوا کـە لـە زەمانی ساسانیەکاندا باو بوو هەر لە پەهلەوی ئەشکانی پێکهاتووە کە لە بواری زەمـاندا هەنـدێ گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە و هـەنـدێ وشـەی ناوچـەی «فـارس» واتـە باشـووری ڕۆژاوای ئێـران تێکەڵاوی بووە. بەداخەوە نازانستیانە و بە هۆکارگەلی سیاسیەوە لە هـەشـتا سـاڵی ڕابـووردوودا پەهلەوی باشووری ڕۆژاوا واتە وڵاتی «فارس» یان بە «فارسی میانە» لە قەڵەم داوە و ویستوویانە زمانی فارسی ئێستا لە گۆڕانکاری ئەو زمانە بدەنە قەڵەم لە حاڵێکدا فارسی لە ئێرانی ئێستادا زمانێکی میوانە و چەند سەدە پاش بڵاو بوونەوەی ئیسلام نەختە نەختە لە ئێراندا لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژاوا پەرەی سەند. بە چەشنێ کە تا سەدەی هەشتی کۆچی زەمانی حەمدوڵڵای مسـتەوفی لـە تاران و کەرەج و قەزوێـن و ئـەسـفەهاندا فارسـی بـاو نـەبوو و تـەنیـا نووسـەران و شـاعیران و خوێندەواران دەیانزانی. لە سەرەتای ئیسلامدا هەر لە بەلخ لە ڕۆژهەڵات تـا کوردسـتان لـە ڕۆژاوا خەلکی ئێران بە زاراوەگەلی پەهلەوی قسەیان دەکرد. سەعدی شاعیری گـەورەی ئێرانـی سـەدەی هەفتی کۆچی بە زاراوەی ئەو زەمـانەی «فارس» کە فارسی نەبووە شیعری هەیە.

کوردگەلیش کوردی قسەیان دەکرد بەڵام نووسینەکانیان بـە پەهلـەوی بـوو کـە زۆر نزیـك لـە کوردیە. میهرپەرستەکان نووسینی ئۆلیان بە یۆنانی بوو کە لە سـەدەی چـواری پـێش زایـین لـە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پەرەیسەند. پاش هێرشی عەرەب نووسین بوو بە عەرەبی و عەرەبی لەگـەڵ پەهلەوی تێکەڵاو بووە. هەستانگای زمانی فارسی ئێستا باکووری ئـەفغانسـتان و تاجیکسـتان و وڵاتگەلی تورکمەنستان و ئوزبەکستان و بەشێ لە قرقیزستانە کـە ئـەو زەمانـە هێشـتا تـورکی لەوانەدا پەرەی نەسندبوو و بە زاراوەگەلی فارسی قسەیان دەکرد).

گۆڕی سوهرەوەردی لە حەلـەبدایـە. کـازم موحـەمـەدی وایقـانی نووسـیویە «گۆڕەکـەی لـە پاسگایەکی سەربازیدایە کە جگە لە هەندێ زانستوەر کەس نایزانێ لە حاڵێکدا ئەم فەیلەسووفە کاریگەری زۆری کردە سەر ئێران و لە گرینگترین هۆ کارەکانی دوایـی فیکـری ئێـران و جیهـانی تەشەییوع بوو (سوهرەوەردی داناى حیکمەت باستان ل ٥٠) ئەم نووسەرە هاوچەرخە سەبارەت بـە کوژرانی سوهرەوەردی نووسیویە: هۆکار و شێوەی کوشتنی ئەو بە تەواوی نەناسراوە و نازانین چـۆن و بۆچی کوژرا. ئایا بە هۆی بەرهەمەکانیەوە یان باوەڕەکان یان باوەڕمەندیگەلی ئـەو بـوو؟... بـە کام ئاینـزا باوەڕمەند بوو؟... ئەوە کە لە جیهـانی ئیسـلامدا فـەقیهـەکـان چ سـوننی چ شـیعە دەسەڵاتیان هەبووە و فتوای زۆریان دژ بە عاریف و سۆفی داوە بەڵام فتوایەکی وەهـا بـۆ کوشـتنی

فەیلەسووفێك لەوانەوە، دەرنەکراوە. دەبێ بزانرێ ئایا فیکرە فەلسەفیەکانی هۆکار بوو؟ ئایا فیکرە عیرفانی و سۆفیانەکانی بوون بە هۆکاری ئەم فتوا؟ یان نا چەشنی باوەڕمەندی ئایینی و ئاینزایی ئەو بۆ کوژران بردی؟... (سەرچاوەی ناوبراو ل ٤٨ و ٤٩) ئەم نووسەرە بەڕێزە کە کتێبەکەی لە ١٣٨٥ واتە ٢٠٠٦ ز دا چاپ کردووە وەکوو گشت نووسەرانیتر کە سەبارەت بە سوهرەوەردی نووسیویانە چون لەسەر ئاینەکوردیەکان و بناغەی ئەوانە توێژینی قووڵیان نیە بە لایانەوە سێ شت ون و نادیارە؟ یەکەم سەرچاوەگەلی سوهرەوەردی بۆ نووسینی فەلسەفەکەی. سوهرەوەردی لە حیکمەتولئیشراقدا بە حیکمەتی خوسرەوانی ئێرانی کۆن و حەکیمگەلی فارس ئاماژەی کردووە بەڵام ئەو ئاماژەگەلە پێوەندی لەگەڵ زەردەشتی پێش ئیسلامدا نیە بەڵکوو لەگەڵ عیرفانی ئێرانی پێش ئیسلامدا بوویەتی کە هەر عیرفانی میهرپەرستی ناوەوەی ئێرانە کە وتمان وەکوو رەوتێکی رۆشنبیری نە ئاینی لە ئێرانی جگە لە کوردستاندا هەبووە. ئەگەر بمانەوێ لە رووی لێکچوونەوە دینەکان دابەش کەین زەردەشتی و جوو و ئیسلام ئیلاهییاتیان نزیك بە یەکە و ئاینی مەسیحی و دینە کوردیەکان و عیرفانی وەحدەتی و جوودی نزیك بە یەکن و هەر سێ سەرچاوەیان میهرپەرستیە.

## ڕوونکراوەکان

١ـ خەواریج. لە سەربازانی حەزرەتی عەلی (د ـ خ) بوون کە پاش ئاشتی ئەو لەگەڵ موعاویە جویێ بوونەوە و لە نەهرەوان لەگەڵ عەلی شەڕیان کرد و تێك شکان و بو ناو ئێران هاتن و تا ئەو پەری ئێران چوون و لە سیستان هاوسنووری پاکستان و ئەفغانستانی ئەمڕۆ حکوومەتیان پێك هێناوە و تا سەرەتای سەدەی سێی کۆچی لەوێدا حکوومەتیان بەردەوام بوو.

٢ـ حەڵوان: شارێك بووە لە نێوان قەسری شیرین و خانەقیندا. عەرەبی کراوی «هەروەن»ی کوردیە. دابێژی کۆنتری «ئەروەنت»ە. ناوی ئەم شارە بە هۆی چۆمێکە کە بە وێدا تێدەپەڕێ و ئێستا ناوی رووباری «ئەڵوەند» ئەڵوەند دابێژی ئێستای ئەروەنتە. روانگەی «ن. پیگولوسکایا»ی رووسی بە دروست نازانم کە حەڵوان بە شاری ئەشکانی «خەل» دەناسێنێ. ئێستا کوردەکانی ئەو ناوچە بەو رووبارە «ئەڵوەن» و «هەڵوەن» دەڵێن و حەڵوان تەعریبی ئەم وشەیە. ئەروەنت بە مانای خورت و خێرایە. ئەوێستاییەکەی «ئەئوورروەنت» بە مانای خورت و بە هێز.

پەهلەوییەکەی «ئەروەند» کە هەر بەو مانایە و جگە لەوەش لە زەمانی ئەشکانی و ساسانیەکاندا ناوی ئێرانی رووباری دیجلە بووە. لە زەمانی شای پێشووی ئێراندا ئەم ناوەیان بڕی بە سەر شەتتولعەرەبدا. سەبارەت بە حەڵوان تیستەخری لە «ئەلمەسالیك وەلمەمالیك»دا نووسیویە: لە کرماشانەوە تا حەڵوان ٢٧ فرسەق دەبێ. ئیبنی حووقەلیش بارستای تا شارەزوور چوار مەنزڵ نووسیوە. ئەو حەڵوان بە بەشی ئێراق نازانی و دەڵێ: لەوێدا بەفر دەبارێ بێ‌گومان بەشێ لە جبالە. (ل ١١٢ سەفەرنامە ابن حوقل. د ـ ج ـ شعار)

٣ـ گەڕووس: ناوچەیەکی کوردستانی رۆژهەڵاتە کە ناوەندەکەی شاری «بیجاڕ»ە. کوردانی گەڕووسی هۆزی زۆریان بووە کە لە گشت گرینگتر هۆزی «سیا مەنسوور» لە مێژووودا ناودارە. گەڕووس بە مانای بەهەشتە ئەم ناوە کورت کراوەی «گەڕووسمان»ی پەهلەویە. گەڕووسمان گۆڕدراوی «گەڕوودمانە»ی ئەوێستای کۆن و "گەڕوونمانە"ی ئەوێستای دواییینییە. لە ئەوێستادا بە مانای بەهەشت بەکار براوە. ماناکەی «ماڵی ئاواز و گۆرانیە». گەڕ بە مانای گارە و گۆرانی. دمانە کە لە کوردی زازاشدا هەر وا ماوە بە مانای ماڵە. دمانە و نمانە لە بواری زەماندا پیتی پێشی سواوە و لە پەهلەویدا «مان» دەڵێن، لە کوردیدا «ماڵ». نابێ «ماڵ»ی کوردی لەگەڵ «مال»ی عەرەبی تێکەڵاو بکرێ. مەبەست لە مان و ماڵ کەسان و پێوەندیگەلی ئەوانەیە لە

خانوویەکدا. دیارە مانای ماڵ لە خانوو جودایە. خانوو لە بناغەی «خا»ی ئەوێستایی بە مانای دیوار هەڵچنینە.

٤ـ تەوسن، وشەی ڕەسەنی کوردی واتە تەوسکەر و سەرکێش. مەبەست ئەسپێکە کە تەوس و تۆر و سەرکێشی هەیە. فارسی لە کوردی گرتووە و کردوویە بە تەوسەن. وشەی تەوس کوردیە و لە هیچ نووسراوەوو قامووسێکی فارسیدا نیە.

٥ـ قەلەندەر بە مانای دەرویشە. وشەی ڕەسەنی کوردیە. دوو وشەیە (قەل+ ئەندەر) قەل= کەل ـ کەر، لە کرمانجیدا ـ گەر ـ گەل بە مانای کێوە. لە ئەوێستاشدا وەکوو کرمانجی «گەر»ە. ئەندەر لە ئەوێستادا «ئەنتەر» و لە کرمانجیدا هندر، هندور. بە مانای دەروون و ناوی شتێکە وەك دەڵێن هندورا گوندێ واتە لە ناو دێدا قەلەندەر واتە ئەو کەسەی کە لە کێودا دەژی. قەلەندەران بۆ خەڵوەکیشان دەچوونە ئەشکەوت لە کێودا و بەم بۆنەوە بە کەلەندەر کە پاشان بووە بە قەلەندەر دەناسران دیارە قەلەندەر لە کوردیەوە چووەتە نێو فارسی چون وشەی کەل یان گەر بە مانای کیو لە فارسیدا نیە.

٦ـ سیمیا. فەرهەنگە فارسیەکان وەکوو زانستی کەرامات و چەشنێ جادووگەری مانایان کردووە بەڵام «سیمیار»یان بە ڕەمز وێژ مانا کردووە کە ئەمە دروستە. دیار سیمیار بە کەسێك دەڵێن کە «سیمیا» دەزانێ. «سیمیا» زانستێکە کە بە پێی ئەوە زانیاریەکان بە ڕەمز و ڕاز دەگوترێ. لە تەرجیعبەندەکەی پیرشالیاری هەورامیدا کە بە تەواوی میهریە ئەم بەیتە دووپات دەبێتەوە:

گۆشت جە واتەی پیرشالیار بۆ هۆشت جەکیاستەی زانای سیمیار بۆ

واتە گۆشت لە وتەی پیر شالیار بێت و هۆشت لای هەناردەی زانای ڕەمز وێژ بێت. زۆربە داخەوە ئەوانەی کە شۆناسی گەلەکەیان نازانن دەڵێن مەبەست لە زانای سیمیار زەڕدەشتە. وتەکانی زەڕدەشت لە گاساکاندا هیچ ڕەمزو ڕازی تێدا نیە. ئەوێستای دواییشنیش بێڕەمز و ڕازە. ئەوەی کە بە ناچار بە ڕەمز و ڕازەوە قسە دەکات گەورەگەلی میهرپەرستی پێش ئیسلام و گەورەگەلی کاکەیی و ئێزدی بەتایبەت شەهابی سوهرەوەردیە. هەروەها کە شارەزووری دەڵێ و لە شرۆڤەی ئاوەزی سووردا دەری دەخەین سوهرەوەردی مەزنترین ڕەمزوێژە. دیارە کە شارەزووری مانای سیمیای زانیوە و دەزانێ کە سوهرەوەردی بە ڕەمز و ڕاز قسە دەکات. ئەوەی کە دەفتەرەکانی کاکەیی دەخوێنێتەوە ئەگەر لە سەمبول و ڕازەکان شارەزایی نەبێ هیچی لێ حاڵی نابێت. دەزانین

پیرشالیار گۆڕی هەیە بەڵام ناشتن و لە گۆڕکردنی مردوو لە زەردەشتیدا حەرامە. دیارە پیرشالیاریش کە لەم دواییانەدا بە هەڵە پێ دەڵێن پیر شالیاری زەردەشتی! مەبەستی لە زانای سیمیار یەکێ لە گەورەگەلی کاکەییە کە رەنگە سانسەهاك یان پیر بنیامین بێت کە هاوچەرخی خۆی بوون یان مەبەست خۆیەتی. پەندەکانی پیرشالیار هیچی لە زەردەشتی ناچێت بەڵام بە ئاینە کوردیەکان زور نزیکە. وشەی «سیمیار» دروستە لە فەرهەنگەکانی پاش «بورهانی قاتیع»دا هاتووە بەڵام لە هیچ دەق و نووسراوەی فارسیدا نەم دیوە.

٧ـ سوختە. وشەی رەسەنی کوردی لە ئەویستادا «ساچتە» و «سەچتە» بە مانای خوێندکار و فێرکراوە (سەچ+ تە) لە بناغەی «سەچ» بە مانای فێر کردنە سەبارەت بە «تە» نیشانەی ئاوەڵناوی بەرکار قسەمان کردووە. چۆنیەتی گۆڕانی ساچتە بە سوختە لە بواری زەمانـدا باسی زمانناسی «تەتەووری»ە کە ئەگەر تەمەن باقی بێت لە وەرگێڕانی وشە بە وشەی گاساکاندا باس دەکرێ. هەندێ «چ» لە کوردیدا بووە بە «خ» وەکوو «سەئوچی» کە ئەمڕۆ دەڵێن شۆخی. لە بەشی ئاخردا زۆرتر باسی دەکەین.

شێخ شەهابی سوهرەوەردی بەرهەمی هەرە گرینگی «حیکمەتولئیشراق»ە کە بە عەرەبی نووسیویە. حیکمەت لە ناو موسڵمانەکاندا بە فەلسەفە گوتراوە. بەرهەمێکی گرانە کە تێیدا ئاینی کۆنی کورد کە نهێنی لە ناوچەی سوهرەوەردا پارێزراو بوو دەکات بە سیستەمێکی فەلسەفی پتەو. جگە لەو بەرهەمە گەورە بەرهەمگەلی زۆری بە عەرەبی نووسیوە. هەفت پەرتووکی چکۆلەی بە فارسی نووسیوە کە بە خەستی سەمبولیك و ئاماژەیین: ریسالەی عەشق ـ ئاوازی پەڕی جبرەئیل ـ ئاوەزی سوور ـ ریسالە لە دۆخی منداڵیدا ـ قیژەی سیمورغ ـ زمانی مێروولەکان ـ رۆژێك لەگەڵ جەرگەی سۆفیاندا. لەم پەرتووکانەدا تێدەکۆشێ لایەنە گشتیەکانی فەلسەفەکەی پیشان بدات.

بۆ تێگەیشتنی تەواو لە فەلسەفەی ئیشراقی ئەو، تەرجەمەی حیکمەلئیشراق و شرۆڤەی ئەوە بە کوردی پێویستە. ئەم کارە لاپەڕەی زۆر هەڵدەگرێ و کارێکی سەخت و ئاکادمیکە بەڵام چون شوناسی فەلسەفی نەتەوەی کوردی تێدایە و لەگەڵ بەیتە کوردیەکان و دینە کوردیەکان پێوەندی نەپچڕاوەی هەیە کاریکە پێویست و ئێستا ئەرکی سەرشانی مامۆستایانی فەلسەفەی زانکۆکانی باشوورە.

بێ‌سوهره‌وه‌ردی ئێمه له فه‌لسه‌فه‌دا هیچمان نیه. له ناو ئه‌و هه‌فت په‌رتووکه‌دا «عقل سرخ» واته «ئاوه‌زی سوور»م هه‌ڵبژارد. چون هه‌م لایه‌نی فه‌لسه‌فیه‌که‌ی زۆرتره و هه‌م ئه‌و نووسه‌ره فارسانه که ویستوویانه کلیله‌کانی ئه‌و نیشانه‌گه‌له په‌یدا که‌ن چون له‌گه‌ڵ دینه کوردیه‌کان به‌تایبه‌ت مه‌له‌که‌تاوسدا ئاشنا نه‌بوون له هه‌ندێ بواردا به هه‌ڵه‌دا چوونه. ئه‌گه‌ر به وردی ئه‌و به‌رهه‌مه بخوێنینه‌وه، خودی سوهره‌وه‌ردی کلیل‌گه‌لێك ده‌دا به ده‌سته‌وه، هه‌روه‌ها له به‌رهه‌مه عیرفانیه‌کانی‌تردا له‌وانه مه‌م و زینی خانی و نیزامی(١) و فیرده‌وسی(٢) و عه‌تتار(٣) که به‌رهه‌مه‌کانیان به فارسیه هه‌ندێ کلیلی ئه‌و سه‌مبولگه‌له هه‌یه. ئاوه‌زی سوورپه‌رتووکێکی ٢٤ لاپه‌ڕه‌بیه و به خه‌ستی کورت کراوه‌یه و ناتوانرێ کورتتر بکرێته‌وه.

لێره‌دا نووسراوه‌که‌ی سوهره‌وه‌ردی ده‌هێنین و شرۆڤه‌کانی له ناوکه‌وانه‌دا ده‌نووسین. ئه‌م به‌رهه‌مه وه‌کوو مه‌م و زین چیرۆکه به‌ڵام زۆرتر له ئه‌و سه‌مبولیك و ئاماژه‌بیه. به وردی وه‌کوو میهرپه‌رسته‌کان و ئاینه کوردیه‌کان ناچار بووه له سه‌مبول و هێما که‌ڵك وه‌رگرێ. هه‌ڵه‌ی نووسه‌ره فارسه‌کان له‌سه‌ر شرۆڤه‌ی ئاوه‌زی سوور زۆره به‌ڵام هه‌ندێکی دروستن به گشتی ئه‌وانه‌ی له‌م بواره‌دا کاریان کردووه گشتیان سێ هه‌ڵه‌ی زه‌قیان هه‌یه. یه‌که‌م سه‌باره‌ت به خودی ئاوزی سوور که وه‌کوو مورشیده پێناسیان کردووه. دووهه‌م ئاوی ژیان و زوله‌مات (تاریکستان) و داری تووبا....

**نووسینی ئاوەزی سوور و شرۆڤەی ئەوە**

پاش سپاسی خودا و سەڵەوات بۆ موحەمەد (د ـ خ) برادەرێك لێی پرسیم، پەلەوەران زمانی یەك دەزانن؟ (مەبەست پێوەندی مینۆکی و ئەزەڵی گیانەکان پێش هاتنە نێو جەستە لەگەڵ یەکە کە گشت لە یەك بناغەن) وتم ئەرێ. وتی چۆن؟ وتم کاتێ ئەو شتەی کە وەك «حەق»ـیان لێ دەکەینەوە (مەبەستی خودایە کە لە کاکەییشدا حەق دەڵێن) ویستی من بئافرێنێ، وەکوو «باز»ێك ئافراندمی. (باز وەکوو واشەیە نەختێ گەورەترە. ئەو بازەی ژێر باڵی سپییە پێ دەڵێن شاباز. ئاماژە بە کەسگەلێکە کە دەروونمایەی ئەوەیان هەیە کە بە پێگەی هەفتەم واتە پێگەی میهری یا سیمورغ کە باسی دەکەین بگەن وەکوو مەم. ئەگەر کەسێ ئەم دەروونمایەی نەبێ هەر چەند هەل و مەرجی زۆری بۆ برەخسی، بەو پلەو پایە ناگات وەکوو تاجدین) لەگەڵ بازەکانیتردا قسەم دەکرد و قسەیانم دەبیست. وتم تۆ چۆن بەو پێگە کە ئێستا هەی گەیشتی؟ وتی ڕاوچیانی «قەزاو قەدەر» (مەبەست ئەو شتانەیە کە بێویستی خۆت دێتە پێشت وەکوو باوك و دایك و زێد و ڕەنگی پێست و موو.... کە هیچکام لە دەست خۆتدا نیە) تۆڕی «تەقدیر» (موقەددەر و پێشبینی نەکراو) یان لە ڕێگام دانا و بە «دانە»ی (لە تۆڕدا دانە دەپژێنن تا پەلەوەر بۆ خواردنی بێتە سەرتۆڕەکە ئاماژەیشە بە خواردنی ئادەم لە بەهەشتدا کە لە سەر ئەوە کەوتنە سەرزەوی) «ئیرادەت» (واتە ئاوات و دڵخوازەکانی نەفسانی) گرتمیان و هێنامیانە وڵاتێکی دیکە (مەبەست جیهانی ماکی سەر زەویە) هەر دوو چاومیان دووری (واتە ئیتر نەمتوانی جیهانی مینۆکی ببینم). بە چوار زنجیر بەستمیانەوە (ئاماژەیە بە باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا کە تەنیا لەو چوارەدا دەبێ هەڵسووڕێی یان ئاماژەیە بە ئاو و ئاگر و خاك و با کە دەورتیان تەنیوە). دە کەسیان کرد بە پاسەوانم. پێنج ڕوولە من و پشت لە دەرەوە و پێنجیتر پشت لە من و ڕوولە دەرەوە (ئاماژەیە بە دە هەستی مرۆڤ بە پێنجی دەتوانی هەستی دەروونی خۆت بکەی وەکوو هەست بە ئێشان، خۆشحاڵ بوون، بێداری ـ دڵە خورپێ ـ قەڵسی و بە پێنجی دەتوانی دەرەوەی خۆتی پێهەست بکەی وەکوو بینایی ـ بیستن ـ چەش ـ بۆ و لەمس کردن مەبەست ئەوەیە ئەم هەستگەلە ناهێڵن سەرنجی جیهانی مینۆکی بدەی). ئەو پێنجەی کە ڕوویان لە من بوو خستمیانە

سەر سوورڕمانەوە بە چەشنێ کە هێلانەی سەرەتایی وڵاتی خۆمم لە بیر نەما. (واتە جیهانی مینۆکیم لە بیر چووە).

وام دەزانی هەمیشە هەروا بووە. پاش ماوەیەك نەختێ چاومیان کردەوە (واتە هەست و دەرکی سەرەتایی زەمانی منداڵی) بەو چاوە لاوازەکە دەمڕوانی شتگەلێکم دەدی کە نەم دیبوو. ڕۆژ بۆ ڕۆژ نەختە نەختە چاومیان دەکردەوە و شتگەلێك دەهاتە پێش چاوم کە سەرم سووڕدەما. تا بە تەواوی چاومیان کردەوە و جیهان هاتە پێش چاوم. لە زنجیرگەلێك دەمڕوانی کە دەست و پێمی بەستبوو (واتە لە جیهانی مینۆکیدا سنوور بۆ چوون و ویستی مرۆڤ نیە بەڵام لەم جیهانی ماکیدا ناتوانی هەر کار کە دەتەوێ بیکەی) لە پاسەوانەکانم تێدەفکریم بە خۆم دەگوت هەرگیز دەبێ ئەم زنجیرگەلەی من بکەنەوە و بتوانم بە باڵەکانم لە هەوادا بفڕم (بچمەوە بۆ زێد و هێلانەکەی خۆم). ڕۆژێك پاسەوانەکان سەرنجیان لێم نەبوو (واتە دەرقەیدی هەست کردن و ویستی نەفسانی نەبووم، لە دنیا بڕابووم). خزامە قوژبنێکەوە (ئەم لە خۆ بڕانە و گۆشە گرتنە قۆناغیەیە کەمە بۆ سەرکەوتن). پاشان ڕووم کردە سارایەك (دوور لە خەڵك وەکوو مەم لە قەراخ چۆمەکەدا) کەسێکم دی کە دەهات. چوومە پێشی و سڵاوم لێکرد. جوابی دایەوە کە سەرنجمدا ریش و سەرو ڕووی سوور بوو. وام زانی لاوە. وتم هەی لاو لە کوێوە دێی. وتی ڕۆڵە بە هەڵەدا چووی من یەکەم ڕۆڵەی ئافراندنم. وتم ئەی چۆن سەروریشت سپی نیە؟ وتی سەروریشی من سپیە من پیرێك نوورانیم بەڵام ئەوەی تۆی بە تۆڕ دیل کرد و ئەو پاسەوانانەی بۆ دانای، ماوەیەکی زۆرە منی خستە چاڵێکی رەشەوە. ڕەنگم کە سوورە لەو چاڵەوەیە. دەزانی ڕەنگی رەش لەگەڵ نووردا سوور دەنوێنێ وەکوو کازیوە یان ئێوارە. کازیوە سپیە لایەکی خۆرە و لاکەیتری تاریکییە، ئەوەیە کە شەفەق سوور دەنوێنێ. چرایش وایە ژێری شۆلەکەی سپیە و سەری دووکەڵە، ئەوەیە کە ژێر دووکەڵەکە سوور دیارە. (گشت نووسەرە فارسەکان عەقڵی سووریان بە مورشید زانیوە کە ڕێنوێنی دەکات بەڵام نەیانگوتووە بۆچی سەروڕووی سوورە. پاش گۆشەگیری و موکاشیفە بە چی بگەی باشە. سوهرەوەردی خۆی کلیلی داوە بە دەستەوە. دەڵێ من یەکەم ئافرێنراوی خودام ئەوەی تۆی دیل کرد منی خستە چاڵێکی رەشەوە و من لێکدراوەیەکم لە نوور و تاریکی. هەروەها، یەکەم ڕێنوێنیکەری مرۆڤە. ئەگەر بە بەرهەمە عیرفانیەکان سەرنج بدەین دەی دۆزینەوە. نیزامی شاعیری کوردی فارسی وێژ لە سەدەی شەشی کۆچی لە کتێبی «مەخزەنولئەسرار»دا دەڵێت:

دور شو از راه زنان حواس      راه تو دل داند دل را شناس

واته لە ڕێگرەکانی هەست کردن واتە هەر ئەو دە هەستەی ناوبراو دوور کەوە. ڕێگای تۆ دڵ دەیزانێ دڵ بناسە.

دل کـه بـرو خطبـتي سـلطاني اسـت　　　　اکـدش جسـماني و روحـاني اسـت

واتە دڵ کە خوتبەی پادشایی بۆ خوێندراوە بە ڕەنگی ماکی و مینۆکی، بەڵکە

نـور ادیـمـت ز سـهیل دل اسـت　　　　صـورت و جـان هـر دو طفیـل دل اسـت

واتە نووری سەرەتایی ئافراندن لە ئەستێرەی سوهەیلی دڵە. جەستە و گیان هەر دوو بە بۆنەی دڵەوە ئافرێندراوە. سەرنجی ورد بە واتای ئەم هونراوەگەلە بەتایبەت وشەی «ئەکدەش» کە بە مانای دوو ڕەنگە و هۆنراوەگەلی‌تری نیزامی ئیتر گومان نامێنی کە مەبەستی سوهرەوەردی لە «عەقلی سوور» دڵە کە جێگای ئەوین و هەست کردنی دروستی جەماڵ و جەلالی خودایە. نیزامی لە سەرەتای پەرتووکی ناوبراویدا بە «پێناسەی شەوو ناسینی دڵ» دەس پێ دەکات. شەو بۆ لە سەرەتادا هاتووە ئەوەیە کە لە میترایی و دینە کوردیەکاندا نوور لە تاریکی دەزێ وەکوو میترا لە بەرد و لە سەدەف. لە هونراوەی نیزامیدا شەو هەم جوانە و هەم پێویست بو ئافراندنی دڵ:

... طفل شب ئاهیخت چو در دایه دست　　　　زنگلـه‌ی روز فـرا پـاش بسـت

ساوای شەو کە دەستی خستە سەر سینگی دایەن ئەویش زەنگۆڵەی ڕۆژی بەست بە پایەوە.

از پـی سـودای شـب اندیشـه نـاك　　　　سـاخته معجـون مفـرح ز خـاك

بە شوێن تاریکی شەودا بە تێڕامانەوە دایەن دەرمانی تێکەڵاوی شادیهێنەری لە خاك دروست کرد.

خـاك شـده بـاد مسـيحای او　　　　ئـاب زده ئـاتش سـودای او

ئەو خاکە وەکوو بای زیندووکەرەوە بوو کە ئاگری سەودای ئەوی ئاو لێ دەپژاند.

شـربت و رنجـور بـهم سـاخته　　　　خانـه سـودا شـده پرداختـه

دەرمان و نەخۆش پێکەوە سازان و ماڵی تاریکی پەرداخت کرایەوە.

رنـگ «درونـی» شـده بـيرون نشـين　　　　گفتـه قضـا کـان مـن الکـافرين...

ڕەنگی دەروونی «ڕەشی» هاتە دەرەوە و قەزاو قەدەر وتی هۆ.. لە کافرگەل بوو.

نیزامی پاش پێناسەکردنی شەو دێتە سەر باسی دڵ:

چــون ملـــك‌العــرش جهـــان ئافريـــد          مملكـــــت صــــورت و جـــان ئافريــــد

ئەو کاتەی کە خودا جیهان و وڵاتی ماکی و مینۆکی ئافراند.

داد بـــــه ترتيـــــب ادب ريزشــــــى          صــــورت و جـــان را بـــــەم ئاميزشــــى

بە ئەدەبەوە ڕیز کردنێکی دانا و جەستە و گیانی تێکەڵاوی یەك کرد.

زيـــن دو همــــاغوش دل ئامـــد پديـــد          ئـــان خلفـــى كـــو بـــه خلافـــت رسـيد

لەو دوو تێکەڵاویە دڵ بەدیهات ئەو ڕۆڵە ڕاستەقینەی کـە بـۆ جـێ‌نشـینی خـودا شـیاو بـوو. مەبەست لە جەستە وەك باسی دەکەین تاریکی و مەبەست لە گیان نووری جەوهەرییـەکـە بـاس دەکرێ.

عـــرش روانــــى كـــه زتـــن رســـتەانـــد          شـــهپر جبريـــل بـــه دل بســـتەانـــد

ئەو ئاسمان ڕەوانەی کە لە دەست جەستە ڕزگاریـان بـوو دیـارە شـاپەڕی جبرەئیلیـان بـە دڵـەوە بەستراوە کە لە ئاسمانمان تێ دەپەڕن

وان كـــه عنـــان از دو جهـــان تافتســـت          قـــــوت ز دريــــــوزەى دل يافتســـــت

ئەوەی کە لە هەوساری دوو جیهانی دنیا و قیامەت ڕزگاری بوو دیارە خۆراکی لە سوالکەری دڵ وەرگرتووە.

زنــده بجـــان خـــود همــه حيـــوان بـــود          زنـــده بـــه دل بـــاش كـــه عمـــر ئن بـــود.

گشت ئاژەڵگەل بە گیان زیندوون بەڵام تو زیندوو بە دڵ بە کە تەمەنی ڕاستەقینە ئەوەیە

دســـــت در ئـــــاويز بـــــه فــــتراك دل          ئـــاب تـــو باشـــد كـــه شـــوى خـــاك دل

دەست بە زین و بەرگی دڵەوە بگرە. ئابڕووی تۆ ئەوەیە کە ببیتە خاکی بەر پێی دڵ

نیزامی هەر لەو شەوەدا دەچێتە میوانی بارەگای دڵ:

چـــون ســـخن دل بـــه دمـــاغم رســـيد          روغــــن مغــــزم بـــه چـــراغم رســـيد

هەر کە قسەی دڵ گەیشتە میشکم ڕۆنی میشکم گەیشتە چرای بوونم و دای‌گیرساند.

گـــوش دريـــن حلقـــه زبـــان ســـاختم          جـــان هـــدف هـــاتف جـــان ســـاختم

گوێم لەم حەلقەدا کردە زمان و گیانم کردە ئامانجی پەیام هێنەری گیان.

در تـــك ئـــان راه دو منــــزل شـــدم          تـــا بـــه يكـــى تـــك بـــه در دل شـــدم

ئەو ڕێگا دوو مەنزڵەم بەخێرایی بڕی بە یەك ڕاکردن گەیشتمە دەرگای دڵ

بـــــر در مقصـــــورەی روحـــــانیم　　　گـــوی شـــده قامـــت چـــوگانیم

لە بەردەرگای پێشەوای جوانی ڕۆحانیم (دڵ)دا، باڵای ڕاستی وەکوو چەوکانم کرا بە گۆی چەماوە و گرمۆڵە

چـــونکه در ئـــان نقـــب زبـــانم گرفـــت　　　عشـــق نقیبانـــه عنـــانم گرفـــت

چونکە لەو ڕەهەندەدا زبانم گیرا و قسەم بۆ نەهات، ئەوین وەکوو پێشەوا هەوسارمی گرت،

حلقـــه زدم گفـــت بـــدین وقـــت کیســـت　　　گفـــتم اگـــر بـــاردهی ئـــادمی اســـت

حەلقەی دەرگام کوتا وتی: بەم بێوەختە کێیە وتم ئەگەر ئیزنی هاتنە دەربار بدەی مرۆڤە.

لاجـــــرم از خاصـــــترین ســـــرای　　　بـــانگ برئامـــد کـــه نظـــامـــی درای

جا لە تایبەتترین ژوورەوە بانگ کرا، نیزامی وەرە ناو.

بـــــارگهی یـــــافتم افروختـــــه　　　چشـــم بـــد از دیـــدن او دوختـــه

بارگاهێکی گەشاوەم دی، چاوی پیس لە دیتنی ئەو دوور بێت.

هفـــت خلیفـــه بـــه یکـــی خانـــه در　　　هفـــت حکایـــت بـــه یـــك افســـانه در

هەفت جێنشین (ی خودا لە زەویدا) لە ماڵێکدا و هەفت حەکایەت لە چیرۆکێکدا بوو

ملـــك از ئـــان بـــیش کـــه افـــلاك راســـت　　　در لتیـــان خـــاك کـــه ئـــان خـــاك راســـت

موڵك و ماڵ (ی دڵ) زۆرتر لە هەفت ئاسمان و مۆڵکداران لە بەرانبەریدا خاك بوون کە هەر بۆ خاکیش دەشێن.

در نفـــس تابـــاد دم نـــیم ســـوز　　　صـــدر نشـــین گشـــته شـــه نیمـــروز

لە جێگای هەناسەدانی هەناسەی نیوەسووتاودا خۆر (دڵ) باڵانشین بوو.

ســـرخ ســـواری بـــه ادب پـــیش او　　　لعـــل قبـــایی ظفـــر انـــدیش او

سوارێکی سوور بە ئەدەبەوە لە پێشی ڕاوەستابوو و کەوا لەعلێك لەسەرکەوتنی ئەندێشەیدا بوو

مـــن بـــه قناعـــت شـــده مهمـــان دل　　　جـــان بـــه نـــوا داده بـــه ســـلطان دل

منیش بە قەناعەت بووم بە میوانی دڵ و گیانم دابەنەوازشتی پادشای دڵ.

چـــون علـــم لشـــکر دل یـــافتم　　　ڕوی خـــود از عالیـــان تـــافتم

کاتی که ئالاّی لەشکری دڵم دی ڕووی خۆمم لە خەڵکی دوو عالەمی دنیا و قیامەت وەرگێڕا.

دل بـه زبـان گفـت کـه ای بـی‌زبـان　　　مـرغ طلـب بگـزر از ایـن ئاشـیان

دڵ بە زمانی وت کە ئەی بێزمان پەلەوەرت بوێت. لە هیلانە ویستن تێپەرە.

سـایەم ازیـن سـرو توانـا تراسـت　　　پایـەم از ایـن پایـە ببـالاتر اسـت

من سێبەرم لەم سەوڵە بە هەتوانترە و پێگەم لەم پێگە کە دەیبینی سەرترە.

گـنجم و در کیسـەی قـارون نـیم　　　بـاتونیم و ز تـو و بـیدون نـیم....

من خەزنەم بەڵام لە کیسەی قاروونداا نیم و لەگەڵ تۆدام و لە دەرەوەی تۆ نیم.

نیزامی لە باسی پاش ئەمە واتە «خەڵوەی یەکەم لە ڕاهێنانی دڵدا» دەڵێ

خواجـه مـعالقصـه کـه در بنـد ماسـت　　　گرچـه خـدا نیسـت خداونـد ماسـت

ئاغا (دل) بە هەر حاڵ کە ئێمەی لە بیردایە و لە بیرمان ناباتەوە هەر چەند خودا نیە بەڵام خودای ئێمەیە

شـحنه راه دو جهـان منسـت　　　گرنـه چـرا در غـم جـان منسـت

پاسەوانی ڕێگەی هەر دو جیهانە ئەگینا بۆچی خەمخۆری گیانمە

روزی از ایـن مصـر زلیخـا پنـاه　　　یوسـفیی کـرد و بـرون شـد زچـاه ...

ڕۆژێك لەم میسرە (دونیا) کە زلێخا تێدا پەنای گرتووە کارێکی یوسفانەی کرد و لە چاڵ هاتە دەرێ (وەکوو عەقڵی سوور کە بۆ ڕێنوێنی دەرکەوت... نیزامی کە دڵ بە خۆر دەشوبهێنێت مەبەستی ئەوەیە کە دڵ وەکوو خۆر ڕاستەوخۆ نووری خۆی لە حەزرەتی «نووروڵنەنوار، خودا بە وتەی سوهرەوەردی» دەگرێت. تەجەللای خودا لە خۆردایە کە لە زەویدا بە سیمورغ ناسراوە و لەسەری باس دەکەین. نیزامی پاشان بەرهەمگەلی خلوەتی خۆی لەگەڵ دڵدا لێك دەداتەوە.

لە زۆربەی بەرهەمگەلی عیرفانی و سۆفیگەریدا سەبارەت بە دڵ وەکوو گرینگترین ڕێنوێنی سەرەکی مرۆڤ و ڕێگە نیشاندەر بۆ زێدی ڕاستەقینەی خۆی واتە سەرچاوەی ئەوین و بوون، باسی زۆر لەم چەشنە هاتووە. مرۆڤ بەو مەرجەی دەتوانێ بە ئاکامی ئەم ڕێنوێنیە بگات، هەروەها کە پیری ئیشراق واتە سوهرەوەردی دەڵێ مرۆڤ دەبێ ماوەیەك لە پاسەوانانی لەش واتە دە هەستەکانی دوور کەوێتەوە و لە هەواگەلی نەفسانی خۆ بپارێزێ تا بە ئاوەزی سوور واتە دڵ بگات. ئەو دڵە لێکدراوەیەکە لە تیشك و تاریکی. لێرەشدا کاردانەوەی ئاینی میهری دەبینین. دڵ گرینگترین بنەمای مرۆڤە کە ناوەندی ئەوین و جوانی و هەستکردنی بوونە کە لە نوور و تاریکی دروست

بووه. ئەم تیشك و تاریکیە کە سەرچاوەی بوونە هەرکام جیاواز دەتوانن کەسایەتی پەیدا کەن و وتمان پەیکەرگەلی ترسناکی ستایشتگاگەلی میهری سەمبولی لایەنی دووهەمیە کە لە دینە کوردیەکاندا پێ دەڵێن مەلەك تاوس).

پاشان وتم ئەی پیر لە کوێوە دیت؟ وتی لە پشت کێوی قافەوە کە جێگای من ئەوێیە. هێلانەی تۆش لەوێدا بوو بەڵام تۆ لە بیرت چووەتەوە. (مەبەست لە کێوی قاف سەرچاوەی بوونی مرۆڤ و هەروەها ئامانجی گەیشتنی مرۆڤ بە ئەوێیە. لە یەکێ لەم کێوگەلەدا سیمورغ هەیە کە جێگای دەرکەوتنی تیشك‌گەلی میهر لە خۆرەوەیە کە قسەی لێ دەکرێ).

وتم لە کێوی قافدا چیت دەکرد. وتی من گەشتیارم و بەردەوام جیهان دەگەڕێم و شت‌گەلی سەرسووڕهێنەر دەبینم (واتە بە دوور کەوتنەوە لە جەستە و موکاشیفە دەتوانم بە نهێنی‌گەل پەی بەرم).

وتم لە شت‌گەلی سەرسووڕهێنەر چت دیوە؟ وتی هەفت شت. یەکەم کێوی قاف کە وڵاتی من وتۆیە. دووهەم گەوهەری شەوچرا. سێهەم داری تووبا. چوارەم دوانزە کارگا. پێنجەم زنجیری داودی. شەشەم شیری بە لارەك. هەفتەم کانی ژیان. وتم ئەو شت‌گەلەم بۆ پێناس کە. وتی یەکەم کێوی قافە کە لە دەوری ئەم جیهانەدایە. یازدە کێوە تۆ ئەگەر ڕزگار بی (بمری) بۆ ئەو جێگا دەچێ چون تۆ لە وێوە هاتووی. لە جیهاندا هەرچی کە هەیە لە ئاکامدا دەچێتە سەر وێنە و جێگای یەکەمی ڕاستەقینەی خۆی. (مەبەست لە کێوی قاف پلە و پێگەکانی جیهانی مینۆکیە لە خوارەوە بۆ ژوور. ڕەنگدانەوەی ماکی ئەمە لە زەوییەوە بۆ ئاسمان یانزە قۆناغە. قۆناغی دوانزەهەم سوهرەوەردی ناوی نابات چون مەقامی «موتلەق»ی خوداییە پێش تەجەللا. پاش تەجەللا لە مێژدا بە میترا پاش ئیسلام بە خاوەندگار و خودێ و تاوسێ مەلەك ناسراوە.

پێش دەرکەوتن واتە تەجەللای خودا نە لە ئاینی میهری و نە لە دینە کوردیەکاندا باس لەسەر خودا نیە. چون بی‌زەمان و بی‌مەکان و موتلەق و بی‌ئاسەوارە و لە مێژگ و هزردا ناگونجێ و قسە کردن لەسەری بی‌ئاکامە و ئیتر جێگای باسی نیە. تەجەللای خودا لە دینی میترایی‌دا میترایە. لە کاکەیی‌دا خاوەندگارە. سوهرەوەردی بە «نووروولئەنوار» واتە «تیشکی تیشکان» خودا ناو دەبات و دەڵێت لە ئاسمانی نۆهەم دایە کە تەجەللای ئەویش دەبێ بە ئاسمانی هەشتەم. لە ئێزدیدا تاوسێ مەلەکە. لە کاکەیی‌دا تاوسێ مەلەك پاشان لە زاتی بنیامیندا دەردەکەوێ. زاتی بنیامین و شەش تەنی دیکە هەر بەشێ لە زاتی خودان بەڵام لە هەفت زاتدا کە هەرکام لە جەستەدا دەردەکەون،

سوهرەوەردی پلەگەلی تەکامولی مرۆڤ بە گەیشتن بە زاتی تیشکی تیشکان (خودا) بە یانزە پلـە دەزانی وەکوو نۆ ئاسمان و دوو نهۆمی دیکە لە نێوان مانگ و زەویدا کە دەبن بـە یـانزە. تیشـکی تیشکان لە ئاسمانی نۆهەمدایە. یەکەم سدوور واتە دەرکەوتنی ئەو ئاسمانی هەشتەمە کـە ئـاخرین پلەی تەکامولی مرۆڤە کە پاش ئەوە مرۆڤ دەتوانێ تێکـەڵاوی تیشـکی تیشـکان بێـت. ئاسـمانی هەشتەم پێگە و تیشك و خاوێنی لە ئاسمانی نۆهەم کەمترە بەڵام لە ئاسمانی هەفتەم کـە ئاسـمانی «گەڕوکنەستێرە»ی «زوحەل= کـەیـوان» زۆرتـرە. ئاسـمانی هـەفتـەم لـە شەشـەم کـە ئاسـمانی گەڕوکنەستێرەی «موشتەری» تیشك و خاوێنی لە هەشتەم کەمتر بەڵام لە شەشـەم زۆرتـرە هـەر بەم شێوە بینە خوارەوە ئاسمانی پێنجەم ئاسمانی مریخە کە تیشك و خـاوێنی لـە ئاسـمانی شەشـەم کەمترە بەڵام لە ئاسمانی چوارەم زۆرترە. ئاسمانی چوارەم هی خۆرە کە ئەگەر ڕەنگدانـەوەی جـەماڵی حەق لە دێنە کوردیەکاندا مەلەك تاوس و لە کاکەیی‌دا وەکوو بنیامین لـە جەسـتەدا دەرکـەوت نەبوایە تیشك و خاوێنی لە ئاسمانی پێنجەم کەمتر بوو بەڵام لە ئاسمانی سێهەم زۆرتـرە. ئاسـمانی سێهەم هی «زوهرە= ناهید» کە تیشك و خاوێنی لە ئاسمانی چوارەم کـەمـتر بـەڵام لـە ئاسـمانی دووهەم کە هی «عەتارود» زۆرترە. ئاسمانی یەکەم هی مانگە کە ئەگەر ڕەنگدانەوەی خۆری تێـدا نەبوایە کە لە دینە کوردیەکاندا ڕەنگدانەوەی جەماڵی مـەلـەکـە تاوسـە تیشـك و خـاوێنی لـە ئاسمانی دووهەم کەمتر بوو. ئاسمانی چوارەم و یەکەم. تیشکی زۆرتریان هـی خۆیـان نیـە. بـەشـی خویان هەیە بەڵام زیادیەکەی بە هۆی ڕەنگدانەوەی جەماڵی تیشـکی تیشـکانە لـە خـۆردا واتـە مەلەکە تاوس. لە نێوان ئاسمانی یەکەم و زەوی‌دا دوونهۆم هەیە «ئەسیر» و «زەمهەریر». ئـەوەیـە کە ناوەزی سوور دەڵێ کێوی قاف یانزە چیایە. بە باوەڕی سوهرەوەردی، تیشکی تیشـکان تیشـکی موتلەق و خاوێنە واتە جەوهەرییە بەڵام هەر لە ئاسمانی نۆهەم دێتە خوارەوە تا دەگەی بە ئاسمانی یەکەم لە خاوێنی تیشك کەمتر دەبێتەوە و جیرم و قورسایی زێدە دەبێ. ئاسـمانی یـەکـەم کـە هـی مانگە و نزیکترین ئاسمانە بە زەوی هەم تیشکی هەیە و هەم جرم و قورسایی. لە ژێـر ئـەوەدا کـە زەویە ئیتر بە تەواوی جیرم و قورساییە و بێ‌تیشکە و سوهرەوەردی پێ دەڵێ نووری کەسـیف، واتـە جیرم و قورسایی دار. تاریکە و تاریکیەکەش هەر نوورە کە بـە هـوی لاوازبـوون، بـووە بـە جـیرم قورسایی. ئەمە بیرهێنەری موعادیلەکەی ئەنەشتەینە «$E=MC^2$» واتە وزەکە چەشـنی هـەرە گرینگی نوورە، هەر مادەیە. لە فەلسەفەی ئیشراقدا جیهان چ نوور و چ ماددە تەجەللاکانی زاتی خودایە. مادەش هەر نوورە بەڵام کەسافەتی پەیدا کردووە).

پرسیم چلۆن دەتوانم بگەم بە کێوی قاف. (چلۆن دەتوانم پلەگەلی تەکامول بپێوم) وتی، ڕێگا سەختە. یەکەم دوو کێو لە پێشتدایە. (مەبەستی نهۆمەکانی ئەسیر و زەمهەریرە) یەکیان گەرمە یەکیان ساردە لەوێدا کەس نیە (واتە لەوانیتردا کەس هەیە کە لە کاکەیی و ئێزدی و میترایی‌دا وتمان ئاسمانی هەفت گەڕۆکەکان هەر کام هی یەکێ لە هەفت سدووری زاتی خودان. سوهرەوەردی نەیوێراوە بە ئاشکرایی بلێت. تەنیا دەڵێت لەم دووەدا کەس نیە!). وتم ئاسانە لە کێوی گەرم بە زستان و لە کێوی سارد بە هاوین تێپەر دەبم. وتی هەڵە دەکەی هەوای ئەو دووە لە زستان و هاویندا ناگۆڕدرێ. وتم چۆن دەتوانم ئەم دوو چیایە ببڕم؟ وتی هەر چۆن بڕوی دووبارە دیتەوە سەر جێی خۆت وەکوو پەڕگار کە سەرێکی لە خاڵە سەرێکی هێل. سەری سەرهێڵەکە هەرچی بڕوات دەگاتەوە جێی خۆی (واتە تۆ لە زەوی‌دا ئەگەر بیرو هزرت لە چەشنی ماکی بێت واتە بیرو هزرت لە خواردن و خەوتن و ڕابواردن بێت هەر بە دەوری خۆتدا دەگەڕێی). ئەم چیاگەلە ناتوانی کون کەی بەڵام ئەو کەسەی کە توانای دەروونی تایبەتی هەیە (وەکوو مەم) بێ ئەوە کونی کات دەتوانێ لە چرکەیەکدا لێ تێپەر ببێت وەکوو ڕۆنی «بلسان، بولسان، بەلسان؟» کە ئەگەر دڵۆپێکی بکەیتە ناو دەستت و لە بەرانبەر خۆرەوە بیگری بە هۆی تایبەتمەندییە کە هەیەتی لە پشت دەستەوە دیتە دەرێ (لە ڕووانگەی سوهرەوەردییەوە ئەو دوونهۆمە بە تەواوی لایەنی ماکی هەیە. فەلەکی مانگ هەم لایەنی ماکی هەیە هەم مینۆکی فەلەکەکانی‌تر لایەنی ماکیان زۆر کەمە و فەلەکی هەشتەم بە تەواوی مینۆکیە و فەلەکی نۆهەم جێگای نوورولئەنوارە. جا تێپەربوون لەو دوونهۆمە ئاماژەیە بەوە کە مرۆڤ دەبێ لە پێشدا لە هەرچی قەید و بەندی ماکیە، دابڕابێت تا تایبەتمەندی ئەوە پەیدا کات بچێتە قۆناغی سێهەم واتە چەرخی یەکەم) وتم ئەو تایبەتمەندیە چۆن پەیدا کەم تا لەو دوو نهۆمەتێ پەڕ بم؟ وتی لە ئاکامی قسەکانمدا دەیڵێم ئەگەر تێ بگەی. وتم ئەگەر لەم دووانە تێ پەڕیووم سێهەمی ئاسانە؟ وتی ئاسانە بەڵام بۆ کەسێ بزانێت. زۆر کەس لەم دوو چیا دمێننەوە. هەندێ دەگەنە کێوی سێهەم و دەمێننەوە هەندێ بە چوارەم و پێنجەم هەروەها تا یانزەهەم پلە. هەر پەلەوەرێك ژیرتر بێت پێشتر دەچێت.

(بە پێی ئەو قسەگەلە کە سوهرەوەردی تا ئێستا وتوویە کاتێ کەسێ لە قۆناغی سەرەتایی ڕەنج کێشان و خەڵوە و موکاشیفە تێپەر بوو واتە بە قۆناغی تەریقەت گەیشت، سەرنجی ڕادەکێشرێتە سەر ڕێنوێنی دەروونی کە لە مێژدا پیان وتووە دڵ کە کانگای ئەوینە. دڵ لە جیهانی ماکیەوە سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشتە سەر جیهانی مینۆکی کە سەنبولەکانیان ئاسمانەکانن.

دڵ لە خوارەوە هانی دەدا بۆ سەر. لە زەویەوە بۆ ئاسمان واتە لە ماکییەوە بۆ مینۆکی. لـە پێشـدا سەختە. زۆرکەس لە پلەی یەك و دوودا دەمێننەوە چـۆن دوو جیهـانی بـە تـەواوی ماکیـە ڕۆنـی بولسان ئاماژەیە بە ئەوین. کەسانی نا ئـەوینـدار ئـەو تایبـەتـمـەندیانـە نیـە سـەرکەون، بـەڵام ئەویندارى ڕاستەقینە بۆ سەر و سەرتر دەچێت. بۆ وێنە کەسانێ وەکوو تاجـدین لانـی زۆر تـا دوا پلەی دووهەم دەچن. چون ئەوینیان ناتەواوە. ئەوین بناغەی کەسایەتی دڵـە. بـێ‌ئـەویـن تـەنیـا، دەژیت. ڕاستەقینەی ژیان هەست ناکەی و سەر کەوتنت تەنیا خۆش ڕابواردنێکی کاتیە. دوو پلەی یەکەم و دووهەم چون بە تەواوی ماکین سەرکەوتن لەوانە دژوارترە. لە پلەکانی سەرتر بـەڵام هـەر مەترسی «مانەوە» هەیە. ئەوانەی کە تایبەتمەندیان هەیە و ژیرترن دەتوانین تـا پلـەی یـانزە کـە جێگای نووری خوایە سەرکەون. تیشکی تیشکان ئافرێنەرە و دەتوانی سیفات و زاتـی خـۆی لـە ئافرێنراوەکانی‌دا دەرخات دڵ ئەمڕۆ بەو پارچە ماسوولکە دەڵێن کە خوێن لە جەستەدا دەگـەڕێنێ بەڵام لە مێژدا دڵ بە ناوەندی هەست و عەواتیف گوتراوە بۆ ئەوەیە بە خۆشەویست دەڵێن دڵـدار، یان دڵبەر.)

گەوهەری[٥] شەو چرایش لە کێوی سێهەمدایە (واتە دوو چیای یەکەم و دووهەم کە دوو نهۆمی زەمهەریر و ئەسیرە، چیای سێهەم مەبەست فەلەکی مانگـە و مەبەسـت لـە گەوهـەری شەوچـرا مانگە. گەوهەری شەوچرا لە چیرۆکە کوردیەکاندا وەکوو تۆپێکی پڕ بە دەست کە ئەگەر شەو لـە جێگایەك دای‌بنێی نیاز بە چرا نیە و هەموو لایەك ڕۆشن دەکاتەوە) لەو گەوهـەرە شـەوی تاریـك ڕوون دەبێتەوە بەڵام هەمیشە لە یەك دۆخدا نیە. لە داری تووبا ڕۆشنی دەستێنێ (دیارە مەبەسـت لە داری تووبا خۆرە بۆچی بە خۆر دەڵێ داری تووبا کە باسی دەکەیـن.) کـاتێ بەرانبـەر بـە داری تووبا دەوەستی لە ئەم لاوە کە تۆ هەی، گشت ڕووناکیەکەی دەبینی (مانگی شەوی چواردە) کـاتی بێتە ئەم لاترەوە کە بە داری تووبا نزیکترە نەختێ لە جەغزەکەی ڕەش دەنوێنێ و پاشماوەکەی ڕوونە هەر چی نزیکتر بە داری تووبا دەبێتەوە (لە ڕوانگەی خەڵکی زەویەوە) لە ڕووناکی کەمتر دەبێتەوە و تاریکتر دەنوێنێ. چون بە تەواوی بکەوێتە لای خۆرەوە ئەوەی ڕوو بە تۆیە ڕەش دەنوێنێ و ئـەوەی ڕوو بە داری تووبایە بە تەواوی ڕووناکە. دیسان کە لە داری تووبا دەچێتە ئەولاترەوە نەختی بۆ تـو ڕووناکی دەردەخات (مانگی یەکشەوە). هەرچی لەو دارە دوورتر کـەوێتـەوە بـۆ لای تـۆ ڕوونـاکتر دەبێت و ڕەشی کەمتر دەبێتەوە تا بە تەواوی دێتە بەرانبەرت ئەوسا هـەمـوو جێگـای ڕوو بـە تـۆ ڕووناکە. (پیری ئیشراق بەو قسەگەلە لە پێشدا تۆ بۆ مانگ و لە مانگەوە بۆ خۆر و بەتایبەت لە

خۆرەوە بۆ «سیمورغ» کە لەسەری باس دەکەین ڕێنوێنی دەکات. هەمیسان نیشانەگەلێك دەدات کە تۆ شکت نەمێنی کە گەوهەری شەوچرا مانگە):

وەکوو ئەوەیە تۆپێ ئەم سەرتا ئەوسەری کونکەی و چیلکەیەك بەو کونەدا بکەیت و بیخەیتە سەر ئاو بە چەشنێ تا نیوەی لە ئاودابی. ئەگەر کەسێ لە ژێر ئاوەکەدا بۆی بڕوانێ تەنیا ئەو نیوە دەبینێ کە لە نێو ئاودایە ئەگەر لە ڕاستەوە (واتە لای ڕاستی ڕووی ئاوەکە) بۆی بڕوانی نیوەی لە ئاودا دەبینی و نیوەی لە هەوادا. ئەگەر لە سەردا بۆی بڕوانی ئەو نیوە دەبینی کە لە هەوادایە. ئەگەر لە ڕووی ئاوەکەوە چاوت نەختێ بەرزتر بگری کەمتر لەو بەشەی دەبینی کە لە ئاودایە... (ئیتر بە تەواوی دیارە کە مەبەستی پیری ئیشراق لە گەوەهری شەوچرا مانگە و داری تووبا خۆرە. خۆر لە فەلسەفەی ئیشراقدا زۆر گرینگە و پیری ئیشراق پێ دەڵێ «نەیری ئەعزەم» (واتە ڕووناك و ڕووناككەرەوەی مەزن. گرینگی لەوەدایە کە جێگای سیمورغە مژار ئەوندە ڕوون و ئاشکرایە کە هەندێ کەس کە فێر بوونە هەمووشت بە ئەوێستاوە ببەستنەوە، ویڕای ڕێز و حورمەتم بۆ ئەوێستا، دیارە لە خۆڕاو بێ ئاکام تێدەکۆشن بڵێن مەبەست لە داری تووبا داری «گەئوکەرێنە»ی ئەوێستاییە. دەمارگرانە بێئەوەی پێوەندی نێوان خۆر و سیمورغ لێك دەنەوە خوێنەر و خوێندکاران بە هەڵەدا دەبەن. ئەمانە هەر ئەوانەنەن کە دەڵێن کوردی یەکێ لە لەهجەکانی فارسیە و نازانستیانە ئەوێستا و پەهلەویش وەکوو ڕێکەوەندی داتاشراوو هەڵەی «فارسی میانە» دەبەستن بە فارسیەوە. پیری ئیشراق پەڕتووکێکی فارسیتری هەیە بە ناوی «رسالة في حالة الطفولية». لەو پەرتووکەدا ئاشکرا بە جێگای داری تووبا دەڵێ خۆر «لاپەڕەکانی ۱۰۳ و ۱۰٤، ئاسار فارسی حضرت شیخ شهاب‌الدین سوهرەوەردی، بە تێکۆشانی فرشید اقبال»

مەبەستەتی سەرەکی سوهرەوەردی گیانی ڕێپێوی ڕێگای خودایە کە بە قۆناغی سێهەم گەیشتووە و تا ڕادەیەك تەکامولی کردووە کە بتوانی ڕەنگدانەوەی نووری خودا لە دڵیدا هەست بکات و وەك ئەویندار دەری خات).

بەڵام .... داری تووبا چیە و لە کوێیە؟ وتی داری تووبا مەزنە و لە بەهەشتدایە. هەر کەس بەهەشتی بوێت کە چووە بەهەشت دەی بینێت. لە نێوان ئەم یانزە کێوەدایە کە وتم. لەو میانە (لەو ناوەراستە) کێوێکە لەو کێوەدایە. (وتمان خۆر لە ئاسمانی ناوەڕاستی هەفت گەڕوکدایە هەروەها بە دوو ئاسمانی هەشتەم و نۆهەم و دوو نهۆمی یەکەم و دووهەم دیسانەوە دەبێ بە

ناوەڕاستی جیهان. جێگای تیشك و سەرچاوگەی ژیانە. هەم لە دینە کوردیەکان و هەم لە میهرپەرستی و هەم لە فەلسەفەی سوهرەوەردیدا سەمبولی بەهەشتی ڕاستەقینەیە.

جێگیر بوون لە ئەو جێگایە سۆفی و عارفەکان پێ دەڵێن «لیقائوڵڵا» واتە تێکەڵاو بوون لەگەڵ تەجەللای نوور و ڕەحمەتی حەق واتە مەلەکەتاوس لە دینە کوردیەکاندا. ئەوە کە دەڵێ کێوێکە لە «میانە» واتە ناوەراستی یازدە کێوی قافدا و مانگ تیشکی خۆی لەوە دەگرێ گۆمانی تێدا نامینی کە مەبەستی خۆرە و ئاسمانی چوارەمی گەڕۆکەکان و ئاسمانی شەشەمی گیهان کە بەهەشت لەوێدایە و مەبەستی جیهانی نووری خودابیە. دیارە کە خۆر سەمبول و تەمسیلە کە ئەگەر کەسێ بەو قۆناغە گەیشتبێ کە بتوانێ لە بەرانبەر نووری خوداییەوە قەرار بگرێ دەتوانێ تیشك گەلی خودایی هەست کات و پێ سەرمەست بێت. دیارە ئەو قۆناغگەلە کە دەبێ بیپێوی لە دڵ واتە دەروونی خۆتە وەدەست پێ دەکات و لە ئاکامدا بە خودا دەگەی نە ئەوەی بچیتە ناو خۆر. خۆر و ئاسمانەکانی دیکە سەمبولی سەرکەوتن و تەکامولی گیانن بو نزیك بوونەوە بە سەرچاوەگەلی بوون کە خودایە و لە توش جوێ نیە. بەهەشت لە فەلسەفەی سوهرەوەردی و لە دینە کوردیەکاندا بە وردی بە مانای قەرار گرتنە لە بەرانبەر تیشكگەلی ڕووحانی تیشکی تیشکاندا و هەست کردنی ئەوە. وتمان کە میهر یان میترا کە تەجەللای خودا بوو وەکوو سان سەهاك و شێخ ئادێ لە زەویدا دەرکەوت و پاش تەواو کردنی کارەکانی سەرکەوت بۆ ناو خۆر. تیشکی خۆر فەیەزان واتە ژیان و تیشك بەخشی بەردەوامی میترایە کە تەجەللای یەکەمی خودایە. ئەمە لەگەڵ میترای ئەوێستا جیاوازی هەرە زۆری هەیە. ئەوانەی کە نا زانستیانە دەیانەوێ دینە کوردیەکانیش ببەستن بە زەردەشتیەوە چەشنێ گێرە شێوینی بە شوناس و کەسایەتی ئۆلی و فەلسەفیگەلی کورد دەکەن. لە ئەوێستادا میترا تەجەللای خودا نیە بەڵکم خودا ئافراندوویە تا لە تەك ئافرێنراوەکانیتریدا لەگەڵ ئەهریمەن یان شەیتان شەڕ بکەن و ئەم شەڕە تا قیامەت «ڕیست ئاخێز»(٦) و شکستی شەیتان بەردەوامە. ئەمە لەگەڵ میترا واتە مەلەکە تاوسی ئاینە کوردیەکان جیاوازی هەرەزۆری هەیە.

تەجەللا لە دینە فینودالیەکاندا کفرە. هەندێکیتر بە چەشنێکیتر نازانستیانە «سپەندمینوو» یەکەم ئافرێنراوی زەردەشتی لەگەڵ میترادا بە یەك دەزانن و دەڵێن سپەند مینو، یەکەم سدووری خودایە بەڵام لە ئەوێستادا بە ڕوونی دیارە کە سپەندمینوو سدوور و تەجەللا نیەو ئافرێنراوی خودایە کە ئەویش وەکوو میترا بۆ شەڕ لەگەڵ ئەهریمەن دروست کراوە. میترا و سپەندمینوو لە

ئەوێستادا دوو کەسایەتی جیاوازن. لە میتراپەرستی و دینە کوردیەکاندا شەڕی خودا و ئەهریمەن واتە شەیتان بیواتا و پووچە. لە دینە کوردیەکاندا «مەزهەرییەت» واتە دەرکەوتن، تەجەللای زات یا سیفاتی خودا لە مرۆڤدا بنەمایە بەڵام ئەمە لە زەردەشتیدا کفرە. بە گشتی ئیلاهییاتی زەردەشتی نەك شەریعەتەکەی، لەگەڵ ئاینی جوو و ئیسلامدا جیاوازی زۆری نیە. یەك جیاوازی هەیە ئەویش ئەوەیە کە لە زەردەشتیدا دەسەڵاتی شەیتان زۆرە و بۆ خۆی ئافرێنراوی هەیە و لەگەڵ خودا و ئافرێنراوەکانیتریدا لە شەڕدایە. ئیتر جیاوازی ئەو تۆیان نیە.)

ئاوەزی سوور وتی: هەر میوەیێ کە تۆ لە دونیادا دەیبینی لەسەر ئەودارەیە و ئەم میوەگەلە کە لە لای تۆیە گشتی لە بەری ئەو دارەیە. ئەگەر ئەو دارە نەبوایە هەرگیز نە لە لای تو دار بوو نە میوە نە سەوزەڵاتی و نە گیا. (دیارە ئاماژە بە تیشکی خۆرەکە ژیانی لێ دەبارێ و بەوە دار و گیا دەگەشێن و میوە و دانەگەلیتر سەوز دەبن) وتم میوە و دار چ پێوەندیەکی بەوە هەیە؟ وتی سیمورغ(٧) هێلانەی لە سەر داری تووبایە. کازیوە لە هیلانەکەی دەفڕێ و پەڕ وپۆی بە سەر زەوەیدا دەکێشی و لەوە میوە بە دارەوە پەیدا دەبێ (سیمورغ کە لە ژماری تایبەتیدا ڕوون کراوە ئاماژەیە بە میترا یان مەلەکەتاوس کە لە خۆردایە. تیشکی خۆر کە پاش کازیوە بڵاو دەبێتەوە لە زەوی دەدات و میوەگەل بە دارەوە پێ دەگەن. هەر کەس لە بڕینی پلەگەلی ئاماژە پێکراو بە پێگەی ئاخر بگات گیانی لەگەڵ تەجەللای خودا کە مەلەکەتاوس یان بە وتەی پێش ئیسلام میترایە تێکەڵاو دەبێت. ئەگەر نەیتوانی بگات پاش مردن گیانی لە جەستەگەلێکتردا بە تەکامول درێژە دەدات. لە بیرو باوەڕی ئارییاییەکاندا گیان چەشنێ نوورە. کەوابوو «نووررولنەنوار» واتە تیشکی تیشکان ڕوحولنەرواح واتە «گیانی گیانان»یشە. ماموستا ڕەزی داری تووبای سوهرەوەردی بە داری «گوئوکەرێنە[٨]»ی زەردەشتی دەزانێ. نەختێ سەرنجی وردی گەرەکە تا بزانی «گەئوکەرێنە» و سیمورغ لەسەر ئەو دارە ئاماژە بە خۆر و میترا یان بە خۆر و مەلەکەتاوسە کە ئاینی زەردەشتی دوایین وەکوو دەیان یەکەیتر لە ئاینی میترایی گرتووە. هەرچەند گەئوکەرێنە لە ئەوێستادا هیچ پێوەندیەکی بە خۆرەوە نیە بەڵام تووبای سوهرەوەردی هەر خۆرە کە سەلمێندرا.
ب.ب ڕوون کراوەکەی ژمارە ٨)

بە پیرم وت بیستوومە کە سیمورغ «زاڵ»[٩]ی بارهێناو «ڕوستەم»[١٠]یش هەر بە یارمەتی سیمورغ «ئەسفەندیاری[١١]»کوشت. پیر وتی بەڵێ دروستە. تکایە (لە پێشدا زاڵ و ئەسفەندیار و سیمورغ لە ڕوونکراوەکاندا بخوێننەوە) وتم چۆن بوو؟ وتی: چون زاڵ لە دایك بوو مووی سپی بوو.

باوکی سام (پیَ عەیب بوو) وتی فڕێی دەنە دەرەوەی شار. دایکیشی زۆر لە زایینی ئەو کەوتبـووە ڕەنجەوە کە دی کوڕەکەی ناشیرین و موو سپییە ڕازی بوو. زاڵیـان خسـتە دەشـتەوە. زسـتان بـوو و سەرما وەها بوو کە کەس گومانی نەدەکرد زاڵ چەند ساتێ زیندوو بمێنێ. چەند ڕۆژێ تێپەڕ بـوو. دایکی زاڵ دڵی سووتاو بە خۆی وت بچمە سارا بەڵکوو کورەکە ببینم. کە چووبو سـارا کوڕەکـەی دی کە زیندووە و سیمورغ خستوویەتیە ژێر پەڕ و باڵی خۆی. زەردە خەنەی کـرد و خۆشـحاڵ بـوو. گرتیە باوش و شیری پێدا.

ویستی بێنێتیەوە بۆ ماڵ. دیسان وتی دەبێ بۆم ئاشکرابێ کە چۆن زیندوومـاوە زاڵی هەر لـەوێ لە ژێر پەڕی سیمورغدا بە جێ هیشت (نووسەر دەڵێ دایکـی دی کـە کوڕەکـەی لـە ژێـر پـەڕی سیمورغدایە. مەبەست لە پەڕی سیمورغ تیشکی هەتاو واتە گەرما و بەزەیی خودایە، چون هێشتا لە سیمورغ خەبەرێك نیە. دەڵێ هەر لەوێ کوڕەکەی لە ژێر پەڕی سیمورغدا بە جێ هێشـت. ئـیتر گۆمانی تێدا نیە کە مەبەست لە پەڕی سـیمورغ تیشـکی هـەتـاوە کـە تـەجـەللای ڕوونـاکی و میهرەبانی خودایە). لەو نزیکیگەلەدا خـۆی شـاردەوە تـا شـەو هـات و سـیمورغ لـەو دەشـتەدا پاشەکشەی کرد (تاریك بوو و تیشك و میهرەبانی هەتاو واتە تەجەللای خودا یان مەلەکە تاوسی دینە کوردیەکان ڕابورد) هەر تاریك بوو ئاسکێك هاتە سەر زاڵ و گوانی خستە دەمـی (نـووری خۆر تەواو بوو ئەمجارە نۆبەی ڕەنگدانەوەی تیشك و ڕەحمەتی خودایە لە مانگدا. لـە زمـانی کـۆنی کوردی واتە ئەوێستاییدا بە ئاژەڵی کاوێژکەری کیوی و مـاڵی بـە گشـتی دەڵـێن «گـەئـو» یـان «گائو». ئاوەڵناوی مـانگ لە ئەویستاییدا «گەئوچیثـرە»یە کە لە دەقی هەرە گرینگی پەهلـەوی واتە پـەرتووکی زەڕدەشـتی «بـوون دەهیشـن»دا وەکـوو «گـاو چـیترە» هـاتووە بـە ئـەوێسـتایی "گەئوچیثـرە وو مـاونگهە" بە کوردی دەبێتە «مـانگی گا چیهرە» واتە مـانگی «گارەگەز» مـانگێ کە بنەچەکەی لە گایە. گائو لە ئەوێستادا دوو مانای هەیە یـەکـەم بـە مـانـای گشـت ئـاژەڵـی کاوێژکەری کێوی و ماڵی و ئەویتر هەر بە مانای «گا» یە چیهرە ئەمڕۆ لە کوردی و فارسیدا بە ڕۆخسار دەگوترێ بەڵام مانای ڕاستەقینە کەی بنەچـەکـە و ڕەگـەزە. دیـارە مـەبەسـت لـە ئاسـك مانگەکە ڕەنگدانەوەی ڕەحم و بەزیی خودای تێدایە. جەماڵی حەق لـە خـۆرەوە تـەوا بـوو نۆبـەی جەلالی[١٢] حەقە کە لە تاریکیدا ڕەنگدەداتەوە. ئاماژەیە بە لایەنیتری ویست و گەلالـەی حـەق. قوولترین تاریکایی شەو «سەحەر»ە. سەحەر لە ئەدەبی عیرفـانی کـوردی و فارسـیدا بـە مـانـای ئەوەیە کە تاریکی بە دوا پلەی خۆی دەگات و پاشان نەختە نەختە ڕوون دەبێتەوە. ئـەو کاتـە لـە

کوردیدا پێ دەڵێن ئەنگوستەچاو. سەبارەت بە سەحەر شاعیرانی سۆفی و عاریفی کورد بەرهەمی جوانیان ئافراندووە لە ژمارەی تایبەت بە جەلالی حەقدا لە شیعرەکانی ماموستا بێسارانی و مەلای جزیری بۆ وێنە هاتووە.

پارێزگاری ئاسك (مانگ) لە شەودا لە زاڵ ئاماژەیە بە بەزیی خودا لە شەودا بەڵام ناڕاستەو خۆ. لە ڕۆژدا پەری سیمورغ واتە تیشك و بەزەیی خودا لە لایەن میتراوەو لە شەودا ئاسك (مانگ) ئەویش هەر تیشك و بەزەیی خودایە لە لایەن «ڕۆحولقودس»ەوە کە هەر میترایە لە هەینەتێکیتردا. سەبارەت بەوە کە نووری حەق هەر یەك نوورە بەڵام لە هەینەتگەلی جۆراوجۆردا شێخ مەحموودی شەبستەری «شەبستەر شارێکە لە ئازەربایجاندا ئیستا بە تورکی قسە دەکەن» عارف و شاعیری گەورەی فارسی وێژ لە سەدەی هەفتی کۆچیدا وا دەڵێ: «همه یك نور دان اشباح و ارواح + گهی زایینه پیدا گه زمصباح.

واتە گشت تیشکەکان بە یەك تیشك بزانە چ گیان بن چ تاپۆگەلی تاریکی هەر ئەو نوورەیە کاتێ لە ئاوێنەوە دەبینرێ و کاتێکیش لە چراوە. سوهرەوەردی کورد لە داڕشتنی فەلسەفەکەیدا بە توندی لە ژێر کاریگەرینایینی باوانی خۆی واتە کورد دایە ئەوەندە کە تەنانەت هەر لە سەمبول و ئاماژەکانیشدا لە ژێر کاریگەری فەرهەنگی ئۆلی گەلەکەیدا بووە. ئەحمەدی خانی پاش ئەویش بە کاری بردووە واتە تیشکی خۆر و مانگ یان ڕوحی خۆر (میترا) و ڕۆحی مانگ (هەیڤ یان هەئومە) کە پاش ئیسلام لە تەریقەتە سۆفیانەکاندا ناونراوە ڕۆحولقودس و ڕوحولئەمین بێئەوە ناوی بێنێ کەڵك زەردەگرێ بە وتەیەکیتر هەر سەمبول و ئاماژەگەلی میترایی پێش ئیسلام بە کار دەهێنێ. هەندێ لەو سەمبولگەلە ئەوەندە مێژینەن وەکوو میترا و هۆم کە هەڵ دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئارییاییەکان کە لەو سەردەمەدا ماد و فارس و هیندیەکان لە یەك جێگا پێکەوە ژیاون و زمان و نوستووڕە و بیرو باوەڕەکانیان یەکێ بووە. پاش کۆچی ئەم سێ هۆزە لە بەرهەمە ئۆلیەکانیاندا ڕەنگدانەوەی هەیە. جوانترین ڕەنگدانەوەی ئەمانە لە «ڕیگوێدا» بەشی هەرە کۆنی وێداکاندایە کە لە سەدەکانی ١٣٠٠ـ ١٥٠٠ی پێش زایین گوتراوە. پاشان حەزرەتی زەردەشت ئەمانەی وەکوو دێوپەرستی ڕەت کردەوە.

میهرپەرستەکان کە لە ڕۆژاوای ماد واتە کوردستاندا ئاینی میتراییان پێکهێنا هەر لەو نوستووڕەگەلە وەکوو نیشانە کەڵکیان وەرگرت. پاش پەرەسەندنی ئاینی میترا بە پێچەوانەی دەستووری زەردەشت، ئەو نوستووڕەگەلە بۆ لاوازکردنی ئاینی میترایی هێنرایە نێو ئەوێستاوە بەڵام

لایەنی دینی پێ درا نەك لایەنی عیرفانی و وەحدەتی وجوودییەك كە ئاینی میهرپەرستی بوویەتی. وتمان كە كوشتنی سۆما= مانگ لە لایەن میتراوە لە ڕێگویدا دا هەیە. پاش دروست بوونی ئاینی میترا لە ڕۆژاوای ماددا وەكوو قوربانی كردنی «گا» لە لایەنی میتراوە بوو بە ئاماژەی قوربانیبوونی ڕەنگدانەوەی خودا لە لایەن خوداوە، بو پەرەپێدان و درێژەی ژیان لە جیهاندا. لە بناغەدا ئاینی میهرپەرستی لەو ئوستوورگەلە وەكوو سەمبول كەڵكی وەرگرت بو داڕشتنی دینە تەوحیدیەكەیان. ئەم سەمبول و ئاماژەگەلە گەیشتنە پاش ئیسلام و دینە كوردیەكان و فەلسەفەی سوهرەوەردی هەر لەو ئاماژە و سەمبولگەلە كەڵكیان وەرگرت. داڕێژەرەكانی مەم و زینیش كەڵكیان لێ وەرگرت بۆ گەیشتنی مەم بە مەقامی مورشیدی كامیل كە لە كاتی مردندا دوو تیشكی زەرد و سپی لەسەری هەستا. مەلای جزیریش لە داڕشتنی شیعرە هەرە بەرزەكانیدا هەر لەو سەمبولگەلە كەڵك زەردەگرێ:

مەی هاتە فینجاناسەدەف، كەس دی وەخۆت ئیرۆبخەف

ساقی ب چەنگ و نای و دەف فەرفووریا مەهتابدا

پێشتر ئەم شیعرەمان لێكدایەوە. هەندێ شیعری جزیری و شاعیرگەلیتری كوردم هەڵبژاردووە كە لە ڕوونكردنەوەكاندا پیشوەدا پێشكەش دەكرێ. لە شرۆڤەی ئوستوورەی میترادا وتمان میترا مانگی كوشت و بارانی ژیان بەخشی ڕژانە سەرزەوی. لە ئاینی میترادا میترا گای قوربانی كرد و خوینی ڕژایە سەرزەوی. گا هەر مانگە و بارانیش بووە بە شەرابی ژیان بەخشی هۆم، هەئومە، هەیڤ ـ سەئومە ـ سۆما. هۆم لە ستایشتگاكانی میتراییدا دەخورایەوە ئاماژە بوو بە ڕەنگدانەوەی خۆر كە جێگای میترا یان مەلەكەتاوسە، لە مانگدا. ئەویش ئاماژەیە بە كاردانەوەی گیانی خودایی لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا. جامی مانگتژی لە تیشك دەبێت و نەختە نەختە خاڵی دەبێتەوە. ڕۆحی مانگ كە هەر ناوی هەئومە «هەیڤ» بەزەوی لە شەودا ژیان دەبەخشێ. ئاسكیش كە سەمبولی مانگە بە زاڵ ژیان دەبەخشێ. لە ستایشتگاگەلی میهرپەرستیدا باوەڕمەندی ئاینی میترایی جامی هۆمی لە دەس پیر (پیری موغان) دەستاند كە ئاماژە بوو بە كارتێكردنی مەقامی میهری لە دڵ و دەروونی قوتابی میهرپەرستدا. پاشان ئەم نەریتە میتراییە لە لایەن زەردەشتیە دواییینیەكان بە پێچەوانەی دەستوورەكانی حەزرەتی زەردەشت وەرگیرا و موغە زەردەشتیەكان، كازیوە لە هاوەندا گیای هۆمیان دەكوتا وتە خمیریان دەكرد و دەیان خواردەوە بەڵام نە بۆ ئەوەی كە لە خوداوە تەجەللا وەرگرن تەنیا بۆ ئەوە كە ئەم گیا لایان پیرۆز بوو. نووسەری

ئەم پەرتووکە بەو باوەڕە گەیشتووە کە هەر چەشنە باوەڕ بە تەجللای خودا لـە دنیـای مـاکیدا چ دینی وەکوو دینە کوردیەکان و هەندێ باوەڕگەلی مەسیحی، چ عیرفانی وەکوو عیرفانی ئیسلامی و جوو و مەسیحی و چ فەلسەفی وەکوو باوەڕگەلی «نوێ ئـەفلاتوونیـان» و قوتابخانەگـەلـی ژێـر کاریگەری ئەوە و دواییینیەکانی، گشت لە ژێر کارتێکردنی ئایینی میترایی کوردەکانە. بۆ پێوەندی نێوان مانگ و ئاژەڵگەلی کاریگەر بڕوانن بۆ گشت سەرچاوەگەلی ئەورووپایی و ئامریکایی ئایینی میترا هەروەها شرۆڤەی میهر یەشت و هـۆم یـەشت لـە پـەرتووکی، یشتها، ج ١ و ٢ اسـتاد ابراهیمپورداود هەروەها شرۆڤەی وتارەکانی «گوش اورون» و «میترا» لە «فرهنگ نامهای اوستا ـ استاد هاشم رضي»، لەم بەرهەمگەلەدا بە پێوەندی نێوان مانگ و ئـاژەڵ ئامـاژە کـراوە بـەڵام شرۆڤەی زانستی ئەوانە لاوازە.

ئەبوو رەیحانی بیرونی لە کتێبـی ئاسارولباقیەدا سەبارەت بە جەژنی میهرەگان کە باسمان کـرد دەڵێ «لەم ڕۆژەدا بوو کە «فەرەیدوون» یان لە شیر گرتووە. لەم ڕۆژەدا بوو کە فەرەیـدوون سـواری گایەك بوو. لە شەوی ئەم ڕۆژە لە ئاسماندا گایەك لە تیشك پەیدا دەبێ کە شـاخەکانی لـە زێـڕ و پێکانی لە زیوە و چـەرخی مـانگ دەکێشـێ. سـاتێ ئاشـکرا دەبـێ و پاشـان نـابینرێ...» ئـەم نووسراوەی بیرونی کە زۆرتر لە هەزار ساڵ لەمەو بەر نووسیویە دیسان پێوەندی ئاژەڵی کاریگـەر و مانگ دەردەخات ئایا ئەمە کە سوهرەوەردی بۆ نووسینی باوەڕگەلی تۆلی و فەلسەفی خـۆی لـە سەمبولگەلی هەرە کۆنی میترایی پێش ئیسلام کەڵك وەر دەگرێ بە هەڵکەوتە؟ ئایـا ئـەم بـاوەڕە کە مامۆستای پایەبەرزی ئێرانی «سەعید نەفیسـی» لـە کتێبـی «سەرچـاوەی تـەسـەووف لـە ئێران»دا دەری دەخات کە سەرچاوەی عیرفانی ئیسلامی ئـایینی بـوودایی هیندیـەکانـە نـابێ بـە گومانەوە بۆی بڕوانن و بۆ سەرچاوەی سۆفیگەری و عیرفانی ئیسلامی نابێ بە جێگای ئـەو پـەڕی ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژاوای ئێران واتە کوردستان کە ناوەندی میهرپەرستی لە چەند سـەدە پـێش زایـین بووە بڕوانن. ئایا ئایینی میترایی ئایینێکی ئیشراقی و عیرفانی لەسەر بناغەی تەجەللای خودا نیـە یا ئەمە کە توێژینەری ناوبراو سەبارەت بە باوەڕەکانی پێش ئیسلامی ناوچەگەلـی ڕۆژاوای ئێـران ئاگەدار نیە؟ یا وەکوو ئەوانەی کە توێژینیان لەسەر زمانی کوردی نیە و بە ئـارەوا ئـەوێستا بـە بەرهەمی ڕۆژهەڵاتی ئێران دەناسێنن چون زێدی زمانی فارسیە).

دایکی زاڵ هەستا ئاسکەکەی لەسەر کورەکەی لادا و کوڕی هێنایە ماڵەوە. لە پیرم پرسی ئـەوە چ ڕەمز و ڕازێك بوو؟ پیر وتی من ئەم حالەم لە سیمورغ پرسی. سیمورغ وتی زاڵ لە ژێر چاوەدێری

توویا (خۆر = میهر، میترا)دا هاتە دنیا. نەمانهێشت بمرێ. کارئاسکەکەمان خستە دەس ڕاوچی و خۆشەوێستی ئەو کوڕەمان خستە دڵی ئاسکەوە تا شەوانە ڕای دەهێنا و شیری دەدایە. منیش بە ڕۆژ دەمخستە ژێر پەڕی خۆمەوە (دیارە سیمورغ ئاماژەیە بە دوونی میترا لە زەویدا کە تەجەللای خودایە و ویست و بەڕیوەبەرێی خودا هەر ئەوە کە نەیهێشت زاڵ بمرێ و ڕۆحی مانگ واتە هۆم= مامز لە شەودا بوو بە پارێزەری)

وتم بە سەرهاتی ڕۆسەم[10] و ئەسفەندیار[11] چۆن بوو؟ وتی لە شەڕی ئەم دووانەدا ڕوسەم پەکی کەوت و (ئیوارە) بە زامدارییەکی زۆرەوە بۆ ماڵەوە چوو (تا ڕۆژی دواتر شەڕ دەس پێ بکەنەوە) باوکی زاڵ چوو بو لای سیمورغ (دیارە ئەم سیمورغە تەجەللای میترایە لە زەویدا وەکوو مورشیدی کامیل یان مەقامی میهری لە ستایشتگاکانی میهریدا. کەسێك بووە وەك زات میهمانەکانی کاکەیی خۆمان وەکوو باوە نائووس و باوە سەرهەنگ. سیمورغ هەم لە دەقە پەهلەویەکاندا و هەم لە ئەوێستادا ناوی مرۆڤیشە. وتمان مەقامی پیری موغان سیمورغیشی پێ گوتراوە واتە تەجەللای میترایان زاتی مەلەکەتاوسە لە زەوێدا). لە سیمورغ زۆر پاراوە (کە کوڕەکەی ڕۆسەم لە شەڕدا سەرکەوێ) لە سیمورغدا ئەو تایبەتمەندیە هەیە کە ئەگەر ئاوێنەیەك بگریتە بەرانبەرییەوە هەرکە بڕوانیتە ئاوێنەکە چاوت بۆ ماوەیەك نابینێت و بێبزە دەمێنیتەوە (دیارە سیمورغ تایبەتمەندی خۆری هەیە. سیمورغ وەکوو کەس دەبینی بەڵام لە بناغەدا خاوەنی تیشك و بەزەیی خۆرە). (بە وتەی سیمورغ) زاڵ جل و بەرگی شەڕی لە ئاسن دروست کرد و سەیقەلیاندا (تا وەکوو ئاوێنەی لێ هات) و کردیە بەر ڕۆسەم. (بەیانی لە مەیدانی شەڕدا) ڕۆسەمی نایە بەرانبەر سیمورغ (خۆر) و ئەسفەندیار پێویست بوو بێتە بەرانبەر ڕۆسەمەوە. چون نزیکەوە بوو تیشکی سیمورغ کەوتە ئاسنە ئاوێنەکە (ڕۆسەم بەرانبەر ڕۆژهەڵات، ڕاوەستا بوو میهرپەرستەکان ئەگەر لە ستایشتگا نەبوایەن ڕوو بە ڕۆژهەڵات ستایشتی خودایان دەکرد) تیشکی سیمورغ کەوتە چاوی ئەسفەندیار و چاوی وەکوو کوێری لێ هات. ئەسفەندیار وای دەزانی کە چاوی زامدار بووە و لە ئەسپ کەوتە خوارێ و بە دەست ڕۆسەم کوژرا. وەکوو شتێ ئەو دوو لەتە چێوەی گەز (داری گەز) دوو پەڕی سیمورغ بوو. (یان دو تیشکی نوورولئەنوار واتە تەجەللای خودا بوو کە ئەسفەندیاری کوێر کرد. ئەسفەندیار جەستەی لە کانزایەك بوو کە تیرکاری لێ نەدەکرد. لە شاهنامەی فیردەوسی کە بەرهەمێکی هەر گرینگی فارسیە هاتووە کە سیمورغ زالی مۆچیاری کرد کە تیرێ لە داری «گەز» کە دارێکە وەکوو دار قەزوانی خۆمان ببڕێتەوە و لە چاوی

ئەسفەندیار بدات. ئەسفەندیار تەنیا چاوی ئاسایی بوو و ڕۆسەم بەو تیرە چاوی ئەسفەندیاری پێکاو کوشتی. لە شاهنامەی کوردی کە بەشگەلێکی بە هۆنراوەی هەورامیە و بەشەکانی‌تری هێشتا لە مێشکی پیرە پیاوانی کوردستانە تا ئەم دواییانە کە هێشتا تلەویزیۆن نەبوو لە قاوەخانە و چایخانەکاندا دەگێڕدرانەوە، جیاوازیگەلێکی لەگەڵ شاهنامەی فیردەوسی هەیە لەوانە کوژرانی ڕۆسەم بە دەست ئەسفەندیارە. بە پێی شاهنامەی کوردی ڕۆسەم بە مۆچیاری سیمورغ قەلغانێك لە ئاسنی سەیقەڵدراو دروس دەکات لە بەرانبەر تیشکی خۆرەوە ئەسفەندیار کوێر دەکاو پاشان تیر دەدات لە چاوی و دەیکوژێ. بە ڕاستی داری گەز چیە کە لە شاهنامەی فارسیشدا هەیە. ئایا دروستە بڵێین دار قەزوان یان دار گەزویە؟ بە باوەڕی من گەز بە دابێژی کۆن «گەزە» کە بە قاعیدەی ئەویستایی دەبی بە گەزەنگهـ هەر ئەوەیە کە لە کوردیدا دەڵێن «گزنگ».

ئەم وشە لە فەرهەنگە کوردیەکاندا وەکوو هەمبانە بوورینەی هەژار و خاڵ و... بە مانای یەکەم تیشکی هەتاوە لە بەرە بەیاندا. هەروا کە بۆ نوێژ لە ئەوێستادا دوو وشە هەیە «نمە» و «نمەنگهـ». «نمە» هەورامیشە. دیارە گەز و گزنگ بە دابیژی ئەمرۆی کوردی یەك مانایان هەیە. لە کوردیدا وشەی «گزگی»یش مان هەیە کە بە مانای ئاوینەیە. وشەی «وزین» کە هەر لەو بناغەیە لە کوردیدا بە مانای هەڵهاتنی خۆرە.

ئیتر گومانی تێدا نیە کە ڕۆسەم و ئەسفەندیاری شاهنامەی فارسی ڕەنگدانەوەیەکی ناتەواوە لە چیرۆکی میهری ڕۆسەم و ئەسفەندیاری کوردی کە لە ژێر کاریگەرینایینی زەردەشتیدا وای لێ هاتووە. لە فەرهەنگە فارسیەکاندا «گەز» وەکوو چەشنە دارێك مانا کراوەتەوە.

کە وابوو پرسێکی گرینگ بۆ نووسەری ئەم پەرتووکە هاتۆتە پێشی ئەویش ئەوەیە کە ئایا چیرۆکی (ئاوەزی سووری سوهرەوەردی) وەکوو مەم و زین هێ پێش ئیسلام نیە کە لە نێو کوردانی میهرپەرستی سوهرەوەردا پارێزراوە و بەرهەمی فیکری ئەو نیە و ئەویش وەکوو ئەحمەدی خانی بە ئەمانەتەوە گێڕاویەتەوە بە فارسی زمانی نووسینی ئەو زەمانە؟ وتمان لە کاتی فەرمی و حکوومی بوونی زەردەشتی لە زەمانی ساسانیەکاندا میهرپەرستی بە توندی کەوتە ژێر گوشارەوە و ئەوانیش ناچار ماون بۆ دەربڕینی بیر و باوەڕی خۆیان لە نیشانە و ئاماژە کەڵك وەرگرن. بە باوەڕی من زۆربەی چیرۆکەکانی شاهنامەی کوردی و فارسی دروست کراوی میهرپەرستەکانی پێش ئیسلامە کە بەشێکی لە شاهنامەی فارسیدا زەردەشتی کراون. بە باوەڕی زۆربەی شاهنامە

ناسانی فارس چیرۆکی هەفت خوانی ڕۆسەم لە شاهنامەدا بناغەی عیرفانیـان هـەیـە مـن دەڵـێم بناغەی میهرپەرستیان هەیە. چون میهرپەرستان وەکوو دینە کوردیەکان لە چیرۆك کەڵکیـان وەر دەگرت. جیاوازیتری شاهنامەی فیردەوسی لەگەڵ شاهنامەی کوردیدا چـیرۆکی ڕۆسـەمـی کوڵـە دەسەکە لە شاهنامەی فارسیدا نیە. هەر وەهـا لـە شـاهنامەی کوردیـدا زەحـاك بـە دەس کـاوە دەکوژرێ بەڵام لە شاهنامەی فارسـی لـە ژێـر کاریگـەی ئـایینی زەردەشـتیدا زەحـاك بـە دەسـت فەرەیدوون لە چیای دەماوەندا بەند دەکرێ، تا ڕۆژی پەسـڵان لـە بەرانبـەر نـەجات دەری ئـاینی زەردەشتیدا وەکوو دەجاڵ دەردەکەوێ و پاشان دەکوژرێ...

وشەی گەز و گزینگم لە دەقە پەهلەوەیەکاندا نـەدی بـەڵام ئـەو دەقگـەلـە گشـت وشـەگەلـی پەهلەوی تێدا نیە. کوردی لە پەهلەوی زۆر نزیکە بەڵام گشت دەقە پەهلەویەکان جگە لـە چـەند بەرد نووسراوە، نووسراوەگەلی ئاینی زەردەشتین. چاو خشانێکیتر بە نووسراوەکـانی سـوهرەوەردیدا بە تەواوی دەری دەخات کە «گەز» هەر گزینگی کوردیە لەوێدا کە دەڵێ «وەکـوو شـتێ ئـەو دوو لەتە دار گەزە هەر دوو پەڕی سیمورغ بوو» واتە دوو تیشکی خۆر لە بەرەبەیاندا بوو. فـیردەوسـی شاهنامەکەی لە ڕووی دەقگەلێکی پەهلەوی نووسیوە کە ئەمڕۆ نەماون. لام وایە کە ئەو وشە لە پەهلەویدا وەکوو «گەز» و «گەزە» بووە کە ئێستا نەماوە. لـە فەرهـەنگـی پەهلـەوی بـەهرامی فەرەوشیشدا نەبوو.

جا داری گەز مەبەست داری نوورە کە سوهرەوەردی شـوبهاندوویە بـە «تووبـا» و سـەلمانـدمان مەبەستی لە داری تووبا خۆرە.

شاعیری عارفی فارسی وێژی ئازەربایجان شێخ مەحموودی شەبسـتەری (سـاڵمەرگ ٧٢٠ کوچـی مانگی) لە شیعرێکی سەبارەت بە سیمورغ باس دەکات ئەوەش بزانین کورد و ئـازەری هاوبـەشـی فەرهەنگیان زۆر پیکەوە هەیە هەرچەند ئەمڕۆ ئەوان بە تورکی قسە دەکەن. زمانی ئازەری پـێش تورکی زۆر زۆر بە کوردی بە تایبەت هەورامی تێکەڵاو لەگەڵ کرمانجیـدا لێـك چـوونی هـەیـە. شەبستەری دەفەرمێ:

| | |
|---|---|
| جناب قدس وحدت دیـر جـان اسـت | کـــه ســـیمورغ بقـــا را ئاشـیان اســت |
| جـهنـابی روحولقـودس یـەکیـەتـی | کە لەوەدا سیمورغی هەتا هەتـایی هیلانـەی |
| ز روح اللـه پیـدا گشـت اینکـار | کـــه از روح‌القـــدس ئامـــد پدیـــدار |

ئەم ڕۆحولقودوسە لە حەزرەتی عیساوە «کە لە فەلەکی خۆردایە» پەیدا بوو ئەو خۆی لە ڕوحولقودسەوە «کە لە مانگدایە» دەرخست.

هم از الله در پیش تو جا نیست        که از روح القدس در وی نشا نیست

لە خوداوە لە لای تو گیانێك هەیە کە ئەو گیانە نیشانێکی لە ڕۆحولقودس تێدایە.

اگر یابی خلاص از نفس ناسوت        در ایی در جناب قدس لاهوت

ئەگەر لە نەفسی ئەم دونیایە خەلاس بیت دەچیتە نزیکی روحولقودسی ئاسمانەوە

هر ئانکس کو مجرد چون ملك شد        چو روح الله بر چارم فلك شد

ئەو کەسە کە لە دونیا بڕا وەکوو فریشتەی لێ هات، وەکوو حەزرەتی عیسای ڕۆحولڵا دەچێتە فەلەکی چوارەمەوە «کە هی خۆرە» ئەم شیعرگەلە بە تەواوی میهرییە. ئەگەر بە جێگای عیسا، میترا و بە جێگای ڕوحولقودس، هۆم ـ هەئومە یان هەیڤدابنێین هیچ باسی تێدا نامێنێ. لەو شیعرەدا سیمورغی هەتا هەتایی تەجەللای خودایە لە خۆردا بە وتەی دینە کوردیەکان مەلەکەتاوس ڕەنگدانەوەی لە مانگدا وەکوو ڕوحولقودسە.

ڕوحولقودس لە حەزرەتی عیساوە پەیدا بوو کە وەکوو میترای کوردی عرووج دەکاتە ناو خۆر لە ئاسمانی چوارەمدا. شەبستەری ویستوویە مژارێکی میهری بە ڕەنگ و بۆی ئیسلامیەوە بگێڕێتەوە. لێکچوونگەلی فەرهەنگی کورد و ئازەری کارێکی گرینگ و ئاکادمیکە و دەبێ هەرچی زووتر بۆ دەرخستنی برایەتی ئەم دوو نەتەوە ئەنجام بدرێت.

سیمورغ چیە؟ ئەمڕۆ لە دینە کوردیەکاندا بە جێگای سیمورغ شای «شابازان» بە کار دەچێت. شاباز لەگەڵ هەڵۆ جیاوازی هەیە. پەلەوەرێکی ڕاوچی ژێر باڵ سپیە کە قورسایی لە نێو کیلۆ زۆرترە. لە بەهار و هاوین و پاییزدا لە چیاو پێدەشتەکانی کوردستاندا دەبینرێ. سیمورغ بە زمانی ئەویستایی «سەئێنە» لە کوردی ئەمڕۆدا بووە بە «شەهێن» و لە فارسیدا «شاهین» دەڵێن. لە پەهلەویدا «سێن مورڤ» «سێن + مورڤ». سێن پاشماوەی سەئێنەی ئەویستاییە. مورڤ بە مانای پەلەوەرە لە کوردیدی ئەمڕۆدا، مر، یان مەل لەگەڵ ئەوەی پەهلەویدا هاو بناغەن. سێن مورڤی پەهلەوی لە فارسیدا کراوە بە سیمورغ. ماموستا ڕەزی ناوبراو دەڵێ شەهێنی ئەمڕو هەر ئەو پەلەوەرەیە کە لە ئەوێستادا «وارەغنە»ی پێ دەڵێن.

سیمورغ وەك ئەوەی کە لە ئەوێستادایە وشەیەکی دواییینییە کە بە باوەڕی من لە میهرپەرستیەوە وەك زۆر شتی‌تر هاتۆتە نیو ئەوێستای دواییینیەوە. لە وێداکاندا وەکوو ئەوەی کە

لە ئەوێستادا تایبەتمەندیگەلی خۆی هەیە نابینرێ بەڵام لە زمانی سانسکریتدا وەکوو ئەوەی کە ماموستا ڕەزی لە «فرهنگ نامهای اوستا»دا هێناویە «سیێنا»یە کە لەگەڵ شەهێنی کوردی و شاهینی فارسی هاوبناغەن. لە ئاینی میترایی‌دا سیمورغ تەجەللای خودایە لە خۆردا کە لە جەستەی مرۆڤیشدا وەکوو دینە کوردیەکان دەردەکەوێ. لە ئەوێستادا سیمورغ هێلانەی لەسەر دارێکە بە ناوی «ویسپوو بەئێشە»، «ویسپە+وو+ بەئێشە» ویسپە یانێ گشت. وو، نیشانەی ئیزافەیە لە هەورامیش‌دا هەیە دەڵێن «دۆستوو منی» واتە دوستی من بەئێشە لە هەورامی و سنەیی‌دا دەڵێن پێشە بە مانای ناوکی میوەگەلە. ویسپوو بەئێشە بە مانای دارێکە کە تووی هەرچی داریە تێدایە. لە زەردەشتی‌دا خۆر، نیە بەڵام لە میهرپەرستی و فەلسەفەی سوهرەوەردی کورددا داری تووبا ئاماژە بە خۆرە. بە ئاشکرایی دیارە کە لە میهرپەرستیەوە موسادیرە کراوە و لایەنە میهریەکەی لێ قرتێندراوە. لە شاهنامەی فیردەوسیدا هێلانەی سیمورغ لە کێوی ئەلبورزدایە. لە ئەوێستادا ئەم چیا ناوی «هەرا بەرزە»یە کە چیایەکی ئوستوورەییە و ئەمڕۆ بە زنجیرە چیای باکووری ئێران دەڵێن. لە شاهنامەی فیردەوسیدا ئەم چیا لە هیندوستاندایە. وتمان سیمورغ لە ئاینی میهری‌دا نیشانەی تەجەللای خودایە لە جەستەی مرۆڤدا. ئەمە لە ئاینی زەردەشتی و ئیسلامدا وەکوو کفرە بەڵام لە عیرفانی ئیسلامیدا کە لە عیرفانی میهرپەرستی گیراوە وەکوو قوتب هەیە کە پیری گەورەی ئیرشادە و کەراماتی هەیە. کەرامات هەر ئەوەیە کە لە دیندا پێ دەڵێن موعجیزە.

ماموستا ڕەزی لە خوێندنی شاهنامەی فیردەوسی و ئەوێستادا بەو ئاکامە گەیشتووە کە «سیمورغ پیاوێکی زانا بووە کە زاڵی ڕاهێناوە و زمانی پێ فێر کردووە» دەزانین ناوی زاڵ و ڕۆسەم لە ئەوێستادا نیە. لە شاهنامەی فیردەوسیدا سیمورغ وەکوو پەلەوەریکە. پەلەوەری ئاسایی چون دەتوانێ مرۆڤ ڕاهێنێ و زمانی پێ فێرکات و بە چارەسازی ئەو ڕۆسەم کوڕی زاڵ، ئەسفەندیار بکوژێ؟ پیاوی زانایش نیە. دیارە تێکەڵاوی زەردەشتی دواییەنی سەبارەت بە سیمورغ زۆرە. هاتوون ئەو چیرۆکە میهریە بکەن بە چیرۆکێکی زەردەشتی بەڵام سوهرەوەردی هەزار ساڵ لەمەو پێش بنەمای ئەو کارە چەوتەی تێکداوە و ڕاستیەکەی گێڕاوەتەوە. دیارە وەك وتمان لە شاهنامەی کوردیدا هەر وایە. ئەگەر سیمورغ پەلەوەرێکی ئوستوورەییە،[١٣] میهرپەرستگەل وەکوو دەیان ئوستوورەیتر کردوویانە بە چیرۆك بۆ مەبەستی ئۆلی خۆیان. پاشان وەکوو دەیان یەکەیتر لە میهرپەرستیەوە هێنراوەتە نێو ئەوێستای دواییەنییەوە.

سیمورغی شاهنامه دەکوژرێ بەڵام سیمورغی میهرپەرستی وەك ئەو شیعرەی شەبستەری کە دیمان و وەکوو و چیرۆکەکەی سوهرەوەردی هەتا هەتاییە و لە خۆردایە و لە جەستەی هەندێ مرۆڤ وەك لە دینە کوردیەکاندا شێخ عەدیّ یان شێخ ئادی و سەهاکدا دەردەکەوێ. عەتتار شاعیر و عارفی ئێرانی سەدەی شەش و هەفتی کۆچی چیروکێکی عیرفانی بە هۆنراوەی هەیە بە ناوی «مەنتیقوتتەیر» لەوەدا دەڵێ گشت پەلەوەرگەل کۆبوونەوە تا گەورەی خۆیان کە سیمورغو و لە کێوی قافدایە پەیدا کەن. شانەبەسەریان کردە سەرۆکی خۆیان. دەبوا هەفت سارای سەخت بپێون تا لە ئاکامدا بە سیمورغ بگەن. لە بڕینی هەر سارایەکدا زۆری لە پەلەوەرگەل مانەوە و نەیانتوانی پیش بچن تا لە سارای ئاخردا کە پێ دەڵێن «فەنافیللا» بە شانەبەسەرەوە تەنیا سی پەلەوەر مانەوە. لە شانەبەسەریان پرسی ئەوە بە سەختی زۆر هەفت سارا پێورا ئەدی کوا سیمورغ؟ شانە بە سەر وتی خۆمان بژمێرین کە ژماردیان سی بوون. مورغ بە فارسی بە مانای پەلەوەرە. سی مورغ بە فارسی ئەمرۆ بە مانای سیّ پەلەوەرە واتە خۆیان سیمورغ بوون یان پاش بڕینی ئەو هەفت قۆناغە بە مەقامی سیمورغ کە تێکەڵاوی لەگەڵ نووری خودادایە گەیشتن. دەبێ ئەوەش بزانین کە عیرفانی ئیسلامی چ بە فارسی نووسرابێ یان عەرەبی یان کوردی یان تورکی و هەروەها تا ۹۰ لەسەدی ئاینی مەسیحی پاشماوەی ئاینی میترابیە. لە شاهنامەی فیردەوسی‌دا چیرۆگگەلێك هەن کە بە تەواوی میهر دینیە کە هەندێکی زیاد کراوەی زەردەشتی تێدایە. بنەمای ئەم چیرۆکگەلە ئوستوورەگەلی کۆنی ئارییایە کە میهرپەرستەکان بۆ مەبەستی ئۆلی خۆیان گۆڕیویانە. هەفت خوانی ئەسفەندیار لاسایی کردنەوەیەکی ناشارەزایانە لە هەفت خوانی ڕۆسەم کە هەڵگری باوەڕگەلی میترابیە و ڕۆسەم لە خوانی هەفتەمدا دێو سپی کە ئاماژەیە بە نەفسی ئامارە دەکوژێ و بە قۆناغی دەرك و هەستی تەجەللای نوورولنەنوار دەگات. لە شاهنامەدا سیمورغ پەلەوەرە و فیردەوسی بە هەڵەدا نەچووە و لە بناغەدا زاڵ و سیمورغ و ڕۆسەم چیرۆکگەلی سەمبولیکن نەك ڕەوتگەلێکی ڕاستەقینەی مێژوویی. جەمشید و زەحاك و فەرەیدوون ئوستوورەگەلی هەرە کۆنی ئارییایین کە پاش بەدیهاتنی ئاینی میترایی لە ڕۆژاوای ئێراندا بوون بە پادشاگەلێك کە هەڵگری باوەڕگەلی میترایین. جەمشید لە ئەوێستادا هەیە بەڵام خاوەنی «جام»ە ناودارەکەی نیە واتە دۆخی عیرفانی و میهریەکەی لێ سەندراوەتەوە. زەحاك هەیە، بەڵام وەکوو شایەکی دوومار لەسەر شان کەمیشکی لاوان دەداتەدە دەرخواردی مارەکانی لە ئەوێستادا نیە. دیارە ئەم چیرۆکگەلە هەڵگری باوەڕگەلی میهرین. ڕۆسەم پالەوانی ئێرانی «سەکز»ی و کارەکانی

له شاهنامەدا بە تەواوی میهریە. ناوی ڕۆسەم و باوکی ئەو زاڵ لە ئەوێستادا نیە ئەمە بۆ ئەوە نیە کە تەنیا ئەسفەندیار پەرە پێ دەری ئاینی زەردەشتیە و ڕۆسەم میهرپەرست بووە، ئەو جۆرە کە هەندێ توێژینەری فارسی نووسیویانە، بەڵکوو بۆ ئەوەیە کە بە سەرهاتەکەی بە تەواوی میهر دینییە. چیرۆکی درێژی «ئەسکەندەرنامە» کە ئەسکەندەری وێرانکەر و ڕوو خێنەری پادشایی هیخامەنشی دەبێ بە پادشایەك کە پشتیوانی خودای هەیە و بە شوێن ئاوی ژیاندا دەچێتە تاریکاییەوە و کوورەی هەتا و دەگرێ و... چیرۆکێکی میهرپەرستیە کە لە ڕێژ کارتێکردنی ئاینی ئیسلامیدا بە جێگای ئەوە کە تەجەللای خودا بێت کراوە بە پێغەمبەری نامورسەل. مێژوونووسەکانی پاش ئیسلام کردوویانە بە برای داریووشی سێهەم ئاخر شای هیخامەنشی کە بە دەست ئەسکەندەر لە ناو چوو. ئەم پیاوە دژ بە ئێرانە بۆ وا بەرێزکرا؟ پێش ئیسلام بۆ ئەوە میهرپەرستەکان لە ئازاری زەردەشتیەکان بە دوور بن بەرهەمەکانیان لە کوردستاندا بە سوریانی و لە ڕۆم و ئەوروپادا بە یۆنانی کە زمانی زانستی ئەو سەردەمە بوو دەنووسی. ئەسکەندەرنامە دیارە لە زەمانی ساسانیەکاندا بەربەند بوو و ئەسکەندەر وەکوو «گوجەستەك» واتە مەلعوون نازناوی پێدرا بوو. پاش ئیسلام کە گوشاری ساسانیەکان و زەردەشتیەکان نەما ئەسکەندەرنامە لە زمانی سوریانیەوە وەرگێردراوە سەر زمانی فارسی. نیزامی شاعیری کوردی فارسیوێژ لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا بە سەرهاتە میهر دینیەکەی کرد بە هۆنراوەی فارسی. دیارە میهر دینەکان کە دژبەریان لەگەڵ زەردەشتیەکاندا بوو ئەسکەندەریان بە پیرۆزناساند و لە تەجەللاکانی خودایان زانی. بە هەر حاڵ دەبێ بزانین خزر و ئەسکەندەر و زولەمات (تاریکایی) و ئاوی ژیان و... سەمبولگەلێکن بۆ دەربڕینی ئاینی میهرپەرستی. بە تەواوی روونە کە چیرۆکی خزر و ئەسکەندەر و ئاوی ژیان چیرۆکێکی میهر دینیە. میهر دینەکان لە ئوستوورەی سامی خزر و ئەلیاس کە لە ناوسامی زمانەکاندا بووە کەڵکیان وەرگرتووە بۆ دەربڕینی باوەڕی خۆیان. ئەم کاریشیانە لە ئەوروپادا کردووە. لە یۆناندا هیلیۆسی خودای یۆنانی بووە بە دوستی میترا و وەك بنیامینی کاکەیی لێهاتووە. دوو دەلیلم هەیە کە دەیسەلمێنی ئەسکەندەرنامە ناو میهردینەکاندا بەتایبەت لە کوردستاندا بەدی هاتووە:

١ـ هەروا کە میهر دینەکان لە ئوستوورەی خزر و ئەلیاس چیرۆکی میهری خزر و تاریکی و ئاوی ژیان و لە تاوس و ئادەم و حەوا مەلەکەتاوسیان دروست کردووە یان لە ڕۆمدا لە ئوستوورەی هیلیۆس شتێ وەکوو بنیامینی کاکەیی دروس کراوە لە بە سەرهاتی ئەسکەندەر کە لای

ئەوروپاییەکانەوە زۆر بەڕێز بووە کەڵکیان وەرگرتووە و ئەسکەندەریان وەکوو «زات میهمان»ی کاکەیی ناساندووە و ئەسکەندەرنامەی لێ بەدیهاتووە.

٢ـ دژبەرینایینی زەردەشتی زەمانی ساسانیەکان لەگەڵ میهردینی کە بووە هۆی دوو شەڕی گەورەی «ئەردەشێر»ی یەکەم شای ساسانی لەگەڵ کوردەکاندا کە لە بەشی تاخردا باسی دەکەن. پاش ئەو دوو شەڕە کە لە شەڕی دووهەمدا کوردەکان بە سەرۆکایەتی «کوردانشای مادی» تێك دەشکێن ڕاوە دوونانی میهرپەرستەگەل لە زەمانی شاپوور کوڕی ئەردەشێریشدا درێژەی هەبوو و ئەم کارە تا تاخری حکوومەتی چوارسەد سالەی ساسانی درێژەی هەبوو. دیارە میهرپەرستگەلیش بێکار دانەنیشتوون ئەوەی کە دوژمنایەتی لەگەڵ پارسە کۆنەکان بووە وەکوو بەڕێز و هەنار دراوی خودا لەوانە ئەسکەندەر ڕێزی لێ گیراوە. لە ئایینی کاکەییدا ئەسکەندەر وەکوو تەجەللای خودایە.

ئەو شار میلات ئەو شار میلات بارگەی شام وستەن ئەو شاز میلات
شام ئەسکەندەر بێ «کید»ش کەرد ئاوش زەرد نەجام چوار تەن وە نیشات

پێش مەسیحیەت میهردینی لە ناو سوریانی زمانەکاندا کە پاشماوەی ئەو زمانە ئەمڕۆ وەکوو ئاسووری و ئاشووری ناسراوە پەرەی سەندبوو. چەند ستایشتگای میهری لە شام دوزراونەتەوە بەلام خەڵکی شام و ئێراقیش لە ئەسکەندەر زیانی زۆریان دی و ڕێز لە ئەسکەندەر گرتن بێهۆ بووە. جا دیارە چیرۆکی ئەسکەندەرنامە ناو میهردینەکانی ماد بەتایبەت لە کوردستاندا بەدیهات. چیرۆکی ئەسکەندەرنامە بە تەواوی لە لایەن نیزامیەوە کە کوردە بوو بۆ یەکەم جار لە سەدەی شەشی کۆچیدا کرا بە هۆنراوە. لەم شتانە کە وتمان ئەم ئاکامە بە دەست دێت کە سیمورغ بە وتەی مامۆستا ڕەزی کە دەڵێ «پیاوێکی زانا بووە» هەڵەیە. سیمورغ نیشانە و نوێنەری تەجەللای میترایە. میترا یان بە وتەی سوهرەوەردی نوورولئەنوار لە جەستەی مرۆڤی کامیل یان پیرە، کە بوونی ئەو ناوەندی تیشکی خودایە لە زەویدا. ئەو زاڵی جۆرێ ڕاهێنا کە دڵ و دەروونی ببێتە جێگای ڕەنگدانەوەی نوورولئەنوار. زاڵ پەڕی سیمورغی لە لا بوو واتە تیشك و بەزەیی خودا لە جەستەیدا بوو کە لە هەڵوێست و کارەکانیدا بەهرەی لێ دەگرت. جگە لەوە هەروا کە سوهرەوەردی دەڵێ، زاڵ نەزەرکەردەی خۆر، هەڵگری تیشکەکانی نوورولئەنوار بوو. لە ئایینی کاکەییدا پیر یادگار بە ناز ناوی یاری زەردەبام هەڵگری نووری خۆرە لە مانگدا.

ئیتر وەك مامۆستا ڕەزی خۆماندوو کردنی ناوێ تا بیسەلمێنن سیمورغ پەلەوەر نەبووە و پیاوێکی زانای ڕاهێنەری زاڵ بووە. زاڵ و سیمورغ چیرۆکێکی میهردینیە بۆ ناساندنی باوەڕگەلی میهردینی.

ئەگەر پیاوێك بە ناوی سەئینە پەرە پێدەری ئاینی زەردەشتیش بووە نابێ لەگەڵ سیمورغ و زاڵی میهردینی تێکەڵاو بکرێت. لە میهردینیدا زاڵ و سیمورغ و بەکر و مەم و زین و... کەسایەتی گەلێکی ڕاستەقینەی مێژوویی نین بەڵکوو ئاکتەرگەلێکی سەمبولیکن بۆ دەربڕینی بیرو باوەڕ. دوو پاتی کەینەوە کە سیمورغ بە بوونەوەرێك گوتراوە کە تەجەللای خودا لە جەستەیدا بووە و توانیویە هەم لە جەستەی مرۆڤدا بێت و هەم بتوانێ لە هەموو جێگایەکدا حازر و خاوەن کەرامات بێت ئەم حازر بوونە بە فڕین شوبهێنراوە. فڕین لە ئەدەبی، فارسی و کوردیدا بە مانای ڕزگار بوون لە جیهانی مادی و ئاواتگەلی نەفسانیە. مەقامی سیمورغ ئاخرین پلە و پێگەی میهردینیە کە مەقامی «میهر»یشی پێ گوتراوە.

**پلە و پێگەکانی تەکامول لە ستایشتگاگەلی میهردینیدا ئەمانەن:**

١ـ پلەی قالاو (هەر ئەوەیە کە پاش ئیسلام لە ئەدەبی کوردی و فارسیدا «موغ بەچە»ی پێ گۆتراوە کە باسمان کرد. ٢ـ پلەی شاراوە. ٣ـ پلەی سەرباز. ٤ـ پلەی شێر ٥ـ پلەی پارسی ٦ـ پلەی خۆر ٧ـ پلەی پیتەر ـ پەتەر = پاپا= پەتەری پەتەران = سیمورغ= پلەی میهری. پەتەر و پاپا لە لایەن مەسیحیەکانەوە لاسایی کراوەتەوە. لە عیرفاندا پاش بڕینی هەفت پلە مرۆڤ بە پێگەی «فەنافیللا» دەگات کە ناو نراوە پیر. هەروا کە ماموستا ڕەزیش گوتوویە «ل ١٢٦ بەرهەمی ناوبراو، بە پیر، «هەڵۆ»یش دەڵێن». دیارە هەڵۆ هەر سیمورغی میهر دینیە. ئەوەش زیادکەین نابێ عیرفان و سۆفیگەری ڕاستەقینە بە شێخ و شێخبازی و گۆشەنشینی و دووری لە دونیا بزانین ئەمە باسێکی دوورو درێژە کە لێرەدا ناگونجێ.

سیمورغ لە ئەدەبی کاکەییدا وەکوو «شاهی شابازان» هاتووە: .... شاه شابازان وە خەیرش کێشۆ...

باسێکی‌ترمان سەبارەت بە سیمورغ هەیە کە بێئەوە شرۆڤەی چیرۆکی ئاوەزی سوور ناتەواوە. هەرچەند درێژەی هەیە بە داوای لێ بووردنەوە لە خوێنەرانی بەڕێز تیدەکۆشم کورتی کەمەوە:

هۆم یان هەئومە یان هەیڤ کە وتمان گیای مانگە لە پێشدا لە خودایانی ئاریایی بووە. بۆ ئەوەیە لە کوردی زازادا هێشتا بە خودا هوما و هووما دەڵێن. لە کرمانجیدا بە مانگ هەیڤ دەگوترێ. مانگ پەرستی کۆن کە ئاینی میترایی بۆ دەبڕینی تاکپەرستی خۆی کەلکی لێ وەرگرتووە هاتۆتە نیو ئەوێستای دواینییەوە و ستایشتی کراوە. بەڵام نە وەکوو ڕەنگدانەوەی

تەجەللای خودا. وتمان خواردنەوەی جامی هۆم لە دەس پیری موغان ئامـاژە بـووە بـۆ خواردنـەوەی تیشکی نوورولئەنوار. جامی جەم کە لە ئەدەبی عیرفانی کوردی و فارسیدا هەیە لە پێش‌دا خۆر و مـانگ بووە. دەزانین جەم یان جەمشێد لە پێشدا خودای خۆر بووە. جەمشێد جامی مـانگی پـڕ لـە نوور دەکرد و دەیڕژاندە سەر زەوی. لەگەڵ ئەو تیشکەدا توخمی گیا و گیانلەبەر هاتۆتە سەرزەوی و ژیان پێکهاتووە. جامی هۆم لە ئەدەبی عیرفانی ئەمڕۆدا بووە بە «جامی مەی». پیر یان مورشیدی کامیل یان قوتب کە هەر مەقامی سیمورغە لە ئەدەبی عیرفانی‌دا وەکوو پیری موغان یان سـاقی لێهاتووە. پیر یان ساقی بەو جامە گیانی مرۆڤ جەلا دەدات و تیشکی ژیان بەخشی خـودا دەکاتـە جەستەی مرۆڤەوە. مەلای جزیری دەفەرمێ:

میسلی مەهی نەوگەرتو دڤـێتن مـەبـینی          مێزە بکە جامێ تو دبینی چ کـەسـم ئـەز

واتە ئەگەر تۆ دەتەوێ وەکوو مانگی یەکشەوە من ببینی ـ تەماشای پیاڵـەی مـەی بکـە ئـەو سادەبینی من کێم و بە چ پلەو پایەیێك گەیشتووم.

ئەوە کە مانگ ناوەندی ژیان بەخشیە هەم لە ڕیگوێدا و هـەم لـە هـەنـدێ دەقـە پەهلـەویـە زەردەشتیەکاندا هاتووە. ئەم ئوستوورە لە ئایینی میهری و دینە کوردیەکان و پاشـان لـە ئـەدەبـی سۆفیگەری و عیرفانی‌دا کەڵکی لێ وەرگیراوە، بۆ دەربڕینی نیاز بە مورشـیدی کامیلـە. بـێ ئـەو گەیشتن بە نوورولئەنوار مومکین نیە، مەگەر وەکوو زاڵ نەزەزکەردەی خودا بێت. هەروا کە مانگ لە تاریکی‌دا جێگای تەجەللای خۆرە لە زەویش‌دا دەبێ کەسێك هەبێ لە مەقـامی سـیمورغ یـان مورشید کە تەجەللای خودایە لە زەویدا ڕێنوێنیت کات. سیمورغ ئەو کەسەیە.

ئەگەر «جام»ی سیمورغ واتە جەستە یان لە ئەدەبی کاکەیی‌دا «جامە»ی مرد دەچێتەوە ناو خۆر هەروا کە لە خۆرەوە سیمورغ دێتە خـوارەوە دەچـێتە جەسـتەیـەکـی‌تـرەوە. جـا خـۆر و مـانگ و ڕەنگدانەوەی تیشکی خۆر ئاماژەیە بە نوورولئەنوار و سیمورغ، وتمان تیشکی مانگ هەر تیشـکی خۆرە. میترا کە گای قوربانی کرد لە ڕاستیدا خۆی قوربانی کرد)

**بە داوای لێ بووردنەوە بگەڕێینەوە سەر ئاوەزی سوور:**

لە پیرم پرسی لە جیهاندا هەر ئەو یەك سیمورغە بوو؟ وتی ئەو کەسەی نەزانێ وای تێـدەگـات بەڵام لە هەر زەمـانێك‌دا لە داری تووباوە سیمورغێك دێتە خـوارەوە و ئـەوەی کـە لـە زەوی‌دا بـوو نامێنی هەر وا بۆی بڕۆ. ئەگەر لەو کاتانەدا سیمورغێك نەیەت ئەوەی هەیە لـە زەویـدا نـامێنی. (مەبەستی سوهرەوەردی ئەختێکی لەسەرەوە باسمان کرد. مەبەستی «وەلی» مینۆکیە نە سـەرۆکی

سیاسی. ئەو دەڵێ لە هەر دەورە و زەمانێکدا لە سەر زەوی یەکێ بۆ ڕێنـوێنی دەروون و هـەستی مرۆڤ هەیە. هەروا کە ئەگەر نووری خۆر نەمێنێ ژیان نامێنی ئەگـەر سـیمورغیش نـەبێ ژیـانی دینی و دەروونی مـرۆڤ تێکـدەشـیوێ. ئەگـەر سـیمورغێك بمـرێ گیـانی دەچـیتە نـاوخۆر و لـە جەستەیەکیتر لە زەویدا سیمورغێك پەیدا دەبێ واتە هیچ کات بـەخشـینی هـەمیشـەیی خـودا نابڕێتەوە چ بەخشینی ماکی چ مینۆکی. ئەگەر بۆ چرکەیەك بەزەیی و بەخشـینی خـودا نـەمێنێ هەموو شتێك لە نێو دەچێ.

مەلای جزیری دەفەرمێ:

حووسنی زاتی بوت ولاتان، ژ جەمالا سەمەدە ـ ژمیسالی سەنەمێ وەهکوو تەجەللایە سەمەد.

ئەو جوانیە کە لە ناخی بت و «لات»دایە لە جوانی خوداوە سەرچاوە دەگـرێ و بـەردەوام وەکـوو سەنەم و سەمەد واتە بت و خودا، سەنەم لە سەمەد جوانی زەردەگرێ یان بەردەوام خودا لە جوانی بتدا خۆی دەردەخات ئەوەیە کە بت ئەوەندە جوانە.

«کل یوم، هوفی شأن» نەبی غافل ژێ ـ هەر پەیاپەی ژشنوونان دگرت فەیز و مەدەد.

هەر ڕۆژو سات لە هەر دۆخیکدا لە بیرنەکەی چون پەتیا پەتیا لە دۆخگەلی جۆراوجۆرەوە فەیـز و یارمەتی دەگات).

هەروەها کە سیمورغ دێتە سەر زەوی دەچیتە «دوانزە کارگا»یش. (سیمورغ بە مانای تەجـەللای نورولئەنوار لە خۆردا وەکوو نوور و گەرمای ژیان بەخش دێتە زەوی و لە ئاسماندا بە دوانزە بورجی جەغزی مەنتیقەتولبرووجدا دەگەڕێ. وتمان سیمورغ یان وەکوو تیشك و گەرما بۆ زەوی و بورجەکان دەڕوا یان لە جەستەی مرۆڤێکدا وەکوو وەلی و قوتب و ... دەردەکەوێ).

وتم ئەی پیر ئەم دوانزە کارگا چیە؟ وتی بزانە کە پادشای ئێمە (نورولئەنوار) چون ویسـتی کـە موڵکی خۆی ئاوەدان کاتەوە لە پێشدا وڵاتی ئێمەی ئاوەدان کردەوە (واتە جگە لـە ئاسمـانی ئـاخر کە جێگای نورولئەنوارە ئاسمانی هەشتەمی درووس کرد کە جێگای ئەستێرەگەلی وەستاو و دوانزە بورجەکەیە. لە دینە سامیەکاندا ئاسمان حەوت نهۆمە و ئاسمانی هەفتەم و لـە هـەندێ فیرقـەدا هەشتەم عەرشی خودایە. لە میهرپەرستیدا ئاسمانەکان نۆیە،کە بـە دوونهـۆمی نێـوان مـانگ و زەویەوە دەبێ بە یانزە. بەڕاستی بۆ کراوە بە یانزە؟ ئاسمـانی یانزەهـەم ئاسمـانی نوورلئـەنـوارە. بـۆ چوونی من ئەوەیە کە نوورلئەنوار وەستاو و موتلەق نیە. بەڵکم هەمیشە لـە بـەخشـیندایـە. جـا ئەمە بۆ مەقامی خودایی ناگۆنجێ دروستە کە خالقی گشتە. خالقی جوانی و ئەوین و گیانە بەڵام

جیاوازی زۆری لەگەڵ مەخلوقەکاندا نیە. نوورلنەنوار لە چەشنی تیشک و گیانە. ئافرینراوەکانیش هەر لەو چەشنەن جا ئەو شتەی کە سوهرەوەردی دەری نەبریوە و هێشتوویە خوێنەر پەی پێ بەرێ قۆناغی دوانزەهەم مەقامی موتلەقی بیزەمان و بیمەکانی خوداییە. چون موتلەق و بیزەمان و بیمەکانە ناتوانین بڵێین، ئاسمانی دوانزەهەم. سەبارەت بەو ناتوانرێ هیچ قسەیەك بکرێ چون لە هزر و هەستدا ناگونجێ. نوورولنەنواری سوهرەوەردی یان میترا یان مەلەکە تاوس و خاوەندگاری دینە کوردیەکان یەکەم تەجەللای ئەوە. ئافراندن نوورلنەنوار دەیکات. لە سەرەوە بۆ خوار تیشك دەنێرێ. لەم تیشکگەلە ئاسمانەکان و زەوی و ژیان پێك دێت. زەویش هەر تیشکە بەڵام بە وتەی سوهرەوەردی تیشکی کەسیف یان مادەیان بەرزەخ. دەڵێ تیشك هەرچی لە ناوەندی دوورتر کەوێتەوە لاوازتر دەبێت. لە لاوازیدا نیازمەند دەبێت لە نیازدا دەس دەکەنە لێکدران. لەو لێکدرانەی تیشکگەلی لاواز مادە پێك دێت. جا تیشك هەرچی لەسەرتر واتە بە ئاسمانی نۆ نزیکتر بێت بەهێزتر و خاوێنترە. ئاسمانی نۆهەم نابینرێت چون تیشکی جەوهەریە. تیشك لە نوورولنەنوارەوە ڕێ دەکەوێت و بەرەوخوارتر دێت. لە خوارترەوە لێکدرانی تیشك بەدیدێت مانگ و زەوی درووس دەبێت. توزقاڵەی تیشك لەسەرەوە تا خوار درێژەی نوورولنەنوارە. جا لێرەدا ئافراندن لە فەلسەفەی سوهرەوەردی و لە دینە کوردیەکاندا تایبەتمەندی خۆی هەیە. ئافراندن لە دین و فەلسەفەی کونی کوردیدا وەکوو ئافراندنی خانوو بە دەس خانوو ساز نیە. ئافرێنراو درێژەی ئافرێنەرە یان دەرکەوتنێکی ئافرێنەرە)

پاشان ئێمەی خستە کار و دوانزە کارگای دروست کرد و لە هەر کارگایەکدا چەند شاگردی دانا (مەبەست لە شاگرد ئەستێرەکانی ناو هەر بورجە).

پاشان شاگردەکانی خستە کار تا لە ژێر ئەو دوانزە کارگادا کارگایەکیتر پەیدا بوو (دیارە کە بورجەکان لە ئاسمانی هەشتەمدان و ئەم کارگایە، ئاسمانی هەفتەمە) وەستایەکی نایە ئەم کارگایە (مەبەستی گەڕۆك ئەستێرەی «زوحەل» یان «کەیوان») پاشان ئەم وەستایە خستە کارتا ئەویش لە ژێر کارگای یەکەمی خۆیدا کارگایەکیتر و وستایەکیتر بەدی هات (مەبەستی ئاسمانی شەشەمە و ئەستێرەی برجیس یان موشتەرییە). وەستای دووهەمی خستە کار تا لە ژێر کارگای دووهەمدا کارگایەك و وەستایەکیتر بەدی هات (مەبەستی ئاسمانی پێنجەم و ئەستێرەی «مریخ») هەروەها تا هەفت کارگا و لە هەر کارگایەك وەستا بەدیهات (کارگای چوارەم ئاسمانی چوار و

خۆر. کارگای سێهەم ئاسمانی سێهەم و زوهرە. کارگای دووهەم ئاسمانی دووهەم و عەتارودە. کارگای یەکەم ئاسمانی یەکەم و مانگ).

ئەوسا ئەو شاگردگەلە کە لە دوانزە خانووەکەدا بوون (واتە ئەستێرەگەلی وەستاوی ناو بورجەکان) بە هەر کام خەلاتێکی بەخشی. پاشان بە وەستای یەکەم (موشتەری) خەلاتی داو دوو کارگای لەو دوانزە کارگا پێدا. (مەبەستی دوو بورج لەو دوانزە بورجەیە کە موشتەری لەویدا وەستانی زۆرترە. دووهەم وەستای (زوحەل) هەر وەها خەلات کرد و لەو دوانزە کارگا دوانیشیدا بە ئەو (دوانیتر لە بورجەکان کە وەستانی زوحەل لەوانەدا زۆرترە) هەروەهایش بە وەستای سێهەم (مریخ، خەلات و دوو کارگا). بە وەستای چوارەم (خور) یەك کارگای بەخشی بەلام خەلات و جل و بەرگێکی لە گشت جوانتری بە ویدا و فەرمووی تا بە سەر دوانزە (بورج)دا چاوەدێری کات (چاوەدێری مەبەستی ئەوەیە کە خۆر پادشای گشت ئەستێرەکانە و هەروەها یەکەمین تەجەللای نوورولنەنوار یا ڕوحولنەرواح لە خۆردایە. ئەو یەك کارگای ئەوەیە کە خۆر بۆ زەمانێکی هەرە زۆر لەو بورجەدا دەمێنێتەوە) بە پێنجەم و شەشەم (زوهرە و عەتارود) وەکوو یەکەم و دووهەم (خەلات و دوو کارگا. تا ئێستا یانزە بورجی بە شەش وەستا بەخشیوە و خەلاتی کردوون. خەلات مەبەست ئەوەیە کە تیشکی پێداون) چون نوبەی هەفتەم (مانگ) گەیشت کارگایەك ماوە ئەویشی بە ئەودا بەلام هیچ خەلاتی نەکرد (خەلاتی نەکرد مەبەست ئەوەیە کە مانگ لە خۆیەوە تیشکی نیە) وەستای هەفتەم هاواری کرد بە هەموو دوو کارگا و خەلاتت داوە بەلام بە من یەك کارگات داوە. خەلاتیشت نەکردووم. فەرمووی دوو کارگایش (نهۆمگەلی ئەسیر و زەمهەریر) لە ژێر ئەودا دروست کەن و حوکمی بدەنە دەست ئەو (چون ئەم دوو نهۆمە ئەستێرەی تێدا نیە). لە ژێر گشت کارگاکانیشدا کێلگە دروست کەن و بەرهەم چنینی بدەنە دەس وەستای هەفتەم. (مەبەست لە کێلکە ئەوەیە کە شەش وەستای سەرووی مانگ لە بەرهەمی تیشکی خۆیان بدەن تا ڕووناك بێتەوە) هەروەها بەڵێندرا کە لە جل و بەرگی جوانی وەستای چوارەم (تیشکی خۆر) هەمیشە نیوە خەلاتێ بدەن بە وەستای هەفتەم (لە خۆر تیشك بگرێت و هەمیشە نیوەی ڕۆشن بێت) جل و بەرگی مانگ هەمیشە دووبارە و دووبارە تازە بکرێتەوە (بەردەوام لە خۆر تیشك بستێنی و لە فەیەزانی نوورولنەنوار بەهرەمەند بێت) وەکوو ئەوەی لە سیمورغدا وتمان (مەبەست لە ئەوەی سیمورغ ئەوەیە کەوتبووی، هەر زەمان ئەگەر سیمورغێ لە زەویدا جەستەی مرد دەچێتەوە ناو خۆر و سیمورغێکیتر وەکوو وەلی دێتە سەر زەوی. ئەو سیمورغە کە پاش ئیسلام ناوی

ڕوحولقودسیان لێ ناوه له مانگدایه. له ئایینی کاکه‌یی‌دا پیر یادگاره. قوربانی‌کردنی مانگ یان گا به ده‌س میترا هه‌ر قوربانی کردنی پیر یادگاره له ژێر «ساجی نار»دا).

وتم ئه‌ی پیر له‌م کارگاگه‌له‌دا چی ده‌چنن؟ (خاتر جه‌م خوێنه‌ری به‌ڕێز ده‌پرسێ مه‌به‌ستی سوهره‌وه‌ردی له هێنانی دوانزه بورج و هه‌شت ئاسمان و دوو نهۆم چیه. جوابی ئه‌و پرسیاره مژاره‌که ڕوون ده‌کاته‌وه) وتی زۆرتر حه‌ریر ده‌چنن (له مێژدا کۆتاڵ و حه‌ریریان به ده‌ست ده‌چنی) به‌ڵام شت‌گه‌لێکیش ده‌چنن که هزر و بیری که‌س نایگاتێ (حه‌ریر و ئه‌و شتگه‌له که ده‌یچنن مه‌به‌ست ئه‌وانه‌یه که بۆ ته‌بعی ئه‌وین‌خوازی مرۆڤ چاکه) له‌وێدا «زنجیری داوودی»ش ده‌چنن. وتم زنجیری داوودی چیه؟ وتی ئه‌م به‌ندگه‌له‌یه که ده‌س و پیی تۆی پێ به‌ستراوه (وتمان مه‌به‌ست له‌و چوار به‌نده هه‌مبه‌ریه‌که چوار وه‌رز و چوار توخما و چوار لایه‌نی باکوور و باشوور و ڕۆژهه‌ڵات و ڕۆژاوایه و به گشتی مه‌به‌ست جه‌سته و جیهانی مادیه‌که تا لێ ڕزگار نه‌بی ناتوانی به نووروڵنه‌نوار بگه‌یت جا به‌رهه‌می دوانزه بورج و یانزه ئاسمان و شاگرد و وه‌ستاکانی به‌دیهاتنی زه‌وی و جیهانی ماکییه. تیشك و به‌زه‌یی نووروڵنه‌نوار جگه له‌وه‌ی له خۆردا ده‌رده‌که‌وێ که ناوه‌ندی ئاسمانه‌کانه له ئاسمانی ئاخره‌وه به ئاسمانه‌کانی ژێر خۆی ده‌گات. ئاسمانی سه‌رووی ژێر نووروڵنه‌نوار ئه‌و تیشك و ره‌حمه‌ته هه‌ڵده‌لووشێ و بوونه‌وه‌ر و گیانگه‌لی ئه‌وێ پێ سه‌رمه‌ست ده‌بن و پاشماوه‌که‌ی ده‌چێته ئاسمانی ژێر خۆی. هه‌ر به‌م چه‌شنه تا به زه‌وی ده‌گات. پێش ئه‌وه‌ی بگاته زه‌وی ئه‌و تیشك‌گه‌له لاواز ده‌بوون پاش لێکدرانی ئه‌وانه زه‌وی که جیهانی مادیه دروست ده‌بێ. ئه‌وه‌ش بزانین که له مێژدا خه‌ڵك لایان وا بوو که جگه له زه‌وی جیهانی سه‌روو گشت هه‌مووی تیشك و خاوێنیه به‌ڵام سوهره‌وه‌ردی تیشك و خاوێنی ئاسمانه‌کانی دابه‌ش کرد که له سه‌ره‌وه بۆ خوار خاوێنی که‌م ده‌بێته‌وه. ئه‌و مانگیشی وه‌کوو ماده به‌ڵام نه‌ماده‌ی که‌سیف وه‌ك زه‌وی ده‌زانی. زانیمان که تیشك له جیهانی سه‌ره‌وه بۆ خوار دێت و له زه‌ویدا ده‌بێ به ماده. ئه‌م ماده‌یه که شوبهێنراوه به «زنجیری داوودی» و ناهێڵی سه‌رنجی گیان بۆ جێگای به‌رزی ڕاسته‌قینه‌ی خۆی‌دا بکێشرێ به گشتی واته ئاسمانه‌کان له کاردان تاتۆی شابازی دونیای سه‌روو له زه‌وی‌دا ببیته خاوه‌ن جه‌سته. تایبه‌تمه‌ندیگه‌لی ماده و جه‌سته ده‌بێته هۆی له بیرچوون و بێ‌سه‌رنجی تۆ بۆ سه‌رچاوه‌که‌ت و زێدی ڕاسته‌قینه‌ت که نزیکی و تێکه‌ڵاو بوونته له‌گه‌ڵ نووروڵنه‌نواردا)

وتم زنجیری داوودی چۆن دروست ده‌که‌ن؟ وتی له هه‌ر سێ کارگا له‌و دوانز کارگای سه‌رروودا به حه‌لقه زنجیر درووس ده‌که‌ن (واته له سێ کارگادا یه‌ك حه‌لقه له دوانزکارگادا ده‌بێ به چوار زنجیر.

بەم چەشنە لە سییانی سەروودا ئاگر، سیٚدانەی ژێر با، سیٚ دانەی ژێرتر ئاو و لە سیٚ دانەی خوارروودا خاك دروس دەبیٚ) ئەو چوارە دەدەنە دەست هەفت وەستا تا هەرکام لەسەری کاریٚ بکەن (واتە ئەو چوارە کە حاڵەتی «هەیوولا»ی هەیە ئەم هەفت وەستا بەتایبەت وەستای هەفتەم لە مانگدا ئامادەی دەکەن تا ببێت بە جەستە و مادە). چۆن دەگاتە دەست وەستای هەفتەم دەی نێرێتە کێلگەکان (تا لە سەری کار بکرێت) بۆ ماوەیەك دەمێنێتەوە پاشان چوار حەلقە زنجیر بە حەلقەیەك دەبەستن (مادەی خاو واتە هەیوولا دەچێتە بۆ شایی ئاسمان و زەوی. چوار توخما (عونسور) پێکەوە لێك دەدرێن و مادە، یان جەستە دروست دەبیٚ و لە زەویدا بە حەریرگەلی خۆشرەنگ دەنەخشێنریٚ) حەلقەکان گشت کون کراوەن (واتە ئامادەی دیلکردنی بازگەلی کێوی قافن) پاشان بازی وەکوو تۆ دیل دەکەن و دەیخەنە ملی تا بە ئەندازەی دەردێت.

لە پیرم پرسی هەر زنجیر چەند حەلقەی هەیە؟ وتی ئەوەندە کە بژمێری زەریای عومان چەند دلۆپە. (مادەی جەستەکراو، هەرەزۆرە).

وتم ئەم زنجیرە بە چی دەتوانی لە خۆت دوورکەیتەوە؟ وتی بە «شیری بەلارەك» وتم ئەو شیرە لە کویٚ پەیدا دەبیٚ. وتی لە ولاتی ئێمەدا جەللادیٚ هەیە ئەو شیرە لە دەست ئەودایە. (مەبەستی فریشتەی مەرگ یان ئیزرائیلە). بۆ ئەو ئاشکرایە کە هەر زنجیری چ ماوەیەك دەخایەنیٚ (واتە ماوەی تەمەنی مرۆڤ و جەستەی ئەو لە پێشدا دیاری کراوە) کە ماوە بە ئاخر گەیشت ئەو جەلاوە بە شیری بە لارەك وەها لێی دەدا کە گشت حەلقە زنجیرەکان دەپسێن. (واتە مرۆڤ دەمریٚ و رزگار دەبێت). لە پیرم پرسی ئێش و زیانی شیری بە لارەك بۆ هەموو مرۆڤ یەك چەشنە؟ (واتە مەرگ بۆ هەر کەسیٚ چەندە ئاسان یان دژوارە) وتی جیاوازی هەیە. بو هێندی کەس ئەوەندە دژوارە کە رەنج و ئێشی کۆ کراوەی سەدساڵەی پیٚ ناگات. بەڵام بۆ هێندیٚ کەس ئاسانە. وتم ئەی پیر چ بکەم تا ئەو رەنجە بۆ من ئاسان بێتەوە؟ وتی کانیاوی ژیان (مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤ ئەگەر ئەوین هان دەری بێت، دڵ رێنوێنی دەکات کە سەرنجی بۆ ئەوینی راستەقینە بکێشریٚ تا قۆناغەکان بۆ گەیشتن بە قۆناغی ئاخر واتە نزیکی و تێکەڵاو بوون لەگەڵ نووروڵئەنوار بېڕیٚ. لەم حاڵەدا مەرگ نە تەنیا ئێشی نیە بەڵکوو دەبێتە هۆی رزگاری گیان و شادی ئەو کەسە). کە بەکانی ژیان (ئەوینی راستەقینە) گەیشتی لە ئاوەکەی بەسەردا کە تا ئەو زنجیرە (بە باڵو لەشتەوە) بڕزیٚ و لیٚدانی شیری بە لارەك بۆت ئاسان بێتەوە. ئاوی کانی ژیان ئەم زنجیرە سست و تەنگ دەکاتەوە و لیٚدانی شیری بە لارەك ئاسان دەبێت. وتم ئەی پیر کانیاوی ژیان لە کوێیە؟ وتی لە تاریکاییدایە.

ئەگەر دەتەوێ دەبێ وەکوو «خزر» پێڵاو لە پێ کەی و ڕێگای «تەوەککول» بگرە پێش و بڕۆ تا بە تاریکایی بگەیت. (ئاماژە بە چیرۆکی خزرە لە ئەسکەندەرنامەدا: ئەسکەندەر کە تەواوی دونیا دەگرێت دەگاتە جێگایەك کە شەو و ڕۆژ بە تەواوی تاریکە. پێ دەڵێن لە ناو ئەو تاریکاییەدا کانی ژیان هەیە هەر کەس لێی بخواتەوە ژیانی هەتاهەتایی دەبێت. ئەسکەندەر و هەندێ لە یاوەرانی دەچنە ناو تاریکاییەوە. تەنیا خزر دەتوانێ بەو کانیاوە بگات. لێی دەخواتەوە ئێستا ژیانی هەتاهەتایی هەیە) وتم ڕێگای کانیاوی ژیان لە کام لاوە بوێ دەچی؟ وتی لە هەر لایەکەوە بچی پێ دەگەی. وتم نیشانەی چیە؟ وتی تاریکایی. (مەبەست لە تاریکایی کە سوهرەوەردی باسی دەکات ئەوەیە کە نیشانەکانی لە ئایینی میترایی‌دا وەکوو تاریکی ستایشتگاکانیانە کە باسمان کرد. دەبێ بزانین چیرۆکی خزر و ئاوی ژیان میهرپەرستەکان بە کەڵك وەرگرتن لە ئوستوورەکانی سوریانی زمانەکان دروستیان کردووە و لە ئەسکەندەرنامەدا جێگایان داوەتەوە. بۆ ژیانی هەتاهەتایی دەبێ بە ئەوینی ڕاستەقینەوە لەو ستایشتگا تاریکگەلەدا هەفت قۆناغەکە بپێوی. مەم بە چەشنێکی‌تر لە سیا چالەکەی‌دا پێوای و بە جیهانی نوورولنەنوار گەیشت.

ستایشتگاگەلی میهری تا ئەو جێگا کە حکومەتی ساسانیەکان توانیان کاولیان کرد ئەوەی کە ماوەتەوە شوێنەواری ئەشکەوتگەلێکی کاولکراوە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات و ئازەربایجان و ئەرمەنستان و کوردستانی باکوور و باشووردا. لە ناوەراست و ڕۆژهەڵات و باشوور و باکووری ئێراندا نیە. چۆن لەو ناوچانە زەردەشتی ڕەواجی بووە.

تەنیا جێگایەك کە هێشتا ماوەتەوە ستایشتگای غاری «لالەش»ە لە باشووردا. جەم خانەکانی کاکەیی کە پاش گوشاری ساسانیەکان و موسڵمانەکان ناچارمان وەکوو خانوو دروستی کەن و هەروەها خانەقا «خانەگا»گەلی تەریقەتگەلی سۆفیگەری و دەرویشی گۆڕدراوی پەرستگەکانی میهرپەرستی کۆنی کوردانە. ستایشتگاگەلی میهری لە کوردستانی باکوور لە سەرەتای ئیسلامدا کەڵکی لێ وەرگیراوە کە پاشان لە زەمانی ئومەوی و عەبباسیەکاندا پەیکەرەکانی بە توانجی بت‌پەرستی ڕووخاوە و بێ‌کەڵك ماون. ناوەندی گەورەی میهرپەرستی و بڵاوبوونەوەی بە ئەورووپادا ئەوێ بووە. ئەوێ سنووری ڕۆم بووە و عەشایەری بە هێزی کوردی تێدا بووە. ساسانیەکان لە ترسی پاڵدانەوەی ئەوان بەرۆمەوە زەختیان نەخستۆتە سەریان.

میر شەرەفخانی بەدلیسی نووسەری شەرەفنامە لە سەدەی یانزەی کۆچی‌دا ناوی زۆر عەشایەری کورد دەبات کە لەسەر ئایینی ئێزدی بوونە کە ئێستا موسڵمانی سوننی یان عەلەوین لەگەلی

جۆراجۆری عەلەوی جگە لە شیعەی دوانزە ئیمامی هەر لەوێ پاشماوەی میترایی دینی کوردستانین کە لەسەریان باس دەکەین.

بۆ چی ستایشتگاگەلی میهرپەرستی بە تەواوی تاریکن. چۆن لە باوەڕگەلی میترایی و دینە کوردیەکاندا لە تاریکیەوە بە تیشك دەگەی وەکوو مەم کە لە سیاچاڵدا گیانی تێکەڵاوی تیشکی نوورولئەنوار بوو. یان لە مەم و زینی فولکلوردا مەم و بەنگینە بۆ ئەوە شیاوی ئەویندارای ڕاستەقینە بن هەفت ساڵ لە تاریکی‌دا ژیانیان بە سەر برد پاش هەفت ساڵ لە کاتی یاری کردندا بە تیشك گەیشتن. یان خزر دەبێ بچێتە تاریکاییەوە تا بە ئاوی ڕووناکی ژیانی هەتاهەتایی بگات. بەڕاستی ئەم تاریکی‌گەلە ئاماژە بە چیە؟ وتمان لە دینە کوردیەکاندا کاری شەیتان کە ئادەم و حەوای خەڵەتاند وەکوو کاری بەکر لە مەم و زیندا بوو بە مایەی خێری ئەوانە. بەکر، مەمی خستە تاریکایی سیا چاڵەوە تا لەوێدا بە دنیای ڕاستەقینەی نووری خودایی بگات. کاری شەیتانیش ئادەم و هەوای خستە جیهانی «مادە» تا لە سەرەتاوە دەس پێ بکات و ڕێگایەك بۆ جیهانی ڕاستەقینەی ئەوین و نوور بدۆزێتەوە.

مەبەستی سوهرەوەردیش لە تاریکایی، جیهانی مادە و جەستەیە. بۆ گەیشتن بە جیهانی تیشك دەبێ ڕەنج و سەختی جیهانی «مادە» قبووڵ کەی. ئەمە بیرهێنەری باوەڕی میهرپەرستگەل و دینە کوردیەکان بە دوونادوون واتە تەناسوخە. گیان بۆ پێوانی ڕێگای تەکامول دەبێ لە جەستەگەلی زۆردا ژیان بە سەربەرێ تا توان و شیاوی ئەوە پەیدا دەکات کە خۆی بەرزکاتەوە بۆ جیهانی نوورولئەنوار. خودای میهرپەرستەکانیش لە پێشدا لە دڵی بەرد یان سەدەفی تاریکەوە تەجەللای کرد. لە ئاینی کاکەیی‌دا ئەمە بە ئاشکرایی ڕوون کراوەتەوە. لە «سەرەنجام»دا بەتایبەت لە بەشی «دەورەی چل تەن» دا گەورەگەلی کاکەیی بە تاریکی و ساردی پێش ئافراندن «تەجەللای خودا» ئاماژەیان کردووە.

پیر بنیامین مەرەمۆ، پیر بنیامین دەفەرمێ:

| | |
|---|---|
| نەدەیجوور تار ـ نەدەیجوور تار | داوو، شاسەهاك نەدەیجوور تاڕ |

واتە لە تاریکە شەوی تاردا .... ئەی داود سان سەهاك (تەجەللای خودا) لە تاریکی تاردا

| | |
|---|---|
| حشمەت جەوری یەخ ئازەرد وەکار | مەیلش زیاوە جەم میدان قەتار.... |

گەورەیی ئازاری سەهۆڵ و سەرمای هێنایەکایەوە ئەوسامەیلی بۆ مێردانی قەتار (هەفتەن و هەفتەوانە و...) بزووت

پیرداود مەرەمۆ، پیرداود دەفەرمێ:

ئازیز بێگەرد، ئازیز بێگەرد بنیام شاسەهاك ئازیز بێگەرد

ئازیز بێ گەرد.... ئەی بنیامین شاسەهاك ئازیزی بێگەرد

جۆشناش قەهار قەترەی یەخ و سەرد نەیانەی دەیجوور و ێش یەکتا و فەرد

لە خانووی تاریکیدا بە تەنیا دڵۆپەگەلی سەهۆل و سەرمای قەهاری هێنایە گەڕ....

پیر مووسا مەرەمۆ:

مەولام سەرمۆرەن مەولام سەرمۆرەن مسەفا، سەهاك مەولام سەرمۆرەن

گەورەم سەر بە مۆرە (پێش ئافراندن دەست لێ نەدراوە) ئەی مسەفا گەورەم سەهاك سەربە مۆرە

یاریش نەسرەن سەرش پەیجوورەن پاشای نوور پاك دانەی دەیجوورەن

دۆسی و میهرەبانی لە ڕازدایە و پەیجۆی ئافراندنە ئەو پادشای تیشکی پاکی دانەی تاریکیە واتە لە سەدەفدا...

دانەی دەیجوورەن ئازیزم سەهاك نەتار زوڵمات هەر ویشەن بێباك....

دانەی تاریکیە ئازیزم سەهاك لە تاریکی تاریکاییدا هەر ئەو بێباکە.....

یار زەردەبام مەرەمۆ (پیر یادگار دەفەرمێ)

نەو یانەی سڕش، نەویانەی سڕش ڕوچیار ـ شاهم نەویانەی سڕش

لە ئەو خانووی مەڵەکە تاوسیدا، ئەی شابرایمی ڕوچیار، شاهم لە ئەو خانووی تاریکی مەڵەکە تاوسیدا

سڕنەرای دەیجوور چە بەتن دوڕش هەفت بارگە مەجوود جەزات پڕش...

سڕ (ئەو) لە ڕێگای تاریکی لە ناخی دوڕەوە بوو ـ هەفت ئاسمان لە زاتی پڕی دابوو...

ڕۆچیار مەرەمۆ، شا ئیبرایم دەفەرمێ

نوور ئەفسەر بی نوور ئەفسەر بی زەردە، شام، سەهاك نوور ئەفسەر بی

تیشکی تاجی سەر بوو.... ئەی پیر یادگار شاهم سەهاك تیشکی تاجی سەر بوو

نەدیجلەی دەیجوور نار ئەحمەر بی نە لەوح یاقووت جهان ئاتەر بی....

نە زەریای تاریکی‌دا ئاگری سوور بوو و لە چەرخی یاقووتدا جیهان ئـاگر بـوو. واتـە خـودا لـە تاریکایی ناو سەدەفدا بوو کە تەرح و نەخشەی دەرکەوتنی خۆی و ئاسمانەکان لە بوونی‌دا بوو...

لەم چەشنە هۆنراوانە لە سەرەنجامدا کە ئاماژەیە بە تاریکی پێش تەجەللا و دەرکەوتـنی زات و سیفاتی حەق زۆرە. ئەوە کە پێش تەجەللای خودا تاریکی بووە لەگەڵ تاریکی جەستە و مـادە کـە سەرەتای دەس پێ‌کردنی مرۆڤە بۆ گەیشتن بە جیهانی نوور جیاوازی هەیـە. تـەنیـا لێـك‌چـوونێك هەیە ئەویە کە هەر دوو لە تاریکیەوە دەس پێ دەکات. تاریکایی ستایشتگاکەلی میهرپەرستیش ئاماژە بە مانەیە. جگە لەم دینە کوردیگەلە کە ئیستا هەمانە وەکوو ئێزدی و کاکەیی و شەبەك و لۆگەلی عەلەوی‌تر لە کوردستاندا (لەسەر شەبەك باس دەکەین) «ئیـبنی نـەدیم» (محمـد بـن اسحاق الندیم) توێژینەری گەورەی سەدەی چواری کوچی (ساڵمەرگ ۳۸۵ی کۆچی مـانگی) کـە نادیارە بە رەچەڵەك عەرەب بێت یان نا، کتێبە هەرە بە ناو بانگەکەی کە بەرهەمێکی فەرهەنگی «سەقافی» مەزنە بە ناوی «ئەلفهرست» و لە ۳۷۷ ی کۆچیدا نووسیوە، لـەم کتێبـە لـە بـەشـی «ئاینزاکان و باوەڕمەندی‌گەل»دا لە فیرقەیەکی دینی ناو دەبات بە نـاوی «رەشـییان» سـەبـارەت بەوانە دەڵێت «باوەڕیان وایە کە جگە لە تاریکایی هیچ نەبوو، لە نێو تاریکایی‌دا ئاو، لـە ئـاودا «با» لە «با»دا «مناڵدان» لە مناڵدان‌دا «ئەو پێستەی کـە جـەنـینی تیدایـە» لـەو پێسـتەدا «توخم» و لە توخمدا «ئاوێکی زیندوو» و لەو ئاوەدا «ئیبنولنەحیای گەورە» بوو. چووە سەر و ئەم زەوی و ئاسمانگەل و سارا و شتگەلە و خودایانی دروست کرد. دەڵێن باوکی کە تاریکایی بوو لـەم کارە بێ‌خەبەر ماو ئەو هاتە خوارەوە». چەند شت لێرەدا سەرنج ڕاکێشە. یەکەم ئـەو فیرقـە کـورد بوونە چون تەنیا کوردگەل بە رەنگی تاریکی «رەش» دەڵێن. دووهەم لە قسەکانی ئیبنی نـەدیم‌دا سەبارەت بەوانە تێکەلاوی ڕووی داوە. سێهەم لە پێشدا تاریکی و ئاو بووە ئەمە نیشاندەری باوەڕی کاکەیی‌گەلە کە پاش دوخی «یا» خاوەندگار ناو سەدەفێـك لـە زەریادایـە. لـە ئوستوورەناسـی‌دا پێوەندی هەیە نێوان مناڵدان و مناڵ و سەدەف و دوڕ و هەروەهـا خـۆر و ئاسمـان کـە باسـکردنی درێژە و لێرەدا ناگونجێ. زۆر شاعیری کاکەیی بە تاریکی و زەریای یەکەمـین ئامـاژەیـان کـردووە. شیعرەکەی ڕۆچیارمان نووسی «نەدیگلەی دەیجوور نار ئەحمەر بی» بڕوانن بۆ سـەرەنجام دەورەی چـل تن. چل تەنی کاکەیی گشتیان لە کاتی ناساندنی خۆیان لە چل هۆنراوەدا بە زەریـای یـەکـەمـین ئاماژەیان کردووە.

وتمان مرۆڤیش بۆ تەکامول دەبێ لە تاریکاییە وەدەس پێ بکات بەڵام تاریکایی مـرۆڤ جیهـانی مادییە کە دەبێ خۆی لێ ڕزگار کات و ئەم ڕزگاریە بە ناوی ژیان واتە ئەوین بـە دەس دێـت کـە هۆی سەرەکی ڕزگاری مرۆڤە وەکوو ڕزگاری مەم) پیر لە درێژەی قسەکانی‌دا دەڵێ:

تۆ خۆت ئیستا لە تاریکایی‌دای بەڵام نازانی. ئەوەی کە ئەم ڕێگا دەپێـوێ خـۆی لـە تـاریکی‌دا دەمێنێتەوە و دەزانێ پێش ئەوڕ دۆخەیش هـەر لـە تـاریکی‌دا بـووە. (سـوهرەوەردی لـە شـرۆڤەی فەلسەفەکەی خۆی واتە ئیشراق‌دا مادە بە دنیای ژێرین دەناسێنێ کە دەبێ مـرۆڤ بیپێـوی تـا بـە مەبەستی دەگات.

فریشتەگەل چون لە خوارەوە دەست پێ ناکەن ناچار بۆ هەمیشە لە ئاسمانەکاندا لە گەڕانن و بە سەرووی سەروو ناگەن. تەنیا مرۆڤە کە دەگات چون لە خوارووی خوارەوە دەسـتی پێکـردووە. ئـەم ڕەوتە نیازی بە دوونادوونە کە لە باوەڕگەلی ئاریایی هەرە کۆنەوە هەبووە و لە دینە کوردیەکـان و ئاینزاکانی هیندوستانیش‌دا هەر ماوە. لە هیندوستانەوە چووە بۆ «تـەبـەت» و چـین و کوریـا و ژاپون. زەردەشتی تەناسوخی قبووڵ نەبوو بەڵام کوردانی میهرپەرست هێنایانە پاش ئیسلام. وتمـان جیهانی تاریکی هەر چەشنێ جیهانی نوورە. تیشکی نوورلئەنوار هەر دێتە خوارەوە لاوازتر دەبێـت تا دەبێت بە مادە واتە تاریکی کەوا بوو تاریکیش هەر هەرچەشنێ تیشك و تەجـەللای خودایـە و هەروا کە لە پێشدا وتمان چەشنێ دەرکەوتنی خودایە لە چوارچێوەی مەلەکە تاوسـدا کـە لـەوەدا هەم نووری کەسیف و هەم قین و تاریکی خودا دەردەکەوێ. وتیشمان کـە بـە پێـی فرموولـەکـەی ئەنەشتەین $E=MC^2$ مادە و وزە هەر دوو یەك ڕاستیە کە بە یەك دەگۆڕدرێن. لایـەنـی مـادە و تاریکی وەکوو تەجەللای خودا لە ستایشتگاگەلی میهرپەرستی‌دا وەکوو پەیکـەر و نەخشـگەلـی ترسناك پیشان دراوە.

لایەنی تاریکی خودا وەکوو لایەنی ڕووناکیەکەی هەر جوانە. ئەمە لە لای عاریف و سـۆفی‌گـەل وەکوو «جەلال»ی حەق ناسێندراوە هەروا کە لایەنی نوورەکەی وەکوو «جەمال»ی حەق ئاماژەی پێ کراوە. لایەنی جەلالی حەق لای شاعیرە سۆفیەکان وەکوو «زولف» و لایەنی جەماڵ وەکوو ڕۆخسـار بەتایبەت کولم و لێو ئاماژەی پێ‌کراوە. لە نێو ئەم شاعیرگەلە لە کوردستاندا بێسارانی و مەلای جزیری جوانترین ئاماژەگەلیان بە جەلالی حەق هەیە کە بە هەندێ لەوانە ئاماژە دەکەین.

کاتێ کە پیرێکی کورد بمردایە گۆڕەکەی لای خەڵك وەکوو پیرۆزێك ڕێزی لـێ دەگـیرا و نـەخۆش بەتایبەت نەخۆشی دەروونیان دەبردە سەر ئەو گۆڕە تا چاکەوە بێـت. لـە سـەدەی یـانزە و دوانـزەی

کۆچی زەمانی بێسارانیدا کچی پیاوێکی دەوڵەمەند بە ڕەوایەتێ دەڵێن کچی خان ئەحمەد خانی ئەردەڵان شێت دەبێت و دەیبەنە سەر گۆڕی «بابە شێخ» لە بێساراندا بەڵام چاك نابێتەوە. شاعیرێك بە ناوی یوسۆ ئاسکە کە لە پێشدا قوتابی بێسارانی بووە لەگەڵیاندایە. پارچە شیعرێك بۆ بێسارانی دەنێرێت و دەیەوێت هەستی عیرفانی ئەو بلیمەتە هەڵخرێنێت. یەکەم بەیتی ئەمەیە

هیمەت نەمەنـدەن هیمەت نەمەنـدەن    جە بارگەی بابا هیمەت نەمەنـدەن...

واتە هیمەت و کەرامەت لە بارگەی بابە شێخدا نەماوە....

بێسارانی کە هەستی عیرفانی دەبزوێ بەم پارچە شێعرە هەرە بەرزە جوابی دەداتەوە:

١ـ یۆسـۆکەم نیـەن یوسـۆ کـەم نیـەن    جـە بارگـەی بابـا هیمـەت کـەم نیـەن

واتە ئەی یۆسو کەم نیە.... لە بارگەی بابە شێخ هیمەت کەم نیە

ـ نـە زەدەی دێـوەن نەسـای پەرییـەن    لـەیلـێ نـەجامدا زولـف وێـش دیـەن

نە پێکراوی دێوە و نە سێبەری پەری کەوتووە بە سەریدا. لەیلێ لە ئاوێنەدا زولفی خۆی بینیوە. لە مێژدا لە کوردستان لایان وا بوو ئەگەر دێو کە ئەمڕۆ پێ دەڵێن جن و جنۆکە دەست لە کەسێ بوەشێنێ شێت دەبێت. یان پەری کە لە ئاسماندا دەگەڕێ ئەگەری سێبەرێ بکەوێ بە سەر کەسێکدا شێتی دەکا. بێسارانی دەڵێ ئەوە پێکراوی دێوو سێبەرێ پەری نیە تا بابە شێخ چاکی کاتەوە. ئەو پێکراوی شتێکی لەوانە گرینگترە کە هیمەت و کەرامەتی شێخ هێزی پێ ناشکێ ئەویش «جەلال»ی حەقە کە لە زولفی ئەو نازدارەدا خۆی دیاری داوە. ئەو لە ئاوێنەدا کە سەرنجی زولفی خۆی داوە شێت بووە. هیمەت و کەرامەتی شێخ کار دەکاتە سەر دێو و پەری بەڵام کارناکاتە سەر جەلالی خودا

٣ـ زولف وێش دیەن شنیان نەرووی خاڵ    جەسای زولـف وێـش پـێش یـاوان مـەلاڵ

زولفی خۆی دیوە کە بە سەر خاڵاندا شنراوە و لە سێبەری ئەو زولفە نەخۆشی تووشیاری بووە

٤ـ جاڕدام وە دێوان تـەمـام سـەر زەمـین    یـەسـای گیانـەن یـاوا بـەو جـەمین؟

بانگەوازم بە گشت دیوگەلی سەر زەویدا کە ئایا ئەمە نەخۆشی دەروونیە گەیشتووە بەو ڕوخسارە جوانە؟

«سا» یان «سێ» کە هەندێ کەسیش دەڵێن «تێ» بە مانای نەخۆشینە. سای گیان واتە نەخۆشی دەروونی وشەی «سێ» لە نەخۆشیگەلی «گرانە سێ» و سەراسێ و... هەر ماوە.

دێـــوان گشـــت حاشـــا ئێمـــه بـــێ‌تـــاوان     چێمه زەرەرێ بـەو خـاڵ نـەیاوان

دێوگەل گشت حاشا یان کردووتیان ئێمە بـێ‌تـاوانین و لـە ئێمـە زیـانێ بـەو خـاڵ و ڕۆخسـارە نەگەیشتووە.

٦ـ لەیلـێ سـاداریش جـە زولـف وێشـەن     گونـای بابـە شـێخ بێسـاران چێشـەن

نەخۆشی ئەو نازارە لە زوڵفی خۆیەتی گوناهی بابە شێخی بێساران چیە؟

ئەم شیعرەی خوارەوەیش ئاماژەیەکی‌تر بە «جەلال»ی حەق واتە تاریکی مەلەکە تاوسە:

١ـ ڕۆیـۆ کـوفر دیـم ئیمـان مـەپۆشـا     دڵ ئیمـان بـە دەسـت کوفـفـار فرۆشـا

ڕۆژی کوفرم دی کە ئیمانی دەپۆشا واتە زوڵفـی کـەوتبـووە سـەر ڕۆخسـاری. جـەلال جـەمالی داپۆشیبوو و دڵیش ئیمانی دا بە دەست ئەو کافرگەلەوە و فرۆشتی، چون سـەرنج بـەو زوڵفـە بـە گەیشتن بە حەق ڕەسەنترە لە بڕینی ڕێگای شەریعەت:

٢ـ دین تەرسا گرت هۆر گـێلا جـەگشـت     پشـت بـەسـت بـە زوننـار، کـەلیسـا و

دڵ بە بینینی ئەو زوڵفە دینی فەلەی گـرت و لـە گشـت هـەڵگـەڕاوە و زوننـاری کـەلیسـا و کەنیشتی فەلەکانی بەستە پشت: زوننار ئەو پشتوێنە ڕەشەیە کە قەشە مەسیحیەکان دەیبەستنە پشت. ئەم پشتوێنە بە نیشانەی لایەنی تاریکی خودا و لە پێشدا هی میهرپەرستەکان بـووە کـە پاشان مەسیحیەکان وەکوو دەیان شتی‌تر لاساییان کردۆتەوە. ئەم پشـتوێنە هێشـتا لـە ئـەدەبـی عیرفانی کوردیدا نیشانەی «جەلال»ی حەقە. پشـتوێنی ڕەش لـە میهرپەرسـتی پـاش ئیسـلام و ئێزدی و کاکەییشدا هەر هەیە. دیارە کە هەرچەند بێسارانی موسڵمان بووە بەڵام وەکـوو خـانی و جزیری لە سەمبولگەلی پێش ئیسلامی کوردستان کەلکی وەرگرتووە. بێسارانی کـە بـە بینـینی ئەو زوڵفە دەبێ بە مەسیحی بۆ ئەوەیـە کـە مـەسـیحیەکـان وەکـوو میهرپەرسـتەکـان و دینـە کوردیەکان باوەڕیان بە تەجەللای خودا لە جیهانی مادە و جەستەدا هەیە و دەڵێن حەزرەتی عیسا تەجەللای خودا لە زەویدا بوو.

٣ـ واتم ئـەی دڵـە فامـت شـۆ نـە سـەر     کێ بەستەن وە دیـن کوفـفـاران کـەمـەر

وتم ئـەی دڵ فامـت لـەسـەر نـەمێنێ     کێ بە دینی کافران کەمـەری بـەسـتووە

٤ـ گرتەنت مـەزهـەب شـێخ سـەنعـانی     ئیمـان مـەرۆشـی کـوفر مـەسـانی

مەزهەبی شێخی سەنعانت گرتووە بۆ ئەو زوڵفە ئیمان دەفرۆشی و کوفر دەستێنی

٥ـ دڵ وات بـه خـودای کارسـاز کـەریم          مـن جـەدیـن تـۆ بێـزارم بـەریم

دڵ (ئاوەزی سوور، یەکەم ڕێنوین) پێمی وت بە خودای کارساز و بەخشندە من لە دینی تو بێزار و بەرکەنارم.

٦ـ تـەڵقێـوە جـە زوڵـف نـازار دڵبـەر          نـەدەوش بـە موڵـك دارا و سـکەنـدەر

حەلقەیەك لە زوڵفی دڵبەری نازار بە موڵکی دارا و ئەسکەندەر نادەم (چون ئەوەیە سەرنجی من بۆ جەلالی حەق ڕادەکێشێ)

٧ـ سوب سەدای ناقووس، سەیـر بوتخانـە          دیـن تەرسـایان کلیسـا یانـە

٨ ـ خاسـتەرەن جـەدیـن ناتـەمـام تـۆ          سـوجدەی ریـایی سـوبح و شـام تـۆ

لە بەرەبەیاندا دەنگی زەنگ و سەیری بوتخانە و دینی مەسیحیەکانی خانوو لە کلیسا، لەو دینە ناتەواوەی تۆ و نوێژی فریوکارانەی بەیانی و شەوی تۆ چاکترە.

مەبەستی بێسارانی ئەوە نیە کە ئاینی فەلە لە ئاینی ئیسلام چاکترە. مەبەستی ئەوەیە سەرنج لە زۆڵف و زوننار و پەیکەرە جوانەکانی کەلیسا باشتر هەستی ئەویندارانەی مرۆڤ دەبزوێنێت و ئەوین رەسەنترە لە شەریعەت بۆ گەیشتن بە خودا، ئەوەیە کە دەڵێ حەلقەیەکی زۆڵفی دڵبەر کە رەنگدانەوەی جەلالی خودایە بە هیچ ناگۆڕمەوە.

نیشانەی تری جەلالی حەق «سەحەر»ە. سەحەر زەمانێکە کە تاریکایی زۆر خەست دەبێتەوە و پاش ئەوە ئاسمان نەختە نەختە ڕووناك دەبێتەوە. سەرنجتان بو شیعری هەرە بەرزی مەلای جزیری

ئـیرۆ سـەحـەر شاهێ مـەجـەر، لـە بـسێ دبـەڕ مـەخمـوور بـوو

ئەو دیم زەرِی سـورِ موشـتـەری یـا رەب پـەری یـا حـوور بـوو ...

لە دیوانەکەی مەلای جزیریدا ڕادەکێشم کە ١٧ بەیتە یان سەبارەت بە زۆڵف شیعری

سەر ددەت ئاوی کەو سەرێ زەمزەمە و سـەمـایی زولـف

سایە نومـایی خـاوەرێ سـیدرەیی مونتـەهایی زولـف...

و دەیان پارچە شیعرتریش کە پیشاندەری جەلالی حەقە لە دیوانی جزیریدا هەیە کە دەبێ شرۆڤە بکرێ و لێرەدا ناگونجێ. هەروەها بۆ «سەحەر» شیعری هەرە جوانی هەفت بەیتی بێسارانی

سۆسەن گوڵێ دیم بوش چون عەنبەر بێ          دەهەن شکوفتەی بـاد سـەحـەر بێ...

بە جوانی پێشاندەری[14] «جەلالی حەقە»

ئەم شیعرگەلە و زۆر شیعریتر لە ئەدەبی عیرفانی کوردیدا رەنگدانەوەی هەر ئەو تاریکاییەیە کە پاش ئەوە ئاوی ژیان واتە ئەوین و پاشان حەقیقەت بە دەست دێت.

مەلای جزیری پارچە شیعرێکی هەیە بە مەتلەعی «ئەزنزانم سەبەبێ، یار چرە دوور کرین...» لە بەیتی ٨یدا دەڵێت.

ژ «ئـەنەلحـەق» ب لـەبـێن لـەعـل خەبـەردار کـرین

ب کولا با سەرێ زولفـێ خـوە تـە «مـەنسـوور» کـرین

سەبارەت بە مەنسووری هەلاج قسەمان کـرد کـە دروشمـی «مـن خـودام»یدا لـە بـەغـدا بـە دەستووری خەلیفەی عەبباسی لە سێدارە درا و قسەی ئاوێنەکەی سـوهرەوەردیمان سـەبـارەت بـەو گێڕاوە. جزێری لەو بەیتەدا دەڵێ بە لێوی ئاڵی خۆت واتە جەماڵی حەق منت لە ئەنەلحـەق واتـە من خودام خەبەردار کرد پاشان بە قولابی سەری زولفی خوت واتـە جـەلالی حـەق منـت وەکـور مەنسوور پێ کرد کە سەری چووە سەردار. لەم بەیتەی جزیریدا بە هەر دوولایەنەکەی تـەجـەللای خودا واتە جەلال یان قین و تاریکی و جەماڵ واتە جوانی و ڕووناکی ئاماژە کراوە. جزیری لە پارچە شیعرێکیتری دا دەڵێ:

دڵ گەشتە مەژدێرێ ناچم کەنیشتەیی قەت ـ میحرابـی وی ب مـن ڕا، وەر، دا بچـینە لالـەش واتە لە دێری فەلە دڵبڕاوم و کەنیشتەیش ناچم، کە میحرابی بـروی ئـەوم بێـت بـەسمـە، جـا وەرە پچینە ستایشتگای تاریکی ئیزدیگەلی لالەش و لەوێـدا جـەلالی حـەق واتـە مـەلـەکـەتـاوس ستایشت کەین. برۆیش وەکوو زولف نیشانەی جەلالە).

پیر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ:

جا یەکەم هەنگاو ئەمەیە و لێرەوە دەتوانێ بچیتە پێشەوە. ئەگەر کەسێك بەم پێگـە گـەیشـت واتە گەیشتە پێگەی مرۆڤی تیگەیشتوو و ئەویندار، نەختە نەختـە سـەردەکـەوێت. ئـەوەی کـە کانیاوی ژیانی دەوێت لە تاریکارییدا زۆر ڕەنج و سـەخلـەت دەکێشـی (ڕزگـاری لـە مادیـات و غەریزەگەل ڕەنج و ئازاری هەیە) ئەگەر ئەهلی ئەو کانیاوە بێت پاش تاریکی ڕووناکایی دەبینێـت جا نابێت بێ ئەو ڕۆشناییە سەرنجی بدەیت (واتە ئەو بووە بە بەشی لە ڕوناکـایی و تیشـك) چـون ئەو ڕووناکاییە تیشکێکە لە ئاسمانەوە بە سەرکانی ئاوی ژیانەوە. ئەگەر گەیشـت و لـەو کانیـەدا

خۆی شۆرد لە ئێش و ئازاری تیری بەلارەك (مەرگ) ڕزگاری دەبێ. هەر کەس نەتوانێ بەم کانیاوە بگات ژیانی هەتاهەتایی پەیدا ناکات. (سوهرەوەردی پاش ئەم قسەگەلە بەیتێکی هێناوە):

بـه تیـغ عشـق شـو کشـته کـه تـا عمـر ابـد یـابی

کـــه از شمشـــیر تـــو لختـی نشـــان ندهـــد کســـی ئیحیـــا

واتە بە شیری ئەوین بکوژرێ تا تەمەنی هەتا هەتایی پەیدا کەیت ئەگەر وا نەبێت لە شیری تو کەسێك نەختێ ناو و نیشانی ژیانی هەتاهەتایی نادات. (پیر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت):

هەر کەس لەو کانیاوەدا وسڵ بکات خەونی شەیتانی نابینێت (غەریزە تێدا کاریگەری نەماوە) هەر کەس مانای حەقیقەتی دۆزیەوە توانی بەو کانیاوە بگات (ئەو کانیاوە سەمبولی حەقیقەتە کە بە دەرك و هەستکردنی، پێ دەگەی) ئەو کاتەی پاش خۆ شوردن لەو کانیاوە کـە هاتـە دەرێ هەتوانی سەرکەوتن پەیدا دەکات و وەکوو ڕۆنی «بلسان» (ی ناوبراو). کـە ئەگـەر لـە بەرانبـەر خۆرەوە بیگری و دڵۆپێ بکەیتە ناو دەست لە پشتی دەستەوە دێتە دەرێ. ئەگەر ببیتە «خزر» (بـە ئاوی کانیاوی حەقیقەت بگەیت) لە کێوی قاف دەتوانی بە سانایی تێ پەڕ بێت.

چون لەگەڵ ئەو دۆستە ئازیزەدا (ئەوەی کە لە پێشدا لێ پرسیبوو ئایا پەلەوەرگەل زمانی یـەك دەزانن) ئەم بە سەرهاتەم گێڕاوە ئەو دوستە وتی تو ئەو بازەی کە لە داودای بەڵام ڕاویـش دەکـەی (واتە هێشتا لە جەستەی مرۆڤدای و لە جیهانی ماکی‌دای بەڵام وەکوو مورشید جەزبـە و هێـزی حەقت تێدایە) ئێستا منیش ببەستە بە تەرکی زینەکەتەوە کە ڕاوێکی خراپ نیم. (واتـە منـیش ڕێ پێوی ڕێگای حەقم و نیازم بە مورشیدە و لەگەڵ خۆتدا بۆ گەیشتن بە مەبەست ڕێنوێنیم کـە) (لە ئاخری چیرۆکەکەدا هۆنراوەیەکی سێ بەیتی هاتووە)

مـــن ئـــان بـــازم کـــه صـــیادان عـــالم　　همـــه وقـــتی بـــه مـــن محتـــاج باشـــند

من ئەو بازمەکە ڕاوچیانی جیهان هەمیشە نیازمەندی منن

شـــکار مـــن ســـیه چشـــم ئاواننـــد　　که حکمت چون سرشـك از دیـده پاشـند

ڕاوی من ئاسکەکانی ڕەشە چاون کە فەلسەفە و زانیاری وەکوو فرمیسك لە چاویان دەبارێ

بـه پـیش مـا از ایـن الفـاظ دورنـد　　بـه نـزد مـا از ایـن معنـی تراشـند

ئەو ئاسکەڕەشە چاوگەلە لای ئێمە لە وتە و قسەی ئاسـایی دوورن و لـەم مانـا و تـێبینیانـە دروست دەکەن

تمت الرسالة بحمدالله و حسن توفيقه و اللصلوة علی خير خلقه محمد و آله اجمعين

پەرتووك تەواوبوو، ستايشت بۆ خودا و سەرخستنی چاكی و سەلەوات بۆ چاكترين ئافرێنراوی ئەو محەمەد و گشت خانەدانی ئەو.

سوهرەوەردی چیرۆكی سەمبولێكی بە فارسی زۆرە كە ئاوەزی سووری شرۆڤە كرا یەكێتر لەوانە «رسالەی عیشق»ە.

لەوەدا بە ئاماژە بناغەكانی دینە كوردیەكان دەردەخات:

بزانە كە یەكەم شت كە خودا ئافراندی گەوهەرێكی نووورانی بوو كە ناوی نا «عەقڵ» ان اول ما خلق الله تعالی العقل، بەم گەوهەرە سێ سفەتی بەخشی. یەكەم ناسینی حەق ـ (خودا) دووهەم ناسینی خۆی ـ سێهەم ناسینی ئەوەی كە نەبوو پاشان ببوو. (مەبەستی لە سێهەمی نۆ عەقڵ و نۆ نەفس و نۆ جیسمە كە لە چەرخەكانی نۆهەم تا یەكەمدان، واتە ناسینی ئەو شتگەلە كە پاشان لەو بەدی هاتن.

ئەمە ئەو كاتەیە كە تازە عەقڵی گشتی لە تیَ هزرینی خودا بە خۆی بەدیهاتبوو). لە سفەتی یەكەم كە ناسینی حەقە (خودایە) «حوسن» (چاكە و جوانی) پێكهات. لە سفەتی دووهەم كە ناسینی خۆیە «ئەوین» پێكهات كە میهریشی پیێ دەڵێن. لە سفەتی سێهەم كە ناسینی ئەوەی كە نەبوو پاشان ببوو خەم و كە سەر پێكهات... (لەمە جوانتر چوارتەنی ئاینی ئەهلی حەق واتە كاكەیی پیشان نادرێ. عەقڵی كول دوونی لە زەیدا پیر بنیامینە).

دوونەكانی حوسن و ئەوین و خەم مووسا و داودو مسەفایە. هەڵبەستەكانی سەبارەت بەوانە ئەو سفەتگەلە دەسەلمێنێ بەتایبەت مسەفا كە كارگێڕی قینی خودایە. لە درێژەی ئەم چیرۆكەدا خۆشی و ئەوین و خەم دینە سەزەوی. حوسن دەچێتە جەستەی یۆسف و ئەوین دەچێتە جەستەی زلێخا و خەم دەچێتە جەستەی یەعقووب باوكی یۆسفەوە.

بناغەی فەلسەفەی سوهرەوەردی مەلەكەتاوسە بێئەوە كە ناوی بێنێ. ئەو لە حیكمەتولئیشراقدا دەڵێ لە خودا عەقڵی یەكەم و لە عەقڵی یەكەم عەقڵی دووهەم و لە عەقڵی دووهەم عەقڵی سێهەم ... تا عەقڵی دەهەم كە لە مانگدایە دەركەوت. عەقڵی یەكەم سەبارەت بە خودا «عەشق»ی هەیە بەڵام سەبارەت بە عەقڵی دووهەم فەلەكی ژێر خۆی «قەهر»ی هەیە. عەقڵی دووهەم سەبارەت بە عەقڵی یەكەم عەشق و سەبارەت بە عەقڵی سێهەم قەهری هەیە و هەروا تا دەگاتە عەقڵی ئاخر. دیارە كە عەقڵی یەكەم و عەقڵەكانیتر تێكەڵاوێكن لە عەشق و

قەهر. عەقڵی یەکەم واتە یەکەم تەجەللای خودا کە لە ئێزدی و کاکەیی‌دا وەکوو مەلەکەتاوس ناسراوە، تێکەڵاوێکە لە عەشق و قەهر. هەروا سیستەماتیك جیهانی بوونیش تێکەڵاوێکە لەم دووە کە لە مەلەکە تاوس پێکهاتووە. پێکەوە بوونی عەشق و قەهر تەنیا لە فەلسەفەی سوهرەوەریدایە کە ویستوویە بناغەی ئاینە کوردیەکان بکات بە سیستەمێکی فەلسەفی و سەرکەوتووە. جا ئەرکی سەرشانی زانکۆکانی فەلسەفەیە کە لەسەری باس کەن و نەهێڵن بیچەسپێنن بە زەردەشتی و... وە ئەوەش زیاد کەم کە لە دینە کوردیەکاندا بەتایبەت لە سەرەنجامی کاکەیی‌دا هەندێ هەڵبەستی سووك و خورافە هەیە کە لە کۆڕێکی زانیاری بەهێزدا بە سانایی پاڵفتە دەکرێ. داخ و کەسەر ئەوەیە کە نیشانەکان لە لایەن کەسانی ئاسایی کاکەییەوە وەکوو ڕاستەقینە هزر دەکرێن.

پێویست بوو بۆ ناسینی زۆرتری فەلسەفەی ئیشراق بەشگەلێکی لەوەم پاش شرۆڤەی ئاودزی سوور بهێنا بایە بەڵام بەڕاستی وەرگێڕان بۆم دژوار بوو. سوهرەوەردی فەلسەفەی مەششائیەکان و لوژیکەکەیان شرۆڤە دەکات و خاڵە لاوازەکانی دەر دەخات و پاشان بە زارارەگەلی دژواری فەلسەفی، فەلسەفەی ئیشراق لەسەر بناغەی دینە کوردیەکان دادەڕێژێت؟ دەبێ بۆ ئەم کارە چاوەڕێی زانکۆکانی باشوور بین تا ئەم بەرهەمە هەرەمەزنە جیهانیە بگەڕێننەوە ناو ماڵی کوردی.

حیکمەتولئیشراقی سوهرەوەردی لە لایەن «دوکتور سەیید جەعفەر سەججادی»یەوە بە فارسی تەرجەمە کرایەوە بەڵام تەرجەمەیەکی زۆر سەختە. هەندێ شت لەو کتێبەدا بۆ ناسینی زۆرتری سوهرەوەردی دەنووسینەوە: وەرگێڕ لە سەرەتاکەیدا دەڵێ:

«ئێران پێش ئیسلام بۆ خۆی خاوەنی فەلسەفەی زەوقی عیرفانی ڕەسەن بووە کە ناچار پاش ئیسلام وەکوو عیرفانی ئیسلامی لێهاتووە. عیرفانی ئیسلامی لە ژێر کار تێکردنی فەلسەفەی زەوقی و عیرفانی ئێراندایە و ... کە گەورەگەلی عیرفانی ئیسلامیش وەکوو عەبدولقادری گێلانی و هەجویری دارانی و... ئێرانین (سەرەتا، ل.د) پێش «سوهرەوەردی باوەڕی وایە کە بناغە دانەری ڕاستەقینەی ئیشراق زەردەشتە. ل. دە»». (دەبێ بزانین لە فەلسەفەی سوهرەوەردیدا تاریکی درێژەی تیشکە و ئافرێنراوی شەیتان یان ئەهریمەن نیە. بەڵام لە ئاینی زەردەشتیدا تاریکی شتێکی چەپەڵ و دژ بە نوورە و ئافرێنراوی شەیتانە و پاش شکستی ئەهریمەن لە ئەهوورامەزدا تاریکی نامێنێ. ئەمە لە بناغەکانی ئیلاهییاتی زەردەشتیە و بە هیچ جۆرێك لەگەڵ سوهرەوەردی یەك ناگرێتەوە. هەندێ بەڵگە پیشان دەدات کە سوهرەوەردی لە ئاینی زەردەشتی زۆری نەزانیوە. یەك لەوانە

ئەوەیە کە دەڵێ: سدووری یەکەم لە خوداوە عەقڵی کوللە کە لای پەیڕەوانی فەلسەفەی پەهلەوییە بەهمەن (لە ئەویستادا و هوومەنە بە مانای فیکر و هزری چاك)ی پێ دەڵێن. ئەم وتەی سوهرەوەردی هەڵەیە. بە گوێرەی ئەوێستا یەکەم ئافرێنراوی خودا «سپێنتامینوو»ە. بەهمەن پاش ئەوە. ئەهریمەن بۆ شەڕ لەگەڵ ئەهوورامەزدا لە بەرانبەر بەهمەنەوە «ئەکومەنە، بە مانای فیکر و هزری پیس و چەپەڵ» دروست دەکات. ئەوندە کورد لە ئاینی زەردەشتی دوور بووە کە ناوەکەی بە هەڵە دابێژ دەکات. فارسەکان کە لە پێشدا زەردەشتی بوونە دروستتر دەڵێن زەرتوشت یان زەردوشت. تەنانەت ئەحمەدی خانی نزیك بە چوار سەدە لەمەو پێش بە هەڵە زەردەشت دەڵێت. لە کاتێکدا کە تاژدین ماڵەکەی خۆی ئاگر دەدات دەڵێ:

ماڵا خوە ژ ڕەنگێ قەومێ زەردەشت     دا ئاگر و گازیا خوەرا هەشت...

واتە ماڵەکە خوی وەکوو قەومی زەردەشت (کە ئاگر بەلایانەوە بەڕێزە) ئاگرداو بانگی هەڵدا... ئەگەر بمانەوێ دابێژی دروستی ناوی پێغەمبەری ئیسلام (د - خ) بزانین چاکترین سەرچاوە قورئانە. چاکترین سەرچاوەش بۆ دابێژی دروستی ناوی زەردەشت دەبێ بۆ ئەوێستا بڕوانین. ئەم ناوە لە ئەوێستادا (زەرەتوو ئوشترە) یان بە کورتی «زەرتووشترە»یە. (زەرتە + وو+ ئوشترە).

زەرەتە واتە زەرد و زێڕین و بریکەدار. «وو» نیشانەی ئیزافەیە لە ئەویستا و هەورامیدا. لە ئەوێستادا دەنووسێ بە ئاوەڵناوەوە بەڵام لە هەورامیدا دەنووسێ بە ناوەوە. توشترە بە مانای وشترە. بە گشتی بە مانای خاوەن یان خاوەنی سفەتی وشتری زەردە. زۆر ناوی ماد و فارسەکانی هەرە مێژین لە ناویی ئاژەڵە پیرۆزەکانە گیراوە بۆ وێنە ناوی مامەی زەردەشت «فرەشوو ئوشترە» و ناوەکانی" ئووروەت ئەسپە - ویشتە سپە - جامەسپە یان گەئۆماتە واتەگای مادی. گۆدەرز (لە ئەوێستادا گەئۆدەرێسە) و...، سەبارەت بە مانای ناوی زەردەشت هەموو ئەوێستاناسانی بە ناوبانگ هەر ئەو مانای سەروویان وتووە.

لە گۆڤارێکدا ناوی هەڵەی زەردەشتم وەکوو زەرتوشتنووسی. لەم لاو لا ڕەخنەیان لێ گرتم کە بۆچی زەردەشت کە خەڵکی سەردەشت بووە (!!) وەکوو زەرتوشت دەنووسی؟! پاشگری «سەر» لە «سەرچاوە» و «سەربەرد» و «سەرهەرد» «سەراو» و سەرمەنزل و... هەیە و ناوی ئەو شارە بە ناوی زەرتوشترەوە پێوەندی نیە. خۆمیش لە خۆم ڕخنەم گرت: بۆچی ناوێك کە بە هۆکاری مێژووییەوە بە هەڵە دابێژ دەکرێ هەروەها بە کاری نەبەم؟ ڕاستی ئەوەیە کە زەردەشتی لە زەمانی ئەشکانی و ساسانیەکان لە کوردستاندا ئەوەندە هۆگری نەبووە و پاش ئیسلامیش هیچ شوێنەوار

و جووڵانەوەیەك بە پێی ئاینی زەردەشتی لە کوردستاندا نەبووە. ئیتر بەسە. بـا نەکـەوینـە شـوێن قسەی هەندێ نووسەری فارس کە دەیانەوێ هەموو شتێ بە زەردەشتیەوە ببەستنەوە. حیکمـەتـی خەسرەوانی کە سوهرەوەردی ناوی دەبات پێوەندی بە «کەیخەسرەو» پادشای ئوستوورییەوە هەیە. لە ئەوێستادا (کەوی هەئووسرەوە») کەوی واتە سەروەر و هەئووسرەوە بە مانای ناوبانگ چـاگە «یـەك جار لە یەشتی ٥دا ناوی هاتووە کە لە ئەناهیتا دەپاڕێتەوە کە هێزی بداتێ تـا بـبێ بـە پادشـای وڵاتە گەورەکان. لەیەشتی ٩دا هۆم بۆی دەپاڕێتەوە تا بە سەر ئەفراسیاودا سەری خات. لە یەشـتی ١٣دا بۆ فەرەوەشی ئەونزا کراوە.

کەیخەسرەو لە ئەویستادا وەك پاڵەوان و شەڕکەری بەهێز ناسراوە. «لە یەشتی ١٥دا لـە ئیـزدی «وایو» واتە «با» دەپاڕێتەوە تا بە سەر «ئەئور وەسارەدا سەری خات». ئەو بـە سـەر هـەموواندا سەردەکەوێ و ئەفراسیاو و ئەوانی دیکە دەکوژێ. فەرهـەنـگ نامهـای ئـەوێسـتا. هاشـم ڕەزی ل ١٠٦٦ تا ١٠٧٠» دیارە کە کەیخەسرەوی ئەوێستا پالەوان و شەڕکەرە و دوژمنان لە نێـو دەبـات. هیچ تایبەتمەندیەکی عیرفانی و حیکمەتی نیە. «لە پەرتووکە پەهلەویەکاندا وەکوو پێغەمبـەر و پیرۆز ناسراوە کە بوتخانەی کافرەکان لە پاڵ گۆلی «چەئی چستە» تێك دەشکێنێ. مامۆسـتا ڕەزی دەڵێ «سەرکەوتنێکی سەربازی ئەوێستا لە دەقە پەهلەویەکاندا بووە بە شەڕی ئاینی. سەرچـاوەی ناوبراو. ل ١٠٧١» جگە لە شەڕەکانی لە دەقە پەهلەویەکانیشدا شتێ لە عیرفـانی و فـەلسـەفـە سەبارەت بە ئەو نەنووسراوە. ئەی حیکمەتی خەسرەوانی کە سـوهرەوەردی نـاوی دەبـات چـیە کـە نووسەرە فارسەکان دەیانەوێ بی‌نووسێنن بە زەردەشتیەوە؟ زۆر سەرنج ڕاکێشە کـە مامۆسـتا ڕەزی لە کتێبـی ناوبراوی‌دا دەنووسێ «هەروا کە فیردەوسی (لە شاهنامەکەیدا) چیرۆکی سیاوەشـی لـە سەرچاوەیەکی‌تر (جگە لە دەقە زەردەشتیەکان واتە ئەوێستا و دەقە پەهلەویـەکـان) وەرگرتـووە و ئێمە لێ ناگادار نین. ڕەنگە لە نووسینی بە سەرهاتی کەیخەسرەویـش‌دا هـەر لـەو سەرچـاوە یـان سەرچاوەگەلێکی‌تر کەلکی وەرگرتووە کە بە ئێمە نەگەیشـتووە. ل ١٠٧٨» زۆر سـەرنج ڕاکێشـە. ئەمە بە وردی وەکوو توێژینەرانی سوهرەوەردیە کە دەڵێن سەرچاوەگەلـی نەناسـراوە. کـەیخەسـرەو وەکوو «زات میهمان» لە دەفتەرەکانی کاکەیی‌دا ناوی هاتووە. لە بارەگە بارگەدا:

| | |
|---|---|
| وست ئـەو کـۆی بـەهرام وسـت ئـەو کـۆی | بارگەی شام لوا وسـت ئـەو کـۆی بـەهرام |
| شـام کـەیخەسـرەو بـی نـەدوون تـارام | نـامش دەرد زیـڵ مـەکـەر ژ تـارام |
| بەهرام پەی تـاج ڕێـو، وێـش وسـت نـەدام | ڕەوانـش چـون دوود بەرشـی نـە ئـەنـدام |

واتە شاهم خاوەندگار لە کۆی بەهرامدا بارگەی خست. شام کەیخەسرەو بوو لە جامە (جەستە)ی ئارامدا کە ناوی دەردی دڵ ئاسوودە دەکات. بەهرام بۆ تاجی ڕێو (مانای ڕێوم نەزانی) خۆی خستە داو و گیانی وەکوو دووکەڵ لە لەشی دەرچوو. لە شاهنامەی فیردەوسیدا کەیخەسرەو پاش شەڕگەلێکی مەزن دوژمنان دەشکێنێ و دەبێ بە پادشاهێکی مەزن. پاش ئەمە ڕوو لە خودا دەکات و «سرۆش» کە وەکوو جبرەئیلی ئیسلام و جووە دێ بۆ لای ئەو. پادشایی بە جێ دێڵی و ڕوو لە کێو دەکات. شەو لە پاڵەوان و سەربازەکانی ماڵئاوایی دەکات و گوم دەبێ. ئەم بە سەرهاتە کە فیردەوسی دەیگێڕێتەوە لە ئەوێستاو دەقە پەهلەویەکانی زەردەشتیدا نیە.

کەیخەسرەو پادشایێکی ئوستوورەییە و ڕاستەقینەی مێژوویی نیە. میهرپەرستەکان وەکوو ڕۆسەم و زاڵ و جەمشێد و... بۆ دەربڕینی باوەڕمەندیگەلیان کەڵکیان لێوەرگرتووە و کە هاتۆتە نێو ئەوێستاو دەقە پەهلەویەکانەوە ڕەنگ و بۆی ئاینی زەردەشتی گرتووە. دیارە لە میهرپەرستیدا وەکوو مەقامی سیمورغ بووە کە لە کاکەییدا وەك زات میوان هەر بەو مانا هاتووە. زۆر بە سەرهاتی شاهنامەی فیردەوسی هەیە کە شوێنەواری میهردینی هەیە وەکوو هەفت خوانی ڕۆسەم. بە سەرهاتی زەحاك و جەمشێد و... . جامەکەی جەمشێد و کەیخەسرەو کە جیهانیان تێدا دەبینی و ئاماژە بە دڵە بە تەواوی میهردینییە. لەم جامە لە دەقە پەهلەویەکان و لە ئەوێستادا هیچ شوێنەوارێك نیە. مەولەوی لە شیعرەکانیدا بە جامی جەمشێد و کەیخەسرەو ئاماژە دەکات ئەو بە مەیگێڕ دەڵێ

| | |
|---|---|
| چابوك بەو ڕەفتار بێ‌دەرەنگەوە | خەرامان بەو ناز باڵای شەنگەوە |
| جامت «جەم» ئاسا لەب ڕێژ | پێم نۆش کەروە یاد بەزم ئاراکەی «کەی»... |

سەبارەت بە تاریکی «عیزوددین نەسەفی» لە عاریفگەلی وەحدەت و جوودی ئێرانی دەڵێ: ئەی دەروێش جیهان دوو شتە. تیشك و تاریکی. مرۆڤی کامیل تیشکی بە تەواوی لە تاریکی جوێ کردەوە، بۆ ئەوەی تیشك لە هیچ کوێدا خۆی وەك خۆی نەزانی و نەدی تەنیا لە مرۆڤی کامیلدا خۆی وەك خۆی دی. ئەی دەرویش ئەم تیشکە بە گشتی لە تاریکی جوێ نابێتەوە چون تیشك لە لایەکەوە لە نێوان تاریکیدایە و تاریکی لە لایەکەوە لە نێوان تیشکدایە. ل ـ بیست»

سەبارەت بە دوو نادوون وەرگێڕی حیکمەتولئیشراق بە فارسی سەیید جەعفەر سەججادی لە سەرەتاکەیدا دەنووسی: «لەو شتانەی کە شێخ لەسەری دواوە دوونادوونە و ئاماژە و ڕوون کردنگەلێکی هەیە کەوا دیارە جگە لە کتێبگەلی پیرۆزی ئەوێستایی و ئاینزاگەلی

مەزدیەسنایی لە فیکر و ناکامی توێژینەکانی ئەبووڕەیحانی بیروونی سەبارەت بە ئاینگەلی هیندی کەڵکی وەرگرتووە یان لە ڕێگەگەلیترەوە بە سەرچاوەگەلی هیندی ئاگادار بووەتەوە. ل بیست و چوار»

زۆر جێگای سەرنج و سەرسووڕمانە. لە ئەوێستا و دەقە زەردەشتیەکان کە بە پەهلەوی نووسراون لە گشتیدا ناوێك لە دوونادوون نەبراوە و ئاینی زەردەشتی وەکوو ئیسلام و جوو دژ بە دوونادوونە. ئاینزاکانی مەزدیە سنایی یانێ چی؟ ئاینی مەزدیەسنا بە مانای ئاینی ستایشتی ئەهوورا مەزدایە کە ئەویش هەر زەردەشتیە. ئەگەر سوهرەوەردی لەسەر دوونادوون باس دەکات بۆ ئەوەیە کە لە زێدی خوی واتە سوهرەوەرد و بەشەکانی دیکەی کوردستان وەکوو ماردیندا بەوە باوەڕمەند بوونە. چ نیازێك هەیە کە لە هیندیەکانەوە فێر بوویێت. نووسەری بەڕێز لایەك بۆ کورد و شارستانیەتی ئەو ناکاتەوە. ئەم لانەکردنەوە بوەتە هۆی سەر لێشێواوی گشت شرۆڤەکەرانی ئێرانی و دەرەوە کە سەبارەت بە سوهرەوەردی نووسیویانە.

هەروەها دەنووسێ: «زۆر لە ئیستیلاحاتی «ئیخوانوسەفا» (فەیلەسووفگەلی شیعەی ئیسماعیلیە) لە شەهابی سوەرەوەریدا کاریگەریان هەبووە. «لە پەرتووکەکانی ئیسماعیلیەکاندا لە هەفت هەیکەل ناوبراوە ئەوە بە هەلکەوت نیە کە سوهرەوەردیش لە پەرتووکی، هەیاکیلونئوردا، هەر هەفت هەیکەلی هێناوە. ل بیست و شەش». (هەفت هەیکەلی نووری سوهرەوەردی بە وردی هەفتەنی کاکەیی خۆمانە. لە بەشی پاشدا دەری دەخەین کە سەرچاوەی ئیسماعیلیە و کاکەیی یەك شتە بەڵام مەبەست ئەوەیە دەیانەوێ سەرچاوگەی فیکری سوهرەوەردی لە کوردستان دوور خەنەوە و تا هیندوستانیش بیبەن.

هەروەها دەنووسێ: «وترا کە سەرچاوەی شێخ جگە لە پەرتووکگەلی دینی ئەوێستایی هەندێ پەرتووکگەلی دیکە بووە کە پاش ئەو لە نێو چووە. شێخ لە ڕێگای جۆراوجۆرەوە بەم ئاینزا گەیشتووە. لەوانە فەلسەفەی فیساغورسیگەل ـ فلووتین و ڕەنگە ئیسماعیلیە و ئیخوانوسسەفاو کتێبی(ماللهند)ی بیروونی. ل بیست و شەش. وتمان کە پەرتووکگەلی زەردەشتی فەڕی بە فەلسەفەی سوهرەوەردیەوە نیە. سوهرەوەردی ئەوەندەی عومر نەکردووە کە زمانی هێندی فێر ببێت. «ماللهند»ی بیرونیش فەلسەفەی هیندی تێدا نەنووسراوە و توێژینێکی کۆمەڵایەتی زانستوەرانەیە. سەرچاوەکانی پەرتووکگەلێك نین کە لە ناو چووبن. ئەو لە دینی باوانی خۆی فەلسەفەکەی دارشتووە.

هەروەها نووسیویە: «شێخ لەسەرەتای کتێبەکەیدا لە باری مەکتەب و ئاینەوە لە دوانەپەرستی و مەجووسی و مانی بێزراوی پیشان داوە و دەڵێ مەبەست لە نوور و تاریکی دوانە پەرستی مەجووس نیە و رەمزێکە لە شتێکیتر، کە وابوو شێخ لە رواڵەتدا موسڵمانە و ئاینی زەردەشتی بە ئاینێکی ئاسمانی دەزانێ ل ـ بیست و هەفت» (وتمان ئاینی میهری و دینە کوردیەکان، زەردەشت وەکوو پێغەمبەری خودا قبووڵدەکەن).

«شەهابوددین بە دەورە و خول باوەڕی هەیە. دوور نیە کە ئەم فیکرەی لە فەلسەفەی تایبەتی دوونادوونی هیند فێر بووبێت ل ـ پەنجا و شەش» (!!) هیند بۆچی؟ مەگەر لە دینە کوردیەکاندا نیە؟

سوهرەوەردی بۆ فەلسەفەکەی دەڵێ: لە فەلسەفەکاندا تەنیا مەششائی کە ئەرەستوو بناغەی دانا دەکرێ لەسەری باس بکرێ بەڵام زۆر ناتەواوە جگە لە ناساندنی لاوازیەکانی دەبێ لەگەڵ حیکمەتی زەوقی و ئیشراقی لێك بدرێت. ئەرەستوو مامۆستای ئەسکەندەری مەقدوونی بوو کە هێرشی کردە سەر ئێران. ئەو بناغەی فەلسەفەکەی لە زەردەشتی و میهرپەرستی ئێران وەرگرت. دیارە سوهرەوەردی ئەو بەشەی مەششائی کە لەگەڵ ئاینی باو باپیری خۆی رێك هاتوونەتەوە کەلکی لێ وەرگرتووە.

سوهرەوەردی پاش باسێکی دژواری فەلسەفی کە نەمتوانی وەریگێڕمەوە دەڵێ: جیهانی بوون بە گشتی لە دوو شت بناغە و سامان دەگرێ ئەوین و قەهر. واتە قەهری تیشکی سەروو لە تیشکی خواروو و ئەوینی تیشکی خواروو بۆ تیشکی سەروو ئەمە هەر باوەڕمەندی بە مەلەکەتاوسە.

لە پاش باسێکی فەلسەفیتردا دەڵێ «هوورەخش» (مەبەستی سوهرەوەردی لەم ناوە خۆرە. لە ئەوێستادا، هوەرەخشەئێتە، لە هەورامیدا هوەر و «وەر» لە پەهلەوی و کوردی سنەیی و کرماشانیدا خوەر کە رۆژ و ژیان پێك دێنی لە نەریتی ئیشراقدا شیاوی رێز و تەعزیمە. وەکوو رێزگرتنی میهرپەرستی و دینە کوردیەکان لە خۆر.

## ڕوون کردنەوەکان

١ـ نیزامی (نظامی) شاعیری هەرە گەورەی کوردی، فارسی وێژە وەکوو فیردووسی شاعیرێکی جیهانی و جێگای شانازی ئێرانیەکانە. شەفیعی کەدکەنی توێژینەر و مێژووناس و شاعیری فارسی لە پارچە شیعرێکدا کە بۆ موحەمەد قازی مەهابادی، وەرگێڕی مەزنی بەرهەمگەلی چیرۆك و ڕۆمانی جیهانی بە فارسی وتوویە:

...«سوهرەوەردی و نیزامی هەردۆ ئەز ئەکرادنەد» واتە سوهرەوەردی و نیزامی هەر دوو لە کوردەکانن نیزامی جگە لە قەسیدە و غەزل و شیوەکانیتری شیعر بە فارسی چەند چیرۆکیشی بە فارسی هۆنیوەتەوە لەوانە خەسرەو شیرین، لەیلی و مەجنوون، هەفت پەیکەر، شەرەفنامە و ئیقبالنامە و ئەسکەندەرنامە و بەرهەمی عیرفانی «مەخزەنولئەسرار». لەسەرەتای لەیلی و مەجنووندا بە دایکی سەرۆك هۆزی کورد ئاماژە دەکات کە ڕەنجی زۆری لەگەڵ کێشاوە

«گەرمادەرم ئان رەئیسەیێ کورد ـ مادەر سیفەتانە پێش مەن مورد.

غەم بیشتەر ئەز قیاس خوردەست ـ گردابە فزوون زقەدد مەرد ئەست....

واتە ئەگەر دایکم ئەو سەرۆك هۆزە کوردە وەکوو دایکی ڕاستەقینە لە لام مرد خەمی لە ڕادە بە دەری بۆ خواردم گۆم قوولتر لە بالای پیاوە. پاشان لە «خالۆ عومەر»ی یاد دەکات کە کاریگەری لە سەر هزر و فیکری هەبووە. ئەو لە ٥٣٦ی کۆچی (١١٤١ز) لە باژێری گەنجە لە وڵاتی ئەمڕۆی ئازەربایجاندا ئەو زەمانە بەشێ لە ئێران بوو لە دایك بوو و لە ٦٠٦ (١٢٠٩ز)دا هەر لەوێ مرد. لە چیرۆکەکانیدا بەتایبەت لە خەسرەو و شیریندا کە جێگای ڕووداوەکان کوردستان واتە بێستوونی کرماشان و قەسری شیرینە وەکوو خانی پێگەی ژن بەرزدەنرخێنێ. زۆرتر لە هەزار ساڵ ئەدەبی فارسیدا تا سەد ساڵ لەمەو پێش ئەمن نەمدیوە شاعیرێکی فارس بە ژنەکەیدا شیعری گوتبێ. ئەحمەدبەگی کۆماسی و مەولەوی نزیك بە دووسەد ساڵ لەمەو پێش بۆ مردنی هاوسەرەکانیان قەسیدی شین گێڕیان داناوە. پێش ئەوانیش خانی و نیزامی و... پێگەی ژنیان بەرز نرخاندووە.

٢ـ ئەبولقاسم فیردەوسی شاعیری هەرەگەورەی ئێرانی و جیهانی، هۆنەری «شاهنامە» کە تێدا بەرهەمە ئوستوورەیی و پاڵەوانی و هەندێ مێژوویی ئێرانی کۆنی لە شەست هەزار بەیتدا بە فارسی هۆنیوەتەوە لە ساڵی ٣٢٩ی کۆچی (٩٤١ز) لە گوندی «باژ» نزیکی شاری توس لە

«مەشهەد»ی ئێستا لە خوەراسانی رەزەوی ئێراندا لە دایك بوو و لە سالەکانی ٤١٠ تا ٤١٥ هەر لەوێدا مرد. سەبارەت بە شاهنامە و شاهنامەی کوردی لە ئایندەی ژمارە ٣٩دا باسم کردووە.

٣ـ «فەریدودین عەتتار»ی نەیشابووری لە ٥٣١ی کۆچی لە نەیشابوور خوەراسانی ئێران لە دایك بوو لە ٦٢٧دا هەر لەوێ بە دەست موغەلەکان کوژرا. شاعیری گەورەی سۆفی و عاریفی ئێرانیە. پەرتووکە هونراوەکانی لە گشت گرینگتر «مەنتیقوتتەیر» و «ئیلاهی نامە»یە و بە پەخشان «تەز کەرەتولئەولیا»یە.

٤ـ ناهید. لە ئەوێستادا «ئەناهیتا» لە روون کراوەکاندا باسمان کرد. خواژنی ئاوە. پاش هێرشی یۆنانیەکان بۆ سەر ئێران و هەندێ کاریگەری ئەوان لەسەر فەرەەنگی ناوچە لە بەرانبەر ڤێنووس کە گەرۆك ئەستێرەی زوهرەیە دانرا. بۆ ئەوەیە کە لە فارسیدا بە «زوهرە» ناهیدیش دگوترێ.

٥ـ گەوهەر. وشەی فارسی و کوردیە. لە پەهلەویدا «گۆهر». لە بناغەدا بە مانای رەسەن، سروشت ـ رەگەز و بەردی هەرە بە نرخ و تێکەڵ نەکراوە. گەوهەر تەعریب کراوە بە جەوهەر کە کوێ ئەوە بووە بە جەواهیر.

٦ـ «ریست ئاخێز» وشەی پەهلەوی کە لە فارسیدا بووە بە «رەستاخیز» واتە هەڵسانەوە. لە فارسیدا بە قیامەت و شورش و سەرهەڵدانیش دەڵێن. ریست لە پەهلەویدا بە مانای جەستەی مردووە. ریست ئاخێزی پەهلەوی بە مانای هەڵسانی مردووەکانە لە ئاخری دونیادا.

ئاخری دونیای زەردەشتی بە پەهلەوی «فرەش کەرت»ی پێ دەڵێن واتە نوێ بوونەوەی جیهان کە لەو کاتەدا ئەهریمەن واتە شەیتان لە ئەهوورامەزدا شکست دەخوات و دەکەوێتەوە دۆژەوە.

ئیتر تاریکی و چەپەڵی و پیری و مەرگ و خراپە و ئاژەڵی زیان هێنەری دەس کردی ئەهریمەن نامێنی و جیهان هەتا هەتایە دەکەوێتە روونـاکی و خۆشیەوە. مردووە گوناهکارەکانیش پاش ریست ئاخێز سزا دەدرێن.

وشەی «رەست» لە رەستاخیزی فارسیدا و وشەی رەستگاری فارسی و رزگاری کوردی نابێ لەگەڵ ریستاخێزی پەهلەوی تێکەڵاو بکرێت.

٧ـ سیمورغ (ب. ب روونکراوەکانی بەشی دووهەم ژمارە ١٥.

٨ ـ گەئوکەرێنە لە ئەوێستای دواییندا دارێکە لە زەریای ئوستوورەیی «ووئوورروو کەشە»دا. ووئوورروو بە کوردی دەبێ بە «هەراو» بە مانای پان و بەرین. کەشە دابێژیتری ئەوێستایی «کەرت»» کەرت لەو وشەدا بە مانای کەنار و قەراخە بە گشتی بە مانای هەراو کەنارەیە

«گەئوکەرێنە» بە مانای شیر دروست کەرە. گەئو لە ئەوێستادا هەم بە مانای گا و هەم بە مانای شیر و هەم بە مانای گۆشتە. لە کوردیدا بە مەمك دەڵێن «گووان» لەم بناغەیە. یان گوشت «گەئوش+ تە» گەئوش بە مانای گا و لەسەر «تە» باسمان کرد.

لە شیرەی گشت گیاگەلیٚ کە ئەهوورامەزدا دروستی کرد ئەو دارە لەو زەریادا دروس کرا. ئەهریمەن بۆ لە نیو بردنی ئەوداره نەهەنگێکی گەورەی ئافراند. ئەهوورامەزدایش لە بەرانبەر ئەوەدا دە ماسی گەورەی بە ناوی «کەرە» دروست کرد (ماسی قەشەی کوردی لەو بناغەیە). هاشمی رەزی لە لاپەرە ١١١٤ی فەرهەنگ نامهای ئەوێستادا دەنووسیٚ «داری تووبا لە عەقڵی سووری سوهرەوەردی لەگەڵ گەئوکەرێنە بە تەواوی تەتبیق دەکات»!! (کاتیٚ کە سوهرەوەردی دەڵیٚ نووری گەوهەری شەوچرا واتە مانگ، لە داری تووبایە ئایا مەبەست خۆرە یان ئەو دارە؟

٩ـ زاڵ کوردی. فارسی زال لە ئەوێستاییدا بناغەی «زەر» بە مانای، درەوشاوە بوون و نووورانی بوون. سەوز. زەردبوون ـ زێرین بوون و زێرین کردن و هەروەها پیربوونە. زاڵ گۆڕدراوی ئەوێستایی «زارتە» واتە درەوشاوە و پیرە. بە کەسیٚ دەڵێن کە مووی لەش و سەر و دیمەنی بە تەواوی سپی بیٚ. زاڵ کە لە دایك بوو مووی بە تەواوی سپی بوو بەم بۆنەوە باوکی فڕێیدایە دەشت.

١٠ـ ڕۆستەم فارسی. ڕۆستەخم پەهلەوی ڕۆسەم کوردی. «رەئوزە تەخمە» بە «ز» نوکدەدانی لە ئەوێستادا نازناوی گەرشاسپ پاڵەوانی ئوستوورەییە. رەئوزە (بە «ز» نوکدەدانی بە مانای رواو و هەڵکشاوە. تەخمە واتە جەستە قەوی بە گشتی بەی مانای کەسێکە کە جەستەی بە هێز و هەڵکشاوە و باڵا بەرزە. ڕۆسەم پاڵەوانی ئوستوورەیی کورد و ئێرانی چون میهرپەرەس بووە ناوی لە ئەوێستادا نەهاتووە. ئەو ئەسفەندیار کوڕی گوشتاسپ شا، کە پەرەپێدەری ئایینی زەردەشتی بوو کوشت. باسی ڕۆسەم لە شاهنامەی کوردیدا لەگەڵ شاهنامەی فارسی جیاوازی هەیە (ب.ب ئایندەی ژمارەی ٣٩). ڕۆسەم لە شاهنامەی فارسی فیردەوسیدا «سەکز»ی واتە خەڵکی سەکستان کە ئەمڕۆ دەڵێن سیستان باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێرانە ئەم جێگا لە سەرەتای مەسیحیەتدا پاش کۆچاندنی سەکاکان بۆ ئەویٚ بووبە سەکستان. دیارە ئوستوورەی ڕۆسەم زۆر لە سەردەمی عیسا کۆنترە و هەڵ دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەشتی پێش زایین کە لە ناوچەکانی «سەقز» کوردستانی ئێراندا بوون. لەوتارێکدا کە بۆ برادەرێکم بۆ کتێبەکەی «سیاوەش» نووسی، ئەم باسەم سەلماندووە. ئیتر چەند ساڵە خەبەرم لەو برادەرە نیە نازانم کتێبەکەی چاپ کردووە یان نا.

لە شاهنامەی کوردیدا شەڕی ڕۆسەم و ئەسفەندیار لـە «قـافلانتوو» نزیـك قـەڵای زێویـە لـە ناوچەی سەقز کە پێتەختی سەکاکان بووە ڕووی داوە. بۆ ناسینی زۆرتری قەڵای زێویـە بـڕوانن بـۆ کتێبەکەی «گیریشمەن»ی ئاڵمانی سەبارەت بە زێویە. وشەی سەقز و سـەکـز لـە بەردنووسـراوەی بیستووندا کە هی داریووشی هیخامەنشیە وەکوو «سەکەزە» هاتووە کە مەبەست جێگـای ژیـانی سەکاکانە. ئەمە چوارسەد ساڵ پێشترە لە سەکاکانی سیستان.

سەکاکان لە سەردەمی مادەکاندا لە «سەقز» کوردستانی ڕۆژهەڵات دەژیان. ناوی سەکز پاشـان سەقز لەوانەوە بە جێ ماوە و ڕۆسەم خەڵکی ئەوێ بووە.

١١ـ ئەسفەندیار فارسـی و کـوردی. پەهلـەوی «سـپەنـددات» ئـەوێسـتایی «سـپەنتۆداتـە» (سپەنت+ و+ دا+تە) سپەنت بە مانای پیرۆز و سوودبەخشە. لەسەر سێ وشەکەی‌تر بـاس کـراوە. بە گشتی بە مانای ئافرێنراوی «سپەندمینوو»یە کە لە زەردەشتی‌دا یەکـەم ئـافرێنراوی خودایـە. (دا= دان، بەخشین، ئافراندن و قانوون دانان)

١٢ـ «جەلال»ی حەق هەر مەبەست ئەوەیە کە سوهرەوەردی پـێ دەڵـێ «قـەهر». لـە ئـەدەبـی سۆفیگەری کوردی و فارسیدا بە زوڵف و برۆ شوبهێنراوە.

حافز شاعیری مەزنی ئێرانی دەفەرمێ

| | |
|---|---|
| گفتم کە کفر زولفت رسـوای عـالم کـرد | گفتا ئەگەر بـدانی هـم اوت رهـبر ئایـد |

وتم کەزیەت لە جیهاندا ریسوای کردم. وتی ئەگەر تێ بگەی هـەر ئـەوە ڕێ نـوێنی تۆیـە. لـە بەرانبەردا جەماڵی حەق بە دیمەنی جوان دەشوبهێنرێ. ب.ب شیعرەکانی جزیری و مەحوی و...

١٣ـ ئوستوورە وەکوو چیرۆك‌گەلێکە کە پێش دین و فەلسەفە ئامرازی پێوەندی‌گەلی کۆمەڵگـا و ڕێك خەری ئاکار و ڕەفتاری کومەڵگا بووە. کە دین و فەلسەفە هـات ئوسـتوورەکاریگەری ئـەو تۆی نەما و وەکوو چیرۆك دەگێردرێتـەوە. مرۆڤناسـی دەڵێـت پـاش تـەواو بـوونی خـولی دیـن و فەلسەفە خولی زانست جێگای دەگرێتەوە.

١٤ـ ئەو شیعرەی بێسارانی ئەمەیە. بێسارانی لە پێش کازیوەدا دێتە دەرێ و

| | |
|---|---|
| سۆسەن گوڵی دیم بۆ ش چون عەنبەر بی | دەهـەن شـکوفتەی بـاد سـەحـەر بـی |
| یەقـین خـۆ نـەوخێز خونچـەی سـاوا بـێ | جـە وەشـبۆش سـارای خوتـەن ئـاوا بـێ |
| بـەڵام سـوب سـەحـەر پێکـا بـێلافی | چـەنـی زوڵـف لـوول موشـگین کـلافێ |

واتش منیچ بۆم وێنەی بۆی زوڵفەن	بەڵام ئەو چین چین سەر تا پا کڵفەن

تومەز بای شەماڵ جەرووی زوڵف دەستە	چەنەش مەژنەوۆ چەندلاف بەی جەستە

بێ‌حیساب قاریێ نە دڵ مەبەرۆ	یەکجا دەهانش شکەست مەدەرۆ

جە پێکای ئەو لاف نامەوزوونەوە	هێمای دەهانش هاوە هوونەوە

سارای خوتەن= لە نزیك چین دایە و مامزی موشكداری تێدایە. پێکا بێ= لێدا بوو کڵفەن= وەکوو کلافەیە. چەنەش= لە ئەو مەژنەوۆ= دەبیسێ. پێکابێ= لێدا بێ

تومەز = وەك بلێی، لاف= قسەی زیادی. بەی جەستە= بەم وێنە. مەبەرۆ= دەبا. مەدەرۆ = دەدا پێکای= لێدان.

هێما= هێشتا. دەهان = دەم. هوون= خوێن.

سەبارەت بە شیعەیانی زێدەڕۆ «غُلاة الشیعة» و خوەرِم دینان کە بنەما و هەستانگای باوەڕگەلیان کوردستان و میهردینییە:

غوللاتی شیعە (غوللات کۆی «غالی»» بە مانای کەسێکە لە شتێکدا زێدەڕۆیی دەکات. غوللاتی شیعە ئەوانەن کە لە کەسایەتی عەلی کوری ئەبووتالیب (د- خ)دا زێدەڕۆیی دەکەن و تا پێگەی خودایی بەرزی دەکەنەوە. هەموو توێژینەرانی مێژووی ئیسلام و مێژووی فەلسەفە و باوەڕمەندیگەلی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست شیعەیانی زیدەرۆ دەخەنە پاڵ جۆرگەلیتری شیعە وەکوو کیسانییە و زەیدییە و ئیسماعیلیەی سەرەکی (بە باوەڕی من شیعەیانی ئیسماعیلی دەبن بە دوو دەستەی سەرەکی و دوایین کە دواییینەکانیان لە پاڵ شیعەیانی زیدەرۆییکەردا دەستەبەندی دەکرێن) و شیعەگەلی ئیمامیە یان دوانزە ئیمامی. لە ڕوانگەی نووسەری ئەم پەرتووکەوە ئەم دەستەبەندییە تا ئێستا هەڵە بووە و دەبێ لە ڕوانگەیەکی تازەترەوە دەستەبەندی بکرێن و شیعەیانی زێدەڕۆییکەر لە شیعەیانیتر جوێ بکرێنەوە. بە گشتی باوەڕمەندیگەل و مەکتەبگەل و ئاین و ئاینزاگەلێك کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراستدا هەن و باەڕیان بە دووناددوون واتە تەناسوخ و حولوول و هەروەها تەجەللای خودا لە زەوی و بوونەوەرگەلی ماددیدا هەیە تەنانەت مەسیحیش کە باوەڕی بە خودابوونی عیسا، یان تەجەللای خودا لە عیسادا هەیە بنەما و بنچینەیان میهرپەرستیە. لە نێو مادەکاندا لە گشت گرینگتر کوردەکانن چون کوردەکان هاوسێگەلی هەرە نزیکی ڕۆمیەکان و هۆزەکانی نێو چۆمانن. ئەگەر لە نێوان دینە کوردیەکان و باوەڕمەندیگەلی هیندوستان وەکوو برەهمایی و بوودایی‌دا لێك چوونگەلێك هەیە ئەمە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدە پێش زەردەشت واتە چەند سەدە پێش کۆچی ئارییایەکان کە باوەڕمەندیگەلی هاوبەشیان بووە و لە ناو هیندیەکان و مادەکان لەوانە کوردەکاندا پارێزراوە. ئەوەش بزانین کە «بوودا» بە وتەی خۆی پێغەمبەر نەبووە و تەنیا هەستاوە بە چاکسازی ئاینی کۆنتر واتە برەهمایی. بوودایی هەر ئاینی برەهماییە بە هەندێ چاکسازیەوە. ئەگەر برەهمایی و بوودایی لەگەڵ ئاینە کوردیەکان و میهرپەرستیدا لێکچوونی هەیە وا نیە کە ئەم دینگەلە لە هیندووستانەوە هاتووە بۆ

کوردستان. بارستای کوردستان و هیندوستان پانتایی ئێران و ئەفغانستان و پاکستانە. ئەم لێک چوونگەلە هەڵ دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی هاوبەشی هۆزگەلی ئارییایی زۆرتر لە هەزار و پانسەد ساڵی پێش زایین). زەردەشت کە لە مادی ڕۆژاوا واتە کوردستان یان ئازەربایجانی ڕۆژاوای ئێستادا هەستا هەروا کە خۆی لە گاساکاندا دەڵێ بە دەست «کاوە»کان و «کەرەپەن»ەکانەوە هەلات بۆ ڕۆژهەلاتی ماد (ئەو زەمانە ناوی ئێران لە گۆڕێدا نەبوو) بۆ دەرباری ویشتاسپ شاو لەوێ دینەکەی رەواجدا. ئەو یەکێ لە «ئەهوورا» یان بە هیندی «ئەسوورا»کانی ئارییایی واتە «ئەهوورا[1] مەزدا»ی وەکوو خودای تاك و ئافرێنەری گشت ناساند و لە بەرانبەر ئەودا گشت خودایان و ئوستوورەکانی‌تری ئارییایی وەکوو دێوپەرستی رەت کردەوە. یەکێ لەو خوداگەلە «میترا» بوو. مادەکان لەوانە کوردەکان ئاینی زەردەشتیان قبووڵ نەکرد و لە ئوستوورەی میترا ئاینی میتراپەرستیان پێکهێنا. لە گاساکاندا نەریتی میترایی واتە قوربانی‌کردنی گاوخواردنەوەی شەرابی هۆم بە ئاشکرایی رەت کراوەتەوە. بەڵام چەند سەدە پاش زەردەشت بە هۆی هەندێ هۆکاری رامیارییەوە خودایانی رەت کراوە لەوانە میترا هێنرانە نێو ئەوێستاوە.

هەندێ لە توێژینەرانی ئێرانی دەڵێن کە ئێرانیگەل بۆ دژبەری و لە ژێر کاریگەرینایینەکانی نێو چۆمان لە میترا خودای ئارییایی دینی میهرپەرستیان دروست کرد بەڵام ئەمە دروست نیە چون:

یەکەم، ئەگەر لێك چوونگەلێك لە نێوان میهرپەرستی و خۆرپەرستی میسرییەکانی قەدیمدا هەیە، ئەوە خۆرپەرستی بوو و دەزانین میترا خۆرنیە جگە لەوەش کورد گەل لەگەڵ ئاشووری و بابیلی و کەلدانی و جووی بە زۆر کۆچراو بۆ بابیلدا هاوسێ بوون نە میسر. توێژینی دینەکانی ئاشووری و بابیلی و کەلدانی پیشان دەدات کە کەمترین لێك چوونێکیان لەگەڵ میهرپەرستی مادەکاندانیە. پێشینەی ستایشتی میترا نە وەکوو ئاین بەلکوو وەکوو داب و نەریت لە نێو مادەکاندا هەبووە. لە هەندێ دەقی زەردەشتی و ئیسلامیدا هاتووە کە باوکی زەردەشت میهرپەرست بووە. لەوانە ئاسارولباقیەی ئەبوورەیحانی بیرونیە. ئەوەش کە دەڵێن بۆ دژبەری لەگەڵ ئاینەکانی نێوچۆماندا دروس کراوە تەواو نیە. دروست ئەوەیە لە بەرانبەرکێ لەگەڵ «پارس»ەکانی باشووری ئێراندا دروست کرا کە حکوومەتی مادەکانیان رووخاند و «گەئوماتە»ی موغیان کوشت و مادیان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە. ئاشوور رووخابوو. جووی بە زۆر کۆچراو هێشتا ئیلاهییاتی تاکپەرستی خۆیان دروس نەکرد بوو. ئەو کاتە هێشتا خودای ئەوان «یەهوە» تەنیا خودای بەنی ئیسرائیل بوو نە ئافرێنەری گشت جیهان (ب.ب کتێبی: ئائین یهود، عباس اقبال

ئاشتیانی). حکوومەتی بابلیش بە دەست کووروش یەکەم شای هیخامەنشی ڕووخابوو. تەنیا دەسەڵات پارسەکان بوون.

بنەمای ئاینی میترایی لە سەر تەجەللای خودا ئافرێنەری گشت لە زەویدایە لە هەیئەتی مرۆڤێکی هەرە جواندا کە پەیکەرەکانی لە ئەشکەوتە میترایییەکانی ئەورووپا لە کاتی قوربانی کردنی‌گادا هەیە. هەندێ پەیکەریشی لە کوردستانی باکووردا هەرماوە. وەکوو سەری گەورەی میترا لە نەمرووددداغدا کە باسی دەکەین.

میترا پاش ئەنجامدانی کارەکانی بۆ ناو خۆر سەردەکەوێت و پاشان وەکوو قوتب، وەلی، یان بە ئاماژەی سوهرەوەردی سیمورغ یان بە وتەی دینە کوردیەکان زات بەشەر و زات میهمان و... لە جەستەگەلێکی‌تردا دەردەکەوێ.

تەجەللا و دوونادوون کە بناغەی ئاینی میتراییە و بە تەواوی لە باوەڕگەلی شیعەیانی زیدەڕۆیی کەردا هەیە و هەروا کە وتمان دانانی ئەوان لە پاڵ شیعەکانی‌تردا وەکوو پەلێك لە شیعە هەڵەیە.

یەکی‌تر لە تایبەتمەندیگەلی شیعەیانی زیدەڕۆیی‌کەر «تەئویل»ی قورئان و باتنی‌گەرییە واتە بە باوەڕی ئەوان لە پشت ڕستەگەل و ماناگەلی ڕواڵەتی قورئانەوە مەبەست‌گەلێکی‌تر هەیە و لە بەتن واتە ناخی ئایەکانی قورئاندا ماناگەلێکی‌تر شاراوەیە. تەنانەت هەندێ لەوانە دەڵێن قورئانێ کە ئێستا هەیە بەش یان بەشگەلێکی ناتەواوە و بە لای ئەو کەسەوەیە کە پاشان وەکوو «وەلی» دەردەکەوێت. ئەوەی کە لە ئیسلامدا سەبارەت بە عیسا وەکوو پێغەمبەرێکی خودا هەیە نە کوڕی خودا یان خودی خودا، یان تەجەللای خودا لە زەویدا، ڕەسەنترە. بەڵام ئەو مەسیحییەتە کە چەند سەدە پاش عیسا چوو بۆ ڕۆم و ئەورووپا و پاشان ئەوان لە جیهاندا بڵاویان کردەوە وەکوو عیرفانی وەحدەتی وجوودی (کە دەڵێن خالیق و مەخلووق یەك شتە) و وەکوو شیعەیانی زێدەڕۆیی‌کەر بنەمای میهرپەرستی هەیە.

ڕێکەوەندی «غوللاتی شیعە» پاشان دروست کرا. شیعە لە پێشدا بە لایەنگرانی عەلی «د ـ خ» و عوسمان (د ـ خ) دەگوترا. لە شیعەیانی عوسمان لە مێژوودا ناوێکی ئەوتۆ نیە بەڵام شیعەگەلی عەلی ئەمانەی خوارەوەن:

١ـ شیعەگەلی کیسانیە، کە چوار ئیمامیش یان پێ دەڵێن. باوەڕیان وایە کە «موحەمەد» کوڕی عەلی پاش حەسەن و حوسەین ئیمامی ئاخرە.

٢ـ شیعەگەلی زەیدییە کە دەڵێن ئیمامی ئاخر یەکێ لە کوڕەکانی ئیمام «زەینولعابدین» بە ناوی «زەید»ە. پێنج ئیمامیشیان پێ دەڵێن.

٣ـ شیعەگەلی ئیسماعیلییەی سەرەکی. کە دەڵێن ئیسماعیل کوڕی ئیمام جەعفەری سادق ئیمامی ئاخرە.

پاشان لە سەرەتای سەدەی سێ کوچیدا فیرقەگەلێ بە ناو شیعەیانی زێدڕۆیی‌کەر دزەیان کردە نێویان و پەلگەلێکیان وەکوو قرمەتی‌گەل و پاشان «نزاری»گەل و سەرۆکایەتی حەسەنی سەباح بوون بە شیعەی زیدەرویی‌کەر و دابگەلێك وەکوو ئەوان لە ناویاندا دروس بوو.

٤ـ شیعەگەلی ئیمامییە کە ئیمامی ئاخریان ئیمامی دوانزەهەم بە ناوی موحەممەد مەهدی کوڕی حەسنی عەسکەرییە. دوانزە ئیمامی و جەعفەریشیان پێ دەڵێن.

ئەم چوار پەلە شیعە جگە لە ئیسماعیلییەی دواینی شیعەگەلی ڕاستەقینەن کە بناغەیان هەر لە زەمانی عەلی (د- خ)دا دامەزرا. ئەمانە لەگەڵ لقگەلی سوننی جیاوازی ئەوتۆیان نیە. وەکوو سوننەکان بە تەجەللای خودا لە عەلی‌دا باوەڕیان نیە. دوونادوونیان قبوول نیە و بە تەئویلی قورئان باوەڕیان نیە و قورئانێ کە ئێستا هەیە بە تەواوی دەزانن. ئەوانەی کە بە غوللاتی شیعە ناسراون ئەمانەن. کاکەیی (ئەهلی حەق) ـ بەکتاشی ـ نوسەیری و درووزی و گشت لقگەلی عەلەوی کوردستانی باکوور و شەبەك.[٣] شەبەك بە شیعەی دوانزەمیش ناسراون بەڵام لە هەندێ جێگادا وەکوو غوللات ناسراون. لەمانە گشت بەهۆی «تەقیە» (واتە شاردنەوەی باوەڕگەلیان) تویژینەرانی دەرەوە و ناوچەیی نەیانتوانیوە بە تەواوی لە چەند و چۆنی باوەڕگەلیان تێبگەن بەڵام هەستانگاو پێگەی مێژینەی گشتیان کوردستانە. لە زەمانی خەلیفەگەلی عەبباسی و بە گشتی حکوومەتی سوننیەکاندا ئەمانە و فرقەگەلێکی‌تر وەکوو خوەڕم دینان (خوڕەم دینان دابێژی فارسی تازەیە و هەڵەیە. لەسەری باس دەکەین) و سپی جامەگان و دەهریوون و... بە «زەندیق» دەناسران و کوشتنیان واجیب بوو. ئەمە بوو بە هۆی ئەوە کە لە نێوانیان بەتایبەت لە نێوان ئەوانەی وا بە غوللاتی شیعە ناسراون تەنانەت لە شیعەگەلی ڕاستەقینەیشدا «تەقیە» پەیدا ببێ.

تەقیە هەر لە زەمانی ساسانیەکانەوە لە ناو میهرپەرستەکاندا هەبوو. تەقیە لە ناو کوردە کۆچەریەکانی ئەفغانستان و گێلان و مازندەرانیش‌دا هەیە. بۆیە گشت تویژینەران گوتوویانە باوەڕمەندیگەلیان نەزانراوە چیە.

نووسەری کتێبی «فرهنگ گیل و دیلم» جەنابی مەحموودی پایەندی لەنگروودی لە لاپەرە ٦٠١ی کتێبەکەی‌دا لە کوردگەلی دوورخراوە بۆ باشووری دەریای مازندەران و ڕۆژهەڵاتی گیلان و ناوچەی چەخاڵە ناو دەبات و دەڵێ «ئاین و مێژوویان شاراوەیە و کەس نازانێ لەسەر چ دینێکن».

دیارە ئەوانیش لە لق و پەلگەلی جوێ بوو لە میهرپەرستین و پاش ئیسلام خۆیان بەستووە بە شیعەوە و بە ڕاگرتنی چوارچێوەی میهرپەرستیەوە پاشان وەکوو غوللاتی شیعە ناسراون.

عەلەوی‌گەلی تورکیا کە زۆربەیان لە کوردستانن بەشێکیان شیعەی دوانزە ئیمامین بەڵام زۆربەیان پاشماوەی میهرپەرستین و بە غوللاتی شیعە ناسراون. چل ساڵ لەمەو پێش کە لە سنووری تورکیا «سەرباز ماموستا» (سپاه دانش) بووم لەگەڵ یەکێکیان قسەم کرد کە لە ناو نووسراوەکاندا دۆزیمەوە. دەی‌گوت گرینگترین ڕۆژ لە مێژووی مرۆڤدا ڕۆژی «عاشوورا» دەی مانگی موحەررەمە. لەو ڕۆژەدا ئیمام حوسەین بۆ ڕزگاری و ژیانەوەی دووبارەی ژیانی مرۆڤ خۆی بە کوشتن‌دا. ئەمە بە تەواوی لە سەر باوەڕی میهرپەرستیە کە میترا بۆ بووژانەوەی ژیان، خۆی لە وجوودی مانگدا (گا) قوربانی کرد. دەڵێن ڕۆژی عاشوورا ڕۆژی ئافراندنی ئادەم، تەواوبوونی باهۆزی نوح، ڕزگاری ئیبراهیم لە ئاگری نەمروود و... بە گشتی ئەو شتگەلەیە کە لە پێشدا میهرپەرستگەل بە چەشنێکی‌تر بۆ جەژنی لە دایك‌بوونی میترا (دەرکەوتنی لە بەرد یان سەدەف) دەیان گوت.

«ثاراللە» کە خۆی قوربانی مرۆڤ و بووژانەوەی کرد بە تەواوی باوەڕێکی میهرپەرستیە. ئەو خوێنی بە دەست یەزیدرژا واتە یەزید یەکێ لە هۆکارەکانی ژیانەوەی دووبارەی مرۆڤ بوو، ئەمە بە تەواوی دەربڕینی باوەڕ بە مەلەکە تاوسە بەڵام بە بەیانی ئیسلامی. لەو پەیڤەدا یەزید وەکوو بەکر لە مەم و زین و شەیتان لە پرۆسەکەی ئادەم و حەوادایە. جا یەزید دەبێ بە نوێنەری ئەو پەیکەرە ترسناکانە لە ستایشتگاگەلی میهرپەرستیدا کە باسمان کرد. بزانن باوەڕ بە مەلەکە تاوسی کوردی چون لە نێو عەلەویەکاندا بە ئاماژە و وتن‌گەلێکی‌تر هەر ماوە.

هەروەها لە عیرفانی توندرەودا کە لە عەینولقوزات و.. باسمان کرد کە شەیتان نفرین ناکەن. لق‌گەلێکی مەسیحیش کە دەڵێن خۆدا بۆ خۆشبەختی بەشەر خۆی لەو جوودی عیسادا قوربانی کرد هەر باوەڕمەندی میهرپەرستیە و بنەمای لە کوردستاندایە.

غوللاتی شیعە کە وتمان بە هەڵە ناونراون چۆن پێکهات؟

دامەزرێنەری حکوومەتی ساسانیەکان، ئەردەشێری بابەکان لە سەدەی سێی زایینی ئاینی زەردەشتی لە ئێراندا فەرمی کرد. ئەو ئاینە زۆرتر لە رۆژهەلات و باشووری ئێراندا باو بوو و ناوەندگەلێکیشی لە ناوچەی ماددا بوو بەلام مادەکان لەوانە کوردەکان لە سەر ئاینی میهرپەرستی بوون. ئەردەشێر پاش دوو شەڕ لەگەڵ کوردەکاندا ئاینی زەردەشتی فەرمی کرد بەلام نەیتوانی ناوەندی گەورەی میهرپەستی لە کوردستانی باکووردا لە نێو بەری. لە جێگاکانی‌تری کوردستان و ئازەربایجاندا میهرپەرستی بە شاراوەیی مایەوە و لە هەندێ جێگایش‌دا میترا تێکەڵاو لەگەڵ زەردەشتی‌دا هەر ستایشت دەکرا و پێگەی هەرەبەرزی هەبوو. ئەم بارووددۆخە تاهێرشی موسڵمانەکان بۆ سەر کوردستان و شام و ئێران و میسر و... درێژەی هەبوو. میهرپەرستی بە «تەقیە»وە هێنرایە پاش ئیسلام واتە سەردەمی حکوومەتی ئومەوی و عەباسیەکان. پێکهاتنی ئیسلام و هێرش کردنە سەر ولاتانی گەورەی رۆژهەلاتی نێوەراست ئەم ناوچەیەی تا سنوورەکانی چین و هێندی هەژاند بوو. زەردەشتیەکان موسڵمان کرابوون ئەوەشیان کە لە باشووری ئێراندا مابوونەوە هەتوانی هەر چەشنە شۆڕشێکیان لێ بڕا بوو. لە ئاینی زەردەشتی‌دا تەقیە و شاردنەوەی بیروباوەڕ زۆر ناپەسەندە و بە هاوکاری دێوی «دورۆج لە کوردیدا دورنج» واتە دێوی درۆ دەزانن. زەردەشتیەکان جگە لە باشووری ئێران ناوەندگەلێ زۆر چکۆلەشیان لە ئێراقی ناوەراست بەتایبەت لە شاری بەغدا مابۆوە، بەلام میهرپەرستەکانی کوردستان لە رۆژهەلات و باکووردا بە تەقیە مابوونەوە و چاوەڕوانی هەل و مەرج بوون. میهرپەرستی لە کوردستاندا وەکوو ئاین بوو بەلام لە جێگاکانی‌تری ئێران لە ناوەڕاست و باشوور و ڕۆژهەلات‌دا وەکوو رەوتێکی عیرفانی و رۆشنبیری نە وەکوو ئاین لە بەرانبەرئاینی حکوومی‌دا هەبوو. ئەم رەوتە لە باکووری رۆژهەلاتی ئێراندا بەهۆی دوور بوونیان لە ناوەندی بەغداوە لە سەدەکانی دووهەم و سێهەمی کۆچیدا وەکوو شۆڕشی «بیە ئافەرید» و «ئاستازیس»دا دەرکەوت بەلام هەر دوو شۆڕشەکە لە خوێندا گەوزا. پاش هاوکاری ئەبوو موسلیمی خوەراسانی لەگەڵ عەبباسیەکان و تێکشکانی ئومەویەکان و پاشان کوشتنی ئەبوو موسلیم میهرپەرستەکان لەو دەرفەتە کەڵکیان وەر گرت و کەسگەلێك هەستان و وتیان رۆحی خودا لە ئەبوو موسلیم‌دا بووە و ئێستا هاتۆتە جەستەی ئێمەوە. شورشگەلێکیان رێك خست کە ئەوانیش سەر نەکەوتن. لە کوردستانی باکوور و بەشێ لە باشووردا، میهرپەرستی وەکوو خۆی بەلام بە ناوی ئێزدی مایەوە. لە جێگاکانی‌تری کوردستاندا میهرپەرستەکان هاتن تا هەژاندنی دنیای ئەو زەمانە بە دەس ئیسلام لە چوار چێوەی ئاینی خۆیاندا بگونجێنن بەو مەرجەی کە

چوارچێوە و بنەمای ئاینەکەیان (تەجەللای خودا لەسەر زەوی و دوونادوون) لە دەس نەچێ. یەکەم ئیسلامیان وەکوو دینەکانی‌تر کە هەر گەلاڵە و ویستی خودایە قبوولْ کرد. ئەو شتانەی لە قورئاندایە بە جێگای تەفسیر تەئویل کرا. پێغەمبەری ئیسلام (د ـ خ) یان وەکوو هەناردراوی خودا بۆ فێرکردنی «شەریعەت» قبوولْ کرد. ئەگەر ئەم دینە گەورە هەر ویست و گەلاڵەی خودایە جا لەو زەمانەدا تەجەللای خودا کێ بووە. ئەم کەسە جگە لە عەلی کوڕی ئەبوو تالیب (د ـ خ) کە لەگەلْ دوژمن و چەوسێنەری ئەوان واتە ئومەویەکاندا شەڕی کرد و کوڕەکانیشی هەر لەم ڕێگادا کوژران کەسی‌تر نەبوو. جا لۆگەلێك لە ئێزدیەکان جویێ بوونەوە و بە تەجەللای خودا زانینی عەلی فیرقەگەلێکی‌تر لە میهرپەرستی بە ناوگەلێکی‌ترەوە بەلاّم بە پاراستنی چوارچێوەی میهرپەرستیەوە پێکهاتن کە لە مێژووی ئیسلامدا بە هەلّە بە «غوللاتی شیعە» ناسراون. وتمان شیعەی ڕاستەقینە هەر لە زەمانی عەلیەوە پێکهاتن و لقەکانی تا ئاخر و ئوخری سەدەی دوو و سەرەتای سەدەی سێی کۆچی لە عەرەبستان و ئێراقدا پێکهات و بە ئێران و جێگەگەلی‌تردا بلاّو بۆوە بەلاّم ئەوەی کە بە غوللاتی شیعە ناسراون لە کوردستان بەتایبەت لە کوردستانی باشوور و ڕۆژهەلاّت، لە ڕۆژهەلاّتدا بەتایبەت لە کرماشان و هەورامان و لوڕستاندا پێکهات و ڕاگەیەنەرەکانیان بۆ ناوچەگەلی‌تری ئێران وەکوو گێلان و هەمەدان و ئەسفەهان و ڕەی (تاران) و... چوون. لە ناوچەگەلی ماد کە ناوەندی گەورەی میهرپەرستی بوو ناوچەگەلی بەرزنجە تا هەمەدان هەرە گرینگ بوو.

بەرزنجە تەعریب کراوی «بەرزینگهە» بە ئەویستایی واتە جێگای «بەرزە»کان. بەرزە، یان بە دابێژێکی‌تری ئەوێستایی «بەرزەنگهە» ناوی عەشایەری هەرە بە هێزی کوردی زەمانی ساسانیەکانن کە پاش ئیسلام بە ناوی عەشایەری بەرزەنگهانی و بەرزنگانی و بەرزینگانی لە باشووری ئێران واتە فارس و کرماندا ڕۆلّی هەرە گەورەیان گێڕا (ب.ب مێژووی فارسنامەی ناصری) و مێژووی (تاریخ ئیستەخری). لۆگەلی ئەم عەشایەرە لە چوار پارچەی کوردستاندا هەن. بەرزان و خانەدانی بەڕێزی «بەرزانی» (بارزانی) و شاری «بەرزە» کە گەشتیار و مێژوونووسە عەرەبەکان ناویان هێناوە و لە نزیکی سەقزی ئەمڕۆدا بووە و کێوەکانی «بارز» لە کرمان و باشووری ڕۆژهەلاّتی ئێران و... یادگاری ئەم هۆزەن. جا بەرزنجە و هەورامان و کرماشان و هەمەدان و لورستان ناوندگەلێکن کە لەوانەدا میهرپەرستی بە ئەو شتەی کە بە هەلّە دەلّێن غوللاتی شیعە گۆڕدرا. لە ناو ئەمانەدا ئیسماعیلیەی دوایین دژبەری و شەڕی زۆریان لەگەلْ

حکوومەتە سوننییەکانی بەغدا و ئێراندا کرد تا ئاخری بە دەست هولاگووخانی موغول قەڵاکانیان لە قەزوێن و گیلاندا رووخاو پاشماوەکانیان بۆ هیندوستان هەڵاتن کە ئیستایش کەمینەیەکیان لەوێ ماوەتەوە. رێبەرانی ئەم فیرقە لە عاریف و رۆشنبیرە ئێرانییەکان بوون کە لە ناویانسدا میهرپەرستی وەکوو رەوتێکی عیرفانی و رۆشنبیری تا پاش ئیسلام درێژەی پەیدا کردبوو. و لە ژێر کاریگەری راگەیەنەرە کوردەکاندا بوون. ئەگەر لە ئەدەبی فارسیشدا عیرفانی توندڕەوی وەحدەتی وجوودی هەیە ئەوەش هەر لەم سەرچاوەوە پێکهاتووە. لە رەوتی مێژوو لە گشت کومەڵگا فیئودالیەکاندا لە بەرانبەر دینی دەسەڵاتەوە رەوتێکی سۆفیگەری و عیرفانی هەبووە. لە ئێراندا جگە لە کوردستان ئەم رەوتە میترائیسم بووە بەڵام نە وەك دین بەڵکوو وەکوو پرۆسەیەکی عیرفانی. ئەدەبی عیرفانی پاش ئیسلامی ئێرانیش پاش سەدەی شەشی کۆچی شوێنەواری ئەم رەوتەی پێش ئیسلامە. ئەگەر کەسانێ لایان وایە کە سۆفیگەری و عیرفان سەرچاوەگەلی ئیسلامی هەیە هەرگیز ناتوانن عیرفانی توندڕەو کە عەقیدەی بە یەك بوونی ئافرێنەر و ئافرێنراوە بە ئیسلامی بزانن. ئەوەی کە بە شیعەی زێدەڕۆییکەر ناسراوە نە تەنیا لەگەڵ شیعەی راستەقینە کە یەکی لە لقەکانی ئیسلامە بەڵکم بە گشتی لەگەڵ ئیسلام و جوو و زەردەشتیدا جیاوازی بنەڕەتی هەیە (بەڵام دژبەری و دژایەتی نیە). ئیسلام و جوو و زەردەشتی ئیلاهییاتیان جیاوازی ئەوتۆی نیە. پێوەندی ئافرێنەریش لەگەڵ دیاردەی شەڕ (شەیتان) لە هەر سێ دیندا زۆر لە یەك نزیکن. ئەهریمەن یان شەیتان یان ئیبلیس لە هەر سێ ئایندا ئافرێنراوی خودایە. لە هەر سێدا ئافرێنەر موتلەقە و لە گوێنی مادە نیە. لە هەر سێدا دوونادوون نیە یان لە هەر سێ تەجەللای ئافرێنەر لە مرۆڤدا شتێکی ناڕاستە. ئەوانە کە لەو سێ دینەدا ناڕاستە لە بنەماکانی میهرپەرستی و دینە کوردیەکان و ئەوانەن کە بە غوللاتی شیعە ناسراون. بەم هۆیە نازناوی شیعە بۆ ئەوان دروست نیە.

وتمان پاشماوەی میهرپەرستگەل یەك دوو سەدە پاش ئیسلام لە ئێزدی جوێ بوونەوە و بەهۆی گۆڕانکاری بە هێزی ئیسلام بەو قەناعەتە گەیشتن کە ئیسلامیش وەکوو دینەکانیتر دینی خوداییە و لە کاتی پێکهاتنی ئیسلامدا هاتنە خوارەوەیەکیتری تەجەللای خودا رووی داوە. وترا لە سەرەتای درووسبوونی ئیسلامدا عەلی تەجەللای خالق بووە و بۆ ڕزگاری مرۆڤ خۆی و پاشان کوڕەکانی بوون بە قوربانی ڕزگاری مرۆڤ. پاش ئەوانیش ئیمامگەلێکیتر هاتن کە ئەوانیش

تەجەللای خودا بوون. جگە لە ئیمامەکان کەسانیتریش وەکوو تەجەللای ئافرێنەر لە زەویدا پەیدا بوون.

بەڵام لە غەزا و هێرش کردنە سەر بە دوور نەمان و لە بواری زەمانیشدا لە ئێراندا لە بەرانبەر شیعەی ئیمامییە و لە کوردستاندا لە بەرانبەر سووننەدا توانەوە و ئێستاش ئەم توانەوە هەر بەردەوامە. هەروەها کە ئێزدی لە کوردستانی باکوور و باشووردا بەهۆی غەزاگەلی پەیتا پەیتا رووی لە کەم بوونەوە نا، غوللاتیش هەروەها لە کەم بوونەوەدان. حکوومەتی کوردستانی دەبی بۆ بەرگری لە لەناوچوونی ئێزدی و عەلەویەکان کە میرات هەڵگرانی ئایینی کۆنی کوردن هەنگاو بنێ.

مێژوونووسە ئیسلامیەکان و ئەوانەی دەرەوە بەتایبەت «پیتروشوفسکی» کە کتێبی هەرە بە نرخی «ئیسلام لە ئێراندا»ی نووسیوە ئیسماعیلیە بە شیعەی زێدەڕۆییکەر نازانێ. بەڵام بە پێی هەندێ بەڵگە و «تەتویل»ەکانی لقی نەزاری و قیرمەتی شیعەی ئیسماعیلی، دەتوانین ئیسماعیلی دوایین وەکوو غوللات دابنێین. بۆ ئەم گریمانە لە پێشدا هەندێ بەڵگەم لە «ئەلکامیل» و وەفەیات... و سیاسەتنامە و... م کۆ کردەوە بەڵام پاشان سەرنجم ڕاکێشرایە سەر کتێبی هەرە زانایانەی «بابەکی خوڕڕەم دین» لە خوا لێخۆشبوو «سەعیدی نەفیسی». ئەم بەرێزە رەنجی زۆری بۆ وەدەست خستنی دەق و بابەت سەبارەت بە خۆررەم دینییەکان و لە پێوەندی لەگەڵ ئەواندا ئیسماعیلییە کێشاوە. ئەو شتگەلە کە من لە هەندێ سەرچاوە دەرم هێنابوو ئەو بەرێزە بە وردبینی زۆرترەوە سی ساڵ پێش من هەولێ لە سەرداوە. ئەوەی کە سەبارەت بە گریمانەکەی ئیمەیە لە بەرهەمی توێژینی ئەو بەرێزە کەڵك زەردەگرین:

«خواجە نیزامولمولکی تووسی» لە کتێبی «سیاسەتنامە» لە سەدەی شەشی کۆچیدا دەڵێ ...لێرەوە ڕوون بۆوە کە بناغەی ئایینی مەزدەك و خوڕڕەم دین و باتنیگەل (مەبەستی ئیسماعیلییەیە کە قورئان تەئویل دەکەن) یەك شتە. لە پێشدا خۆیان بە ڕاستوێژی و لایەنگری و خوشەویستی ئالی رەسوول (د ـ خ) دەناسێنن تا خەڵك ڕاوکەن. پاشان کە هێزیان گرت تێدەکۆشن کە ئۆمەتی رەسوول لە خشتە بەرن. کتێبی ناوبراو. ل٢٣»

ئەمە دورستە کە بناغەی خوەڕمدینی و ئیسماعیلییەی دوایین یەك شتە. ئەگەر خوەرمدین بە پاشماوەی ئایینی مەزدەك بزانین کە لە زەمانی فەیرۆز و ئەنەوشیەواندا دینێکی تازەی هێنا، بەهۆی

لێكچوونی زۆری خوەڕم دینی لەگەڵ میهرپەرستیدا من بەو قەناعەتە گەیشتووم خوەڕم دینی پێوەندی بە ئاینی مەزدەکەوە نیە.

خوەڕمدینی وەکوو میهرپەرستی بە دوونادوون و تەجەللای خودا لە ڕێبەرانی ئاینیدا باوەڕی هەیە کە ئەوانە لە مەزدەکیدا نیە. ئیلاهییاتی مەزدەکی وەکوو ئاینی مانی زۆرتر بۆ لای دوانەپەرستی دەکێشرێ بەڵام هیچ مێژوو نووسێك گوزارشتی لە دوانەپەرستی خوەڕم دینییەکان نەداوە. لێكچوونگەلی خوەڕمدینی و غوللات و ئێزدی ئەوندە زۆرە کە گومانی تێدا نەماوە کە هەر سێ یەك سەرچاوەیان هەیە و ئەوەش میهرپەرستیە نە مەزدەکی. ماموستا نەفیسی نووسەری ناوبراو پاش خوێندنی بەرهەمی مێژوونووسان دەڵێ «هەندێ مێژوونووس خوەڕمدینانیان لە مەزدەکیگەل و هەندێ لە باتنیگەل و ئیسماعیلیەیان زانیوە و هەندێ لە لقەکانی موسلمییە یان ئەبوو موسلیمە و هەندێکیتر لە غوللات یان غالییە دەزانن. ل ۲۲ کتێبی ناوبراو». ئەوەی کە ماموستا نەفیسی پاش توێژینی زۆر پەی پێ بردووە هەر ئەمەیە. بەڕاستی بۆوایە؟ ئایا بنەمایەکی هاوبەش بۆ ئەو فیرقەگەلە نیە و نەبووە؟ مامۆستا لە درێژەدا دەنووسێ «بەڵام ئەو شتەی کە لێرەدا ڕاستە ئەوەیە کە خوررەم دینەکان بە دوونادوون و هاتنەوەی گیانەکان (لە جەستەگەلیتردا) باوەڕیان بووە. وەکوو مەزدەکیگەلیش هەندێ شتیان هاوبەش و حەڵاڵ زانیوە ل ۲۲ کتێبی ناوبراو» باوەڕ بە تەناسوخ و دوونادوون بناغەی میهرپەرستی و ئێزدی و غوللاتە. مێژوونووسان و ئاینناسان نەیان نووسیوە کە مەزدەکیگەل بە دوونادوون باوەڕیان بووە. لێكچوون لە نێوان خوەڕمدینی و غوللاتدا ئەوەندە زۆرە کە هەندێ مێژوونووس لەگەڵ یەك تێکەڵاویان دەکەن. مامۆستا نەفیسی دەنووسێت «ئیمام ئەبولحەسەنی ئەشعەری پێشەوای ئەشعەریگەل لە کتێبی مەقالاتولئیسلامیین و ئیختیلافولموسلمیندا دەڵێ. هەندێ وتوویانە کە ئیمامەکان موعجیزەیان هەیە و فریشتەگەل دێنەلایان ئەمە وتەی هەندێ لە رافزیگەلە... بەشێ لەمانە کە خوەڕمدینەکانن تا ڕادەیەك پێش دەچن کە دەڵێن پاش موحەممەد (د.خ) پێغەمبەرگەلیتریش دێن و شۆنی ناقرتێ ل ۲٤ کتێبی ناوبراو». دیارە کە لە نێوان خوەڕمدینی و غوللاتدا چەشنێ باوەڕمەندی بە ولایەت هەبووە کە ئەشعەری تووڕە کردووە. هەڵبەت ئەم باوەڕمەندیە بە وەلی یان قوتب و سیمورغ لە فەلسەفەی سوهرەوەردیدا و عیرفان و بە گشتی لە میهرپەرستیدا بنەمایە. لە ئاوەزی سووردا سوهرەوەردی وتبووی زەمین هیچ کات لە سیمورغ خاڵی نامێنێ و پەیتا پەیتا لە توویا (خۆر)ەوە سیمورغ دێتە سەرزەوی. ماموستا نەفیسی نووسیویە «سەیید مورتەزا بنداعی

حەسەنی ڕازی لە کتێبەکەیدا، تەبسەرەتول... سەبارەت بە فرقەگەلی ئەبوو موسلمییە دەڵێ: فرقەیەکتر لەمانە، ڕەزامییە، یە. ئەمانە دەڵێن موحەمەد کوڕی عەلی (د.خ) وەسیەتی بۆ کوڕەکەی ئیبراهیم کرد چون ئەبوو موسلیم ڕاپەڕی لەگەڵ ئەودابێ. بە خەڵك ڕاگەیەنن کە ئەبوو موسلیم خاوەنی موعجیزەیە (وەکوو ڕەسووڵ) ئەمانە پێیان دەڵێن خوڕڕامییە. ئەلموقەننەع لەمانە بوو ڕایگەیاند کە ڕۆحی ئەبوموسلیم لە جەستەیدایە و ئەو خودایە. ڕاگەیەنراوەکەی بردە شاری «کەش» (لە سەرووی چۆمان باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران) ل ٢٥ و ٣٦)» ڕاگەیاندنی تەناسوخ، گیانی کەسێك لە کەسێکی دواییدا یان تەجەللای خودا لە کەسێکدا وەکوو ڕادەیەکی سەرتر لە وەلی و قوتب هەر باوەڕگەلی کاکەیی و بنەمای میهرپەرستیە.

ئیمام جەعفەری سادق (د.خ) لە مەدینەدا بوو. بازەردارانی ئەو و شیعەگەلی ڕاستەقینەیتر لە بنەمای باوەڕەکانیاندا لەگەڵ سوننەکان جیاوازی ئەوتۆیان نیە. جیاوازی تەنیا لە جێنشینی پێغەمبەردایە. سەبیی سێ خەلیفەی پاش پێغەمبەر لە شیعەی کیسانیە و زەیدیەدا نەبووە و لە ئیمامییەشدا شتێکی تازەیە کە لە زەمانی شائیسماعیلی سەفەویدا، داهات. غوللات لە هێنانە سەرکاری سەفەویەکاندا دەستی بالآیان هەبوو. هەرچەند غوللات تێکۆشانی زۆریان بۆ سەرکەوتنی سەفەویەکان کرد بەڵام بە دوو هۆکار شیعەی ئیمامییە بوو بە ئاینزای فەرمی ئێران. یەکەم، ئاینی غوللات زۆرتر لە تەریقەت دەچێ نەك دین. دووهەم، باوەڕمەندیگەلیان دژ بە سیستەمی ئابووری و ڕامیاری ئەو کاتەیە. باوەڕیان بە برایەتی و وەك یەکبوون هەیە کە ئەمە لە سیستەمی پادشایی و دەرەبەگایەتیدا ناگونجێ. هەر ئەم دوو هۆکارە وای کرد کە لە پێش ئیسلامدا میهرپەرستگەل و پاش ئیسلام ئێزدی و غوللات و خوەڕمدینی نەتوانن سیستەمێکی حکوومی لەسەر کومەڵگای دەرەبەگایەتی پێشکەشکەن. لە گشت شۆڕشەکانیاندا خەڵکی چەوساوە لایەنگریان بوون بەڵام کاتێ هێزیان دەگرت دەرەبەگ و خان خەیانەتیان پیان دەکرد و تێك دەشکان. تەنیا حکوومەتێ کە لەمانە پێکهات قرمەتیەکان بوون لە «بەحرەین»دا کە سوسیالیزمێکی کشتوکاڵیان دامەزراندو پاش ماوەیەك حکوومەتەکەیان گۆڕدرا بە دەرەبەگایەتی و تێکشکان. لە زەمانی ئەبوو موسلیمی خوەراسانیدا عەبباسیەکان و لە زەمانی سەفەویەکاندا شێخ حەیدەر و شائیسماعیل لە هێزی ئەوان کەلکیان وەرگرت بەڵام بەشیان لە دەسەڵاتنەدرا. هەندێکیان بوون بە شیعەی دوانزە ئیمامی و هەندێکیتریان لە پەراوێزدا مانەوە. ئەو کوردانەی کە بوون بە شیعەی دوانزە ئیمامی بۆ خوەراسانی کۆچیان کرد. بەشێکیتر لە خێڵات

ولادییەکانی کورد لە کەنگاوەر و توویسرکان و ناوچەی کولیایی و قەڵخانی و لورستان و هەورامان وەکوو خۆ مانەوە.

ئیسماعیلی ئێران ڕەوتێکی هەرە بە هێز بوو کە فیرقەگەلیتری غوللات هاوکاریان دەکردن. تا زەمانێ کە ئیسماعیلیە لە عەرەبستان و ئێراقی باشووریدا بوون لەگەڵ فیرقەکانیتری شیعەدا جیاوازیان تەنیا لەسەر ئیمام بوونی کوڕەکانی جەعفەری سادق بوو بەڵام هەر گەیشتنە بەغدا و باکووری بەغدا (ناوچە کوردنشینەکان) لە ژێری کارتێکردنی ڕاگەیەنەرەکانی غوللاتی کوردستاندا کە لە بەغدایشدا زۆر بوون وایان لێهات کە مێژوونووسەکان وەکوو خوەڕمدینەکان دەیان ناسێنن. مامۆستا نەفیسی دەنووسێ: «سەیید مورتەزا بن داعی حەسەنی سەبارەت بە ئیسماعیلیەکە وەکوو باتنی ناویان دەبات دەنووسێ، عیبادەتگەلی ڕواڵەتی (وەکوو نوێژ و ڕۆژوو...) بۆ خەڵك وا جیب نیە.... لە مانەن (واتە لە ئیسماعیلیگەلن) ل ۲۷ کتێبی ناوبراو».

خودی خوا لێخۆشبوو نەفیسی سەبارەت بە ئیسماعیلییە نووسیویە: «بزووتنەوەگەلی جاویدان و بابەك (ئەم دووانە خوەڕم دینی بوون ڕۆحی جاویدان لە جەستەی بابەکدا پەیدا بوو) وەکوو ئەبوو موسلیم و بێهافەرد و موقەننەع و سەنباد و ئاستازسیس و حەمزە کوڕی ئازەرەك و عەبدوڵڵا کوڕی ڕەوەندە و ئەسحاقی تورك و مازیار و ساحیبوززەنج و قرمەتیان و گرامیان و هەندێ لە لقگەلی خەوارج (خەوارج لە ئێراندا لە ژێر کارتێکردنی باوەڕگەلێ ئێرانیدا بوون) و سەر عەلەمان و سپی جامەگان بووە. ئیسماعیلیەیش شۆنی ئەوانی گرتە بەر. ل۲۸ سەرچاوەی ناوبراو» ئەوەی کە من بەم ڕاستییە زیادی دەکەم جگە لە شۆڕشەکەی ئەبوو موسلیم (کە بووە هۆی ڕووخانی ئومەوی و هاتنە سەرکاری عەبباسیەکان) و خەواریج گشت ئەو فیرقەگەلە کە مامۆستا نەفیسی ناویانی هێنا باوەڕیان بە تەناسوخ بوو. پاشان لایەنگرانی ئەبووموسلیم پاش گوژرانی ئەو هەر باوەڕیان بە تەناسوخ و دووبارە هاتنەوەی ئەبووموسلیم بوو. جا دەتوانین بڵێین میهرپەرستی پاش ئیسلام لە شیوە و فورمگەلی جۆراوجۆردا لە گشت ئێران لەوانە کوردستان چالاك بوو. یەکەم چالاکیگەل لە ڕۆژهەڵاتی باکووری ئێران کە زۆر لە دەرباری عەبباسیەکانەوە دوور بوو ڕوویدا. پاشان گەیشتە ڕۆژاوای ئێران و وەکوو خوەڕمدینان لە ئازەربایجان و کوردستان و هەمەدان و ئەسفەهاندا دەرکەوتن. پاش تێك شکانی خوەڕم دینەکان میهرپەرستی وەکوو ئیسماعیلیە دەرکەوتن تا لە ئاکامدا ئەوانیش بە دەست هولاکوخانی موغول تێکشکان.

خواجە نیزامولمولك وەزیری ئەلب ئەرسەلانی سەلجووقی کە بە دەست یەکی لە غـوللاتی کـورد لە کوردستان لە سەهەنە نزیکی کرماشاندا کوژرا دەنووسێ: «هەر کاتێ خوەرِم دینەکان هەستان باتنیگەلیش (شیعەگەلی زێدەرۆیی‌کەر) لەگەڵ ئەواندا یەك بوون وئەمانیان بـەهێز دەکـرد کـە بنەمای هەر دوو ئاین یەکێکە. ل ۳۰ کتێبـی ناوبراو». «یاقووتی حەمەوی لە موعجەمولبولدان سەبارەت بـە شـاری «بـەز» لـە ئازەربایجانـدا دەنووسـی: موحـەممـەرە (جـل و بـەرگ سـووران= خوەرِمدینان) لەوێدا دەستیان‌دایە شورِش و چاوەرێی مەهدی" یان دەکرد. ل ۳۰». خوەرِمدینەکان چاوەرێی مـەزهەرولّلایان دەکرد کە چەشنێ لە تەجەللای زاتە. غوللات ئەمـەیان وەکـوو مـەهـدی ناونابوو.

مەهدی غوللات لەگەڵ مەهدی شیعەگەلی ڕاستەقینە جیاوازی هەیە.

خوەرِمدینان وەکوو غوللات بە دوونادوون باوەرِیان بوو «ئیبنی ئـەسـیر (مێژوونووسـی کـورد) سەبارەت بە هەلس و کەوتەکانی ساڵی ۲۰۱ی کۆچی دەڵێ لەم ساڵەدا بابەکی خورِرەمی لەسـەر ئاینی جاودانیە شۆرِشی کرد. ئەو لە لایەنگرانی جاویدان کورِی سـەهل فـەرمانرِەوای بـەز شـاری ئازەربایجانی باکووری بوو. بابك وتی رِۆحی لەودا ئاشکرا بووە. ئەمانە لە لـق‌گـەلـی مـەجووسـن (مەجووس پاش ئیسلام بە ئایندارانی زەرِدەشتی و میهرپەرستی دەگـوترا). پیاوگـەلیـان دایـك و خوشك و کچی خۆیان مارە دەکرد بۆ ئەوە پێیان دەڵێن خـورِەمێ بـە دوونـادوونیش باوەرِیـان بـوو دەیانگوت رِۆح لە گیانلەبەرێکەوە بۆ گیانلەبەرێکی دیکە دەرِوات ل ۳۰ و ۳۱ کتێبـــی نـاوبراو» «شەهرستانی نووسەری، ئەلمیلەل وەنیحەل سەبارەت بە غوللات دەڵێت: زیدەرِۆیی‌کـەران هـەرکام نازناوێکیان هەیە: لە ئەسفەهاندا خورِرەمییە و کۆدەکییە. لە رەی، دا مەزدەکییە و سـەنبادییـە. لە ئازەربایجاندا، زەقوولییە و لە جێگاگەلی‌تر «سیپاڵ سووران» لـە سـەرووی چـۆمـان (بـاکووری رِۆژهەڵاتی ئێران) موبەییەزە، (جل و بەرگ سپییان). ل ۳۰ کتێبـی ناوبراو».

ئەم فیرقە نائیسلامیگەلە وەکوو شیعەیانی زیدەرِۆیی‌کەر کە ناویـان هـاتووە بـۆ ئـەوەیـە کـە ئەمانیش بە مـەزهەرولّلا کە شتێکی میهرپەرستیە باوەرِیان بووە جا باوەرِ بە ئولووهییەتی عەلی (د- خ)یش لەم چوارچێوە جودا نیە. «بە وتەی ئیبنی ئەسیر لە ساڵی ۲۱۸دا زۆرێك لـە خـەڵکی، جبال، (کوێستانی رِۆژهەڵاتی دیجلە) و هەمەدان و ئەسـفەهان و ماسـبەزان (پارێزگـای ئیلامـی ئێستا لە کوردستان) و جێگاگـەلێکـی‌تـر دیـنی خوررەمیـان قبـووڵ کـردوو لـە هـەمـەدانـدا لەشکرگایان پێك هێنا. ل ۶۲ کتێبـی ناوبراو». ئەم جێگایانـە ناوندگـەلـی غـوللات و ئێـزدین

بەتایبەت جیبال و هەمەدان کە وتمان ڕەوتگەلی ڕۆشنبیری عەینولقوزات و ... تێدا بوو کە پاشان لە ڕۆژاوای هەمەدان واتە کوێستانی نێوان هەمەدان و شارەزوور پاشان سان سەهاکی بەرزنجی لەسەر بنەمای ڕەوتگەلی باوەڕمەندی پێش خۆی ئاینی کاکەیی (ئەهلی حەق)ی ڕێك و پێك کرد.
لێك چوونێکیتری غوللات لە باوەڕمەندی بە مەزهەر وللآیە لە هەر زەماندا:

«مەقدەسی لە کتێبی، ئەلبەدەئ وەتاریخ، کە لە ۳٥٥ی کۆچیدا نووسیویە سەبارەت بە بابەك دەڵێ بە باوەڕی ئەمانە زەوی هەرگیز لە پێغەمبەر خاڵی نامێنی. ل۷۱ کتێبی ناوبراو» سەبارەت بە باوەڕی خوەڕمیگەل بە دوونادوون وەکوو غوللات مەقدەسی دەڵێ: بابەك دەیگوت ڕۆحی جاویدان چوەتە جەستەیەوە ل۷۱». «شەمسەدین ئەبوو عەبدوڵلا زەهبی لە کتێبی، دووەلولئیسلام، سەبارەت بە بابەك دەڵێ: پیاوێکی هەرە ئازا و دلێر و هەرە تێکۆشەر و چەپەڵ بوو دەیەویست دینی مەجووس زیندوو کاتەوە ل ۱۱۸ کتێبی ناوبراو» دیارە مەبەست لە مەجووس زەردەشتی نیە کە دژ بە دوونادوون و مەزهەرولڵلا بووە. مەجووس تەعریبی، مەگووس، ئەویش یۆنانی کراوی «مەگوو»ی ئەوێستاییە کە ئەمڕۆ بە فارسی دەڵێن «موغ». بە پیاوی ئاینی زەردەشتی و میهرپەرستی هەدوو گوتراوە.

ئەو قسەگەلە دروستە کە بابەك ویستویە ئاینی مەجووسی زیندووکاتەوە بەڵام میهرپەرستی مادەکان نە زەردەشتی. بابەك بە باوەڕی من ناو نیە بەڵکوو نازناوە. ئەوەی کە لە لێکدانەوەی وشەی بابەکدا بۆم دەرکەوتووە بابەك نازناوی ئەو شۆڕشگێڕەیە «مێژوونووسی ئەرمەنی» وارداپەت وارتان کە لە ٦۷۰ی کۆچیدا مردووە ناوی بابەکی وەکوو «باب» و «بابەن» هێناوە. لە کوردی و ئازەریدا بابە و بابا و باوا بە مانای باوکی باوك و هەروەها بە باوك دەڵێن کە لە فارسیدا بابا و لە ئاینی میهرپەرستی ئەورووپادا وەکوو پاپ و پاپا و پاپە سەرۆکی ستایشتگاگەلی میهری و پاشان لە مەسیحی ئەورووپادا نازناوی بەرزترین پلەی پیاوی ئاینی مەسیحییە. دەزانین پاش ئیسلام بابە و بابا نازناوێکی عیرفانی و دینە کوردیەکانە وەکوو باوەیادگار و باوە سەرەهەنگ و... مەرقەدگەلێکی زۆر لە ئەفغانستان و ئێران و کوردستاندا بە نازناوی بابا و بابە و باوە هەیە. لە کوردستاندا «باوە» نازناوێکی خوارتر لە پیرە. پیریش خوارتر لە «سان». نازناوی بابەك کە دابێژی ئازەری و پەهلەوی بابەی کوردیە پێوەندی قووڵی لەگەڵ میهرپەرستی پیشان دەدات و ئەوانەی کە بابەك بە مەزدەکیەوە گرێ دەدەن لە هەڵەدان و هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نیە. ناوی «پاپەك» یان بابەك، باوك یان خەزوورەی ئەرەشێری بابەکانیش هەر نازناوە و ئەو سەرۆکی ئاینی، مەعبەدی

گەورەی فارس لە ئیستەخردا بووە. ئیتر لە مێژووی پێش ئیسلام و پاش ئیسلام تا زەمانی بابەکی خوەڕمدین ناوی بابەك ئەوتۆ لە مێژوودا نیە دیارە ئەمە نازناو بووە. ناوی خانەدانی «بابـان» کـە لە کوردستانی باشووردا حکوومەتیان بووە هەر لـە وشـەی «بـاب» گـیراوە. پاشـگری «ك» لـە بابەك‌دا پاشگرێکی ئازەری پەهلەویە. ئەوەی کە لـە کـوردی و فارسـیدا «شکسـتە» دەڵـێن لـە پەهلەویداوە وەکوو شکەستەك دابێژ دەکرێ جا باب و باوە و بابە و بابەکی ئازەری نازناوێك بووە بۆ گەورەگەلی ئاین. ناوی باوکی بابەك، عەبدوڵڵا و براکەی ئەسحاق بووە و ناوی بابەك لەگـەڵ ئـەو ناوگەلەدا ناگونجێ. هەندێ لە گەورەگەلی ئەهلی حەق نازناوی باوەیان هەیە وەکوو، بـاوە تایـەری هەمـەدانی. سەرهەنگ ـ عـەلی هەمـەدانی کەرچەك ئەورامی. قەلەم ـ قەیسەر ئەورامی ـ یادگار ـ نائووس ـ فەقیهـ هەمـەدانی ـ سرنج کەلاتی ـ حاتەم و بوزورگ لورستـانی ـ جـەلیل دودانـی و باوەڕەتاف و .... لە کاکەیی‌دا پیر پێگەیەکی سەرتر لە باوەیە. لە ناو گەورەگەلی یارسـان‌دا نزیـك بە ۱۰۰پیرم بژاردووە کە لەوانە پیر بنیامین ـ شاریار ئـەورامـی ـ عـەلی ـ مووسـا دمـەشـقی و میکائیل دۆدانی و... گرینگترن نازناو «سان» جارێ تەنیای هی سەهاکی بەرزەنجیە کە بە سوڵتان وەرگێڕدراوەتەوە.

سەرنج لەسەر نازناوی بابەك نزیکی زۆرتری ئەو ئاینە بە دینە کوردیەکان و میهرپەرستی زۆرتر دەسەلمێنی.

وشەی خوڕرەم‌دینی لە فارسی و عەرەبی‌دا وەکوو «خرّم‌دینی» بە تەشدیدی «ر»ێوە زەبـت کـراوە هەڵەیە. دەزانین ئەم فارسیەی کە ئەمڕۆ لە ئێراندا قسەی پێ دەکەن زمانی باکووری ڕۆژهـەڵاتـی ئێرانە بەتایبەت ئەو جێگاگەلـەیـە کـە ئـەمـڕۆ بـە ئـەفغانسـتان و تاجیکسـتان و هـەروەهـا تورکمەنستان و قەزاقستان ناسراوە (کە ئێستا بە فارسی و تورکی قسە دەکەن). ئـەم زمـانـە لـە پێشدا وەکوو زمـانی ئەدەبی و پاشان زمانی دەرباری هاتە گورێ. ئـەم زمـانـە لـە نـاوەوەی ئێـران وەکوو ئەسفەهان و ڕەی و ئازەربایجان و هەمەدان لانی کەم تا سەدەی هەشت و نوێ کۆچی لە نێـو خەڵکدا ڕەواجی نەبوو. تەنیا ئەدیب‌گەل و کارمەندگـەلـی حکـوومی دەیـانزانـی. حـەمـدوڵڵای مستەوفی لە کتێبـی تاریخی گوزیدەدا شیعری شاعیرگەلی ناوچەی ڕەی (تاران) و کەرەج و ئەبهەر و قەزوێنی هێناوە کە بە زاراوەگەلێکی ناوچەیین، دیارە لە سەدەی ۹دا هیشتا فارسی لـە نـاوەوەی ئێراندا قسەی پێ نەکراوە. ئەوان بە زاراوەگەلی پاشماوەی پەهلـەوی قسـەیـان دەکـرد کـە زۆر لـە ئازەری و کوردی نزیکە. وشەی «خوررەم‌دین» مێـژوونووسگـەلـی عـەرەب و فـارس لـە خـەڵکی

ناوچەیان بیستووە بەڵام بەهۆی نەبوونی «ڕ» واتە «ر» قەڵەو، یان بە وتەی فەرهەنگنووس «موحەممەد حوسەین بن خەلەف تەبریزی» لە قامووسی «برهان قاطع»دا «رای سەخت» بە هەڵە وەکوو «ر»ی تەشدیددار نووسیویانە. ئەگەر لە مرۆڤێکی لوڕستانی بپرسی ناوەندی پارێزگاکەتان ناوی چیە؟ دەڵێ «خوەڕماوا». ئەگەر بتەوێ خوەڕم بە عەرەبی بنووسی دەبێ بە «خرّم» واتە «خوڕڕم» کە فونوتیکی فارسی وەکوو خوررەم دابێژی دەکات. زۆر وشەی ڕەسەن و کۆن لە ژێر کاریگەری فارسی و ئەلفبێی عەرەبیدا گوڕدراون وەکوو ئەسپەهان کە بووە بە ئسفەهان. تەهران، تهران سەهەنە دژ، سەنەندەج (سەرنج بدەنە سەرهاتنە ناوی دالی مەفتووح و «ر»ی مەفتووح، لە سەنەندەج و خوررەمدیندا) کرماشان، کرمانشاه (لە دەقی پەهلەوی بوون دەهێشدا وەکوو کرماشێن هاتووە کە تەعریب کراوە بە قرمەسین. تەشکەوتی قوڕەقەڵا (لای پاوە کراو بە قووریقەلعە. تا قووسان (واتە تاقی شاه) بووە تاق بوستان و خراپ کردنی وشەگەلی پەهلەوی و کوردی بە دەس فارسە ناشارەزاکان ئێستاش هەر بەردەوامە. وشەی خوەڕمدینیش هەروا خراپ کراوە. بێگومان ماناکردنی خوەڕمدینیش وەکوو دابێژە هەڵەکەی هەر هەڵە دەبێت وەکوو ماناکردنەکەی ئیبنی ئەسیر. وشەیەکیتر کە خراپ کراوە شاری «سەقز»ە. لە بەرد نووسراوەی بێستووندا وەکوو سەکزە بە مانای ناوەندی سەکاکان هاتووە. دابێژی دروستی خەڵك واتە سەقز بەداخەوە لە فارسیدا کراوە بە «سەققز» واتە بنێشت.

لە پارێزگای کرماشان شاری هەرە جوانی «سەهەنە» واتە سەدکانی هەیە و دابێژی خەڵکی ناوچە سەهەنە بە تەواوی دروستە کەچی لە عەرەبی و فارسیدا کراوە بە «صحنه» (سەحنە). یان کێوی هەرە بەرز و جوانی «تەلەوکوە» لە مازندەران بە دابێژی دروستی خەڵکی ناوچە و دابێژی مێژوونووس زەهیرەددین لە فارسی ئەمڕۆدا کراوە بە «علم کوه» (عەلەم کووە) ئەلەو، لە پەهەلەوی و مازندەرانیدا بە مانای هەڵۆیە. تەنانەت وشەی «ئێران»یش کە لە ئەوێستادا «ئێریەنە» کە دابێژی کوردی و پەهلەویە و فارسیەکەی تا چەند سەدە لەمەو پێش هەر ئێران بووە، چون پیتی «ێ» لە عەرەبیدا نیە کەمکەم لە فارسیدا بووە بە ئیران. خراپکردنی وشە ڕەسەنەکان لە فارسیدا وەکوو عەمد دیارە. خوەڕماوای لوڕی کراوە بە «خوڕڕەمئاباد» دروستە ئاوای کوردی و لوڕی بە مانای ئابادی فارسیە بەڵام ئیتر خوەڕم یان خوڕم بە مانای خوڕڕەمی فارسی نیە. خوەرم و خۆڕم لە خوەڕماوادا هاو بناغەیە لەگەڵ خوەڕمی خوەڕمدیندا، بەڵام دوو دابێژە لە دوو زاراوەی مادیدا. خەڵکی ئازەربایجان لە سەدەکانی یەك تا شەش و هەفتی کۆچی

زمانی ئازەریيان بووە کە بە وتەی شەمس قەیس رازی لە لقەکانی زمانی پەهلەوییە. ئەمڕۆ دەڵێن پەهلەوی باکووری ڕۆژاوا کە وەکوو کوردی پاشماوەی زمانی ئەوێستاییە. ئەمڕۆ فارسەکان پیتی «ڕ»ی سەخت وەکوو «ێ» «ۆ» چون لە پیتگەلی عەرەبیدا نیە دابێژ ناکەن و لە بیریان چوەتەوە. خەڵکی ساکار و نەخوێندەوار وشەی «دەریدەن» واتە دڕین هەر بە «ر»ی سەخت دابێژ دەکەن بەڵام لە خوێندنگاکاندا وەکوو «ر»ی نەرم دابێژ دەکرێ چوون لە نووسیندا ئەو دوو جۆر «ر»ێیە وەکوو یەك دەنووسرێ. مێژوونووسە عەرەبەکانیش لە هەر جێ «ر»ی سەختیان بیستووە کردوویانە بە تەشدید و پاشان فارسی نووسەکانیش لاسایی ئەوانیان کردۆتەوە. دابێژی دروست خوەڕمدین (ڕێی سەختی مەکسور، بە فونوگرافی جیهانی Xwarem یان ئەو لاتینە کە کوردی و تورکی پێ دەنووسنXwerim یان بە دابێژیکی‌تر خوەڕم Xorm کە لە عەرەبی‌دا و پاشان لە فارسیدا کراوە بە خوڕڕەم. خوڕرەم لە فارسیدا بە مانای سەوزەڵاتی و جێگای باسەفایە کە پێوەندی بە خوەڕمدینەوە نیە. مێژوونووس ئیبنی ئەسیری ناوبراو کە وتبووی خوڕرەمدینەکان چون لەگەڵ کچ و دایك و خوشکیاندا زەماوەن دەکەن (و خەریکی سەفا کردنن!) بۆ ئەوە پێیان دەڵێن خوڕرەم دین. ئەم توانجە نارەوایە لە لایەن دوژمنەکانیان واتە نووسەرە موسڵمانەکانەوە لە غوللات و باقی دینەکانی‌تر جگە لە جوو و مەسیحی دراوە. خوا لێخۆشبوو نەفیسی سەبارەت بەم توانجە زۆری لە بەرهەمە مێژووییەکاندا دەرهێناوە کە نیاز بە باس کردنیان نیە. ئەم توانجگەلە جگە لە دوژمنایەتی لە دابێژ و ماناکردنی هەڵەی وشەی خوەڕم و خوڕڕەمە.

چەند شاری مێژوییمان بە پاشگری «خوەرە» وە هەیە وەکوو ئەردەشێرخوەرە. کە پاشان بووە بە ئەردەشێرخەرە. کە چی مێژوونووس ئیبنی خوردادبیە- لە کتێبی ئەلمەسالیك وەلمەمالیك‌دا کردوویە بە (اَردشیر خره) = ئەردەشێر خەررە. موشەددەد کردنی «ڕ» واتە ڕێی سەخت ئیستاش هەیە. وەکوو خانەدانی گەورەی کوڕانی لە کوردستان بەتایبەت لە کرماشاندا خودی کوڕانیەکان و خەڵکی ناوچە بێ‌تەشدید دەیلێن کە چی لە فارسی‌دا ڕێکەی بە تەشدیدەوە دەڵێن و لە سەری تەشدید دادەنێن. وشەی خوەڕم وەکوو «خوەرن» بە فونوگرافی جیهانی Xwarenیش لە زاراوەگەلی‌تری مادا هەیە زۆر وشەی ئاخر نوون گوڕاوە بە ئاخر میم وەکوو وشەی پەهلەوی و کوردی «بان» کە ئێستا لە فارسیدا دەڵێن بام. هەر ئێستا خەڵکی ئازەربایجان زۆر وشەی ئاخر نوون دەکەن بە ئاخر میم بۆ وێنە بە مەسەلەن دەڵێن مەسەلەم یان مەسلەم خوەڕم و خوەرن پاشماوەی «خوەرنە»ی ئەوێستاییە (لەم وشەدا «ر» بزرۆکەی هەیە) خوەرنە لە فارسی و کوردی

ئەمڕۆدا دەڵێن «فەڕ». سەرنج ڕاکێشە کە لە فارسیشدا هەر ڕێ سەختی هەیە و بە تەشدیدەوە دەینووسن. فەڕ هێزێکی خوداییە کە دەچێتە گیان و جەستەی کەسگەلێکەوە و دەیانکاتە خاوەن کەرامات و هێزگەلێکی تایبەت. ئەم هێزە بە گوێرەی ئەوێستا لە جەستەی پادشایانی کەیانی و زەردەشت و هەندێ کەسی بەرجەستەدا بووە. بە وشەکەیدا دیارە کە لە ئایینی میهرپەرستییەوە گیراوە. «خوەرنە»ی ئەوێستایی دوو وشەیە «خوەر+ نە» خوەر هەر خۆرە. «نە» پاشگری ئاوەڵناوسازی ئەوێستایی و کوردیە کە باس کرا. وەك لە کوردیدا دەڵێن «شەرمنە» ڕکنە و ڕۆچنە و... خوەرنە واتە ئەو شتە کە هێز و سیفەتی خۆری پێوەیە. شتێك کە سەرچاوەکەی خۆرە. زانیمان لە میهرپەرستیدا سەرچاوەی مەزهەرولڵاکان وەکوو سیمورغەکەی سوهرەوەردی خۆرە. وشەی خوەرنە کە پاش تێپەڕبوونی تا دوو هەزار ساڵ لە سەردەمی ئەوێستاییەوە لە هەزار ساڵ لەمە و پێشدا وەکوو خوەرم و خۆرم لە پەهلەوی تازەیدا دابێژکراوە و ئەم وشە بەم ماناوە وشەی یەکەمی ڕێکەوەندی خوەرمدینیە. نەك خوررەمی فارسی بە مانای سەوزەلانی و جێگای باسەفا. ئەم چەشنە توانج و تۆمەتگەلە شوێنەواری لە مێژوودا زۆرە. مەسیحییەتی ئەورووپاتوانجی قوربانی کردنی مرۆڤی لە میهرپەرستان دەدا. میهرپەرستگەل پێش و پاش ئیسلام بە ناوگەلی جۆراوجۆرەوە بۆ مەلەکە تاوس داب و نەریتگەلێکیان بووە کە باسی دەکەین بەڵام هیچ کات وەکوو مارەکردنی دایك و خۆشك و هاوبەشی لە ژندا نەبووە. میهرپەرستگەلی پێش و پاش ئیسلام بە یەکسانی و بەرابەری لە ماڵدا باوەڕیان هەبوو بەڵام دوژمنەکانیان تۆمەتی ئیشتراك و هاوبەشی لە ژنیشیان داوەتە پاڵیان.

هەندێ نووسەری تازە پێ گەیشتووبێ بەڵگەی باوەڕ پێکراو دەڵێن وشەی خوررەم لە ناوی ژنەکەی مەزدەك کە «خوررەمە» بووە گیراوە کە پاش مەزدەك پەرەپێدەری ئاینەکەی بووە. ئەمە لە هیچ نووسراوەی باوەڕ پێکراودا نیە. بەم بۆنەوەوە مامۆستا نەفیسیش ئاماژەی پێ نەکردووە.

میخائیل دخوویە زانایەکی بەناو بانگ و بێلایەنە. ئەویش کۆ کراوەی زۆری سەبارەت بە باسەکەی ئێمە هەیە. لێ کەڵك وەردەگرین: «قرمەتیان چەشنێ لە سوسیالیزمی ئەرزییان لە بەحرەیندا دروست کرد. قرمەتیانی بەحرەین و فاتمیان، دخوویە. وەرگێڕ بە فارسی موحەمەد باقر ئەمیرخانی» هەروەها «ئیسلام دەرئێران، پتروشونسکی». دخوویە سەبارەت بە قرمەتیگەل کە لە غولاتی ئیسماعیلی بوون کۆکراوەی زۆری هەیە بەم حاڵەوە دەڵێ «بەهۆی شاردنەوەی گشتی بیروباوەڕیان تەنانەت لە لایەن ڕۆشنبیرانی ئەم ئاینەوە و هەروەها درۆ و توانجی دوژمنەکانیانەوە

ئاگاداری بەسەندەمان لێیـان نیـە». دخوویـە بـە دروسـتی قرمـەتـی‌گـەلـی لـە ئیسـماعیلیە و عەلەویگەل (غوللات) دەزانێ. گشت غوللات شەجەرە نەسەبیان دەگەیەننەوە سـەر عـەلی (د- خ). دخوویە لە لاپەرە ١٣ تا ١٨ی کتێبەکـەیدا بـە بـەڵگـەی پێویسـتەوە دەیسـەلمێنێت کـە فاتمی‌گەلی میسر و ئیسماعیلی‌گەلی ئێـران هـیچ‌کـام لـە نـەوە و نەتـەوەی موحـەمـەد کـوڕی ئیسماعیل کوڕی جەعفەری سادق نین و ئەو شەجەرەنامەگـەلـە گشـت سـاختەیـە. (سەرچـاوەی پێشوو)

دیارە کە سەرچاوەی غوللات، ئێران بەتایبەت مادی ڕۆژاوا و ئێـراق و کیـوەکـانی ڕۆژهـەڵاتـی ئێراقە کە ڕاگەیەنەرەکانیان لەم لاولا بەتایبەت لە بەغداشدا چالاك بوونە. یەکێ لە هـەفتـەنـی ئەهلی حەق «شائیبراهیمی ئێوەت» لە بەغدادا ڕاگەیەنەری ئەم ئاینە بووە کە هەر لـەوێ کۆچـی دوایی کردووە. «بەهلوول مادی» کە لە سەرەتای سەدەی سێی کۆچی‌دا مردووە ناوەکەی کوردیـە و لە زەمانی هاروونەرەشیددا لە ژێر چاوەدێری‌دا بووە. ئەهلـی حـەق ئـەمـە بـە یـەکـەم پیشـەواو ڕاگەیەنەری ئاینەکەیان دەزانن. ئاشکرایە کە بەهلوول ئەم ئاینەی‌دا نەهێناوە و پێش ئەو کەسانی دیکە بوونە کە بە نهێنی ئەو باوەڕەیان پاراستووە. وتمان غوللات لە ئێزدی جـوێ بـۆوە. بـەهلوول وەکوو لە ڕونکردنەوەکەی‌دا داهێناومە ناوێکی کوردیە. ئیحتیمالی ئەوە دەدەم کە بەهلوول یەکـێ لە پایەدانەرانی غوللات بێت. ئەو چەند بەیتە کە لە سەرەنجامدا بـە نـاوی ئـەوەوە هـاتووە هـەر چەند لە باری فورمەوە گومانی لەسەرە بەڵام لە باری ماناوە ئامانجی ئەوی وەکـوو کـەسێك کـە دەیەوی ئاینی ئێران و کوردان زیندوو کاتەوە تێدایە. فورم و دەسـتەواژەی هـەنـدێ لـە شـاعیرانی کاکەیی لە بواری زەماندا گوڕدراون. زەمان کە لە بـواری زەمانـدا دەگـۆڕدرێ و بەرەگـەلـی تـازە ناتوانن کەڵکی لێ وەرگرن جا شیعری هەندێ لە شاعیرانی کاکەیی کـە بـە فـورم و دەسـتەواژەی ئەمڕۆ نزیکن، لە لایەن دەسنووسەکانەوە بۆ بەرەی داهاتوو هەندێ گۆڕدراون. ئێـزدی لـە زەمـانی بەهلوولدا وەکوو ئاینێك لە ئەرمەنستان و کوردستانی باکوور و کوردسـتانی باشـووردا هـەبـوو. دیارە لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتیشدا کە گۆڕدرا بە کاکەیی هەبووە ئەم ئاینە زۆرتر لە لایەن کوردە موسڵمانەکانەوە لاواز کرا. سەدان جار بە ناوی «غەزا» وە بەڵام لە ڕاستیدا بۆ تاڵان و دەس درێژی هێرش کرایە سەریان. هەر ئەمیرێکی موسڵمان کە لە جێگایەکی کوردسـتاندا فەرمانـدار دەکـرا یەکەم جار بۆ دەوڵەمەند و بەهێز کردنی خۆی «غـەزا»یەکی وەرێ دەخست و هێرشی دەکردە سـەر ئێزدی‌گەل. ئاخرین عەشایەری گەورەی کورد کـە دەسـتیان لـە ئـاینی ئێـزدی هـەڵگـرت خێڵـی

دونبولی بوو. نووسەری شەرەفنامە، شەرەفەددین بەدلیسی کە لە ۱۰۰۳ تا ۱۰۱٤ی کۆچی مێژووەکەی نووسیوە دەڵێ: لە پێشدا سەرۆکگەل و عەشایەری دونبولی لەسەر رەوشتی ناپەسەندی یەزیدی بوون.... بەشێ لە عەشایەری ئەوان هەڵگەڕانەوە و ڕێگای سوننە و جەماعەتیان گرتە پێش». پاشان بەشەکانیتریان بوون بە شیعە و بۆ زەمانێکی زۆر حکوومەتی تەبرێز و خۆی یان بە دەستەوە بوو.

ئیسماعیلیگەلی دوایینی وەکوو میهرپەرستگەل بە ئەستێرەناسی و هات و چۆی ئەستێرەکانی ئاسمان بۆ پێشبینی ڕووداوەکان باوەڕیان بوو. لەم بارەوە هەجویری شتگەلێکی نووسیوە. بناغەی میهرپەرستبوونی ئیسماعیلی دوایینی تا ڕادەیەکی زۆر ڕوون کرایەوە.

دخوویە بەهێنانی دووبارە نووسیەك لە کتێبی «فەزا ئیحولباتنییە»ی غەزالی دەڵێ «قرمەتیگەل بە دوونادوون و حلوول باوەڕیان بوو. غەزالی نووسیویە: موعتەزید خەلیفەی عەبباسی لە ۲۸۹ی کۆچیدا یەکێ لە سەرۆکگەلی قرمەتی دادگایی دەکرد لێی پرسی ئایا ڕاستە کەوتووتە ڕۆحی خودا و ڕۆحی پێغەمبەران هاتوونە جەستەمەوە... و لە کارەکاندا یارمەتیم دەدەن؟ قرمەتی جوابی دایەوە ئەگەر ڕۆحی خودا بڕواتە جەستەی ئیمەوە بۆ تو زیانی هەیە یا ڕۆحی شەیتان بچێتە جەستەمانەوە بۆ تۆ سوودی هەیە؟ لەوەی کە بۆ تۆ سوود و زیانی نیە مەپرسە...» قرمەتیگەل وەکوو میهرپەرستگەلی پاش ئیسلام بە «هەزارە» باوەڕیان بوو واتە هەر هەزار ساڵ جارێك تەجەللای خودا لە مرۆڤێکدا دەردەکەوێت. دخوویە دەڵێ «نزیك بوونەوەی دوو گەڕۆك ئەستێرەی زوحەل و موشتەری لە یەك کە پێ دەڵێن «قیران» سێ جۆرە. نزیك بوونەوەی چکۆلە کە بیست ساڵ جارێکە. نزیك بوونەوەی ناوەنجی دووسەد و چل ساڵ جارێکە. نزیك بوونەوەی گەورە ۹٦۰ ساڵ جارێکە.

ئەم ۹٦۰ ساڵە نزیکە بە هەزارەیە. ل ۷٤، قرمەتیانی بەحرەین و فاتمیان، دخوویە. وەرگێر بە فارسی موحەممەد باقر ئەمیرخانی» گشت غوللات باوەڕیان وایە لەو چل ساڵەی ئاخری هەزارەدا تەجەللای خودا لە زەویدا لە کەسێکدا دەردەکەوێ باوەتایەری هەمەدانی لەم بارەوە لە زمانی باوە خوەشینەوە، دەڵێ:

بە هەر ئەلفێ ئەلف قەددێ بەرایێ مەن ئان ئەلفەم کێ دەر ئەلف ئامەدەستەم

واتە بە هەر هەزار ساڵدا باڵابەرزێك (پیاوێکی بەرچاو) هەڵدەکەوێت من ئەو باڵا بەرزمە کە لە هەزارەدا هاتووم. هەروەها دخوویە سەبارەت بە قرمەتیگەل دەڵێ «ئەوانە بە لاسایی کردنەوە

لە دوانزە حەواری عیسا دوانزە «نەقیب» بۆ ڕاگەیاندنی باوەڕگـەلیـان دەنێـرن. بـە گێڕانـەوە لـە ئەبولئەشراف، بە لازەرییەوە».

دەبێ بڵێین دوانزە حەواری عیسا لە مەسیحیەتی ئەوروپادا خۆی لاسایی کردنەوەیـە لـە دوانـزە یارمەتیدەری میترا کە وتمان دوانزە بورجی ئاسمانن. قرمەتیگەل کە لقێك لە ئیسماعیلین لەگـەڵ دەزگای خەلافەتی عەبباسیدا دوژمن بوون. کاتێك لە بەحرەیندا حکومەتیان پێکهێنا هێرشـیان کردە سەر مەکەو خانووی کەعبەیان ڕماند و «حەجەرولئەسوەدیان» لەگەڵ خۆیان بـۆ بـەحـرەین برد. هەڵبەت پاش ٢٢ ساڵ ئاشتیانە گەڕانیانەوە بۆ مەکە و لە جێگای ئێستایدا دانراوە. دخوویە بە گێڕانەوە لە ئەبووڕەیحانی بیرونی دەڵێ:

«لە سەرەتای ساڵی ٣١٩ی کۆچی لە نێو قرمەتیاندا گوناهکارێك بە ناوی ئیبنی ئەبی زەکەریا تەمماعی هەڵساو وتی من خودام. خەڵك بانگەوازی ئەویان قبووڵ کرد و ئەو خەڵکی بۆ کارگەلـی چەپەڵ هاندا. ئاگرپەرستی ڕایج کـرد و پێغەمبـەرانی ڕابـوردووی وەکـوو درۆزن ناسـاند... ل ٨١ سەرچاوەی ناوبراو». میخائیلیان دخوویە لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ «لە سەدەی چواری کۆچـیدا زۆرکەس بانگەوازی حلوولی خودا لە جەستەیاندا کردووە و زۆرکـەسـیش بانگهێشـتی ئـەوانیـان قبووڵ کردووە بەڵام جێگای قرمەتیگەل بۆ ئەم بانگهێشتە چاکتر بوو. ل ٨٤ سەرچـاوەی نـاوبراو» دخوویە بە توندی دژ بەوەیە کە قرمەتیەکـان هاوبـەشـیان لـە ژنـدا بـووە و پـاش توێـژینی زۆر دەنووسێ بە تەواوی بەو قەناعەتە گەیشتووم کە هەرگیز لە نێوان قرمەتیگەلدا شتی وا نەبووە... بە تایبەت ئیبنی حووقەل کە زۆرتر لە نووسەرانیتر لە سەر ئەوان توێژینی هەیە، گوزارشتی وای نەداوە. ل ٩٥. تەنیا «ئیبنولجەوزی»ە کە دەنووسێ بە هیچ قرمەتیەك ئیزن نەدراوە ژنـی لـە هـاو ئاینەکانی بشارێتەوە ڕەنگە قرمەتیگەل لەگەڵ حیجابی ژنان مێملێ بوونە کە ئەو گشتە توانجەیان لێ داون ل ١٨١»

درووزییەکانیش لە لقگەلی ئیسماعیلی دواییـنن. ئەمانـە کوردگـەلـێکن لـە بەرزاییـەکـانی جەولان (گۆلان؟)دا و ئێستا لە لوبنانیشدا دیهاتگەلێکیـان هـەیـە. دخوویـە سـەبـارەت بـەوان نووسیویە «بە وتەی ئەوان ناسینی زاتی خودا بێمەزهەرێ لە ئـەو نـاکرێ ئـەگینـا نـاتوانی بـە ناسینێکی دروست لە زاتی ئەو بگەیت (واتە دەبێ کەسێك هەبێ کە خـودا لـە جەسـتەی ئـەودا تەجەللای کردبێت تا بەهۆی ئەوەوە بتوانێ خودا بناسی) بەڵام خـودا چـون میهـر و بـەزەیـی بـۆ بەشەر هەیە حیجابی دانا تا ئێمە نەیبینین. هەروەها «مەکـان»یشـی دانـا تـا لـە مـەکانـەوە

لەگەڵمان قسە بکات و ئێمە بتوانین ئەو وەکوو «وجوود» ببینین و هێز و هەستی کەین و بیپەرستین. (واتە مەکانیش تەجەللای خودایە وەکوو سوهرەوەردی کە دەڵێ مادەش هەر نوورە بەڵام نووری کەسیف و کێشدار). پەرستن و زانینی گەورەیی خودا بە هۆی ئەم حیجاب و ئەم مەکانەوەیە کە دەتوانین ببینین و قسەکانی ببیسین و لە گەڵیدا قسە بکەین. حاجیب و مەکان هەر دوو بەڵگەن بۆ جەستەی مرۆڤێك کە تەجەللای خودای تێدایە. ل ۹۸ هەر ئەو سەرچاوە».

ئەمانە کە دخوویە سەبارەت بە درووزیەکان وتوویە بە تەواوی پیشاندەری ئایینی میهرپەرستیە کە لە چوارچێوەی باوەڕ بە تەجەللای خودا بوونی عەلیەوە پارێزراوە جا با ئەوەی کە تەجەللای خودایە موحەمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی جەعفەری سادق بێت یان بە وتەی قرمەتیگەل مەهدی بێت یان عەلی بێت یا .... مەبەست پاراستنی چوارچێوەی میهرپەرستی بووە. دخوویە لە درێژەی وتەکانیدا سەبارەت بە درووزیگەل دەنووسێت لە زەمانی ئادەمەوە تا موحەمەد (دـ خ) تەنزیل (هاتنە خوارەوەی ڕۆحی خودایی بۆ جەستەی کسیك) نەبوو (واتە یەکەم تەنزیل عەلی بوو. تەنزیلی دووهەم تەنیا لە زەمانی موحەمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی جەعفەری سادق بوو (واتە موحەمەد کوڕی ئیسماعیل تەجەللای زاتی خودا بوو)

تەنزیلگەلی پاش ئەو وەکوو خەلیفەگەلی فاتمی بوون. ئاخرین و شکۆدارترین تەجەللاکانی زاتی حەق لە جەستەی «حاکم» خەلیفەی فاتمیدا بە دیهات. ئەم حیحابگەلە تەنیا لە ناو و جەستەدا جیاوازیان هەیە ئەگینا لە ڕاستیدا یەکن. ئیزنمان هەیە کە خودا بە ناوی هەر کامیانەوە بپەرستین ل ۹۸ سەرچاوەی ناوبراو» «ئیسماعیلیگەل بە هەفت تەنزیل باوەڕیان هەیە کە ئاخرینی ئەوانە موحەمەد کوڕی ئیسماعیلە. لە ڕوانگەی درووزیانیشەوە موحەمەد کوڕی ئیسماعیل ئاخرین تەنزیلە ئەگەر گەڕانەوەگەلی دیکە هەیە تەنزیل نیە بەڵکوو گەڕانەوە و هاتوچۆی موحەمەد کوڕی ئیسماعیلە لە جەستەگەلێکیتردا.

بزانن لەم نووسراوەی خوارەوەدا بنەمای میهرپەرستی چلۆن لە چوارچێوەی وشەگەلی عەرەبی و ئیسلامیدا خۆی دەنوێنی:

«حاکم (خەلیفەی فاتیمی کە لە میسردا حکوومەتی دەکرد) دەیگوت تەجەللای خودام. لە ئایینی ئەواندا هەر «ناتیق» (ئەوەی کە ڕاستەوخۆ تەجەللای خودایە) جێ دارێکی بە ناوی «ئەساس» کە لە ئەو تەنزیل (شەریعەت) زەردەگرێ و پاش مردنی ناتیق دەبێتە جێنشینی. ئەساس ئیمامەکە پاش ناتیق شەش ئیمام دێن. کە خولی شەش ئەساس تەواو بوو (بە ناتیقی

پێشوو وە دەبێ بە هەفت) ناتیقیکی دیکە واتە تەجەللایەکی‌تری خودا پەیدا دەبێت .... ئەساس‌گەلی پاش عەلی ١ـ حەسەن ٢ـ حوسەین ٣ـ علی کوڕی حەسەن ٤ـ موحەممەد کوڕی عەلی ٥ـ جەعفەری سادق و کوڕەکەی ئیسماعیل پێکەوە ٦ـ موحەممەد کوڕی ئیسماعیل ٧ـ عەبدوللا کوڕی عەینولقەداح کە تەعەییون و تەجەللای خودایە. ل ١٠٠ سەرچاوەی ناوبراو» ئیسماعیلیەکان باوەڕگەلی میهرپەرستیشیان لە فەلسەفە دەرهێنا. خودا خۆی موتلەقە و هیچ سفەتێکی نیە، (وەکوو قۆناغی دوانزەهەم لە فەلسەفەی سوهرەوەردیدا کە ناوی نابات). «عەقڵی کول (تاوەزی گشتی کە یەکەم تەجەللای خودایە و بەرانبەرە لەگەڵ میترا و مەلەکە تاوس). ناتیق تەنزیلی عەقڵی کوللە و مرۆڤ دەبێ ئەو ستایشت بکات. لە عەقڵی کول نەفسی کول دەرکەوت ناتیق خودی عەقڵی کوللە و نەفسی کول ئەساسی ئەوە واتە ناتیقەکان یان بە وتەی کاکەیی زات بەشەرەکان هەر عەقڵی کوللن کە تەجەللای خودایە. هەیوولای یەکەم مەکان و زەمانە کە لە نەفسی کوللەوە دەرکەوتن. لە زەویشدا ناتیق و ئیمام و حوججەت و داعی لەگەڵ ئەم چوار پلە هاو پلەیی هەیە ل ١٠٠ دخوویە کتێبی ناوبراو».

ئیسماعیلیەی دواییینی لە ئێران و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پەرەی زۆری سەند. لە ئێراندا لە پاڵ حکوومەتی سەلجوقیەکان و خوارەزمشاهی‌گەل لە ناوچە شاخاویە سەختەکاندا نیمچە حکوومەتێکیان هەبوو. لە یەمەنیشدا هەندێ پەرەی سەند «کتێبی، تەنویلوززەکات، (ئەم کتێبە کە دخوویە ناوی دەبات نەمزانی هی کێیە) زۆر لەو پرس و مژارگەلە سەبارەت بە قرمەتیگەل دەمان زانی ڕوونی دەکاتەوە «گشت حوکم‌گەلی قورئان بە تەئویل، ڕواڵەتگەلێکە کە لە بناغەدا بە فەرمانبەری تەواو لە ئیمام (تەجەللای خودا) حوکم دەکات. باوەڕ بە زیندوو بوونەوەی جەستە لە قورئاندا بە شۆخی و گەمە دەزانن و دەڵێن ژیانی هەتا هەتایی گەڕانەوەی گیانە بۆ بناغەی خوی (بە وتەی سوهرەوەردی تێکەڵاو بوون لە جیهانی نوورولئەنواردا) کە ئەویش بە دوونادوون دەکرێ موسوڵمانی ڕاستەقینە کەسێکە کە بە ڕواڵەتی قورئان و سوننەت بەسندە ناکات... ل ١٠٠ کتێبی ناوبراو» سەبارەت بە هاوبەشی لە ماڵ و داراییدا، لقەکانی ئیسماعیلی دواییینیش وەکوو غوللات و خوەڕم دینەکان و گشت لقەکانی میهرپەرستی پاش ئیسلام پێ باوەڕیان بووە بەڵام تۆمەت و توانجی هاوبەش لە ژندا لە لایەن دوژمنەکانیانەوە لەمانیش دراوە. ئەم تۆمەتگەلە کە لە خوەڕمدینی و کاکەیی و غوللات دراوە من وەکوو نووسەری

ئەم پەرتووکە پڕ باوەڕم درۆیە. قەسیدە ناجوامێرانەکەی «شێخ ڕەزا تاڵەبانی» هەر لە بەیتی یەکەمدا دیارە کە ئیفترایە:

هەتانە هەر وەکوو بیستوومە بەزمێ    لە ساڵێکا شەوێ یارانی دیندار...

دیارە کە شاعیر شتێکی بیستووە. ئەم شتە کە تەنیا بیسراوە هەزار ساڵ پێش شێخ ڕەزایش لە ناو موسڵمانانی دەمارگردا هەبووە. مەسیحیگەلی ئەوروپا تاوانی قوربانی کردنی مرۆڤیان دەدایە پاڵ میهرپەرستەکان بە گشتی نەتەوە و هۆنەرگەلی دوژمن بە یەك، بۆ یەکتری تاوانج و تۆمەتیان هەڵدەبەست. شێخ ڕەزا جگە لە هەندێ تەنزی جوان لە زۆربەی شیعرەکانیدا حورمەت و ڕێزداری پێ نووسی لانیە. تەنز و هەجو لەگەڵ شەڕە دوژمێن و ناونیتکە جیاوازی هەیە. زۆر نارەوایە تەنیا بە بیستن، ئاینی تاكپەرستی هاو وڵاتی خۆت بەو شێوە هەجوبکەی. کاکەیی لە ناوچەی کرند و قەڵخانی وزەردەڵان و.... هەروەها ئێزدیگەل لە ستایشتگای لا لەشدا بۆ مەلەکە تاوس دابگەلێکیان هەیە بەڵام نەمینۆرسکی کە بە تەواوی کاکەیی توێژین کردووە و زۆر دەفتەرگەلیانی بۆ رووسیا بردووە و نە هیچ زانا وتوێژینەرێکی بێلایەن بۆ شتی وا ئاماژەی نەکردووە. دخوویەی ناوبراو کە بێلایەنە شتیوای رەت کردۆتەوە.

مەلەکە تاوس کە بە درێژی باس کرا لە لقگەلی غولاتدا بووە بەڵام بۆ بەرگری لە تاوانجی شەیتانپەرستی لە نەێنیدا ستایشت کراوە. سوهرەوەردیش وەکوو ئەجدادی خۆی بە مەلەکە تاوس باوەڕی بووە بەڵام بە شێوەگەلی ئاماژەیی وتوویەتی. وتمان پەرتووكگەلێکی سەمبولیکی بە فارسی هەیە لەوانە ئاوزی سوورمان شرۆڤە کردەوە، کە بوون تێکەڵاوێك لە قەهرو ئەوینە. یەکێ لەو پەرتووكگەلە «ئاوازی پەڕی جبرەئیل» کە دەیان لاپەڕە شرۆڤە هەڵدەگرێ. لەوەدا پرسیارکەر بە پیری دەهەم دەڵێ لە پەڕی جبرەئیل ئاگادارم کە (هەر وەها کە وتمان جبرەئیل دوونی پیر بنیامینی کاکەیی خۆمانە کە فەلەکی خۆر بە دەستیە و جبرەئیل رەنگدانەوەی ئەوە لە مانگدا. مەبەستی سوهرەوەردی لە پەڕی جبرەئیل نووری خۆرەو ئەویش ئاماژەیە بە رەحمەتی مەعنوی خودا) «پیر وتی بزانە کە جبرەئیل دوو پەڕی هەیە یەکەم پەڕی ڕاست، ئەوە نووری موتلەق و خاوێنە. ئەو نوورە نووری خودایە کە زیاد کراوە بە پەڕ. دووهەم پەڕی چەپ کە هەندێ نیشانەی تاریکی تێدایە وەکوو لەکەیەکە لە ڕووی مانگدا کە وەکوو پای تاوسە و ئەوە نیشانەی بوونی ئەوە کە لایەنی نەبوونی هەیە، چون بۆ لای زیادکراوەی بوونی ئەو بڕوانی، بە حەق زانینی نەبوونیەتی،

هەر ئەمە پێداویستی بوونی ئـەوە. بـە کـورتی دوو پـەڕ (بـاڵ)ی جبرەئیـل ئـەم مانـای هـەیـە: زیادکردنی بە حەق کە شتێکی واقیع و ڕاستەقینەیە و بە شیاو زانینی لە نەفسی چەپی خۆیدا»

مەبەستی سوهرەوەردی ئەوەیە فەیەزانی حەق کە وەکوو سەمبول لە خۆرەوە دێت دوو لایـەنـی نوور و تاریکیە و هەر دووش وەکوو دوو باڵی پەلەوەر پێویست و پێداویستی یەکـن و هـەر دووش یەك شتن لە یەك سەرچاوە. بوون و نەبوون یـەك هـەڵوێستـە و تـاریکی و ڕوونـاکی یـەك شـتـە. سوهرەوەردی لە حیکمەتولئیشراق‌دا دەڵێ «ئەوەی لە نووررولنەنوارەوە دەردەکەوێ بەشێکی تیشکە و بە شێکی بەرزەخگەل و مادەی کێش‌دار و تاریکە». سوهرەوەردی ئەستێرەکانی سەروو بە نـوور و زەوی بە تاریکی و مانگ بە شتێك دەزانێ کە هەم لایەنی نوورو هەم لایەنی مادەی تاریکی هەیە.

جگە لە مەلەکە تاوس ئەوەی‌تر کە لە سـوهرەوەردیدا سـەبـارەت بـە ئـایینی غـوللات شـیاوی لێکۆڵینەوەیە ئەوەیە کە ئەویش وەکوو غـوللات قورئـان تـەئویـل دەکـات. گشـت توێژینـەرانی موسڵمان چون گەرەکیانە فەلسەفەی سوهرەوەردی وەکوو فەلسەفەی ئیسلامی لە قەلـەم دەن لـەم ڕاستیە خۆ یان گێل کـردووە. هـەنـدێ ناسیونالیسـتی ئێـرانیش دەیانـەوی بیلکێـنن بـە ئـایینی زەردەشتیەوە وەکوو ئەو گشتە هەوڵەی کـە بـەڕێز هـاشمی ڕەزی داویـە. بـۆ ئـەوە تـەئویلـەکـانی سوهرەوەردی دەرکەوێ ناچارین فەلسەفەی حیکمەتولئیشراق شرۆڤەکەین کە زۆرتر لە دوو هـەزار لاپەرە هەڵدەگرێ. ئەم کارە دادەنێنین بۆ زانکوکانی کوردستان. سـوهرەوەردی بـۆ ڕوون کردنـەوەی فەلسەفەکەی هەندێ جار بە ئایەگەلی قورئان ئاماژە دەکات کە جگە لـە دوو سـێ ئایـە وەکـوو «الله النور السموات و الارض...» ئەوانەی‌تر بێ تەئویل (نە تەفسیر) ناچـەسـپێ بـە وتـەکـانی سوهرەوەردیەوە.

بۆ تەئویلاتی غوللات لەوانە ئیسماعیلی کتێبـی «جامیعولحیکمەتەیـن» لـە «ناسرخەسـرەو» نووسەری ئیسماعیلی ئێرانی لە سەدەی شەش و هەفتی کۆچیدا گرینگە. ئەم کتێبـە بـە فارسـی نووسراوە و بە تێکۆشانی خوا لێخۆشبووان «دوکتور موحەمەدی‌موعین» و «هەنری کـەربن» لـە چاپ دراوە پڕە لە تەئویلاتی غوللات. ناسرخەسرەو لە پێش‌دا پاش هێنانەوەی حەدیس و وتوێـژی ڕەسوول (د ـ خ) لەگەڵ چوار خەلیفەدا تەنیا «عەلی» بە خاوەن هێزی تەئویـل دەناسێنێ (ل ٦١ سەرچاوەی ناوبراو). لە بـەشـی «انـدر هیئـت خاصـه و رسـم وحـد»دا ڕوانگـەی فـەلسـەفـەی مەششائی‌گەل بە تەئویل لە قورئانەوە دەردەخات. ئەمە بیر هێنـەری کاری سـوهرەوەردیە و ئـەمـە دەسەلمێنی کە سەرچاوەی هەر دوو یەك شتە. لە چوار سەدە پێش زایین‌دا مەششائی‌گەل و پاشان نۆ

ئەفلاتوونیەکان فەلسەفەکەیان لە میهرپەرستی گرت و دارشت پاش ئیسلام ئیسماعیلیەکانیش بە هۆی لێکچوونی ئەم فەلسەفەگەلە لەگەڵ بنەمای دینەکەیان واتە میهرپەرستیدا لەوە کەلکیان وەرگرت. سوهرەوەردی بە فەلسەفەی مەششائیەکان ئیشراقی زیاد کرد و بە تەواوی فەلسەفەو باوەڕمەندی ئەجدادی کوردی خۆی پێشاندا. ناسرخەسرەو وەکوو میهرپەرستی بۆ دەربڕینی باوەڕمەندی ئیسماعیلی لە هەفت گەرۆك ئەستێرە وەکوو کاکەیی و سوهرەوەردی کەلك وەر دەگرێ: «چون دەبینم لە جیهانی واقیعدا هەفت ئەستێرە هەن. ئەوانەی بە دیهاتوون لەوانە نورر و جوانی دەگرن. ئەمانە بەڵگەن بۆ ئەوە بزانین لە جیهانی سەروودا هەفت تیشکی یەکەمین و ئەزەڵی هەن کە ئەو تیشکگەلە هۆی بەدی هاتنی تیشکگەلی مادی و جەستەیین ئەو نوورگەلە یەکەم «ئیبداع» و دووهەم «جەوهەری عەقڵ» و سێهەم «کۆی عەقڵ» واتە عەقڵ و عاقڵ و مەعقووڵ. چوارەم «نەفس» کە لە عەقڵ پێکهات. پێنجەم «جدد» شەشەم «فەتح» و هەفتەم «خەیاڵ» کە لە ڕواڵەتی شەریعەتدا وەکوو جبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل و... ناسراون و هەفت ئەستێرەگەلی گەرۆك ڕەنگدانەوەی ئەوانەن. ل ١٠ ـ ١٠٩ی سەرچاوەی ناوبراو». هەفت نووری ئەزەڵی ناسرخەسرەو هەر هەفتەنی کاکەیی خۆمانن کە بە ناوگەلێکی دیکە هاتوون. دیسان لە قسەگەلی ناسرخەسرەودا بناغەی ئاینەکە واتە میهرپەرستی دەردەکەوێت «لە کاریگەری خۆی لە درووس بوونی مرۆڤدا دڵ بە دیهات (دەزانین میترا کە لە خۆردایە بە مانای ئەوین و خۆشەویستیە. میترا لە ئەوێستادا میثرە لە بناغەی میث بە مانای ئەوین و دۆست بوون و پەیمانی دۆستی بەستنە) و لە کاریگەری مانگ لە بەدیهاتنی مرۆڤدا مێشك دروس بوو کە سارد و تەڕە وەکوو سروشتی مانگ... لە نێوان مێشك و دڵدا پێوەندی هەیە، هەروەها کە لە نێوان مانگ و خۆردا پێوەندی هەیە بەو چەشنە کە تیشك و جوانی مانگ لە خۆرە. تێفکرینیش سەرچاوەی لە دڵە... ل ٢ـ ٢٨١ سەرچاوەی ناوبراو».

ئەوانە کە دەڵێن ئاینزای شیعە بەرهەمی فیکری ئێرانیە دروست نیە وتمان شیعەگەلی ڕاستەقینە وەکوو کیسانیەو زەیدییە و ئیمامییە و ئیسماعیلی سەرەتایی لە پێشدا بەدیهاتن بەڵام ئەوانەی کە بە هەڵە بە غوللات واتە شیعەگەلی زێدەرۆییکەر ناسراون بە تەواوی ڕوونە کە لە ئاینی میهرپەرستی ناوچەی ماد لەوانە کوردستان گیراون. ئاینگەلی خوەرمدینی و ئێزدی و کاکەیی و عەلەویگەلیتری کوردستان وەکوو دورووزی و .. و غوللاتیتر وەکوو لقەکانی ئیسماعیلی دواییی و شەبەك لە بناغەی دینەکەیاندا هیچ جیاوازیەك نیە. ئەگەر جیاوازی هەیە

له ناو جامه (جەستە)ی مەزهەروڵڵاکانی پاش ئیسلامدایە. ئیسماعیلی دوایینی لە ژێر کارتێکردنی دینە کوردیەکاندا بەتایبەت کاکەیی پێشوو لە زەمانی بەهلوول و پێشتردا بە دیهات، پاشان لە ئێران و میسر و یەمەن و بەحریندا بڵاو بۆوە. ئیسماعیلی دوایینی لە پێشدا وەکوو مەحفیلی تاینی لە ئێراقدا دروست کرا پاشان بوو بە دین و لە ئێراندا بڵاو کرایەوە و بوو بە خاوەن لقوگەلێکی بەهێز. «ئیبنی نەدیم» لە کتێبی «ئەلفیهریست» کە لەوەدا لە شیعر باس دەکات سەبارەت بە ئیسماعیلییە دەڵێت «عەبدوللا کوڕی مەیموون ناسراو بە قەدداح، خەڵکی قوزحولعەبباس نزیکی ئەهواز بوو. باوکی مەیموون لایەنگری خۆی لە بانگەوازی ئەبووخەتتاب موحەمەد کوڕی زەینەب لەوەی کە عەلی (ر ـ ه) خودایە دەرخست. ئەلفیهریست ل ٣٤٨»

«مەیموون و کورەکەی هەر دوو لە دیسانیگەل بوون (دێسانی بە کوردی دەڵێن داسنی و دێسنی، لە کوردستاندا زۆر بوون بەڵام جگە لە بەیتی سەیدەوان و شیعری چەند شاعیرێك شوێنەواریانم بەدی نەکرد ئەو زەمانە ناوی میهرپەرستی شاراوە بووە ئەوان وەکوو مانەوی و مەزدەکی و خوەرەمدینی و دێسانی و ... دەناسران» عەبدووڵڵا بۆ ماوەیەك خۆی وەکوو پێغەمبەر دەناساند (وەکوو مەزهەروڵڵا دروستترە) بۆسەلمیە نزیکی حەمس (نێوان حەلەب و دیمەشق) هەڵات و بانگهێشتکەرانی خۆی هەنارد بۆ کووفە ل ٤٩ـ ٣٤٨» «عەبدوڵڵا لە ساڵی ٢٣٧دا ئەبوو سەعید شەعرانی بۆ خوەراسان هەنارد و ئەو زۆرێك لە شیعەگەلی فریودا ل ٣٥١». «پێش لە قەدداح هەر لەو سەردەمەدا کەسگەلێك بوون بۆ مەجووس و بۆ فەرمانڕەوایی مەجووسگەل تێدەکۆشان. دەڵێن ئەبوو موسلیم خوەراسانیش لەوانە بوو. لەوانە کە بۆ فەرمانڕەوایی مەجووس تێکۆشا بابەکی خوەڕمدینی بوو ل ٣٥٢»

ئیبنی نەدیم پاش ناوبردن لە کتێبگەلی ئیسماعیلیە دەڵێ بۆ فێرکردنی قوتابیانی ئاینی خۆیان هەفت بەللاغ یان هەیە. بەللاغی یەکەم بۆ قوتابی خەڵکی ساکار. دووهەم بۆ ئەوەی هەندێ سەرتر چووە سێهەم بۆ ئەوە ساڵێکە خەریکی فێربوونە... هەفتەم بۆ ئەوەی کە خاوەنی کەرامات و موکاشیفاتی گەورەیە.. ل ٣٥٣» ئەمە زۆر نزیکە بە فێرکاری هەفت قۆناغی ستایشتگاگەلی میهرپەرستی. ئیتر بۆ خوێنەری بەڕێز گۆمان نەماوە کە ئیسماعیلی دوایینی لە شیعە و ئیسلام دوورەو هەر میهرپەرستیە لە چوارچێوەیەکیتردا.

ڕەوتێکیتر کە پێوەندی زۆری لەگەڵ میهرپەرستی هەیە عیرفانی توندڕەوی وەحدەتی وجوودیە کە ڕەوتێکی نزیك بە میهرپەرستیە. وتمان میهرپەرستی نە وەك دین بەڵکوو وەکوو ڕەوتێکی

عیرفانی و ڕۆشنبیری لە پێش ئیسلامدا لە جێگاکانیتری ئێران جگە لە کوردستاندا هەبووە و پاشان هاتۆتە پاش ئیسلامەوە. عیرفانی وەحدەتی وجوودی دەڵێ هیچ جگە لە خودابوونی نیە هەرچی هەیە خودا و تەجەللای ئەوە. لقگەلی عیرفانی زۆربەیان خۆیان لەگەڵ ئیسلامدا ڕێك خست. مەنسووری هەلاج کە کاکەییەکان لە خۆیانی دەزانن و سوهرەوەردی کورد خاوەنی ئەم بیرە بوون و خۆیان بە موسڵمان دەزانن بەڵام ئیسلامی ئەو زەمانە ئەوانی بە کوشتن مەحکووم کرد. ئیبنی نەدیم سەبارەت بە مەنسووری هەلاج دەنووسێ «بە لای لایەنگرانی خۆی دەیگوت من خودام (ئەنەلحەق و ئاوێنەکەی سوهرەوەردمان سەبارەت بەو نووسی) ئەو باوەڕی بە دوونادوون و حلوول بوو. لە بەرانبەر پادشا و فەرمانڕەواگەلدا خۆی بە شیعە دەناساند. لە لای خەڵکیتر خۆی وەکوو سۆفی دەناساند. بۆ خۆی باوەڕی وابوو کە تەجەللای خودایە و ڕۆحی خودای تێدایە. کاتێ کە گیرادایان بە ئەبولحەسەن عەلی کوڕی عیسا. لەگەڵیدا وت و وێژگەل بوو. لە زانستگەلی قورئانی هیچی نەدەزانی. پێ وت چەندە لەگەڵ خاوەن تیشکی هەرە تیشکدەرکە دێتە خوارەوە قسەت کرد؟... لە هەندێ نووسراوەیدا، خۆی وەکوو نوقمکەری قەومی نۆح و کوشندەی عاد و سەموود ناساندووە... ل ٣٥٦ ئەلفیهریست» ئەو قسەگەلە لە زاری گەورەگەلی غوللاتیشەوە گێڕدراوەتەوە دیارە سەرچاوەیان هەر یەك شتە. سەرنج ڕاکێشە کە ئیبنی نەدیم بە سەرهاتی پاش بە سەرهاتی نووسەرانی ئیسماعیلی گێڕاوەتەوە. ئەو لە گەورەگەلی شیعەی زەیدی و ئیمامی بەڕێزەوە قسە دەکات بەڵام بۆ ئیسماعیلی و مەنسوور وای نەکردووە. دیارە دوو ڕەوتی یەکەم ئیسلامی و دووهەم ڕەوتی عیرفانی و غوللات سەرچاوەیتریان هەبووە. مەنسوور لە ساڵی ٣٠٩دا بە چەشنێکی نامرۆڤانە کوژرا.

لە عیرفان و سۆفیگەری ئەهوەنیشدا کە بە ئیسلام نزیکترە هەندێ باوەڕگەلی میهرپەرستی هەیە.

«مەولانا جەلالەددین مەولەوی بەلخی» یەکێ لە گەورەترین و ناودارترین عاریف و سۆفی جیهانی ئیسلامە بەرهەمی گەورەی ئەو «مەسنەوی» بە زۆربەی زمانە گەورەکانی جیهان وەرگێڕدراوەتەوە لەوەدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| از جمادی مردم و نامی شدم | از نما مردم ز حیوان سر زدم |
| واتە لە مادەی بێگیان مردم و بوومە گیا | لە گیاییەوە مردم و بووم بە ئاژەڵ |
| مردم از حیوانی و ئادەم شدم | از چە ترسم کی ز مردن کم شدم |

| | |
|---|---|
| لـه ئـاژەڵبـوون مـردم و بـووم بـه مـرۆڤ | جـا كـەی بـه مـردن كـەم بوومـەوە |
| بعـد از ئـانش از ملـك پـران شـوم | ئانچـه انـدر وهـم نايـد ئـان شـوم |

پاش مرۆڤ بوونیش له فریشتەگەل تێپەڕدەبم و به ئەوەی دەبم كه له خەیاڵدا ناگونجێ

ئەمە به تەواوی وەكوو دوونادوونی میهرپەرستی و دینه كوردیەكانه كه له لقەكانی غـوللات و عیرفانی توندڕەودا هەیە. تەكامولی گیان له بێگیانەوە بۆ گیا و له گیاوە بۆ ئاژەڵ و له ئاژەڵـەوە بۆ مرۆڤ و له مرۆڤەوە بۆ سەرتر لەگەڵ قورئاندا تەنیا به تەئویلەوە دەگونجێ. له قورئاندا مرۆڤ له تەكامولی گیا و ئاژەڵ بەدی نەهاتووە. ڕەوتی ئافرانـدنی ئـادەم و حـەوا لـه قورئانـدا زۆر ڕوون و ئاشكرایە كه ڕاستەوخۆ خودا دروستی كردووە. له قورئاندا هاتووە كه خـودا جیهـانی لـه شـەش ڕۆژدا ئافراند و ڕۆژی هەفتەم له عەرشدا موستەوی بوو (فاستوی علی‌العرش) ئیسـماعیلیەكـان (دەڵێن ئەوە ڕواڵەتی قورئانه مەبەست له هەفت ڕۆژ هەفت هەزار ساڵه. به ئاشكرایی دیـارە كـه ئیسماعیلییە دەیەوی ئەم وتەی قورئانیـه لـەگـەڵ بـاوەڕ بـه هـەزارەگـەلـی پـێش ئیسـلام لـه میهرپەرستیدا وەك یەك بنوێنێ.

له میهرپەرستی‌دا هەر هەزار ساڵ یەك جار ئەو گیانەی كه خاوەنی یەكێ له فەلەكـی گـەڕوك ئەستێرەكانه بۆ بووژاندنەوەی ژیان دێنه سەر زەوی. له شیعرەكەی باوەتایەردا وتمان: به هەر ئەلفێ ئەلف قەددێ بەرایێ...

## ڕوونکردنەوەکانی بەشی شەشەم

١ـ ئەهوورامەزدا، سێ بەشە «ئەهوو + رە+ مەزدا» ئەهوو بە مانای سەروەرییە. لە لەگەڵ پاشگری «رە» کە یەکێ لە نیشانەکانی ئاوەڵناوی کارکەرە، بە مانای «سەروەر»ە لەسەر مانای وشەی مەزدا لە نێو ئەوێستاناساندا ناکۆکی هەیە و زۆرتر بە مانای «زانا» دەزانرێ. بە باوەڕی من. وشەی مەزدا دوو بەشە بناغەی «مەز» لە ئەوێستاییدا بە مانای گەورەییە لە ئەوێستادا لەگەڵ پاشگری ئاوڵناوی «نە» کە باسمان کرد واتە «مەزنە» بە مانای گەورە و هەر ئەوەیە کە لە کوردیدا دەڵێن مەزن. «دا» لە سەری باسمان کرد و یەکیتر لە ماناکانی زانایيە. کەوابوو مەزدا بە مانای زانایی مەزنە. مەزنە لە ئەویستادا وەکوو «مەزەنگهە»یش هاتووە.

٢ـ بەهلوول زات میوانی کاکەیی لە ئاخری سەدەی دووی کۆچی لە زەمانی هاروونەڕەشیددا دەسگیرکرا و لە ژێر چاوەدێریدا بووە ئەم ناوە بە پەهلەوی کە خۆشکی زمانی کوردیە. دەبێ بە «وەهرۆد» بە قاعیدەی ئەوێستایی «وهوورۆزە» یان «وهوورەئوزە». «(ز)ی نووکەددانی» وهووی ئەوێستایی لە پەهلەوی خۆشکی زمانی کوردیدا بووە بە «وێهـ» و «وەه» لە کوردیدا «بەه» وەك دەڵێن بەهرۆز، یان بەهبەه، واتە زۆر چاك. کەوا بوو «بەه» لە وشەی بەهلوولدا پاشماوەی «وەوو»ی ئەوێستاییە بە مانای چاك. لە کرمانجیدا وەکوو بەهداری و بەهێداری ماوەتەوە.

وشەی «روود» «رۆد» لە پەهلەوی و «رووذە» و «رەئووذە» لە ئەوێستادا بە مانای شتێکە کە هەڵ دەکشێ و گەورە دەبێ و بە مانای منداڵ بە کار براوە. ئەم وشە لە کوردیدا بە پاشگری «لە» کە پاشگری چکۆلەیی و خۆشەویستیە و لە ئەوێستادا وەکوو «رە» هاتووە لە پێشدا وەکوو «رۆذرە» و پاش پەرەسەندنی «ل» لە زمانە ئێرانیەکاندا، لە کوردیدا وەکوو «ڕۆذلە» و پاش سوانی «ڕ» بە دالی موهمەلە و دەغمی ئەوە لە بواری زەماندا بووە بە «ڕۆلە» بە مانای منالی چکۆلە و خۆشەویست. کە وابوو «بەهلوول»ی کوردی پاشماوەی «وەهرووذرە»یە کە «ر» کانی بوون بە «ل». لە زەمانی ئەوێستاییەوە تا ئێستا بەم جۆرە گۆڕانی بە سەردا هاتووە:

و هوورووذرە ـ وەهرووذلە ـ بەهروول ـ بەهلوول

ئەمڕوو لە کوردیدا دەڵێن «باڵوول» دیارە «با» هەر گوڕدراوی «بەه»ە. وەك دەڵێن بادینان کە گوڕدراوی بەهدینانە و... بە گشتی باڵووڵ بە مانای رۆڵەی چاکی کۆمەلگایە.

حەمدوللای مستەوفی مێژوونووسی سەدەی هەشتی کۆچی لە لاپەرەی ٦٣٧ی تاریخی گوزیدەدا وەکوو شێخ بەهلوول هێناویەتی و وەکوو ئامۆزای هاروونە رەشیدی زانیوە بەڵام عەرەبی نەبوونی وشەی بەهلوول ئەو خزمایەتیە بە درۆ دەخاتەوە. لە چیرۆکە کوردیەکانی ناوچەی سنەدا وەکوو برای هاروونە. دیارە بەهلوول وەکوو یەکێ لە ڕاگەیەنەرەکانی میهرپەرستی و غوللات بووە کە دەسگیرکراوە و لە بەغداددا لە ژێر چاوەدێریدا بووە.

٣ـ توێژینەری کورد کاك موحەمەدعەلی سوڵتانی لە کتێبی فارسی «قیام و نەهزەتی عەلەوییانی زاگروس»دا سەبارەت بە شەبەك دەنووسێ:

«عەلائەددین عەلی لە گەشتەکانی خۆی بۆ کوردستان، پەیرەوان و فیدائیگەلێك لەسەر بنەمای مەکتەبی فیکری عەلەوییانی زاگروسدا هەن کە بە «شوبباك» (شەبەكگەڵ) ناژناویان دەرکردووە...»

بەڕێز سوڵتانی لە درێژەدا نووسیویە:

شەبەك فیرقەیەکی کوردی تایبەتە کە زۆربەیان لە مووسڵدا دەژین... پێوەندی بەهێز لە نێوان ئەوان و ئەهلی حەقدا هەیە، ... ئەوان وەکوو بەکتاشیە بۆ (...) ڕێزدا دەنێن (بەڕێز سوڵتانی ئەو ناوەی نەهێناوە) و بەشێ لە باوەڕمەندیگەل و نەریتیانە. لە جەژنگەل و نزاکانیاندا لێ کەڵك وەر دەگرن. شەبەك پیاوێکی ڕۆحانی بە ناوی بابە، یان پیریان هەیە کە لایەوە ددان بە کردەوەکانیاندا دەنێن (وەکوو مەسیحیەکان کە لە میهرپەرستەکانەوە گرتوویانە) و ئەویش دەیانبەخشێ. ئەوان سەبارەت بە عەلی زێدەڕۆیی دەکەن و لە نزاکانیاندا لە حاجی بەکتاش و گەورەگەلی قزلباش (عەلەویەکانی ئێران و ڕۆم) یارمەتی دەخوازن. لە نێویاندا ژمارە گرینگی تایبەتی هەیە و بابە لە کۆ بوونەوەکاندا لە ژمارەگەلی ٤ و ١٤ و ١٢و ٧ و ٥ و ٣ زۆر ناو دەبات. چل واسلان عەوداڵن کە سەرۆکیان عەلیە و لە هەر شەوی دوو شەممە و هەینیدا لە ئەشکەوتێ لە شنگاردا کە سەرچاوەی ماڵباتی سەفەویەکانە... کۆ دەبنەوە و کاریان یارمەتی ستەم لێ کراوانە و کەس ناتوانێ بیانبینێ و بیانناسی. بەڵام (ئون دورد لەر) واتە چوارەدەکان، دوانزە ئیمامن لەگەڵ پێغەمبەر و فاتمەی زەهرادا (دـ خ). ئون ئیکیلەر. دوانزە ئیمامی مەعسوومن کە یەکەمیان عەلی و ئاخریان مەهدیە. «یددی لەر» واتە هەفتەکان بە مانای ئەمەیە کە مرۆڤ خوازیاری هەفت قۆناخە: خوازیاری ئەوین ـ ناسینی خودا. زوهدوتەرك یەکیەتی ـ تەحەیوور ـ فەقر و لە ناوچوون لە خودادایە. ناوگەلێ وەکوو مورید و قەلەندەرو رەند و قوتب یان هەیە. «بێشلەر» پێنج

کەسی «ئالی عەبا»ن کە پێگەی خودایی تایبەتیان هەیە. «ئووچلەر» خودا و موحەمەد و عەلیەو لە زکرەکانیاندا وەکوو ئەڵڵا و موحەمەد و عەلی یاد دەکرێن. کتێبێکی پیرۆزیان بە ناوی مەناقیب هەیە کە لەسەر داب و نەریتی نووسراوە و قسەکانی شێخ سەفیەددین و شێخ سەدرەدینی سەفەوی تێدایە. ئەوان لە (....) شتێك نازانن (بەرێز سوڵتانی ناوی نەهێناوە) و تەنیا لایان وایە کە دۆسایەتی لەگەڵ عەلیدا هەر گوناهێك دەشواتەوە. لە ڕۆژی عاشوورادا عەزاداری دەکەن و شەوی دەی محەررەم بۆ ڕێزنان پاپەتی دەکەن و تا ئاخری ڕۆژی دوایی کەوش لە پا ناکەن. بەو شەوە دەڵێن (شەوی کەوش). شەوی «غوفران» یان هەیە کە ژن و پیاو لە جێگایەك کۆ دەبنەوە و لە خوا بۆ لێخۆش بوون دەپاڕێنەوە و ئەمە بە ڕێگایەك بۆ هاتنە نێو تەریقەتی سۆفیگەری دەزانن و بەمە «عوزرگیجەسی» دەڵێن (بەرێز سوڵتانی بەم سەرچاوەگەلە ئاماژەی کردووە: ئەششەبەك ـ فەرهەنگ فیرەق ئیسلامی ـ دائیرەتولمەعارف ئیسلامییە ـ پەژووهشی دەربارەی تەوایف غوللات لە ئەسکەندەر ئەسفەندیاریەوە.

ئەوەی کە بەرێز سوڵتانی لە سەرەتادا نووسیویە تا سەرەتای پیرۆز بوونی ژمارەکان لەسەر بنەمای غوللات و میهرپەرستیە. ئەوی پاش بە شیعەگەلی ئیمامییە نزیکە.

**هەندێ بیروڕاو کۆکراوەیتر**

**سەبارەت بە ناوەڕۆکی بەشەکانی ئەم پەرتووکە**

هەندێ مژارو کۆکراوەیتر سەبارەت بە بەشەکانی ئەم کتێبە هەبوو کە ئەگەر لە ناو دەقەکاندا بم هێنابا دەبوو بە هۆی شەکەتی خوێنەرانی بەڕێز. لەم بەشەدا لەگەڵ هەندێ بیروڕای خۆم دەیاننووسمەوە و پاشان لەسەر وشەی میهر و شوێنەوارەکانی لە زمان و کەلەپووری کوردیدا قسە دەکرێ.

کتێبی هەرە زانستوەرانەی «ئەتتەنبیە وەلنیشراف» کە مەسعوودی مێژوونووس لە سەرەتای سەدەی چواری کۆچیدا بە عەرەبی نووسیویە و ئەبولقاسمی پایەندە کردوویەتی بە فارسی تێدا هاتووە:

«ئیبن ئەبی تاهیر، لە کتێبی، ئەخبارولبەغداددا نووسیویە: لە بەغدادا لە نزیک، سرات، دێرێکی قەدیمی هەبوو. بە وتەیەك پێش پەیدا بوونی دینی مەجووس (دیارە مەبەستی پێش فەرمی بوونی ئاینی زەردەشتیە لە سەرەتای حکوومەتی ساسانیەکاندا) و دەسەڵاتی ئێرانیەکان لەم ناوچەدا، لەوێ بتێك هەبوو بە ناوی باغ، ل ٣٤٣» ئەمە دروستە «باغ» هەر «بەغ» لە زمانی ئاریاییەکاندا بە مانای خودایە. لە بەشی یەکەمدا وتمان کە بەغەیادیش (یادی بەغ) لە بەرد نووسراوەی بێستووندا (سەدەی پێنجی پێش زایین) جەژنی «میترەکانە»یە. مەبەست لە بەغ میترایە. ئەویشە پەیکەری میترا بووە. کە پاشان بە دەس ساسانیەکان لە نێو چووە.

دێری بەغدا و ئەو هەموو دێرە کە لە کوردستانی باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵاتدا هەیە و لە باکووردا پاشان بەشێکی بووە بە کەلیسا پاشماوەی میهرپەرستیە لە ڕۆژاوای ئێراندا کە لە زەمانی ئەشکانیەکاندا باوی گشتی هەبوو. لە هەموویاندا پەیکەری میترا هەبووە کە بەشێکی لە زەمانی دەسەڵاتی زەردەشتی ساسانیەکاندا و پاشماوەکەشی پاش دەسەڵاتی موسڵمانەکان وەکوو بتپەرستی لە نێو چوون. ناوی بەغدادیش هەر لە ناوی میترا خودای ئاریایی و کوردیەوە گیراوە. بە قاعیدەی ئەوێستایی دەبێ بە «بەغووداتە» و بە پەهلەوی دەبێ بە «بەغدات». ستایشتگاگەلی میهرپەرستی کە ئێستا دێری لالەشی لێ بە جێ ماوە تا سەرەتای سەدەی سێ زایینی کاتی

ڕووخانی حکوومەتی ئەشکانیەکان و شەڕەکانی ئەردەشێر لەگەڵ کوردەکاندا کەڵکی لێ زەردەگیرا.

مەسعوودی دەنووسێ «لە سەرکەوتنەکانی‌تری موعتەسەم (خەلیفەی عەبباسی) پاش سەرکەوتنی بە سەر خوررەمدینەکاندا کوشتنی جەعفەر کوڕی، میهرجیشی کورد، بوو کە لە نێوان مووسڵ و ئازەربایجان و ئەرمەنستاندا حکوومەتی پێك هێنابوو ل۳۲۹» ئەو ناوەندە کە مەسعوودی هێناویە هەر کوردستانە. جیش عەرەبی کراوی «گیش»ی پەهلەویە (لە فارسی ئێستادا دەڵێن کیش). لە ئەوێستادا «تکە ئێشە» کە پیتی یەکەمی بە قاعیدە سواوە. میهرگیش بە وردی بە مانای میهردینە دیارە میهردینی لەو زەمانەدا بە نهێنی ڕەواجی هەبووە و پاشان بە غەزای پەیتاپەیتا کز بۆتەوە و پاشان بووە بە ئێزدی و کاکەیی و عەلەویەکانی‌تر.

مەسعوودی نووسیویە: «نسارا» (مەسیحیەکان) ڕۆژی چوارشەمە بە ڕۆژوو دەبن دەڵێن عیسا لە چوارشەمە ۲۳ی ئازاردا بە خاچ کێشراو مرد بەڵام زیندوو بووەوەو هەڵساو بۆ ئاسمان سەرکەوت. دەڵێن هەر کەس لە ئاسمانەوە نەیەتە خوارەوە بۆ ئاسمان سەر ناکەوێت ل۱۱۵» دیارە مەسیحیەکان زۆر داب و نەریتی پێشووی خۆیان پاراستووە. ڕێزی چوارشەمە پێوەندی بە میهردینی و ئێزدی و کاکەییەوە هەیە و هاتنی عیسا لە ئاسمان و گەڕانەوەی ئەو بۆ ئاسمانی خۆر هەر هاتنە خوارەوە و سەرکەوتنی میترایە لە شەوی یەلدا و شەوی نەورۆزدا کە لایەنی‌تری ئەو لە چوارشەمە سووری و سێزدەبەدەردایە. سێزدە بەدەر زۆر بە نەریتی درۆی نیسان نزیکە. ئەم نەریتە بەداخەوە ئێستا خراپ کراوە. ئەم نەریتە وەکوو درۆیەکی گشتی بوو نەك هەر کەس بیەوێ درۆیەك ساز بکات. زۆرتر وەکوو گاڵتە بوو. بۆ وێنە دەیان گوت، دوێنێ لە فلان شار قرژاڵ باریوە و...

مەسعوودی نووسیویە: دێسانی (لە کوردستاندا داسنی و دێسنی) پێش مانی هەبووە چون مانی لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە وان شتی نووسیوە» (بەداخەوە سەبارەت بە داسنی زانیاری تەواوم نیە لە ئاخری ئەم بەشەدا باس دەکرێ).

ئاسەوار و ستایشتگای میهرپەرستی لە ئیتالیادا زۆرە. ناوی شاری میلان و میلان، عەشیرەی گەورەی کورد گۆڕدراوی «میتران»ە. میلانی کورد لەگەڵ میتران سەرداری ئەشکانیدا پێوەندی هەیە. هەروا کە وتمان سۆران لەگەڵ سوخران یان سوهران سەرداری‌تری کورد لە زەمانی ئەشکانیەکاندا لە پێوەندیدایە «گۆران»یش لەگەڵ «گێو» سەرداری ئەشکانیدا پێوەندی هەیە کە چوەتە ناو ئوستوورەوە.

گۆران بە دابێژی کون «گێورانە»یە. ئەم وشە دوو بەشە «گێو+ رانە» گێوناوی سەرداره. رانە لە ئەوێستادا بە مانای حەشیمەت و لەشکره. ران ئەمڕۆ لە کوردیدا بە مانای ڕەوەی ئاژەڵ بە کار دەچێت. ئەمە قاعیدەیە کە ئەگەر دوو پیتی دەنگدار لە لای یەکەوە بن لە بواری زەمانندا یەکێکی دەسوێ. لە گێوراندا «ێ» سواوە و بووە بە گۆران. وەکوو کاویەی ئەوێستایی و وێدایی کە بووە بە کاوە. گۆران بە مانای خەڵك و حەشیمەتی گێوە.

ڕوانگەی «مینۆرسکی لە کتێبی کورددا کە تاوس و تەمووزیەیەکیێ دەزانی ل ۱۱۷، ۱۱۸» هەڵەیە. لەسەر ناوی ئاماژەیی تاوسێ مەلەك باسمان کرد.

**مینۆرسکی دەنووسیّ:**

«لەو شتە سەیرانەی کە قزلباشەکانی تورکیا (بەشیّ لە عەلەویەکانی کوردستانی باکوور) بڕوایان پێیە ئەوەیە کەوا:

دەزانین خوا بۆیە هاتۆتە سەر زەوی کە ئیش بکات. عەلی شیرە گەورەکەی داوە بە ڕووسیا و نیشانە سەوزەکەشی‌داوە بە ئینگلیس. ئەم دووانە تورکەکان لە ناو دەبەن. گەڕۆکە ڕووسیەکان لە سیواس لەوانەیان بیستوە کە لە سالانی سییەکاندا عەلییەکی‌تر دەردەکەویّ. خەلکیش خۆیان ئامادە کرد بوو بۆ پێشوازی ئەو. اسلام در ایران». ئەم هاتۆچۆی عەلییە هەر هاتۆچۆی میترایە وەك زات بەشەر و زات میەمان (سیمورغ).

مەولەویش وەکوو سوهرەوەردی بە نۆ ئاسمان باوەڕی هەیە:

وە لوەلەی لوولەی پێشەی ئازای چاك     یا وا وەسەرین نۆ پەردەی ئەفلاك...

ناوی بەشیّ لە ئینجیل «عەهدی عەتیق» واتە پەیمانی کۆن. وەکوو زۆر شتی‌تری مەسیحی هەر باوەڕمەندی میترابیە. لە کاکەیی‌دا دەلێن بەیابەست.

---

وەلی دیوانە کاکەیی نیە بەلام وەکوو فەرهەنگی کۆنی‌گەلەکەی بە جێگای خودا وەکوو کاکەییەکان «شا» بەکاردێنی: یاشا ئەی نەردە نەشا نیم وەبەخت. ئەر بۆمەرگم بۆ وەرجەوادەو وەخت.

لە باوەڕی سوهرەوەردی لە سەرەوە بۆ خوار ئاسمانی نۆهەم کە ئاسمانی مانگە بەشێك مادەو تاریکی تێدایە لە ئاینی کاکەییش‌دا هەروایە بەم بۆنەوە ناونراوە لەوحی حەجەر واتە بەرد. ناوی ئاسمانەکانی‌تر بەردگەلی قیمەتی وەکوو دوڕ و یاقووت و ئاقیق و....هـ.

میترا یان مەلەکە تاوسی ئێزدی و کاکەیی لەگەلّ شەمشە (شەمەش)ی بابلی و ئاشووری جیاوازی زۆری هەیە. (هەر چەند ئیزدیەکان ناوی شەمشەی سوریانیان بۆ خۆر هەلّبژاردووە یان مەلەکە تاوسیش هەر ناوی سوریانیە یان کاکەییەکان دورنادوون و یورت و ...ی تورکیان هەلّبژاردووە کە باسمان کرد.

---

جورج کامیرۆن لە کتێبی «دائیرەتولە عارف فارسی»دا کە بەڕێز حەسەن ئەنووشە بە فارسی وەری‌گێڕاوەتەوە، سەبارەت بە شەمشە هەندێکی نووسیوە. وەرگێڕ کە خۆی ئێران ناس و ئوستوورە

ناسه له ریژ نووسه‌کانیدا ده‌ڵێ: شه‌مشه (شه‌مش) خودای خۆره و له خودایانی سامیه‌کانه. (سامیه‌کان به‌شێ له سپی پیسته‌کانن که به زمانگه‌لی فنیقی، عیلامی، ئارامی، بابلی ـ که‌لدانی ـ ئاشووری ـ سوریانی ـ عیبری و عه‌ره‌بی قسه‌یان کردووه. هۆزه‌کانی پێش هاتنی ئاریه‌کان که له زاگروس‌دا ژیاون وه‌کوو گۆتوو لولۆبی و کاس‌سۆ و هه‌رسامی ره‌گه‌زبوونه و له‌گه‌ڵ فه‌رهه‌نگ و زمانی کوردیدا پێوه‌ندیان نیه). شه‌مشه کوڕی «سین» که خودای مانگ بووه. پاش گه‌شه‌کردنی ئابووری کشت و کاڵ شه‌مشه به گرینگ‌تر هاته پێش چاو، ئه‌و له‌گه‌ڵ باوکی (سین) خودای مانگ و عه‌شته‌ر خودای زه‌وی پاشان وه‌کوو خودایانی سێ دانه بوون به چینێکی خودایان. ل٢٨» له میهرپه‌رستیدا میترا کوڕی مانگ نیه. خۆریش ته‌نیا جێگای میترایه. میترا ته‌جه‌للای خودایه له زه‌ویدا نه‌ك ئه‌وه‌ی یه‌کێ له خودایان بێت. خودایان له میهرپه‌رستی و دینه کوردیه‌کاندا جێگای نیه. کاری نازانستیانه ئه‌وه‌یه که ئایینی تاك‌په‌رستی میترایی و ئێزدی و کاکه‌یی بێ‌تویژینی به‌سنده به دینه سامیه‌کانه‌وه ببه‌ستنه‌وه. که به‌داخه‌وه ئه‌م کاره کراوه.

نوورعه‌لی ئیلاهی گه‌وره‌ی ئه‌هلی حه‌قی سه‌هه‌نه له کتێبی ئاساروله‌ق‌دا بۆ جه‌ژنی شاهی (جه‌ژنی حه‌قیقه‌ت) نووسیویه: «شیخ ئه‌میر» ده‌فه‌رمێ: واده‌ی شاخ شمار (شه‌مار)که‌ڵ ره‌م شاهۆ ـ ئیقرار میردان، کۆه وه‌سه‌ر ئاسۆ. تا ئێستا نه‌بووه که مانگ و کێو و که‌ڵره‌م له کێوی شاهۆدا له یه‌که‌م رۆژی نیه‌تی رۆژووی مه‌ره‌نوی‌دا رێك نه‌که‌وێ ... کێو و سه‌ر ئاسۆ له نیوه شه‌و به دواوه‌یه. به ته‌ئکید له یه‌کێ له‌م سێ شه‌وه‌دا ده‌بینرێ. ته‌نیا جارێك ده‌بینرێ که کێو له‌گه‌ڵ مانگ نزیك بێت. که‌ڵره‌می شاهویش هه‌ر له‌م کاته‌دایه. ل ٥٣١»

خوێنه‌ری به‌رێز له باسی ئاوه‌زی سووری سوهره‌وه‌ردیدا له بیری ماوه که وتمان یه‌کێ له سه‌مبولگه‌لی مانگ، گاو ئاسك و که‌ڵه. له‌و به‌یته‌دا مه‌به‌ستی شیخ ئه‌میر له <u>شاخ شمار و که‌ڵ هه‌رمانگه که له‌و سێ شه‌وه‌دا له ئاسۆی شاهۆ ده‌بینرێ.</u>

وتمان به‌کتاشیه‌کانی تورکیا که مه‌کته‌بێکی عیرفانی و عه‌له‌ویه به‌شێ له غوللاتن. کاکه‌ییه‌کان ده‌ڵێن که حه‌زره‌تی سان سه‌هاك مرد رۆحی چووه جه‌سته‌ی حاجی به‌کتاشه‌وه. نورعه‌لی ئیلاهی ده‌فه‌رمێ «حاجی به‌کتاش هه‌ر حه‌زره‌تی سوڵتان ئه‌سحاقه. بناغه‌کانی به‌کتاشیه‌کان وه‌کوو کاکه‌ییه. ل ٥١١».

«له بناغه‌دا نه‌ورۆز و پێوه‌نده‌کانی هی حه‌زره‌تی عه‌لیه. جا تاجیلی چوارشه‌مه سووریش به عه‌شقی عه‌لیه‌وه نزا ده‌ده‌ین. ل ٥٣٠ سه‌رچاوه‌ی پێشوو» خوێنه‌ری به‌رێز له باسی نه‌ورۆز و

چوارشەمە سووری پێش ئیسلام لە بیری ماوە و پێوەندی چوارشەمە سووریمان لەگەڵ مەلەکە تاوس ڕوون کردەوە «شەیتان، بوونی لە دەرەوەی مرۆڤەوە نیە. هەر نەفسی ئامارەی خۆمانە ل ٢٤٤»

دۆژە و بەهەشت لە ئاینە تەناسوخیەکاندا: گیانلەبەر هەر چێ پێگەی خوارتر بێ ڕەنجی زۆرترە و هەرچی سەرتر بێ ڕەنجی کەمتر و خۆشی زۆرترە. نورعەلی ئیلاهی دەفەرمێ «ئەگەر بەشەر جەریمە بکرێ دەچێتە دونیای حەیوانیەوە... ئەگەر جەریمەی کەم بێ دەبێ بە ئاژەڵی حەڵاڵ گوشت تا زووتر سەر ببڕێ و ئاسوودە بکرێ. ئەگەر گوناهی زۆرتر بێ دەچێتە جەستەی حەیوانی پەستەوە ل٣٢» دیارە ئەگەر چاکەی زۆر بێ دەچێتە پێگەی سەرتر «تا لە ئەنجامدا تێکەڵاوی جیهانی تیشکی خودایی بێت ل ٣١٢» ئەمە بیرهێنەری باوەڕمەندی میترایی و سوهرەوەردیە کە باس کرا.

لە ئاینی کاکەیی‌دا وەکوو باوەڕی سوهرەوەردی مرۆڤ لە نوور دروستکراوە: «مرۆڤ لە چوار توخما (عونسور) خاك و باو ئاو دروست کرا، بە جێگای ئاگر تیشك بوو. تیشك هەر ئەو فووی خودایە کە کرایە جەستەی ئادەمەوە» (هەر ئەو سەرچاوە)

---

کاکەیی هەموو ئاینەکانی مرۆڤایەتی لای بەڕێزە. نوور عەلی دەفەرمێ: هەر کەس لەسەر هەر باوەڕمەندیەك بێت لامان بەڕێزە... کاتێ ئێمە هەموو کەسمان وەکوو برا خۆش بوێت و بە هەموو کەس خۆشەویستی کەین جیاوازیەکان نامێنێت ل ٣٣٦» ئەو بەڕێزە لە خۆشەویستی قسە دەکات. وتمان یەکێ لە ماناکانی میهر ئەوین و خۆشەوێستیە و تیشك و تاریکی گشت لە یەك سەرچاوەیە.

**لە ستایشتگاگەلی میهری کە ماونەتەوە ئەمانەی خوارەوە گرینگن**

١ـ ستایشتگای سێ دێر ناوی‌تری «دورانوروپووس» لە سووریا قەراخ چۆمی فوراتە ٢ـ والبرووك لە لەندەن ٣ـ سووفیە لە بولغارستان ٤ـ ئەکوتنیکوم لە بولغارستان ٥ـ ئیمپراتوور لە کاراکالا ٦ـ کاپیتولی لە رۆما ٧ـ سووتری لە رۆما ٨ـ سنت کلمنت ٩ـ دویچ تالتنبورگ لە ئەمسا ١٠ـ دوین لە ئەرمەنستان ١١ـ گارنی لە ئەرمەنستان ١٢ـ غاری لالەش و دیرە رووخاوەکانی کوردستانی باکوور و باشوور کە هێشتا شێوەی ستایشتگای میهری بێ‌پەیکەری میترا هەیە ١٤ـ کرفتوو لە کوردستانی بەشی ئێران نزیکی سەقز.

---

له ئەلفیهریستی ئیبنی نەدیمدا سەبارەت بە تەموورلێدانی بابەکی خوەڕمدینی قسە کراوە (ل ٦١٢). بە گوێرەی دەفتەرەکانی کاکەیی شاخوەشین و سان سەهاك تەمووری چاکیان لێ داوە. تەموور و دەف، سازی سەرەکی جەمخانەکان و نەریتی دینی ئیزدی و ستایشتگاگەلی میهری بووە.

---

کاك موحەمەد عەلی سوڵتانی دروست فەرموویە کە «خوررەمدینەکان، پاشکوشتاری زۆر لە عەلەویەکاندا توانەوە.

«فیرقەیەکی‌تری غوللاتمان بە ناوی «موشەعشەعیە» واتە تیشك دەرهەیە. دانەرەکەی سەید موحەمەد بن فەلاح موشەعشەعی (لە ٨٧٥ کۆچی‌دا مردووە) جێ‌نشینەکەی «مەولاعەلی» وتی من مەزهەری خودام. لە ئەهوازەوە تا واسیتی گرت و تەنانەت مەرقەدی عەلی (د ـ خ) تالآن کرد و دەیانگوت خودا نامرێ تا مەرقەدی هەبێ. کە سەفەویەکان هاتنە سەر کار دەوڵەتەکەیان ڕووخاو کەم‌کەم بوون بە شیعەی دوانزە ئیمامی. لە پێشدا شیعەی زیدەرۆیی کەرو باوەڕمەند بە دوونادوون و تەئویلی قورئان و تەجەللای خودا بوون (عەلەویان زاگروس ـ محمدعلی سلطاني)»

فیرقەیەکی‌تری غوللات «حرووفیە»ن. باوەڕمەندیەکانیان وەکوو کاکەییە تەنیا بە پیت و وشە گرینگی دەدەن. هەندێ توێژینەر لێك چوونگەلێکیان نێوان ئەوان و مەسیحیەکاندا دۆزیوەتەوە. ئەم لێك چوونگەلە هەڵ دەگەڕێتەوە بوو بناغەکەیان کە میترایی‌یە. وتمان ئاینی مەسیحی زۆرتر لە هەشتا لە سەدی نەریتەکانیان لە میترایی گرتووە. «حرووفیە پاش سەرکوتیان لە ئێراندا چوون بۆ ڕۆم و لەگەڵ بەکتاشیەکاندا تێکەڵاو بوون. لە ساڵی ١٢٤٠ی کۆچی‌دا لە لایەن عوسمانیەکانەوە بە خەستی قەتڵ‌عام کران و پاشان بە نهێنی چالاکیان هەبوو (سەرچاوەی پێشوو)»

---

مەلای جزیری لە شیعرێکی‌دا دەڵێ:

من دی ژ غەفلەت جام دکەف «شاهێ نەجەف» دل کرهەدەف

«ڕۆژ» هات شەرەف ستێر بوونە خەف هەر چارتەرف نوورایەقەق

زولەت نەما، سوحبەت وەما، نووراشەمالان چوو سەما

لێ ئەو دما زولف بوون جەما، هاتن سەمایێ یەك نەسەق...

ماموستا هەژار بەیتی یەکەمی درووس مانا نەکردووە. مەبەست لە شەرەف، خانەی شەرەفە کە پیرۆزترین خانەی خۆرە لە جەدوەلی ئەستێرە ناساندا. مەولەوی دەرفەمێ:

ســـــتارەی تاڵـــــەی مـــــەینـــــەت گـــــازەکــــەم

خورشـــــیدەکــــەی ئــــەوج بــــورج نــــازەکــــەم

هانـــــە گۆشـــــەی ئــــەوج خانــــەی شـــــەرەفدا

نــــوور ئـــــەفشانیشـــــەن بـــــە هـــــەر تەرەفـــــدا....

جزیری لە شیعرەکانیدا ماموستای «موراعاتی نەزیر»ە. ئەو عەلی (د- خ) و «رۆژ»ی لەگەڵ یەك رێك خستووە کە بە پێی هەندێ رەوایەت دەڵێن لە کاتێکدا خۆر لە خانەی شەرەفدا بوو عەلی لە کەعبەدا لە دایك بوو و پاش مردنی بۆ ناو خۆر سەرکەوت. مانای ئەو دوو بەیتە ئەوەیە:

من لە ناکاو ئازیزم دی بە جامی مەیەوە لە دەستیدا. بەم جامەوە بوو کە عەلی (د- خ) دڵی کردە ئامانج وەها کە خۆر هاتە خانەی شەرەف و رۆژبۆوەو ئەستێرەکان شارانەوە و چوار سووچ نووری ئاقیقی سپی دای گرت تاریکی و باوەڕمەندی خراپ نەما و قسەی بە سەر چوو. نوورە چکۆلەکان کز بوون و بۆ ئاسمان رویشتن بەڵام پاش ئەوە تاریکی کەزیەکان بوون کە بەرێك و پێکی لەو جیهانی تیشکە سپیەدا هاتنە هەڵپەرین.

ئەم شیعرە تێکەڵاوی و تەوحیدی جیهانی تیشك و تاریکی لە ئاینە کوردیەکاندا بە جوانترین شێوە دەگەیەنێ وتمان زولف و خاڵ لە شاعیرانی عاریف و سۆفیدا نیشانەی جەلالی خودایە. جزیری دەفەرمێ:

ســـوجدەیـــا بـــەر ئـــەســـوەدان نـــادەم ب ســـەد حـــەج ئـــەکبـــەران

ســـــوند ب وان زولفـــــان و خـــــالان هـــــەچ وەکـــــی بێـــــژم وەیـــــە

واتە سوجدە بردن بو خالە رەشەکان ناگوڕمەوە بە سەدان حەجی ئەکبەر، سوێند بەو زوڵف و خاڵانە هەرچی بڵێم ئەوە قسەی دڵمە. واتە لە رێگای ئەوینی ئەو کەزیە و خاڵانەوە بە خودا دەگەم نە لە رێگای حەجەوە ئەمە بیرهێنەری ئەوینی مەمەکە باسمان کرد. هەر لەم بارەوە دەفەرمێ"

| | |
|---|---|
| مەی نەنۆشی شیخی سەنعانی غەلەت | ئەو نەچوو نێو ئەرمەنستانی غەلەت |
| میسلی مووسا، وی تەجەللایا تەدی | ئی تودی، کانێ خەتا، کانێ غەلەت؟ |

واتە مەی‌نۆشی و ئەرمنستان چوونی شێخی سەنعان بە دوای کچە مەسیحی‌دا هەڵە نەبوو. وەکوو مووسا کە تەجەللای توێ (خودای) لە ئاگردا دی ئەویش تەجەللای جەمال و جەلالی تۆی لە کچە مەسیحیەکەدا دی. هەڵە لە کوێیە؟

---

وتمان هەر چەشنە باوەڕ بە تەجەللای خودا لە دیاردەکانی سەرزەویدا بناغەی میهرپەرستی هەیە. بە بەشێ لە کێوەکانی لوبنان «جبالی کەسرەوان» دەڵێن کەسرەوان تەعریب کراوی خەسرەوانە و حیکمەتی خەسرەوانی تایبەت بەم ناوچە بووە. ژێرنووسی وەرگێڕی ئەحسەنوتتە قاسیمی مەقدەسی «بەڕێز عەلی نەقی وەزیری ل ٦٢»

پێش ئیسلام ئەو کیوگەلە ناوچەی میهرپەرستەکان بووە. ئەو بەڕێزە تەنیا کەسێکە کە حیکمەتی خەسرەوانی نەنووساندووە بە زەردەشتیەوە.

پاش ئیسلام تەنیا لق‌گەلی میهرپەرستی وەکوو خوەرمدینی و غوللات بوون کە بۆ ڕزگاری لەگەڵ حکوومەتی عەبباسیەکاندا شەڕگەلی هەرە مەزنیان کرد. زەردەشتیەکان هیچ بزوتنەویەکیان لە مێژووی ئیسلامدا گوزارشت نەکراوە.

---

لە «تاریخ گردیزی» سەدەی پێنجی کۆچی کە بە تێکۆشانی «عەبدولحەی حەبیبی» لە چاپ دراوە لە بەشی جەژنەکانی مەسیحی‌دا دەڵێ یەلدا (شەوی چلە) شەوی لە دایك بوونی عیسایە. ل ٤٩٣». ئێستا لە دایکبوونی عیسا سێ شەو لەگەڵ شەوی چلە لە دایك بوونی میترا جیاوازی هەیە.

«گردیزی» لە سەدەی پینجی کۆچی‌دا لە دوو نەورۆز ناو دەبات یەکەم نەورۆزی چکۆلە (کە وتمان جەژنی سەری ساڵە دووهەم نەورۆزی گەورە کە ڕێکەوتەکەی ڕوون نەکردۆتەوە. ل٥١٥» ڕوونمان کردەوە کە نەورۆزی ڕاستەقینەیەکەمی هاوین بووە.

---

«ا ـ م ـ دیاکونف» مێژوونووسی ڕووسی لە «مێژووی ماد» وەرگێڕ بە فارسی «کەریمی کەشاوەرز»دا دەڵێ: «هیرۆدوت مێژوونووسی یۆنانی ئاشکرای کردووە کە نەریتگەلی ئۆلی و موغانی مادی لەگەڵ فارسەکاندا جیاوازی هەبووە...

ڕەوایەتگەلێ هەن کە فێرکردنەکانی فیساغورس گیراو لە زەردەشتی دەزانن. ئەمە بە تەئکید هەڵەیە. باوەڕگەلی گنۆستیکەکان (سۆفیەکان) و نوێ ئەفلاتونیەکان لەگەڵ زەردەشتی ڕاستەقینەدا زۆر لە یەك دوورن ل ٣٤٦» لە پێشدا وتمان کە مادەکان و لەوانە کوردەکان پێش ساسانیەکان زەردەشتی نەبوون. پاش هاتنە سەرکاری ساسانیەکان لە سەدەی سێی زایینی بەم لاوە

هەر چەند کوردەکان لە ئەردەشێر شکستیان خوارد بەڵام میهرپەرستی پارێزراو گەیشتە پاش ئیسلام.

دیاکونوف دەنووسێ: «هێرتل» دەڵێ موغانی ناوچەی ماد چون گەشەی زەردەشتیان دی (هەندێکیان) بە ڕواڵەت بوون بە زەردەشتی تا لە ناخەوە لە ناوی بەرن. ل ٣٤٨» (پاش ئیسلامیش ئەم ڕەوتە هەبوو!) هاشمی ڕەزیش لە وەرگێڕانی وەندیداد (بەشێ لە ئەوێستا)دا بۆ پێش ئیسلام ئەم ڕوانگەی هەیە و ئەوندە پێش دەچێت کە «موغانی مادی بە نائاریایی و دوژمن دەزانێت». هیرۆدوت موغان لە هۆزەکانی ماد دەناسێنێت. ناوی موغانیش ناوێکی ئاریاییە. بە باوەڕی من ڕاستی ئەوەیە کە موغەکانی میهرپەرستی ماد لە ژێر گوشاری سەختدا بوون و هەر ئەوان ئاینی زەردەشتی زەمانی ساسانیەکانیان بۆ خورافەپەرستی کشاند.

ناوی تاژدین کە لە مەم و زینی فولکلوردایە، ئەولیای چەلەبیگەشتیاری عوسمانی لە سەدەی یانزەی کۆچی لە گەشتنامەکەیدا کە فارۆقی کەیخەسرەوی بە فارسی وەری گێڕاوەتەوە سەبارەت بە شاری «وان» دەڵێ.. «لە سەردەمی ئیسلامدا یەکێ لە ماڵباتی یەزدگرد (ئاخرین شای ساسانی) بە ناوی تاژدین بوو بە فەرمانڕەوای وان و قەڵاکەی نۆژەن کردەوە. ل ١٦٢ لە لاپەرە ١٧١دا دووبارە ناوی هێناوە»

---

سوهرەوەردی دەیگوت فەیەزانی خودا نابڕێتەوە و هەمیشە سیمورغێك لە زەویدا هەیە. خوالێخۆشبوو حاج نیعمەتوڵڵای جەیحوون ئابادی گەورەی کاکەیی ئێران لە شاهنامەی حەقیقەتدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ولایــــت نمــــرده، نمـــیرد دگـــــر | بــود همچــو خــور دائمــاً جلــوه‌گــر |
| ولــــی ذره حـــق بــــه دوران بــــدی | همیشــــه بــــه مهمـــان نیکـــان بـــدی |

واتە ولایت کە لای سوهرەوەردی و کاکەیی وەکوو تەجەللای خودایە لە زەویدا نەمردووە و نامرێ و هەمیشە لە زەویدا وەکوو خۆر دەرکەوتووە. تۆزقاڵەی لە هەر دەورەدا میوانی جەستەی چاکان دەبێ.

وتمان لە باوەڕی مەششائیەکان یەکەم سدووری خودا، یان بە باوەڕی سوهرەوەردی یەکەم تەجەللای خودا «عەقڵی کول» یان ئاوەزی گشتیە. چون تەجەللا واتە دەرکەوتنە، هەر تایبەتمەندی خودای هەیە. لە دینە کوردیەکاندا مەلەکە تاوسە کە پیر بنیامین لە کاکەییدا دوونی ئەوە. لە هەفتەن جگە لە بنیامین شەشەکەی دیکە لە ئەندامەکانی خاوەندگار بە دیهاتن

وەکوو ڕوچیار و پیر یادگار لە چاوەکانی. ئەوەی کە دایە ڕەزبار دوونی ئەوە لە عارەقەی لەشی و... ئەمانەش ئاماژە بە چەشنێ تەجەللایە واتە هەر یەك تیشکە کە بووە بە چەند بەشەوەوە.

---

وتمان لە میهرپەرستیدا گاسەنبولی مانگ (ڕۆحی مانگ واتە هەیڤ ـ هەئومە، سەئومە)یە و شێر سەمبولی خۆرە جەیحوون ئابادی دەفەرمێ:

زپیشانی گاو و شیر خدا + دو جام زرین شد ز ئانها جدا

یکی بود ماه و یکی بودشید + از ئان گاو، از این اسد شد پدید

خوداوند از گاو مه ئافرید + دگر خور از ئان شیر ئامد پدید

که شیر هم شدی خلق از روچیار+ دگر گاو شد خلق از یادگار

واتە لە هەنیەی گاو شێرەکەی خۆی دوو جامی زێڕینی بەدی هێنا یەکێ مانگ بوو ئەوی دیکە خۆر ـ کە شێر لە ڕۆچیار (ئیبراهیمی ئێوەت) بە دیهات و گا لە پیر یادگار. وتمان پیر یادگار پارێزەی فەلەکی مانگە هەروەها دەڵێ:

بە پشت بەقر شیر شد استوار		بە پشت اسد تخت حەق برقرار

واتە شێر نیشتە سەرپشتی گاو لە پشتی شێریشەوە (خۆر) تەختی حەق بەقرار بوو ل ٣٦». ئەوە کە شێر نیشتوەتە سەر پشتی گا لە سەر بەردی خواجەنشینە کۆنەکانی سنەدا هەیە کە وێنەکەی پێشکەش دەکرێ. لە هەندێ لە ستایشتگاکانی میهریدا بە جێگای میترا شێر لەسەر پشتی گایە و خەریکە دەیکوژێ (قوربانی دەکات). شێر نیشانەی میترا و خۆرە.

---

لە بەشی سوهرەوەردیدا وتمان ئاسمان نۆ فەلەکی هەیە و فەلەکی نۆهەم هی نوورولئەنوار واتە میترا یان خاوەندگارە لە ئایینی کاکەییشدا وایە. جەیحوون ئابادی دەفەرمێ:

«بە فرمان حەق ز اول و انتها		بە هشت یوم ایجاد شد ماسوا

بە هەر روز یك ئاسمان ئافرید		کە تا هشت ئەفلاك گشتی پدید

بە روز نهم عید نوروز بود		در ئان روز عرش برین رخ نمود

واتە بە فەرمانی خودا لە هەشت ڕۆژدا جیهان پێکهات. لە هەر ڕۆژدا یەك ئاسمان درووس کران تا هەشت فەلەك بەدی هاتن لە ڕۆژی نۆهەمدا کە نەورۆز بوو ئاسمانی نۆهەم کە عەرشی خودایە ئاشکرا بوو ل ٣٨» ئەوە کە پاش تەواوبوونی ئافراندن جەژنی نەورۆزە کە وتمان عرووجی میترایە شتێکی بە تەواوی میترایيە.

هەفت ئاسمانی هەفت گەڕۆك هی هەفتەنە و هەفت نهۆمی زەوی و ژێر زەوی هی هەفتەوانەیە و فەلەکی هەشتەم بەهەشتە و نزیکی بە نووروڵنەنوار. مامۆستا دەفەرمێ:

کـه هفـتن بـه معناسـت هفـت ئاسمـان          زمـین گشـت بـر صـورت هفتـوان

واتە هەفت ئاسمان لە ژێر چاوەدێری هەفتەن و زەویش و هەفت نهۆمەکەی هیهەفتەوانەیە.

جیهان لە ژێر مودیری و ڕاهێنانی بنیامین نیشتەجێ لە خۆردایە. تیشك و تاریکی شتێکی سروشتیە لەگەڵ یەك بەرابەرن. دەفەرمێ:

کـه چـون نـور و ظلمـت برابـر بـود          بـدو نیـك دایـم بـه همسـر بـود...

اگـر شـب نباشـد چـگونه ایـام          معـین شـود قـدر او در جهـان

چون تیشك و تاریکی لەگەڵ یەك بەرابەرن ئەوەیە کە چاکە و خراپە هەمیشە پێکەوەن. (بەکر و مەم لە مەم و زیندا). ئەگەر شەو نەبێ چۆن نرخی ڕۆژ ئاشکرا دەبێ؟ دەفەرمێ: سەردەمێك ڕۆژ و ڕووناکی بە سەر تاریکی‌دا زاڵە و زەمانێ بە پێچەوانەوە تاریکی زاڵ دەبێ. واتە چاکە و خراپە کە لە تیشك و تاریکی پێك دێن نۆبە بە نۆبە حکوومەتیان هەیە و ئەمانە لە بنیامینەوە سەرچاوە دەگرێ کە مودیری جیهانە و لە خۆردایە.

---

هەفت مەقامی ڕاهێنان لە میهرپەرستیدا هەرکام یەکێ لە گەڕوك ئەستێرەکان یارمەتی دەدەن. یارمەتی‌دەری مەقامی هەفتەم کە گرینگترین پێگەیە و بە پاپا و سیمورغیش (پاش ئیسلام بە قوتب و مورشید) ناسراوە زوحەلە (ساتورن)، کە ئەستێرەیەکی نەحس و شەیتانیە.

مامۆستا ڕەزی وەکوو هەڵەی میترناسانی ئەورووپا، ساتورن بەزروان دەناسێ (ل ٤٠٦ــ ئائین میترائیسم). زوحەل لە میهرپەرستیدا نوێنەری لایەنی قەهر و تاریکی خودا واتە ئەهریمەنە کە لە دینە کوردیەکاندا بە مەلەکە تاوس ناسراوە. ئەوەیە کە ئێزدیەکان دەڵێن زاتی شێخ عەدێ هەر زاتی مەلەکە تاوسە لە زەویدا. مەقامی سەرەکی هەفتەن لە کاکەیی‌دا پیر بنیامینە. پاپا و سیمورغ لە ئاینی میترایی نوێنەری مەلەکە تاوسە کە وتمان یەکەم تەجەللای خودایە لەگەڵ پیر بنیامین ڕێك دێتەوە. زوحەل لە میهرپەرستی‌دا پاش عرووجی میترا بۆ ئاسمان سەرپەرشتی ئیمانداران دەکات و پاپا و پیر و سیمورغ دوونی ئەون. ئەمەش بە تەواوی لەگەڵ کاکەیی ڕێك دێتەوە کە دەڵێن بنیامین مودیری جیهانە و نوێنەرەکانی لە زەویدا هەفتەوانەیە.

ناوی ساتورن لە یۆناندا «کرونووس»ە. ئەم ناوە مانای زەمانیشی هەیە. وەك دەڵێن کورنۆمەتر واتە ئامرازی هەڵسەنگاندنی زەمان. هەر ئەمە سەرچاوەی هەڵەی کومون و ئەوانی‌تر و مامۆستا

ڕەزی‌یە چون زروان خودای زەمانە. ئەمە هەڵەیەکی مەزنە چون: یەکەم، لە میهرپەرستی ئەورووپادا ساتورن بە ئەهریمەن ناسراوە نە زروان و بۆی پێشکەشی و نەزر و نیاز دراوە. دووهەم، لە زروانی دا زروان باوکی ئەهریمەن و ئەهوورامەزدایە کە لە میهرپەرستیدا شتێکی وا نیە. سێهەم، پەیکەرە ترسناکەکانی ستایشتگاگەلی میهری هی شەیتانە و لە هەندێ پەیکەردا ئەهریمەن و میترا لێکدراوە لەگەڵ یەکدایە کە بە تەواوی مەلەکە تاوسی کوردی پێشان دراوە. لە زروانی‌دا زروان لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە بەڵام لە میهرپەرستیدا کاتێ لە میهر و ساتورن و پێگەکانی‌تری میهری قسە دەکرێ ساتورن مەقامێکی خوارتر لە میترای هەیە.

---

جەژنی سێزدەبەدەر کە لە ئێران و کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا بەڕێوە دەچێ و کە ڕۆژێکی نەحسە، ڕۆژی عرووجی مەلەکە تاوسە. لە سەدەی چواری زایینی‌دا مەسیحیەکان ئەم نەریتەیان وەکوو جەژنی فەسح ڕۆژی عرووجی عیسا بۆ ناو خۆردانا. جیاوازی نیە وتمان ئەهریمەن هەر ئەو دیوی سکەی میترایە. ڕێکەوتی فەسح زۆر لە سێزدەبەدەر نزیکە.

---

سەکاکانیش یەکێ لە چوار هۆزە ئارییایەکان بوون. لە ناو ئەوانیش‌دا ئوستوورەی میترا (نە وەك دین) هەبووە. لە کتێبی «سەکاها» هی (تامارا تالبوت رایس ـ وەرگێڕ بە فارسی روقییە بێهزادی) هاتووە «لە وێنە گەرییەکانی سەکایی‌دا کوشتنی گا بە هێرشی شێر و یان کوشتنی گا بە دەس هەڵۆیەك کە تەرحی سیمورغی هەیە پێشان دراوە» ئەمە بیرهێنەری کوشتنی سۆما بە دەس میترا لە ڕێگ وێدا دایە کە باسمان کرد. لەسەر خواجەنشینەکانی سنەدا دەیهێنین.

---

یەکەم ڕۆژی ئافراندن لە ئاینی کاکەیی‌دا ڕۆژی شەمە و دوایین ڕۆژ واتە پاش هەشت ڕۆژ هەر شەمە بوو ڕۆژی نۆهەم کە یەکشەمەیە نەورۆز بوو خودا لە فەلەکی نۆهەمدا جێگیر بوو و لەگەڵ هەفتەن و چل تەن و... بەزمێك گێرا. ئەم باوەڕمەندی بە یەکشەمە و ڕۆژی حەسانەوە لە مەسیحیش‌دا هەیە. یەکشەمە (سان‌دەی) بە مانای ڕۆژی خۆرە و تایبەتە بە میهرپەرستی نەك مەسیحی.

---

وتمان بۆ بووژاندنەوەی ژیان لە زەویدا میترا گا قوربانی دەکات و سەلماندمان کە میترا (بە ئاماژە نووری خور) گا (مانگ کە هەر نووری خۆرە لە جەستەیدا) قوربانی دەکات. لە ڕاستیدا میترا هەر خۆی لە جەستەی گادا قوربانی دەکات. ئەم باوەڕە لە کاکەیش‌دا بە چەشنێ هاتووە:

زات نەوایرەن، زات نەوایرەن      گاو یاریەن پەی دین دایرەن

نــــه ڕۆژ ئـــــەزەڵ زات نــــــەوایرەن          مایـــــه و نــــوور زات ئــــەوەڵ ئــــاخرەن

(دیوانه گەورە سەیید محەمەد حسەینی ل ٤٧٠)

واتە تەجەللای زاتی خودا لە قوربانیدایە .... گای ئاینی یارسانە کە بۆ دین قوربانی دەکرێ لە ڕۆژی ئەزەلەوە زاتی خودا لە قوربانیدا بووە و قوربانی مایەی تیشکی زاتی خودای هـەوەڵ و ئاخرە.

لە مەم و زینی فولکلۆردا باوکی زین ئیبرایم شای یەمەن بـوو. بـە ئیـبرایم شـای یـەمـەن لـە دەفتەرەکانی کاکەیی‌دا ئاماژە کراوە:

ئیبرایم ئێوەت دەفەرمێ:

زەلاّل یـــــەمـــــەن. زەلاّل یـــــەمـــــەن          یادگـــــار مـــــن، زەلاّل یـــــەمـــــەن...

کاکەم بی نە یورت ئەزهان سەمەن ـ ئەز فرزندش بیم نەو تەخت و مەسکەن

ئیبرایم شابیم بەرشیام نەو وەتەن. (ل ٦٣٤ دیوانه گەورە)

واتە ئەی زەلاّل (ڕووناك و زێرین)ی یەمەن ئەی پیر یادگارەکەم ئەی زەلاّلی یەمەن...

باوکم پیر یادگار بوو لە دوونی ئەزهانی سەمەندا ـ من لەو تەخت و مەسکەنـەدا کـوڕی بـووم ئیبرایم شا بووم کە لەو ولاّتە هەستام.

وتمان لە ئاینی کاکەیی کاتێ کە خودا لە جەستەی یەکێك لە زەویدا تەجەللا دەکات ٢٨ کەس (چوار هەفت کەس) لە ڕەگەزی نوور لە جەستەگەلێکی‌تردا دێنە لای. لە لایـەکـی تریشـەوە ٢٨ کەس لە ڕەگەزی تاریکی دەردەکەون ناوی ئەمانە لە زەمانی عەلی و خـوەشـین و سـان سـەهاکدا هاتووە کە بۆ درێژ نەبوونەوەی باس نایهێنین. ئەگەر تەجەللای خودا لە ناوەڕاستدا بێنین و لە لای ڕاست و چەپییەوە ٢٨ ڕەگەز نووروڕەگەز تاریکی دانێین و لە هەر لاوە بـێ‌ژمێـرین بـە تـەجـەللای خوداوە دەبێ بە بیست و نۆ. بیست و نۆ ژمارەی ڕۆژ و شەوەکانی مانگە. ئەم کۆ بەنـدە کـە یـەك مانگە پەیکەری میترا و مەلەکە تاوس لە لێکدران لە یەکدا بیر دەخاتەوە کە پیشان دراوە و بـۆی بڕوانن. (پەیکەری ژمارە ٢١ و ٣٣)

وتمان له دینه کوردیه‌کاندا به خودا شا ده‌ڵێن. له ڕێگ ویدای هیندیه‌کاندا ته‌نیا به میترا و «وروونه» شاه وتراوه. دیاره پاش پێکهاتنی ئاینی میترایی له ڕۆژاواینیێران به میترا شا وتراوه و گه‌یشتووه‌ته پاش ئیسلام.

---

ئه‌وانه‌ی که به دوای مێژووی نه‌ورۆزدا ده‌گه‌ڕێن و هه‌ندێ زانستیانه‌تر بیر ده‌که‌نه‌وه و نایخه‌نه پاڵ زه‌رده‌شتیه‌وه، ئه‌وانه‌ی که له سه‌ر ئاینه کوردیه‌کان توێژینه‌وه‌یان نیه بزانن چۆن سه‌ریان سوور ده‌مێنی و به هه‌ڵه‌دا ده‌چن: «میهرداد به‌هار» له کتێبی «پـه‌ژووهشی دەر ئه‌ساتیر ئێران»دا ده‌نووسێ:

«ئه‌مه دروسته که له ئه‌وێستادا قسه‌یه‌ك له نه‌وروز و جه‌ژنی میهره‌گان و جه‌ژنی سه‌ده نیه و له ده‌ق‌گه‌لی میانه‌دا (مه‌به‌ست ده‌قه په‌هله‌ویه‌کانه) له نه‌وروز و میهره‌گان یاد کراوه». (له نه‌ورۆز وه‌کوو جه‌ژنی فره‌زه‌رده‌کان هاتووه. وه‌کوو نه‌ورۆز نه‌هاتووه ئه‌گینا به‌ڕێز به‌هرامی فه‌ره‌وه‌شی له فه‌رهه‌نگه په‌هله‌ویه‌که‌یدا ده‌یهێنا. منیش جگه له دینکه‌رت که کورته‌یه‌کی لێ بلاو کراوه‌ته‌وه هه‌موو ده‌قه په‌هله‌ویه‌کانم خوێندووه و ناوێك له نه‌ورۆز نیه) له درێژه‌دا ده‌نووسێ: «به‌ڵام له جه‌ژنی سه‌ده باس نیه و ئه‌مه زۆر سه‌رسووڕهێنه‌ره. ئه‌گه‌ر ئه‌و جه‌ژنگه‌له هیند و ئێرانی بێت ده‌بوا به چه‌شنێ له ویداکان و ئه‌وێستادا ئاماژه‌ی پێ‌کرا بایه به‌ڵام وا نیه. ره‌نگه ئه‌م جه‌ژنگه‌له به‌تایبه‌ت نه‌وروز و میهره‌گان که وه‌کوو جه‌ژنی هۆزگه‌لی کێلگه‌ر بێت نه‌ك ئاژه‌ڵدار، ده‌بێ جه‌ژنگه‌لێکی هه‌ره کۆن پێش هاتنی ئاریاییه‌کان بۆ ئێران بێت و له بناغه‌دا هی هۆزه نا ئاریاییه‌کانی ئه‌م وڵاته بووبێ که له‌گه‌ڵ سوومریه‌کاندا براوه بۆ نێو چومان (عێراقی ئێستا) و دوو جه‌ژنی زه‌ماوه‌ندی پیرۆزی «ئه‌کیتی» لێ به دیهاتووه که پاشان له نێو چۆماندا وه‌کوو یه‌ك جه‌ژنی لێ هاتووه به‌ڵام له ئێراندا تا خولی ئیسلام وه‌کوو دوو جه‌ژنی لێهاتووه. ل ٤٩٦» (به ئه‌کیتی ئه‌کیتویش ده‌ڵێن) ئه‌ی بۆ ناوی نه‌ورۆزه واته ڕۆژی نوێ و ناوی نائارییایی نیه. ئه‌ی خۆ میهره‌کان له ناوی میهره‌وه که هه‌ر میترایه هاتووه مه‌گه‌ر میترا نوستووره‌ی هیند و ئێرانی نیه؟ مه‌گه‌ر نه‌ورۆز ومیهره‌گان (میتره‌کانه له به‌رد نووسراوه‌ی بێستووندا) پێکه‌وه پێوه‌ندیان نیه؟...

---

جه‌لاله‌ددین به‌لخی مه‌وله‌وی عاریف و سۆفی گه‌وره‌ی جیهانی که به‌رهه‌مه‌کانی به فارسی نووسیوه له هێرشی موغوله‌کاندا کاتێ که شه‌ش ساڵه بوو له‌گه‌ڵ باوکیدا بۆ ڕۆم (تورکیای ئێستا) هه‌ڵاتن. ئه‌و له «قوونیه» شاری کوردستانی تورکیه گه‌وره بوو. زاواکه‌ی حیسامودین

چەلەبی کوردە و مرۆڤێکی عاریف و هەرە زانا بووە و مەولەوی دەفتەرێك لە مەسنەویەکەی بە ناوی ئەوەوە داناوە. دیارە عەقیدەی بە دوونادوون لە کوردەکانەوە فێر بووە چون پێش ئەو عاریف و سۆفیە ئێرانیەکان وەکوو سەنایی و عەتتار لە سەر ئەم باوەڕە نەبوون. چەند بەیتی تەناسوخی ئەومان نووسی ئەمەش بەیتێکیتر: هفتصد و هفتاد قالب دیدەام ـ همچو سبزە بارەا روئیدەام. واتە هەفتسەد و هەفتا جەستەم بە خۆوە بینیوە و وەکوو سەوزە چەندان جار رواوم تا هاتوومەتە جەستەی مرۆڤەوە.

---

لە نەورۆزدا کە سەلمێندرا ڕۆژی عرووجی یەکەمی میترایە و ئێستا هاتۆتە سەری ساڵ لە گشت کوردستاندا هێلکە رەنگ دەکرێ. عرووجی دووهەمی وەکوو مەلەکە تاوس سێزدە بەدەرە لە جەژنی فەسح واتە جەژنی پاکی مەسیحیدا کە ڕۆژی عرووجی عیسایە بۆ ناو خور کە هەر نزیك بە سێزدە بەدەرە هێلکە رەنگ دەکرێ. دیارە ئەمە نەرتییێکیتری میترایيە کە مەسیحیەکان لە میترایی ئایینی پێشووی خۆیانیان گرتووە. لەسەر هێلکە رەنگ کردن باس دەکەین.
«هۆی نەریتی درۆی ئاوریل لە ئەورووپادا چییە» وتمان زۆر باوەڕمەندیەکان و نەریتگەلی مەسیحی پاشماوەی میترایيە. بە پێی ئەو ئاکامگەلەی کە لەم توێژینەدا بە دەستم هێناوە، ڕۆژی عرووجی عیسا بە عرووجی لایەنیتری میترا واتە مەلەکە تاوس لە سێزدە بەدەردا نزیکە و بۆ ڕێزگرتن لە مەلەکە تاوس یان بە وتەی میهردینی ئەهریمەن دەبێ کارێکی شەیتانی بکرێ. پێش ئەو جەژنە درویەك ساز دەکەن و ناو خەڵکدا بڵاوی دەکەنەوە.

---

ماموستا هەژار لە وەرگێڕانی توحفەی موزەففەرییەی ئوسکارمان لە سەرەتای بەیتی مەم و زیندا دەنووسێ «مەم و زین بە هەموو گۆڕانێکیەوە نیشانەی ئایینی زەڕدەشتی بە ئاشکرا پێوە دیارە» (!!!)

دیارە مامۆستای تێکۆشەر و بە ئەمەگ و زۆر کەسانیتر لە ژێر کاریگەری نووسەرانی فارسی سەردەمی خۆی بووە. ئەم هەڵە مەزنە کاك سدیق سەفی زادەی بۆرەکەیی لە شروڤەی کاکەییدا کردوویەتی دیارە ئەمانە بێ توێژینەوەی پێویست و هێنانی فاکتی پێویست تەنیا بە پێی ئەوە ئەم قسەیان کردووە کە لایان وا بووە گشت کوردستانی پێش ئیسلام زەڕدەشتی بوونە. سەریان لێ شێواوە و قسەی یەکتر دەگێڕنەوە. بێتوێژینیکی ساکار لە ئایینی زەڕدەشتیدا بە پیر شالیاری

هەورامی کە گۆڕەکەی لە هەورامان دایە دەڵێن پیرشالیاری زەردەشتی. بێ ئەوەی بزانن مردوو ناشتن لە زەردەشتیدا تاوانێکی هەرەمەزنە.

---

بنەماکانی میهردینی کوردان لە بەیتەکانی‌تردا نە وەك مەم و زین بە ڕێك و پێکی بەڵام بە هەندێ گۆڕانکاریەوە هاتووە.

لە بەیتی لاس و خەزاڵدا هاتووە «لاس لەسەر پشتی شێر نوتفەی گرسا». ئەم بەیتە و بەیتی برایمۆك وەکوو مەم و زین شرۆڤەی پێویستە. لە گشت گرینگتر بەیتی «شێخ فەرخ و خاتوو ئەستی»یە. ئەم بەیتە هەندێ لێك‌چوونی دەگەڵ چیرۆکی «سەلامان و ئەبسال» هەیە کە بناغەکەی دەڵێن یۆنانیە و «جامی» عاریف و سۆفی ئێرانی لە سەدەی دەی کۆچیدا بە فارسی هۆنیویەتەوە. یۆنان کاتێ کە کەوتە ژێر دەسەڵاتی ڕۆم میهرپەرستی تا سەدەی سێ و چواری زایینی تێدا ڕەواجی بوو. پاشان کە مەسیحی لە ڕۆمدا فەرمی کرا نەختە نەختە میهرپەرستی توایەوە. لە بەیتی شێخ فەرخ و خاتوو ئەستی‌دا لایەنگەلی میهرپەرستی زۆرە وەکوو: «ئەستی تەماشای کرد نووری خودای دەگەڵ فەرخۆلەدایە...» وسوو ئاغا کەسایەتی نەرێنی لە بنەچەکەی بەکری مەرگەوەرە (لە مەم و زیندا) بەڵام لەگەڵ فەرخ دەستی برایەتی دا (چاکە و خراپە تێکەڵاو بوون).

فەرخ دوعای کرد دایکی ئەستی بوو بە بەردێکی شین ڕەنگ. سوار بوون. سەبوونی گەرمێنێ هات. فەرخ بانگی کرد: ئەی ڕەبیی بینای چاوانە، حەزرەتی جوبرەئیلێ بنێرەکن بالوولی دیوانە، شەماڵ مەرەخەس بکرێ. بە گشتی ئەم بەیتە درێژە شرۆڤەی چڕ و پڕی پێویستە. لە بەیتی «جۆڵندی»دا جبرەئیل وەکوو «ئێخی» ناوبراوە «ئەخی» لە دەفتەرەکانی کاکەیی‌دا بە جوبرەئیل کە دوونی پیر بنیامینە دەڵێن.

لە بەیتی خزێم‌دا لە ئاینی داسنی ناوبراوە کە باسمان کرد. لە بەیتی «قەر و خاتوو گوڵە زەرد»دا کەسایەتی نەرێنی ناوی «بەکری شێخانە» لە فەرخ و ئەستی‌دا «شێخالە کەچەڵ» و وسوو ئاغا کە لە بنەچەکەی بەکری مەرگەوەرە کە لە مەم و زیندا بوو.

---

لە زەمانی سەفەویەکانەوە (چوار و نیو سەدە پێش) تا ڕووخانی حەمەرەزا شا (١٩٧٩) نیشانەی ئاڵای ئێران شێر و خۆر بوو. دیارە شێر و خۆر نیشانەی میهرپەرستیە. ئەم نیشانە پێش حکوومەتی شیعەی سەفەوی لە حکوومەتەکانی ئێراندا نەبووە. سەفەویەکان کە دەسەڵاتەکەیان بە یارمەتی شیعەگەلی زێدەڕۆ بە دەس هێنا ئەو نیشانەیان لەوان گرتووە و ئەوانیش هی باوانی

میهرپەرستیان بووە کە پاراستوویانە.خۆر نیشانەی ئاڵای کوردستان شتێکی بە جێیە. ڕەنگی سوور لە سەرەوە ڕەنگی یەکەم و بیرهێنەری کڵاوەکەی سوهرەوەردی و تێکەڵاوی تیشك و تاریکیە کە ئاوەزی سوور بوو کە سەلماندمان ئاوەزی سوور دڵە هەروەها مێژەری سوور.

بە باوەڕی سوهرەوەردی ئاخرین پێگەی مرۆڤ لای «عەقڵی یەکەم» واتە عەقڵی کوللە و تێکەڵاو بوون لەگەڵ ئەودایە کە بە ئاسمانی هەشتم شوبهێنراوە. ئەمەش لە میهردینی و دینە کوردیەکاندا هەیە. لە سۆفیگەری ئیسلامدا بووە بە دەرگای هەشتەمی بەهەشت.

---

لە ئاینی میترایی‌دا بۆ هاتنە خوارەوەی میترا وەکوو لە دایکبوونی لە کچێکی شوو نەکردوو باسگەلێکمان کرد و وتمان زات بەشەرگەلی کاکەیی بەم جۆرە لە دایك بوون. خوا لێ خۆشبوو و جەیحوونابادی بۆ داهاتوو پێشبینی دەکات:

| | |
|---|---|
| بـه بطـن یکـی دخـتر مـهجـبین | تولـد شـود ذات جـان ئـارین |
| چـو خورشـید تابـان شـود در جهـان | منـور کنـد دیـن و دنیـا بـه کـان |

واتە لە منداڵدانی کچێکی مانگ ڕۆخسارەوە زاتی خودا (تەجەللای زاتی خودا) لە دایك دەبێ و وەکوو خۆری درەوشێنەر دەبێ لە جیهاندا و دین و دونیا ڕووناك دەکاتەوە.

---

بە هێرشی ئەسکەندەر بۆ سەر ئێران و ڕووخانی هیخامەنشیەکان و هاتنە سەرکاری سلووکیەکان میهردینی لە ماد بەتایبەت لە ناوچە کوردنشینەکاندا بە هێزتر بوو. زەمانی ئەشکانیەکانیش میهردینی وەکوو ئاینێك لە گشت ئێران جگە لە باشوور و ڕۆژهەڵات کە زەردەشتی بوون ڕەواجی هەبوو.

لە ئاینی زەردەشتی‌دا بە جێگای نۆ ئاسمانی میهردینی و دینە کوردیەکان حەوت ئاسمان هەیە: یەکەم هەور پایە. دووهەم ئاسمانی ئەستێرەکانی تێکەڵ کراو. سێهەم ئاسمانی ئەستێرەکانی تێکەڵ نەکراوە. چوارەم بەهەشت پایە کە ئاسمانی مانگە. پەنجەم خۆرپایە کە گەرووسمان (واتە بەهەشت)ە. شەشەم ئاسمانی شەش بێمەرگی پیرۆز. هەفتەم ڕووناکی بێسنوور کە جێگای ئەهوورامەزدایە ئیتر لە زەردەشتیدا ئاسمانی هەشتەم و نۆهەم نیە. لە میهردینی و دینە کوردیەکاندا ئاسمانی یەکەم مانگە و چوارەم خۆرە. لە زەردشتیدا هەفت گەڕوك ئەستێرە لە سەربازەکانی ئەهریمەن واتە شەیتانن ئەوان بە دوو مانگ و دوو خۆر بڕوایان هەیە. مانگی تاریك و مانگی ڕووناك هەروەها خۆری تاریك و خۆری ڕووناك. لە کاتی خۆرگیراندا دەیانگوت ئەوە خۆری تاریکە کە پێش خۆری ڕووناك دەگرێ. بۆ مانگیش وایان دەگوت.

میهرپەرستی و دینە کوردیەکان لەگەڵ ماندائی، یان سەبیەکاندا جیاوازی بنەڕەتیان هەیە. ئەمانە ئێستا لە ئێراقی عەرەب و هەندێ لە خوزستانی ئێراندا دەژین. سەبیەکان نابێ لەگەڵ سابیەکانی حەران تێکەڵاو بکرێن ـ ئەوانیش لەگەڵ میهردینی و دینە کوردیەکاندا جیاوازی هەرە گرینگیان هەیە.

نووسەری «ماه در ایران» دەڵێ «چون پێش زەردەشت میهرپەرستی لە ئێراندا رەواجی زۆر بوو زەردەشت بۆ کەم کردنەوەی خۆشەویستی ئەو نەریتی گا و خوێن رشتن و قوربانی کردنی گاو خواردنەوەی هۆم (نوشاوەی مانگ)ی بەرنبەند کرد. ل ۱۳۹».

هەروەها دەنووسێ «پلۆتارك دەڵێ رۆمیەکان میترایان لە لایەن چەتەزەریاییەکانی «سیلیس»یەوە ناسی (سیلیس لە رۆژهەڵاتی رۆم لە تورکیای ئێستادا بووە) ل ۱۳۹» وتەی پلۆتارك درووس نیە. بلاوەی میهرپەرستی لە رۆمدا بە دەست راگەیەنەرەکانی کوردستانی باکوورەوە کرا کە لە سەرەتادا رۆمی رۆژهەلات (تورکیای ئێستا) و پاشان رۆمی رۆژاوا واتە ئیتالیا دینی میترایان قبووڵکرد. چەتە چۆن دین بلاو دەکاتەوە. ئەمە توانجی مەسیحیەکان بووە، کە گشت نووسەرانی ئاینی میترا باوەڕیان پێیە.

ئوستوورەکەی میترا و هۆم لە جێگای خۆیدا نووسرا. زەردەشتیەکان کە چەند سەدە پاش زەردەشت میترایان هێنایە نێو ئەوێستاوە «ئەم کارەی میترایان بە چەپەڵ و نادروستزانی و وتیان کاری ئەهریمەن بووە سەرچاوەی پێشوو ل ۱٤۲» لە میتراپەرستیدا میترا و ئەهریمەن هەدوو یەك شتە و لە دینە کوردیەکاندا بە مەلەکە تاوس ناو دەبرێت.

سۆما لە ریگ‌وێدادا مانگە. هەم خودای مانگ و هەم گیای سۆما کە خواردنەوەی مانگی لێ دروس دەکرێ. لە میترایی‌شدا هەئومە، لە «کوردیدا هەیڤ» هەر وایە. سۆما دابێژی ئێستایە. لە وێداکاندا وەکوو سەئومە هاتووە.

---

کریستیەن سن «ئێران ناسی ئینگلیسی» کە میهرپەرستی وەکوو زروانی و شەیتانپەرستی دەناسێنێت بە هەڵەدا چووە. جگە لە ئەو زینرو کومون و ورماوزن ئەم هەڵەیان کردووە. نووسەری «ماه دەرئێران» دەڵێ «دوشن گیمون، لە روانگەی زینردا گومانی هەیە ل ۱٤۹» بەلام نەدوشن گیمون و نە ئەو نووسەرە بەرێزە بەڵگەی پێویستیان نەهێناوە. بەڵگەی پێویست لە دینە کوردیەکاندایە کە ئاماژەی پێ کرا.

«مارتین وان بروین سن» لـه کتێبـی «کۆمـەڵگاناسـی گـەلـی کـورد» وەرگێـڕ بـە فارسـی «ئیبراهیمی یۆنسی» عەشایەری میلانی وەکوو «میران» (شیوەی پێشینی خۆی) هێنـاوە ل ٢٥٥. وتمان ئەم عەشیرە و شاری میلان لە ئیتالیا لە ناوی میتراوە گیراوە و بە قاعیدە «ت» کەی سـواوە. هەروەها دەنووسێ «بە سەخڵەت باوەڕ دەکرێ عەلەویەکانی دێرسیم کە زۆتریـان زمانیـان زازایـە وەکوو موسڵمان لە قەلەم بدەین ل ٣٩» «زۆرێ لە عەلەویەکانیش تـورکن ل٣٥ (دروس ئـەوەیـە پاشان زمانیان گوڕاوە بە تورکی ئەگینا هەشت سەدە پێش ئێستا لە ئاسیای بچووك تورك نەبوو.

«نەریتەکانی عەلەویەکانی تورکیا وەکوو کاکەییەکانی باشووری کوردستانە ل ٣٩» مـەبەسـتی ڕۆژهەڵات و باشووری ئێستایە. «یەزیدیەکان شتگەلی هاوبەشیان لەگەڵ غـوللات زۆرە ل ٣٩». «بەشێ لە میرانەکان ئێسـتا لـە ڕۆژهـەڵاتـی سـووریەدا دەژیـن ل ٨٣». «زاراوەی زازا و گـۆران (مـەبەستی هەورامیە) لە ڕواڵەتدا لە پەلگەلی ئێرانی باشووریە ل ١٥٣» ئەمە هەڵەیەکی هەرە مەزنە. ئەو نووسەرە ئەوێستایی و پەهلەویەکانی نەزانیوە. لە لاپەڕە ١٥٤دا قسەکانی مینورسکی بە دروست دەزانێ کە دەڵێ «زازا و گوران بۆ دەیلەمیەکانی قـەراخـەکانی زەریـای خـەزەر هـەڵ دەگەڕێتەوە» جا خۆ زمانی دەیلەمیەکان لە زمانەکانی پەهلـەی بـاکووری ڕۆژاوایـە نـە باشـوور. زازاکان بە خویان دەڵێن دێملی ئەو وشە لەگەڵ دەیلەمیدا جیـاوازی هـەیـە. لـە لایـەکـیتـرەوە لێکچوونی ڕوالەتی بەڵگەی زانستیانە نیە.

بۆ گۆرانیش لێکچوونی ڕواڵەتی شاری «گاوارە»ی ناوچەی قەڵخانی و حکوومـەتـی «گاوبـارە» کانی گێلان بە بەڵگە دەزانێ. بە دوو بەڵگە ئەو بۆ چوونە بە تەواوی هەڵەیە. یەکەم هۆزی گۆران لە ناوچەی قەڵخانیدا دروستە لەسەر ئاینی کاکەیین بەڵام زمانیان هـەورامـی نیـە تـەنیـا دەقـە دینیەکانیان هەورامیە کە زمانی ئەدەبی ئەو سەردەمە بووە. لە چەند دە ساڵی ڕابوردوودا زاراوەی هەورامیان وەکوو زاراوەی گۆران ناساندووە کە ئەمیشە هەڵـەیـەکـی هـەرە مـەزن بـووە. زاراوەی هەورامی لەگەڵ بنزاراوەی هۆزی گۆران جیاوازی هەیـە. ئـەم بـنزاراوە دەگەڕێتـەوە سـەر زاراوەی کەلهوڕی. نازانم یەکەمجارکێ ئەو هەڵەی کردووە و هەندێ کەسیش بە دوایدا ڕۆیشـتوون. دووهـەم لێکچوونی ڕوالەتی نابێ بە بەڵگەی زانستی. بەڵگەی زمانناسی (زمانەوانی!!) پێویستە.

یەکەم ئەورووپایی کە وتی دیالۆگەکانی گۆران (هەورامی!) کوردی نین ئوسکارمان بوو. ل ١٨٤ و ١٨٥ سەرچاوەی پێشوو». بۆ ئـەوەی بـزانین هـەورامـی کوردیـە و لـە ڕاستیشـدا وایـە، دەبـێ ئەوێستایی دایکی زمانی کوردی و دوو پەهلەوییەکەش بە تەواوی بزانین. فارسی کۆن کـە ئێسـتا

بە تەواوی ناسراوە و ڕێزمانەکەی نووسراوە دەبێ بزانین. فارسی کۆن دایکی زمـانی فارسـیە بـەڵام ئەم فارسی ئێستا کە لە فارسەکانی خوەراسانی بـاکوورەوە پـاش ئیسـلام رەواجـی پـەیـدا کـرد، پاشماوەی فارسگەلێکە کە لە هەزارەی یەکەمی پێش زاییندا بۆ باشووری ئێـران کۆچـیان نـەکردو لەوێ مـانەوە. بە هەڵسەنگاندنی هەورامی لەگەڵ ئەوێستایی و دوو پەهلەویەکە و پاشان لـەگـەڵ فارسی کۆن بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێ کە هەورامی کوردی پەتیە و قاعیدەکانی زمانەکە وەکوو زاراوەکانی‌تری کوردی بۆ ئەوێستایی (زمانی مادەکان) دەگەڕێتەوە.

دوو کاری دژەزانستی لە ئێرانی دەورانی شوۆنیزمی فارسی لە ڕژێمی پێشـووی ئێرانـدا کـراوە. یەکەم فارسی ئێستایان بە پاشماوەی پەهلەوی ساسانی ناساندووە. بەڵگەگەلـی مـێـژوویی پێشـان دەدات کە فارسی ئێستا لە ئێراندا زمانێکی میوانـە. پەهلـەوی ساسـانی فارسـی نیـە و وەکـوو پارسیك ناوی نەبراوە. هەر پەهلەوی ئەشـکانیە (بـاکووری ڕۆژاوا) کـە هـەنـدێ وشـەی فارسـی باشووری ڕۆژهەڵاتی تێکەڵاو کراوە و لە بواری هەزار ساڵ تەمەنیدا گورانکاری بە سەریدا هاتووە. ئەوانەی کە دەڵێن ئەوێستایی زمانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێرانە تەنیـا ڕوانگـەیـە و بـەس. هـیچ هەڵسەنگاندنێك لە نێوان زمانی ئەوێستایی و زمانەکانی باکووری ڕۆژهـەلات نـەکراوە. ئـەرکی سەرشانی ئێمەیە کوردی لەگەڵ ئەوێسـتایی و ڕێزمانەکـەی و پەهلـەوی بـاکووری ڕۆژاوادا هـەڵ سەنگێنین تا بەرهەمی فەرهەنگی ماد و کورد ئاشکراتر پیشان بدرێت. هـەنـدێ ئـەوێستاناسـی ئەوروپایی وتوویانە کە ئەوێستایی زمانی مادەکان بووە. بەڵام ئەوانیش تەنیا ڕوانگەیان دەربڕیوە و هەڵسەنگاندنیان نەکردووە. نووسەری ئەم پەرتووکـە هـەنـدێ هـەڵسـەنگانـدنی کـردووە و بـۆی سەلمێنراوە کە ئەوێستایی دایکی زمانی کوردیـە بـەڵام وەکـوو بەرهـەم نەینووسـیوە و چـاوەڕێی دەرفەت و یارمـەتیە چون کارێکی هەرە دژوارە و بە تاکەکەس لە تەمەنی پیریدا هەرە دژوارترە.

---

«جان هینلز» ئینگلیسی. نووسەری «پرشن میتولوجی» وەرگێڕ بە فارسی «ژالـە ئاموزگـار و ئەحمەد تەفەززولی» بە ناوی «شناخت ئەساتیر ئێران» لەوەدا هاتووە «پاپا و سیمورغ کە ئـاخرین پلەی میهرپەرستیە نوێنەری زەوینی میهرە. نیشانەکەی گۆچـان و حـەلقـەیـە، یـان داسـە، کـە نوێنەری زوحەلە» وتمان زوحەل نیشانەی مەلەکە تاوسە.

لەم کتێبەدا دووسکەی سەکایی کووشانیەکانی سیستان پێشان دراوە کە لەوەدا «میـثروو» واتە میهر بە تاجێك لە تیشك بە دەوری سەریەوە پیشان دراوە ل ١٣١» ئەم سکەگـەلـە هـی زەمـانی

ئەشكانیەكانە. دیارە سەكاكانی كوشانیش كە لە سەردەمی ئەشكانیەكاندا بۆ سیستان كۆچـران میهرلایان بەڕێز بووە)).

وتمان لە میهرپەرستی و دینە كوردیەكاندا خودا مرۆڤی دروس كرد تا تێدا تەجەللا بكات. لـە دینە هیندیەكاندا مرۆڤ دروست كرا تا خودا كایە و یاری پێ بكات. لە ئیسـلامدا «خلـق الجـن و الانس الا لیعبدون» مرۆڤ و جنۆكە بۆ عیبادەتی خودا ئافرێنران. لە زەردەشتیدا مرۆڤ ئافرینرا تـا لە شەڕی ئەهوورامەزدا دژ بە ئەهریمەن، یارمەتی ئەهوورامەزدا بدات.

میهرپەرستی لە هەر ولاتێكدا كە پەرەی سەندووە لە باوەڕگـەلی پێشـینی ئـەوان كـەلكیـان وەرگرتووە وەكوو شەمەشی سوریانی و «سول»ی ڕۆمـی كـە خـودای خـۆر بـووە. سـۆل دەبـێ بـە گرینگترین هەواڵی میتراو پێگەیێ وەكوو پیر بنیامینی كاكەیی پەیدا دەكات. میترا پاش قوربانی گا و بووژاندنەوەی ژیان لە زەویدا لەگەڵ دوانزە یارمەتی دەری كە نوێنەری دوانزە بورجی ئاسمانە و ئاخرین شەوی ژیانیدا لە سەر زەوی میوانیەكی شێو دەرازێنێتەوە و لـەگـەڵ سـول بـۆ نـاو خـۆر سەردەكەون. ئەوە پێ دەڵێن شێوی ئاخر. لە مەسیحیدا ئەو دوانزە یارمـەتی دەرە بـوون بـە دوانـزە حەواری و لە نەریتی شامی ئاخری عیسایش هەر ماوەتەوە. بە پێی وێنە و پەیكەرەكانی میترایـی شێوی ئاخری میترا لە ئەشكەوتدا بەڕێوە دەچوو كە نیشانەی ئاسمانە. لەو میوانیـەدا كـە لـە لای جەستەی گای قوربانی كراو بەڕێوە چووە میترا لەگەڵ یارانی پەیمان و بەڵێن دەبەستێ وتمـان غـار سەنبولی ئاسمانە. ئەمە بیرهێنەری بەیا بەست (بەڵێن و پەیمان)ە. لە ئاینی كاكەییدا كە لە ژێـر ساجی نار (خۆر) ئاسمانی چوارەمدا بەڕێوە چوو و لەوێدا پیر یادگار نوێنەری فەلەكی مـانگ (گـا) قوربانی كراو خاوندگار لەگەڵ تەجەللاكانیدا بەیابەستی كرد. سەبارەت بە پەیكەری شێوی ئـاخر لە ئاخری ئەم بەشەدا باس دەكرێ.

---

تاوتی میهردینەكان لە ئێراندا دوو جۆر بووە و یەكێكی بە وردی وەكوو تاوتی مەسـیحیەكانـە بەڵام لە سواڵەت دروس دەكرا نەك لـە دار. چەشـنی دووهـەمی وەكـوو هوومـەیـەكـی گـەورەی سەربەستراوە كە لە مەریوان و كرماشاندا زۆر دۆزراوەتـەوە. لای زەردەشـتیـەكـان ناشـتنی مـردوو حەرام بوو. مردووەكانیان لە بەرزاییەك دادەنـا تـا گوشـت و پێسـتی دڕنـدە و داڵـی كـەلاكخـور بیخوات. پاشان كە چەند باران و بە فـر دەبـاری بـە سـەر ئێسـكەكانـدا كۆیـان دەكـردەوە و لـە جێگایەك كە پێیان دەگوت «ئەستۆدان» واتە ئێستكدان دەیان ناشت.

---

لە ئاینی میترایی‌دا هەیە کە میترا سواری گەردوونەیەکە کە خۆر وەکوو ئەسپ رایدەکێشێ. لە دەفتەرەکانی کاکەیی، سەبارەت بە شاخوەشین (زات بەشەری کاکەیی)، سولتان چەلەبی سەدەی پێنج دەڵێ: خوەشین بینا ـ خوەشین بینا، شاه زەرسوار خوەشین بینا ... یان دەڵێ: پەرێ شام کەردەن .. ئی رەمەزەنی پەرێ شام کەردەن ـ شاهم دیارەن ئەسپشان زەردەن ـ خوا جام خوەشینا دووای گرد دەردەن. ئەم چوارینەش بە باوەهێندووی هەورامی نیسبەت دراوە:

گرد ئاینەی زیل باریم وەرۆژیان پاس شاخوەشین واچیم وە، دی و گیان

جیهان شێرە نان ـ شێر خوەشێنە نان خوشین جەمشەت کەرد وە دێ لورستان

واتە گشتمان ئاوێنەی دڵ بێنین و لە بانەوە بەرانبەر خۆر بیگرین و پاسەوانی شاخوەشین بە دیدە و گیان بێژین. جیهان شێرە و شێریش خوەشینە... (لە وشەی جەمشەت تێ نەگەیشتم رەنگە جەم و جەمخانە بێت) وتمان شێر نیشانەی خۆر و میترایە. شاعیر دەڵێ جیهان لە مادە و تیشک گشتی تیشکی خۆرە و خۆریش هەر شاخوەشینە (شیعرەکانم لە بەرهەمە ناوبراوەکەی سدیق سەفی زادە بۆرەکەییەوە هەڵبژاردووە.. بەڵام مانا و لێکدانەوەی ئەوانە هی خۆمە).

---

لە دەفتەرەکانی کاکەیی‌دا وەکوو سوهرەوەردی ناوی نوورولئەنوار هەیە. مۆئمن لە چلتەن‌دا دەڵێ

...جەمەودای ئەنگوشت شای ساحیب جە نوورلئەنوار بیەنم شەوکەت...

لە کاکەییش‌دا وەکوو سوهرەوەردی تووبا نیشانەی خۆرە. خودی سان سەهاك لە شیعرەکانیدا سەبارەت بە چلتەن دەڵێت:

هەر چل لۆی شەمم چون فانووس گرپیا

گواهیشان وەن جەی سەنگ و دەسگا

نەیورت دەیجوور نە رۆژ تووبا

نە زاهیر چلتەن نە باتن یەکتا

... واتە هەر چل تاڵی شەمم وەکوو فانۆس گرپیا و لەم سەنگ و دەزگادا گواهییان خوێندەوە لە قۆناغی تاریکی و لە رۆژی خۆردا بە رواڵەت چل کەس و لە بناغەدا لە یەك نوورن. واتە خودا لە نووری خۆی کە تەجەللا گەورەکەی نووری خۆرە چلتەنی ئافراند.

لە هەندێ بەرهەمەکانی سۆفی و عارفەکاندا چاکە و خراپە وەکوو میهرپەرستی و دینە کوردیەکان لە یەك سەرچاوە زانراوە. شەبستەری شاعیری ئازەربایجانی سەدەی هەفت و هەشتی کۆچی دەڵێت.

| | |
|---|---|
| درون حبەای صد خرمن ئامد | جهانی در دل یك ارزن ئامد... |
| بدین خردی کە ئامد حبە دل | خداوند دو عالم راست منزل |
| در او در جمع گشتە هر دو عالم | گهی ابلیس گردد گاه ئادم |
| ببین عالم همە درهم سرشتە | ملك در دیو و شیطان در فرشتە |

واتە دانە دەتوانێ بیێ بە سەد خەرمان و خودا لە ناخی گاڵێك جیهانێکی داناوە. ئەو دڵە چکۆلە کە مرۆڤ هەیەتی جێگای خودای گەورەی هەر دوو جیهانە. بزانە جیهان چون لەگەڵ یەکدا تێکەڵاوە بە چەشنێ کە فریشتە لە دێو (شەیتان)دا و شەیتان لە فریشتەدا مەکانی هەیە.

مار و شێریەکێ لە نیشانەکانی «میترا ئەهریمەن» واتە مەلەکە تاوسی کوردیە. لە فەرگەردی دووی وەندیداد کە تازەترین بەشی ئەوێستایە بە جێگای وشەی ئەهریمەن «ئەژی» واتە مار هاتووە. وەندیداد تازەترین بەشی ئەوێستایە.

---

وتمان لە هێرشی ئەردەشێری بابەکان لە سەدەی سێی زایینیدا بۆ سەر کوردەکان بۆ فەرمی کردنی ئاینی زەردەشتی زۆربەی کوردەکان ئاینی زەردەشتیان قبووڵ نەکرد. هۆی سەرەکی ئەوە شەریعەتی هەرە دوا کەوتووی زەردەشتیە لەوەندیداد بەشی ئاخری ئەوێستادا. ئەم بەشەی ئەوەندە دوا کەوتوویە کە وەرگێڕی وەندیداد هاشمی رەزی دەنووسێ «وەندیداد پڕە لە مژارگەلێ چ لە بناغە و چ لە پەلەکاندا لەگەڵ پەیامی زەردەشت دژایەتی ڕاستەقینەی هەیە». بەڕاستی وایە بگرە سەرکەوتنی ئاینی ئیسلام لە ئێراندا یەکێ لە هۆکارەکانی ئەمە بووە.

باوەڕی مەسیحیەکان بە «گوناهی یەکەمین» کە مرۆڤ کردوویەتی هەر باوەڕێکی میهردینییە چوون لە میهردینیدا هەر لەسەرەتاوە چاکە و خراپە تێکەڵاوە.

بە «جونەیدی بەغدادی» تاووسولعاشقین گوتراوە. بە ئەبوونەسر سەرراج، تاووسولفوقەرا دەگوترا. هەر دوو لە عاریف و سوفیە گەورەکانن ئەمەش لەگەڵ وشەی مەلەکە تاوسی کوردیدا پێوەندی هەیە.

لە فەرهەنگە فارسیەکاندا بۆ خزمەتکاری کەلیسا وشەی شەماس هەیە. لە وشەی «شەمس» واتە خۆرەوە گیراوە. ئەمەش پاشماوەی میهرپەرستیە لە ئایینی مەسیحیدا.

---

وتمان ئازەربایجانی پێش ڕەواجی تورکی زمانیان زۆر لە کوردی نزیك بووە. تا ئەوەند لە سەدی زمانی ئێستای ئازەربایجان تورکیە. پاشماوەکەی ئازەری کۆنە. هێشتا لە زەنجان و مشکینشار وەکوو کوردی بە چوارشەمەسووری «کولە چوارشەمە» واتە چوارشەمەی کورت دەڵێن. لە فەرهەنگی «برهان قاطع»دا کە پڕە لە وشەی ئازەری کۆن، کولّ بە مانای کورت هاتووە. کولّ لە کوردی و ئازەری کۆندا دابێژێکیترە لە کورت. زۆر «رت»ەی ئەوێستایی لە کوردیدا بووە بە «ڵ» وەکوو دەرتە = داڵ (دڕندە). سەرتە = ساڵ. زەرتە = زاڵ (زەرد و درەوشێنەر) و....

---

لە زۆر جێگای ئێران شەو و ڕۆژی چوارشەمە سووری بە شووم و نگریس دەزانن. لەو ڕۆژەدا بۆ سەفەر ناچن و دەترسن. دیارە ئەو جێگاگەلە لە پێشدا زەردەشتی بوونە. ئەڵماس خانی کە نوولەیی شاعیری کوردی سەدەی دوانزەی کۆچی لە بەرهەمی شیرین و فەرهادەکەیدا بە شوومی سێزدە بەدەر و چوارشەمە سووری کە وتمان شەوانی هاتن و عرووجی لایەنی قین و تاریکی خودایە (مەلەکە تاوس) ئاماژەی کردووە. شێرۆ کوڕی خەسرەو پەروێزی ساسانی کە ئەوینداری شیرین باوەژنی خۆی دەبێ باوکی خۆی دەکوژێ. ئەلماس خان لە کاتی نوتفە بەستنی شێرۆدا دەڵێ:

مـاه سـەفـەر بـی جلـووس ئـەنجـوم | چوارشەمە سـووری سـەفـەر سێزدەهـوم
---|---
ئـەو دەم ئـە تـالیع شـووم شـۆر شـەڕ | سـتارەی مـریخ شـانا بـاڵ و پـەڕ...

واتە لە مانگی سەفەر ڕۆژی چوارشەمە سووری سێزدەی سەفەر کە ئەستێرەی مریخ (دیاردەی شەڕ) دەرکەوت نوتفەی شێرۆ بەسترا.

---

جلی ڕەش و سپی زاوا و بووك لە ئەورووپادا کە پاشان لە زۆر جێگای جیهاندا باو بووە نیشانەی تاریکی و ڕووناکی واتە میهر، یان مەلەکە تاوسی کوردیە کە مەسیحی لە میهرپەرستی گرتوویەتی، لە کوردستاندا دیواخی سووری بووك هەم نیشانەی شادیە و هەم تێکەڵاوی تیشك و تاریکیە کە لە ئاوەزی سووری سوهرەوەردیدا باسمان کرد:

ئاوەزی سوور واتە دڵ وتی بۆیە ڕەنگم سوورە کە لە مندا تیشك و تاریکی تێکەڵاوە، وەکوو ڕەنگی شەفەق و سووری تیشکی سەرووی شۆڵەی مۆم. سوور ڕەنگی میهر یان مەلەکە تاوسە کە تێکەڵاو بوونی تیشك و تاریکیە. لە کڵاوە سوورەکەی سوهرەوەردی و جلی سووری بابا نوئیل و...دا باسمان کرد.

---

لە شیرین و فەرهادەکەی ئەڵماس خاندا شیرین دەچێتە سەرتەرمی فەرهاد کە قوڵنگ چەقیوە بە سەریدا و لە سینگیەوە دەرهاتووە و کەلاک خۆران دەورەیان داوە. فەرهاد وەکوو مەم لە مەم و زینی خانیدا زیندوو دەبێتەوە.

مەسیحای مەریەم دەمیاش نەو قەفەس

مورغش پەواز کەرد نە قورنەی نەفەس

دیادیش فەرهاد تاوەخت وەستەی وێش

تەکاندا نە جا هۆرێزا وە پێش...

واتە شیرین وەکوو عیسا لەو جەستەدا فووی کرد و باڵندەی فووەکەی لە گەرووی هەناسەوە هەڵفڕاند. دی فەرهاد ئاواتەخوازەکەی تەکانیدا و لە جێگای هەستا. دیارە ئەم چیرۆکگەلە، بناغەیەکی هاو بەشیان هەبووە. ئاوەخت لە سوورانیدا «خ»کەی وەکوو سوخران کە باسمان کرد سوواوە و بووە بە ئاوات. لە ئەوێستادا «ئاوەستە» لە کرماشانی و ئیلامیدا «ئاوەخت» و لە سۆرانیدا ئاوات. (ئا + وەس+ تە) لەسەر «تە» باس کرا. «ئا» پێشگرە کە نەختێ مانای وشەکار دەگۆڕێ. وەس یان ڤەس لە ئەوێستادا و لە هەورامی و زازادا «واس» لە سۆرانیدا «خواز» بە مانای خوازیار بوونە. لە ئەوێستا و کوردیدا بە پاشگری «ئا»وە مانای ئاوات و ئارەزووی هەیە.

پاش مردنی فەرهاد تەرمەکەی بە پێچەوانەی ئاینی زەردەشتی لە گۆڕستاندا نێژرا. میهرپەرستەکان مردوویان لە ناو تابووتێکدا بە پشتەوە دەناشت. پاشان مەسیحیەکان لاسایی ئەوانیان کردەوە. لە فولکلۆری کوردیدا بۆ وێنە دەڵێن: تا ئەو ڕۆژە کە لووتم دەدا لە بەردی ئەحەد لە بیرم ناچێتەوە. مەبەست کاتی مردن و زیندوو بوونەوە لە گۆڕدایە ئەگەر وەکوو موسڵمان بە شانی ڕاستەوە بنێژرێ لە کاتی هەستاندا گوێچکەی دەدا لە بەردی ئەحەد نە لووتی. دیارە ئەو وتە لە زەمانی میهرپەرستی کوردانی پێش هاتنی ئیسلامەوە بە جێ ماوە.

لە جێگایەك لەسەر «سوختە» و بناغەکەی لە ئەوێستادا قسەمان کرد. ئەم بناغە لەوێدا کان و لە زمانی ئەمڕۆی هیندیشدا هەیە. لەم زمانەدا بناغەی «سیخ» بە مانای فێر کردنە و سیختە بە مانای فێرکراوە کە هەر بە مانای سوختەی کوردیە.

---

دیارە کە سۆفیگەری بە تایبەت سۆفیگەری توندڕەوی وەحدەتی وجوودی لە بناغەی میهرپەرستیە و لە پێشدا لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا جیاوازی هەبووە پیتروشوفسکی لە

کتێبی«اسلام در ایران وەرگێڕ کریم کشاورز»دا دەڵێ «غەززالی سۆفیگەری ئەهەونی لەگەڵ ئیلاهییاتی ئیسلامدا ئاشتی دایەوە و هێنایە ناو جیهانبینی ئیسلامەوە ل ۲۳۹»

---

قرمەتی‌گەل (لقێ لە ئیسماعیلیەکان) سفرەی برایەتیان بوو و لەوەدا، نانی بەهەشتیان دەخوارد. ڕەنگە ئەمە لە مەسیحی گرتبێتیان ل ۲۹۹ سەرچاوەی پێشوو» ئەمە دروس نیە مەسیحی لە میترایی گرتووە و قرمەتیش وەکوو دینە کوردیەکان ئەو نەریتە میتراییەیان بەڕێوە بردووە.

---

«ئیسماعیلیەکان (وەکوو پاشماوەکانی‌تری ئاینی میهری) بە ئەشکەنجەی ئەبەدی دۆژە باوەڕیان نیە و دەڵێن لە ڕێگای دووناددوونەوە مرۆڤ بە زانستی تەواو دەگات ل ۳۰٦ سەرچاوەی پێشوو»

---

پتروشوفسکی سەبارەت بە نوسەیری (لە شیعەیانی زێدەڕۆیی کەر» دەڵێ: پاشان لە باکووری سوریا نیشتەجێ بوون ئەمانە شیعە و مەسیحی و هەندێ شتی پێش ئیسلامیان تێکەڵاو کردووە ل ۳۲۰» بە مەسیحیەوە پێوەندی نیە.

کاکەیی لە ئێراندا ناویان «ئەهلی حەق»ە «بناغەی هاوبەشیان هەیە. لە تورکیادا بە قزلباش، لە ئازەربایجاندا قەرەقویونلەر و گورەنلەر واتە بینەرەکان (گۆرانەکان دروستە) و لە ورمێدا ئەبدال بەئی و لە قەزوێندا بە «کاکاوەند» دەناسرێن ل ۳۲۵ سەرچاوەی پێشوو» لە لای کاکەییەوە بەهەشت و دۆژە تەنیا ئاماژە بە زانست و نەزانینە. ل ۳۲٦. «کاکەیی سفرەی تەشریفاتی دینیان هەیە لایان وایە توزقالگەلی نووری خودا لەو خواردنە بە مرۆڤ دەگات. ڕەنگە ئەمە پاشماوەی مەسیحی سەرەکی بێت. ل ۳۲۷» هەڵەی نووسەرانی‌تر دووپات بوەتەوە. پاشماوەی مەسیحی نیە. پاشماوەی میترایی ئاینی کوردانی پێش ئیسلام و سەردەمی ئیسلامە.

پتروشوفسکی بۆ دۆزینی سەرچاوەی سۆفیگەری گریمانە دەخاتە بەرچاو: «سەرچاوەی مەسیحی و نوێ ئەفلاتوونی و سەرچاوەی ئێرانی و سەرچاوەی هیندی ل ۳۳۲» ڕوانگەیێ کە دەڵێ «سۆفیگەری سەرچاوەی ئیسلامی هەیە بەڵام سۆفیگەری توندڕەو سەرچاوەی هیندی هەیە ل ۳۳۳».

پتروشوفسکی بە دروستی دەڵێت «فەلسەفەی نوێ ئەفلاتوونی کە نووسراوەکانی فلووتین و قوتابیەکەی «فرفوریوس»ە و توێژێنەرانی‌تری نوێ ئەفلاتوونی کاریگەرییان لەسەر سۆفیگەری نەبووە ل۳۳٤» بەڵام سەرچاوەکەی کە میهرپەرستیە دەرناخات. «ناتوانین کاریگەری هیندی و بووداییش لەسەر سۆفیگەری قبووڵکەین ل ۳۳٥» ئەمەش دروستە. «ئاینی مەسیحی لەسەر

سۆفیگەریکاریگەری هەبووە و ئەمە «رام ئاسین پالاسیوس» سەلماندوویە ل ۳۳۵» ئاینی مەسیحیی و عیرفان و زوهدەکەی وەکوو دەیان شتیتر خوێ لە میهرپەرستی گرتوویە.

«سۆفیگەری لە ژیانگەی عەرەبی هەرچەند نە لە عەرەبستان بەڵکوو لە ئێراق و سووریا و میسردا پێکهاتووە ل ۳۳۷» میسر دروست نیە. ئێراق بەتایبەت باکووری ئێراق و سووریا دروستە. ئەوانەش لە پێشدا عەرەب نەبوون. پاش ئیسلام نەختە نەختە زمانیان گوڕدرا بە عەرەبی. زۆرترین دێری میهرپەرستی لە باکووری ئێراق و رۆژهەڵاتی سووریا و باکووری سووریا و ئێراق واتە لە کوردستانی باکووردا ماوەتەوە «هەندێکیتر لە سۆفیەکان بێئەوەی راستەوخۆ شەریعەتگەلی ئیسلام رەتکەنەوە ئەنجامدانی شەریعەت و عیبادەتەکانی بە واجب نەدەزانی ل ۳٤۰» دیانگوت ئەنجامدانی شەریعەت بۆ بە دەس هێنانی بەهەشتە. بیرکردنەوە لە بەهەشت وەکوو بیرکردنەوە لە ماڵی دونیایە و مرۆڤ لە خودا دوور دەخاتەوە.

---

ئیبنولعەرەبی سۆفی و عارفی ناودار لە ئێراق و سووریادا فیکرە وەحدەتی وجودیەکەی پێکهێنا «ئەو لە ئەندولس (باشووری ئیسپانیادا لە دایکبوو لە توونسەوە هاتە مەککەو پاشان هاتە بەغدا و حەلەب و مووسڵ (ناوەندگەلی میهرپەرستی کۆن) پاشان چووە ئاسیای بچووك (تورکیای ئەمرۆ) و لە ئەنجامدا لە دیمەشق گیرساوە ۳۵۵» مەلەك زاهیر پاش کوشتنی سوهرەوەردی رێزی زۆری لەونا.

پترو شوفسکی زۆری سەبارەت بە باوەڕی وەحدەتی وجوودی ئەو نووسیوە و ئاکامەکەی لەم رستەدا کورت دەکاتەوە «بوونی ئافرێنراو هەبوونی ئافرێنەرە ل ۳۵۷». ئەمە بە وردی فەلسەفەکەی سوهرەوەردی کوردە کە دەڵێ تیشك و مادە کە مادەیش لێکدراوەی تیشکە سەرچاوەکەیان نوورولئەنوارە. ئیبنولعەرەبی پاش کوشتنی سوهرەوەردی دەچێتە حەلەب و لە ژێر کاریگەری بەرهەم و لایەنگرانی ئەودا بووە. «بەلای ئیبنولعەرەبیەوە شەریعەتەکان بێبایەخ بوون. دەیگوت ئیمانێك کە لەسەر بناغەی شەریعەتگەل و بنەماکانی نەگۆڕ بێت.... رەت دەکرێتەوە ل ۳۵۷» «تەریقەتی قادری وەحدەتی وجودیە و لایەنگرانی بەنهێنی عەبدولقادری گیلانیان بە خودا دەزانی ل ۳٦٤». ئەم تەریقەتە ئێستا ئەهوەن کراوەتەوە. «کڵاوی دەروێشەکانی مەولەوییە لە قوونیەدا کڵاوێکی درێژە ل ۳٦۵» وەکوو کڵاوە سوورەکەی سوهرەوەردی کە باسمان کرد «بناغەدانەری نەقشبەندی لە سەدەی هەشتی کوچیدا بەهائوددین موحەممەدی نەقشبەند بوو کە ئەوینی وەحدەتی وجوودی لەسەردا بوو بەڵام پاش ئەو نەقشبەندیەکان باوەڕیکی دژ بە وەحدەتی

وجوودیان پەیدا کرد و دەمارگری دینی لەواندا پەیدا بور ل ٣٦٦» «پاش سەدەی هەشتی کۆچی سۆفیگەری شتی تازە و بە بناغەی نەهێنا و نەختە نەختە دابەزی ل ٣٦٩»

---

هەروا کە توانجی خۆرپەرستی و شەیتانپەرستی لە میهرپەرستەکان دەدرا لە دینە کوردیەکانیش دراوە ماموستا ئەمین زەکی بەگ کە بێ توێژینەوەی پێویست وتەکانی «دەبستانولمەزاهب» دەگێرێتەوە لە پێشدا دەڵێ:

«بروایان وایە عەلی بو ناوڕۆژ گەڕاوەتەوە و لەگەڵ ئەودا بووە بە یەك. جا بیرو باوەڕی وەها لە ناویاندا جێگیر دەبێ و هیچ کۆسپێکیش لە ڕێی زیندووکردنەوەی خۆرپەرستیدا سەر لە نوێ پاش گۆڕینی ناوەکە نایەتەڕێ. کتێبی کاکەیی محەمەد ئەمین هەورامانی ل ٢٧» (بەداخەوە)

ماموستا محەمەد جەمیل ڕۆژ بەیانی تاوس لە بناغەی دێو دەزانی و دەڵێ بووە بە «دییوس» و لای کاکەییەکان بووە بە «داو» و لە هەندێ شتدا لەگەڵ زەردەشتیەکان بەشدارن وەکوو مردوو ناشتن .... سەرچاوەی پێشوو ل٣١». چۆن دێو کە وشەیەکی کوردی و ئەوێستایی و وێداییە لە بواری زەماندا دەبێ بە «دییوس»؟ وشە لە بواری زەماندا دەسوێ سووك دەبێتەوە. دێو وەکوو دابێژی هەرە کۆنی ئێستا لە زمان و ئوستوورە کوردیەکاندا ماوەتەوە.

مردووناشتن لە زەردەشتیدا بە توندی حەرامە و سزادانی «مەرگ ئەرزان» واتە ئیعدامی هەیە. بەداخەوە ماموستایانی کورد بێ‌لێکۆڵینەوە و تەنانەت زانستێکی ڕواڵەتی هەڵەی گەورەیان سەبارەت بە دینە کوردیەکان کردووە.

تەنانەت گەورەکانی کاکەییش کە هەورامی زمان نین وەکوو خوا لێخۆشبوو حاج نیعمەتوللای جەیحوونئابادی و نوورعەلی ئیلاهی بە یارسان دەڵێن «یارستان»! نووسەری کتێبی کاکەیی گۆران بە گاوران واتە کافران و چەند شتی سەیریتر مانا دەکاتەوە.

ماموستا جەمیل ناوی چوار فریشتە بنیامین و داود و... دەبات لە حالێکدا ئەمانە فریشتە نین. لە سەر فریشتە باسمان کرد. نووسەری کاکەیی دەڵێ «سیا چەمانە. سیا جامانەیە. چون ماگاکان (موغەکان) کە گاسایان وەکوو گۆرانی دەخوێندەوە و جامانە واتە مێزەری رەشیان دەبەست ل٨٤» (!!!) ئەوەی کە تەنیا تەرجەمەیەکی ئەوێستا بەتایبەت ویسپەرد و وەندیداد (وی دێوداتە)ی خوێند بێتەوە دەزانێ رەنگی رەش لە زەردەشتیدا شتێکی ئەهریمەنیە. جل و بەرگی موغەکانیش سپی و درێژ بووە و وەکوو ئەو دەڵێ وەکوو ڕانکوو چۆخەی کوردی! نەبووە.

لە ئەوێستادا ناوەندی بڵاوبوونەوەی ئێریەکان «ئێریەنە ڤەئێچە» هاتووە. واتـە بـێچ و بنـاوانی ئێریەکان واتە ئەو ناوچەی کە ئێریەکانی لێ هەستا و بـەم لاو لا کۆچیـان کـرد. نووسـەر دەڵـێ «ئەریەن ڤەچ» (!) لە «بێژە» وەرگیراوە کە بە هەورامی واچە و بە سۆرانی بێـژە و وێـژەیـە... (!) یان «بۆیە هەورامان پڕە لە نەزرگە، گلکۆی دەیان زەردەشتی تێدایە (!) یـان «جـەم (مـەبەسـتی جەم لە جەمخانەدایە) وشەیەکی ئەویستاییە و بە واتای کۆ بوونەوە هاتووە ل۱۲۰» ئـەمـە قسـەی کەسێکە کە تەنیا ناوی ئەوێستای بیستووە و خەیاڵاتی خۆی بە ئـەوێسـتایی دەزانـێ. یـان «وەك نەریتی باو باپیرانی کۆن پەیڕەوی زەردەشتی ...» لە کوێ دەزانێ باو باپیرانی کۆنی ئێمە زەردەشـتی بوونە؟ بە گۆڕی زەردەشتیەکاندا دیارە؟!

یان «ڕۆژوولای زەردەشتیەکانیش (وەکوو کاکەیی) سێ ڕۆژ بووە ل٢٥٤» ڕۆژوو هەر چەشنە خـۆ ئازاردان، بە توندی لە زەردەشتیدا حەرامە. بە گشتی هەر چی ئەم نووسەرە سەبارەت بە ئەوێسـتا و زەردەشتی نووسیویە خەیاڵاویە و شتی وا لە ئەوێسـتادا نیـە وەکـوو «لـە گاتاکانـدا دنیـا بـە سەرگای ئاوییەوە (خودا) بەندە ئەگینا چۆن دەوەستێ ل ٢٥٤». یان «گاو لە ئەویستادا بە واتـای خودا و سەر کردە و خودایی و مەزن و سەر فراز هاتووە ل٢٩١» (!) بـە داوای لـی بـووردن داخ و کەسەری فراوان ئەوەیە کە ئەمە تەنیا وتەی یەك نووسەری کورد نیە تەنانەت هەندێ لە نووسەرە بە ناو بانگەکانی کورد بێئەوەی هیچ لە زەردەشتی بزانن هەموو پێشینەی کوردیان نووساندووە بە زەردەشتیەوە. نابێ بێتوێژین لە سەر زاراوە کوردیـەکـان بنووسـین. مـەگـەر ئـەوەی کـە زمـانی ئەویستایی کە دایکی زمانی کوردیە و دوو پەهلەویەکە کە خۆشکی زمانی کوردین بـە تـەواوی بزانین. ئەگەر وانەبێ دەکەوینە قسە هەڵبەستن بە ئەوێستاوە. لەسەر دینـە کوردیـەکـانیش نـابێ بنووسین مـەگـەر بـە تـەواوی لـە میهرپەرسـتی و مـەسـیحی و ئیسـلام و زەردەشـتی و تەریقـە سۆفیگەریەکان و فەلسەفەی سوهرەوەردی و نوستووڕە کوردیەکان و بەیتەکان بە تـەواوی بـزانین. ئەگینا دەکەوینە شۆن قسەی زانکۆکانی تاران و ئەستامبووڵ و ئەو ئەورووپاییانـە کـە بـە پـارەی تاران و ئانکارا بەرهەمیان نووسیوە.

«مارتین وێرماوزن»یش لە کتێبەکەی «ئاینی میترا» کە لـە لایـەن «بـوزورگ نـادرزادە»وە بـە فارسی وەرگێڕدراوەتەوە باوەڕی بە شەوی یەکەمی زستان بۆ جەژنی میهرەگان و یەکەمی هاوین بۆ جەژنی نەورۆزە. ل ١٠ و ١١»

---

دەزانین کە میترا جگە لە تەجەللای خودا لە زەویدا پاشان کە بۆ ناو خۆر دەگەڕێتەوە هەندێ کاری بە ئەستۆیە لەوانە لە جەنگدا یارمەتی دەری شەڕ کەرێکە کە دژ بە پەیمان شکێن شەڕ دەکات.

بە پەیمان شکێن لە ئەوێستادا «میسروو درۆجە» بە سینی نووك ددانی Mithru، دەگوترێ (میسرە + وو+ درۆج +هـ). میسرە هەر میترایە. وو ـ هـ، هەر دوو پاشگری ئیزافەیە کە باس کران درۆج واتە درۆ. بە گشتی بە دوومانایە ١ـ بە مانای پەیمان درۆیە، ئەوەی کە پەیمان و گرێبەست دەشکێنی چون، میترا بە مانای پە یمانیشە. Mith+re. ٢ـ ئەوەی کە لەگەڵ خودای پەیمان درۆ دەکات.

میترا لە شەڕەکاندا هاوبەشە و دەبێ بە هۆی کەم کردنەوەی ورەی پەیمان شکێن و یارمەتی لایەنی ڕاستکار دەدات. لە ئەویستاشدا، ورێ و ورە هەر مانای وەرەی کوردییە و لە وشەکانی ورێ سرە، بەسینی نووك ددانی، و ورەسرەغنە داهاتووە کە باسی زۆرە.

زەمانێ کە یۆنانیەکان هێرشیان کردە سەر ئێران و ئێرانیان داگیر کرد زمانی یۆنانی بۆ ماوەی سێسەد ساڵ بوو بە زمانی فەرمی و حکوومی ئێران. لە قەباڵەکانی دۆزراوە لە هەورامانـدا دووانی بە زمانی یۆنانی نووسراون. ئەشکانیەکانیش تا دووسەد ساڵ ئەو زمانەیان بە کار دەهێنا. جا تێکەڵاویەك لە نێوان هیرکوول خودای شەڕی یۆنانی و میترادا ڕووی داوە. لە سەردەمی ئەشکانیەکاندا ئەو کاتەی کە ژوورەکانی ئەشکەوتی کەرەفتوو لە نزیکی سەقزدا دروس کرا چون زمانی فەرمی زمانی یۆنانی بوو لەسەر ستایشتگاکە بە زمانی یۆنانی نووسراوە ستایشتگای هیرکوول. لەوێدا گا قوربانی دەکرا. بەهرامی زەردەشتیش کە لیکچوونگەلێکی لەگەڵ مارس (مریخ)دا هەیە بە یۆنانی بە مارس ناسراوە یان ئەناهیتا، خواژنی زەردەشتی و میترایی وەکوو ونووس ناسراوە تەنانەت ئێستاش لە فارسیدا بە ئەستێرەی زوهرە (ونووس) ناهید (ئەناهیتا) دەڵێن. ئەگینا پەرستگەی میهری کەرفتوو پێوەندی لەگەڵ هیرکوولی یۆنانی نیە و لە میهرپەرستی ڕۆم و یۆنان و جێگاکانیتری ئەورووپادا هیچ ئاماژیەك بە هیرکوول نیە.

«لە ئەورووپادا ٢٥ی دسامبر جەژنی لە دایکبوونی میترا بووە ل ١٠٧ سەرچاوەی پێشوو» ئێستا بەرانبەرە لەگەڵ جەژنی لە دایکبوونی عیسا (دـ خ). ئەورۆژە لە ئەورووپادا ئێستا چوار ڕۆژ پاشترە لە شەوی چلەی خۆمان واتە شەوی یەلدا (لە دایك بوون) کە وتمان بەهۆی پشت گوێ خستنی کبیسەکان لە بواری زەماندا وای لێهاتووە.

«میترا لە بەر لە دایکبوو. بەردیش ئاماژە بە ئاسمانە. سەرچاوەی ناوبراو» سەدەفیش ئامـاژە بـە ئاسمانە. بۆ شرۆڤەی سەدەف و دوڕو زەریا و... لە ئیلاهییاتی تەوحیدی کاکەیی‌دا زانستی تـەواو و سەرنجی هەرە وردی پێویستە.

---

مارتین وێرماوزن چون دینە کوردیەکان ناناسی بە بینینی ئەو بەردنووسراوە گەلـە کـە وەقفـی ئەهریمەن کراوە دەنووسێ «لـە ئـاینی میهریـدا دو هێـز هـەمیشـە لـەگـەڵ یـەك لـە شـەڕدان ئەهوورامەزدا فەرمانرەوای ناوچەی ڕۆشنایی و ئـەهریمـەن فـەرمانرەوای ناوچـەی تـاریکی و لـە سەرووی ئەمانەوە زروان هەیە کە خودای زەمانە. ل ٦ــ ١٤٥». هـەنـدێ نووسـەر کـە بـەڵگـەی پێویستی بە دەستەوە نەبێ دەکەوێتە گێژی خەیاڵاتەوە. لە میهرپەرستی هەزاران بـەڵگـە بـە دەس هاتووە لەو بەڵگەگەلەدا لە هیچ کوێ ناوی ئەهوورامەزدا و زروان نەهاتووە. و لە شەڕی تـاریکی و ڕۆشنی باسێك نیە.

ورماوزنیش وەکوو ئەوانی‌تر پەیکەرە ترسناکەکان بـە هـێ زروان دەناسـێنێت. تـەنیـا لـە نـاو کەوانەدا دەنووسێ (هەندێ کەس بە پەیکەری ئەهریمەنیان زانیوە. ل ١٥٨) ناوی ئـەو کـەسـانەی نەهیناوە.

---

«سەبارەت بە جوغرافیای میهرپەرستی لە کتێبەکەی «ویدن گرێن»دا کە «نوزهـەت سـەفـای ئەسفەهانی» بە ناوی «مانی و تعلیمات او» وەری گێڕاوەتە سەر فارسی نووسراوە «لە نێو چۆمان و شارەکانی لە زەمانی ئەشکانیەکاندا لە چینەکانی سەرووی ئەشکانیدا میهرپەرستی بە تونـدی ڕەواجی بوو. لە ڕاستیدا ماد واتە مادی گەورە هەمەدان ـ ڕەی (تـاران) و ئـەسـفەهان و (گشـت ناوچە کوردنشینەکان) و مادی چکۆلە واتە ئازەربایجان ناوەندی گەورەی میهرپەرستی بـوو ل ٣٣» بە سەر سووڕمانەوە لە هەمەدان وڕەی و ئەسفەهان هیچ شوێنەواری میهرپەرستی نیـە بـەڵام لـە ئازەربایجان یەکێك هەیە و لە کوردستان زۆرە. لە ئازەرشەهر نزیکی تەورێز لە کێوی قیبلـەداغـی ستایشتگای میهری هەرە جوان هەیە کە جێگای پەیکەرەکەی میترا وەکوو میحرابیان لێ کردووە.

ڕستەیەکەم لە خوا لێخۆشبوو تەوفیق وەهبیەوە هەڵگرتبوو بەداخەوە سەرچاوەکەی لە بیرم چـوو بوو بینووسم پێم وابێ «بنە چەکەی کوردان و... وەرگێر بە کوردی ئەهافریزی زادە» بوو. دەفەرمێ: «ئەحمەدی خانی بە هۆی هێنانی خەیر و شەڕەوە پێکەوە لە زەردەشت دەچێ»! زەردەشت هیچ کـات خێر و شەڕی لەگەڵ یەك نەهێناوە و دژ بە یەك و لە شەڕ لەگەڵ یەکـدا زانیویـە. لـە زەردەشـتی سەرەکی و دواییندا ئافرێنراوەکانی شەڕی ئەهریمەن تا ئاخری دونیا لەگەڵ ئافرێنراوەکانی خـەیری

ئەهوورا مەزدادا لە شەڕدان نە پێکەوە. بزانن پەتای «زەردەشتی بە بناغە زانین» چلۆن ڕووناکبیرانی کوردیش دەخاتە دوور کەوتنەوە لە ڕەسەنایەتی بەرهەمە فەرهەنگیەکانی کورد. تەنیا لە میهرپەرستی و پاشان فەلسەفەی سوهرەوەردی و دینە کوردیەکاندایە کە خێر و شەڕ لە سیستەم و وردە سیستەمەکانی ماکی و مینۆکی جیهاندا لەگەڵ یەکن. دەبێ بزانین هەندێ شۆنیست ویستوویانە فەرهەنگی کوردی لە سەربناغەی پڕو پووچدا بنرێ. دەیان نووسەری کوردیش کەوتوونەتە ئەم داوە نامرۆڤانەوە.

---

لە باژێڕی کوردنشینی کەنگاوەر (حەمدوڵڵای مستەوفی لە سەدەی هەشتی کۆچی لە نوزهەتولقلووبدا نووسیوە کەنگاوەر دەروازەی کوردستانە) شوێنەواری مەعبەدی میهرپەرستی هەیە. لەوێدا زۆر تاوتی سواڵەتی کە مردووی تێدا نێژراوە پەیدا بوونە. میهرپەرستی ئەو ناوچە لە کوردستانی پێش ئیسلامدا پێشان دەدات. ئەگەر خەڵکی ئەو ناوچە زەردەشتی بوایەن بە جێگای تابووت «نەسوودان» دەدوزرایەوە.

---

باوەڕ بە دوونادوون جگە لە میهرپەرستی و ئاینە کوردیەکان لەمانەی خوارەوەشدا بوون ١ـ هێندیەکان، چ بوودایی و چ برەهمایی (هیندوئیسم) کە پێشینەی ئوستوورەییان لەگەڵ کورد و ئێرانی یەك شتە. ٢ـ مانەویگەل لە سەدەی سێهەمی پێش زایین دینەکەیان کە دوانە پەرستیە لە لایەن مانیەوە پێکهات. ٣ـ فەیلەسووفگەلی یۆنانی لەوانە سوقرات و فیساغوورس و ئەفلاتوون باوەڕیان بە دوونادوون بوو رەنگە ئەم باوەڕە لە مادەکانەوە فێر بوون. هەندێ بەڵگەش لە دەسدایە کە لێرەدا جێگای باسی نیە و هەندێ لەوانە لاوازن.

زەردەشتی و جوو و ئیسلام و مەسیحی دوونادوون رەت دەکەنەوە بەڵام لە ژێر کارتێکردنی میهرپەرستیدا هەندێ لقی مەسیحی لە سەر باوەڕمەندی بە دوونادووندا مابوونەوە. «ئریگان» لە پاپاکانی مەسیحی سەرەتایی لە ڕۆمدا نووسیویە: ڕۆحەکان بۆ خولێکی دوونادوونی دێنە سەرزەوی و لە جەستەی گیا و ئاژەڵەوە دەچنە جەستەی مرۆڤ تا خۆیان بە جیهانی ئاسمانی بگەیێننەوە. هەندێ کەسایەتی و فەیلەسووفی دونیای ڕۆژاواش بە دوونادوون باوەڕیان پەیدا کردووە لەوانە «پاڵ گوگن» وێنەگەری فەرانسەیی. هەنری فورد (دامەزرێنەری تەراستی سەییارەسازی فورد) کارل یونگ (دروونناسی گەورەی سویسری و جیهانی) هەر وەها شاعیرگەلێ وەك «ویتمەن» و ئمێرسۆن و....

---

حەمدوڵڵای مستەوفی لە نوزهەتو...دا دەڵێ «هەندێ لە پەیڕەوانی مەزدەك لە ئێراقدا هەن ل٤١٢» چون غوللات و خوەررەمدینەکان لە پێشدا بە هەڵە بە مەزدەکی ناسرابوون بە ڕوونی دیارە کە مەبەستی دینە کوردیەکانە کە لە سەدەی هەشتی کۆچیدا لە بەغدایشدا وەکوو کەرکووك لایەنگریان هەبووە.

لە زەمانی ئەشکانیەکاندا میهر وەکوو خودا پەرستراوە ناوی چەن شای گەورەی ئەشکانی «میترە دات»ە واتە میهرداد. لە ناو کوردی موسڵماندا ناوی خوداداد هەیە بەڵام موحەممەدداد، نیە. دیارە پەرستنی ئەهوورامەزدا خودای گەورەی زەردەشتی لە ناو ماڵباتی ئەشکانیەکاندا باو نەبوو ئەگینا وەکوو مەزددات یان هورموزدات کە لە زەمانی ساسانیەکاندا زۆر بوون ناودەنران.

---

ڕەنگی شین وەك ڕەنگی ئاسمان و نەختێ لەوە دێزتر واتە شین (مەبەست ڕەنگی کەسك و سەوز نیە کە هەندێ زارۆچکە شینی پێ دەڵێن) لە ناو کوردگەلدا ڕەنگی عەزاو شین گێڕی بووە. لە ئەوێستاو کرمانجی و پەهلەوی (خوشکی زمانی کوردی) «خشین»ە لە ستایشتگاگەلی میهری کە لە ئەورووپا دوزراونەتەوە لە هەر دوو لای پەیکەرەکەی میترا دوو پەیکەری مرۆڤ هەیە کە یەکێ دارێکی سەرئاگرین ڕوو بە ئاسمان و ئەوی دی سەرە و ژێر ڕوو بە زەوی گرتووە. یەکەمی بە یونانی ناونراوە کوتس و ئەوی دی کوتوپاتس. ئەو دووە ئاماژەن بە هەڵاتن و نیشتنی خۆر. کوتووپات کە ئاماژە بە ڕۆژاوا بوون دەکات دیمەنێکی خەمباری هەیە و بە ڕەنگی شین نەخشراوە. بەڵام کوت کە دیمەنێك شادی هەیە ڕەنگی سووری هەیە. دیارە ئەوە کە ڕەنگی شین لە کوردستاندا نیشانەی عەزا و شین گێڕیە دابێکی میتراییە.

---

هەندێ نووسەر و مێژوونووس داسنی‌یان بە لقێك لە یەزیدی ناساندووە. ئەگەر داسنی هەر ئەوە بێت کە ئیبنی ئەدیم لە سەدەی چواری کۆچیدا وەکوو دیسانی ناساندوویە هەڵەیە چون دێسانی دوانەپەرست و ئێزدی تاكپەرستن. بەداخەوە لە داسنی زانیاری ئەوتۆ بە دەستەوە نیە. لە دەقێکی مێژووییدا هاتووە سوڵتان سەلیمی یەکەم هەولێر و گشت ناوچەی «سوهران»ی دا بە حەسەن بەیگی داسنی. لە ئاخری ئەم بەشەوە لە سەری باس دەکەین.

نیکیتین دەڵێ: فیرقەگەلی (کوردی) ڕێ ون کردوو (لە ڕوانگەی خۆیەوە) وەکوو سارلی و شەبەك لە دەورو پشتی مووسڵدان. ئەمانە لە کوردگەلی قزلباشن (مەبەستی غوللاتە. کتێبم

لەسەر سارلیەکان وەدەست نەکەوت بەڵام شەبەك ئێستا وەکوو شیعەی دوانزە ئیمامی بە هەندێ نیشانەگەلی غوللاتەوە ناسراون کە باس‌کرا).

---

ڕۆمەن گیرشمەن کە یەکێ لە بەرپرسانی گەورەی هەڵکەندنی شوێنەوارە مێژووییەکانی ئێرانە لە کتێبی «ئێران لە سەرەتاوە تا ئیسلام» وەرگێڕ بە فارسی «موحەمەدموعین» دەڵێ:

«لە نیپوور ـ کاکزە دورائوروپووس (هەترا) گۆرستانگەلی زەمانی ئەشکانی دۆزراونەتەوە لە تابووتی سوالەت لەگەڵ هەندێ کەرەسە لە لایەن دێرینە ناسانە وە دوزراونەتەوە ل ۳۲۱» مندالەکانیان لە هوومە (خومرە)دا دەناشت ئێمە چەند دانەمان لە شووش (پارێزگای خووزستان) دا دۆزیەوە ل ۳۳٤» لەم چەشنە تاوتگەلە لە مەریوان و کرماشان و کەنگازەردا زۆر دوزراونەتەوە. بەتایبەت لە کەنگازەردا هەر دوو جۆرەکەی دۆزراوەتەوە.

«بارتوولوومە» لە «لوغەتنامەی ئێرانی کۆن» دادەنووسێ «ناوگەلی مادی میترەداتس (یۆنانی کراوی میترەدات) میتروپاتس (میترۆپات) لە زەمانی کەمبووجیە سەدەی شەشی پێش زایین و میترەگاشس (میترەگاس بەسینی نوکدەدانی) سەرۆکی لیدیەکان لە شەڕی سالامیس‌دا و هەندێکی‌تر نیشانەی گرینگی میترا لە نێو مادەکاندایە» (لە سەردەمی دەسەڵاتی هیخامەنشیەکاندا)

---

دەزانین لە سەرەتای هەزارەی دووهەمی پێش زایین‌دا دوو هۆزی ئاریایی هەرە کۆن بە ناوی هیتی و میتی لە باکووری زەریای کاسپێنەوە بۆ ئاسیای بچووك کۆچیان کرد. (هەرچەند ئەمانە ئارییایین بەڵام زمانی ئێستای کوردی پاشماوەی زمانی ئەوان نیە بەڵکوو پاشماوەی زمانی مادەکانە) لە بوغاز کووی نزیکی ئانکاراوە لەوحەیەك لەوان دۆزرایەوە هی سەدەی چواردەی پێش زایین کە پەیماننامەیەکە لە نێوان دوو پادشای هیتی و میتانی‌دا. لەوەدا میترا و ئیندرە و وەروونەو ناسەتیە، بە چاودێروگەواه گیراون.

ئیندرە لە وێداکانی هێندی‌دا ئیستاش خودای هەرە مەزنە بەڵام لە ئەوێستادا وەکوو دێو هاتووە. میترا و وەروونەش لە ریگوێدادا هەمیشە ناویان پێکەوە هاتووە کە پادشای جیهانن. ڕۆژ لە میترا و شەو لە وەروونەوە بەدی دێت.

بگرە ناوی هۆزی میتانی هەر لە بناغەی «میت» گیراوە کە بە مانای بەڵێن و پەیمان بەستن و دۆستی و خۆشەویستی کردنە و بەشی یەکەمی ناوی میترایە (میت + رە) کە باس دەکرێ. لە بەردنووسراوەکانی پادشاکانی سەرەتای حکوومەتی هیخامەنشیەکاندا ناوێ لە میترا و

خودایانی‌تر نیە و تەنیا ئەهوورامەزدا وەکوو خودای گەورە ناسێنراوە. تەنیا لە کەتیبەکەی داریووش لە بێستووندا ناوی مانگی «بەگەیادیش» هەیە کە جەژنی میترایە و باسمان کرد. بەڵام بە هۆی ڕووداوگەلێکی سیاسی لە ئاخری حکوومەتی هیخامەنشیەکانەوە بەتایبەت لە زەمانی ئەردەشێری درێژدەس و پاش ئەو ناوی میترا و ئەناهیتا لە پاڵ ئەهوورامەزدادا لە بەردنووسراوەکاندا دەبینین. ڕەنگە لەو کاتەدایە، کە خوداکانی‌تری ئاریایی هێنراونەتە نێو ئەوێستاوە. لە گاساکاندا کە هۆنراوەکانی خودی زەردەشتەیەك جار ناوی میترا هاتووە ئەوێش نەك بە گوێرەی ئێزد، تەنیا بە مانای ڕاستەقینەی خۆی واتە ئەرك و پەیمان بە ئەستۆ گرتن هاتووە و وەکوو ئێزد ناراستە و خۆ لە کاتی بە خراپ زانینی قوربانی و خواردنەوەی هۆمدا ڕەت کراوەتەوە. لە بەشەکانی تازەی ئەوێستادا بە مانای ئێزدی ڕووناکی و چاوەدێری بەڵێن و پەیمان کە ئەهوورامەزدا ئافراندوویە ناوی زۆر هاتووە و بە شتێکی تەواو لە یەشتەکان لە ستایشتی ئەودایە.

---

وێرماوزن دەنووسێ: «خانووگەل (دێرەکانی دەسکردی میهرپەرستی) و بەردنووسراوە و شوێنەوار و بەڵگەکانی‌تری دێرینە ناسی میهردینی لە ئیمپەراتووری ڕۆم (ڕۆمی گەورە کە پاشان بوو بە دوو ڕۆمی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی) و سووریا و ئاڵمانی کۆن (دۆچلەند و وڵاتە داگیرکراوەکانی) و ئینگلیس‌دایە کە هی سەدەی یەك تا پێنجی زایینیە ل ۱۸» (بە کوردستان و ڕۆژاوای ئێران ئاماژەی نیە) هەر وەها دەنووسێ «هەندێ هۆکاری دەروونی و ئاکاری بوون بە هۆی پەرەسەندنی میترائیسم و پاشان مەسیحی کە ئەمانە توانیان خواستی دینی زەمانی خۆیان وەرام بدەنەوە. ئەم هۆکارگەلە بریتین لە:

۱ـ باوەڕ بە خودایەکی تاك ۲ـ نیاز بە یەك نێوەنجی لە نێوان خودا و مرۆڤدا ۳ـ ڕزگاری پاش مردن و داوەری دنیای پاش مردن. ل۱۹». وێر ماوزن دەنووسی «سەبارەت بە بەهەشت لە ئایینی میترادا شتێك نازانین بەڵام بێ‌گۆمان میترا بەڵێنی بەهەشتی بە باوەڕمەندان داوە ل ۲۲» (!). وێرماوزن بەڕاستی ناسینی لە میترائیسم ناتەواوە. بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەگەر دوونادوون یان برینی هەفت پلەی میتراپەرستی بۆ گەیشتن بە جیهانی نوور هەبێ ئیدی بەهەشت شتێکی زیادیە. بەهەشتی میترایی و فەلسەفەی سوهرەوەردی و دینە کوردیەکان هەر جیهانی تیشکی خوداییە کە پاش برینی پلەی هەفتەمی میترایی کە باسمان کرد یان بە دوونادوونی تەواو پێ دەگەیت. هەر

وەها دەنووسێ «دەبێ ئاینی میهری و مەسیحی بە یەك ڕەوتی فیکری بزانین کە هی قۆناغێك لـە گۆڕانکاری هزری مرۆڤە ل۳۲».

---

ئەو زانستوەرە ئەورووپاییانە و نووسەرانی ئێرانی کە لەسەر میهردینی نووسیویانە سەئومە یـان هەئومـە (هەیڤ) سەر بە خۆ ناو دەبەن. لە پێشدا دەبێ بڵێین میهردینی ئاینی تاك پەرسـتیە لـە بەشەکانی پێشوودا سەلماندمان کە نووری مانگ (هەئومە = هەیڤ) هەر نووری خۆرە واتـە هـەر میترایە. گشت ئەو گیانەوەر و مرۆڤگەلە کە لەوێنە و پەیکەرەکاندا لـەگـەڵ مـیتران هـاوزەمـان گشتی هەر ئەون بەلاّم لە جەستەگەلی جیاوازدا. وەك لە ئاینە کوردیەکاندا هەفتەن و هەفتەوانـە و چلتەن هەر یەك نووری دابەش کراون. «لە نـەریتی ستایشـتگاگەلـی میهریـدا نـان و شـەراب دەخورا ل ۱۳۹» ئەم نەریتە لە مەسیحیش‌دا هەیە. «بە پێـی نەریتگـەلـی میترایـی ئـەوەی کـە دەهاتە نێو ئاینی میهرپەرستیەوە، غوسڵی تەعمید، دەدرا ل ۱۹٤» ئەم نەریتەیش لە مەسیحی‌دا هەیە و هەروەها لە دێرگەلی میهرپەرستی کوردسـتانی بـاکوور و باشـووردا حـەوزێـك بـۆ ئـەم مەبەستە بە دی دەکرێ «ئـەوەی کـە دەهاتـە نێـو میهرپەرستیەوە دەسـی لـە لایـەن سـەرۆکی ستایشتگاوە مۆردەکرا یان وەکوو خاڵ کوتانن دیاری دەکرا و تەنانـەت لـەسـەر هـەنیـەی خـاڵی تایبەت دەکوترا ل ۱۹٤» لەسەر خاڵکوتانن باس دەکەین.

---

لە جێگای خۆیدا لە عەینولقوزاتی هەمەدانی قسەمان کرد چوارینەیەکی فارسیان پێ نسبەت داوە:

دل گفـت مـرا علـم لـدنی هـوس اسـت — تعلـیم کـن گـرت بـدین دسـترس اسـت

گفتم که الـف، گفـت دگـر، گفـتم هـیچ — در خانه اگر کس است یك حرف بس اسـت

دڵ وتی زانستی نزیکی بە خواوە ئارەزوومە ـ فێرم کە ئەگەر بەو زانستە دستت دەگات

وتم ئەلف، وتی ئیتر، وتم هیچ ـ لە ماڵدا ئەگەر یەك کەس هەیە یەك پیت بەسە

واتە یەك شت نیشانە و جیلوەی هەموو شتە. کە وتم ئەلف بە سـەبـۆ وتـنی هـەمـوو شـتێك. چکۆلەترین پاژە دیاردەی هەموو جیهانە. عەینولقوزات وەکوو خانی بۆ گەیشتن بـە خـودا بـاوەڕی وایە کە مرۆڤ دەبێ لە پێشدا ئەوینی مەجازی واتە ئەوین بە جوانی ڕوالەتی هەبێ. دەڵێ:

ئەی خۆشەویست جوانی لەیلێ وەکوو دانەیەك بزانە کە لە ژێریدا داوێك هـەیـە. چـوزانی داو چیە؟ ڕاوچی ئەزەل کاتێ ویستی کە لە ناخی مەجنووندا ئەسپێکی سواری لـەو تـەوێنـەی خـۆی

درووس کات، مەجنوونیش هەتوانی ئەوەی نیە بکەوێتە ئەوینی جوانی ئەو و بە تروسکەیەکی دەمرێ، وتی تالە ئەوینی لەیلێ لە ناخی مەجنووندا ئەسپێکی سواری دروس بکرێ. تا لەو ئەوینەدا بکولێت و ئامادەی ئەوینی جوانی خودا بێت.

---

«ریونوسووکە ئاکووتاکاوا» شاعیری ژاپونی کە مەسیحیە لە کتێبی (لووت) کە ئەحمەدی شاملو و بە شیعری فارسی وەری گێڕاوەتەوە دەڵێ: بە پێی باوەڕێکی مەسیحی عیسای باوك لە جەستەی عیسای کوڕدا لە خاچ درا و کوژرا و لە تاوتێکی بەردینەدا دانرا. ڕۆژی سێهەم زیندوو بۆوە. ڕۆحی لە زەوی خاکیدا بڵاوە دەکات و پاشان بە سەرکەوتنی هەرەمەزن و کیبریای مەزن بە نێسکەکان گیانی تازە دەبەخشێ و ڕۆحی یەکەمین دەخاتە جەستەکانەوە. ل ٢٩»

دەرکەوتنی ڕۆحی یەکەمین لە بەرد و بڵاوە کردنی گیانەکان لە زەوی خاکیدا دووپاتێکی دیکەیە لە،لە دایك بوونی میترا لە بەرد و سەدەف و گیانبەخشینی بە گیا و گیانەوەر.

زایینی میترا ڕۆژی یەکەمی زستان تا عرووجی مەلەکە تاوس لە سێزدەی بەهاردا دەبێ بە ١٠٣ ڕۆژ. زایینی عیسا لە ڕۆژی چواری زستاندا تا عرووجی ئەو (جەژنی پاك) لە ٢٢ی بەهاردا دەبێ بە ١٠٨ ڕۆژ. ئەو چوار پێنج ڕۆژە زیادیە لە سەرەتای زستاندایە کە پاش دروسبوونی ڕۆژژمێری گریگوری لە ڕۆمدا و جەلالی لە ئێراندا پێکهات.

---

جوانی ئافرەت هەر جوانی خوایە. لە مەم و زیندا باسمان کرد. شاعیری کاکەیی «نیعمەت» لە زەمانی باوە نائووسدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| چەنی چل کەنیز شێوەش دا بسیار | زاتوو ویت نە دۆش شیرین بی‌سوار |
| نا لەوح سینەش نمانای حاشار | نا عیشق بە سەرش نمانای دیار |

شیرین لەگەڵ چل کەنیز کە زۆر شێوەی جوانی دەنواند، تۆ زاتی خۆت لە شانی شیریندا سوار کرد. لە لەوحی سینەیدا خوت حەشاردا تا بە ئەوین لە سەریەوە خۆت نواند و دیارێتدا.

---

وتمان میهرپەرستی وەکوو رەوتێکی ڕۆشنبیری و سۆفیانە لە زەمانی ساسانیەکاندا لە ئێراندا هەبووە کە پاش ئیسلام عیرفان و سۆفیگەری لێ پەیدا بوو و بە هۆی پێکهاتنی ئەدەبی عیرفانی فارسی کە لە جیهاندا بێوێنەیە.

عەتتار شاعیری سەدەی شەش و هەفتی کۆچی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ساکن دیری و از کعبە نشان می‌پرسی | در خرابات مغانی و خدا می‌طلبی |

(دیوان عگار ل١٠٦)

واتە لـە دێـر دای و ئـادرەس و نیشـانەی کـەعبـە دەپرسـی؟ ـ لـە ستایشـتگای موغـەکانی (میهرپەرست)دای و لە شوێن خودا دەگەڕێی؟

خەرابات کە لە شیعرەکانی مەحوی و جزیری و مەولەوی و... هەیە کۆی خەرابەیە. خەر (خـوەر + ئابە)، ئابە بە مانای میچی گومەزی هاتووە و مەبەسـت دێـری میهرپەرسـتەکانـە بـەڵام بـە شاراوەیی و ئاماژە وەکوو «خەرابە»ی عەرەبی نووسراوە ماموستا رەزی دەنووسێت «وشەی ئابە لـە ئینگلیسیدا وەکوو abbey و لە فەرانسـەدا وەکـوو abbaye هـاتووە کـە بـە مانـای دێـر و کەلیسایە». چون زمانی نووسینی میهرپەرستی یۆنانی بووە رەنگە ئەم وشە لە یۆنانیەوە چـوەتـە نێو ئینگلیسی و فەرانسە.

لە سەردەمی سەفەویەکان بەم لاوە غوللاتی ناوچەی ماد بەتایبەت لـە کوردسـتاندا واتـە لـە ئیلام و کرماشان و لورستان و قورەوە و هەمەدان نەختە نەختە توانەوەو بوون بـە شـیعەی دوانـزە ئیمامی. هەر وەها شیعەکانی زەیدییە لە گێلان و مازندەراندا بوون بە شیعەی دوانزە ئیمامی.

---

جەنابی، کازم موحەمەد وایقانی، نووسەری «سوهرەوەردیدانای حکمەتی باستان» سەبارەت بـە شرۆڤەی فیکری سوهرەوەردی رەنجی زۆری کێشاوە و زانیـاری زۆری بـە دەسـت خسـتووە. جـەنـابی هاشمی رەزیش لە سەر سـوهرەوەردی زۆری نووسـیوە. ئـەم دوو بـەڕێزە یـەکـەمـی ویسـتوویە بـۆ فەلسەفەکەی سوهرەوەردی بنەمای ئیسلامی و قورئانی و دووهەمی ویستوویە بنەمای زەردەشـتی بۆ دابنێ بەڵام هەروا کە سەلێندرا بنەمای فەلسەفەکەی ئەو دینە کوردیـەکانـە کـە بناغـەیـان میهرپەرستی کۆنی ناوچەی ماد بەتایبەت کوردستانە.

مـاموستا وایقاتی دەنووسێ: «بیروڕاکانی ئیخوا نوسسەفـا (فـەیلـەسـووفەکـانی ئیسـماعیلی دوایینی کە غوللاتن)یش لە سوهرەوەردیدا کاریگەری بووە. ئەوەی کە لە ئەستێرەناسیدا لـەگـەڵ فەلسەفەی سوهرەوەردی پێوەندی قووڵی هەیە لە بەرهەمەکانی ناسرخەسرەو (لە حـەکیمـەکـانی ئیسماعیلی دوایین، کۆچی دوایی ٤٤٠ی کۆچـی)دا هـەیـە. ل١٠٧» وتـمـان ئیسـماعیلییەکـانی دواییێنی و ناسرخەسرە و لەغوللات بوون و ئەوانـیش بنەچـەکـەی میهردینییـان هـەیـە. ئـەوان ئەستێرەناسی خۆیان لە میهردینەکانەوە وەرگرتووە کە هەندێ ئەم ئەستێرە ناسیەمان بـاس کـرد. سوهرەوەردیش بناغەی فەلسەفەکەی لەسەر میهردینی ئەجدادی خۆی داناوە جا ناچار لێـکچـوون لە نێوان ئەستێرەناسی میهردینی و دینە کوردیەکان و غوللاتدا بەدی دەکرێ. دەتوانین بڵـێین کـە

فەلەکییاتی سوهرەوەردی بە هۆی هاو بناغەبوون لەگەڵ ئیسماعیلیەدا تەنیا لێكچوونیان لەگەڵ یەك هەیە نە ئەوی کە سوهرەوەردی لە ئیسماعیلیە گرتوویەتی. لە هەر دوودا شتی هاوبەش ئەوەیە کە جیرم و تێکەڵاوی لە خوارەوە بۆ سەرکەم دەبێتەوە. لە میهردینیشدا وایە. ئاسمانی هەفتەم کە هی پێگەی هەفتەمی میهردینیە مرۆڤ ئامادە بووە کە بچێتە ئاسمانی هەشتەم نزیکی جیهانی تیشك. پێگەی یەکەم ئاسمانی مانگە کە خاوەنی جرم و تێکەڵاوی لەگەڵ مادەیە و هەرچی بچێتە سەرتر نوور خاوێنتر دەبێت تا دەگاتە ئاسمانی نۆهەم کە خودی نوورولئەنواری تێدایە.

---

لە پەرتووکی فارسی سوهرەوەردی «ڕۆژێك لەگەڵ جەماعەتی سۆفیان» بۆ نۆ ئاسمان و نهۆمەکانی ژێر ئەوانە و پێگەی دوانزەهەم (پێگەی موتلەق ولامەکانی خودایی) یادداشتم هەڵگرتبوو. بەڕێز وایقانیش هێناویە: چون خودا ئاسمانەکانی ئافراند بۆ ڕازاندنەوەی ئەوانە تیشکێکی بۆ ئاسمانی یەکەم (لەسەرەوە بۆ خوار) هەنارد. ئاسمانی یەکەم لە بەر لەتیفبوونی ئەو تیشکە خۆی پێ ڕانەگیراچون ئەو ئاسمانە لە ناو بوون و نەبووندا بوو. لە سەرەوە هاوسێی بوون و لە خوارە وەهاوسێی نەبوون. جا لە نێوان بوون و نەبووندا شتێك هەیە کە بە نەبوون نزیکە لە ڕووی دیمەنەوە بەڵام لە ڕووی سفەتەوە لە هەر بوونێك بوونترە ...

... جا ئاسمانی یەکەمیش کە لەو جیهانەدا (لە بەرانبەر بوونی سەرەوەی خۆی) وەك نەبووە وایە. لە بەرانبەر ئەو نوورەدا کە پێ گەیی، خۆی بۆ نەگیرا و تیشکێك لێ جوێ بووەوە و گەیشتە چەرخی دووهەم (کە ئاسمانی ئەستێرە وەستاوەکانە) هەر پاژەیەکی بوو بە ئەستێرەیەك. زیادیەکەی گەیشتە فەلەکی سێهەم کە لەوە گەڕۆك ئەستێرەی زوحەل پەیدا بوو. زیادی تیشکی چەرخی سێهەمیش گەیشتە چەرخی چوارەم و موشتەری لێ پەیدا بوو. هەروەها لە زیادی تیشکی موشتەری لە چەرخی پێنجەمدا مریخ لە زیادەی مریخ لە چەرخی شەشەمدا خۆرو لە زیادەی خۆر لە چەرخی هەفتەمدا زوهرەو لە زیادەی زوهرە لە چەرخی هەشتەمدا عەتارود و لە زیادەی عەتارود لە چەرخی نۆهەمدا مانگ بەدی هات»

لە ژێر مانگیشدا دوو قاتی ئەسیرو زەمەهریر هەیە دەبن بە یانزە. جا لە سەرەوە چەرخی یەکەم کە لە خوارەوە دەبێ بە چەرخی نۆهەم و بە دوو قاتەوە دەبێ بە یانزەهەم جێگای نوورولئەنوارە کە گشت ئەستێرەکان و جیهانی بوون لەوەوە سەرچاوە دەگرێ و ئافرێنەری جیهانە. نوورولئەنوار بە پێی ئەم نووسراوەی سوهرەوەردی خۆی لە ویستی خودای موتلەق و بێمەکان بۆ ڕازاندنەوەی

چەرخەکان کە وەکوو نەبوون، بوون بە دیهات. بە باوەڕی من پێگەکان بە پێگەی خوداییەوە دەبن بە دوانزە کە ژمارەیەکی ئۆلی و ئوستوورەییە.

جیهانی بوون بووە بە سێ بە شەوە: جیهانی ئاوەز، یان مەلەکووتی گەورە ـ جیهانی نەفس (مەبەستی گیانە) یان مەلەکووتی چکۆلە و جیهانی جیسم و مادده یان موڵك ـ دوو جیهانی یەکەم لە چەشنی مادە نین.

«نەفس لە سەرمادە کاریگەری هەیە و لە ژێر ڕکێفیدایە. جیهانی سێهەم کە خۆی دوو بەشە جیهانی ئەسیر کە چەرخەکان و جیهانی توخماکانە (عونسورییات). جیهانی توخماکان لە لای چەرخەکانەوە بێبایەخن. چەرخەکان لە ژێر قەهری نەفسەکاندایە و نەفسەکان لە ژێر قەهری ئاوەزو ئاوەزەکان لە ژێر قەهری هۆکار کراوەی یەکەمیان عەقڵی گشتی و ئەویش لە ژێر قەهری تیشك و مەزنی خودای عیزوسسولتانە». مەبەست لە قەهر ئەوەیە کە سۆفیەکان وەکوو جەلالی حەق ناوی دەبەن. ئەو چوارە لە ئاینە کوردیەکاندا لە زەویدا ڕەنگدانەوەی هەیە. ئاگر نیشانەی عەقڵ ـ هەوا نیشانەی نەفس ئاو نیشانەی چەرخەکان و توخماکان نیشانەی خاکە کە چوار سدووری خودا واتە بنیامین و مووساو داود و مسەفا لە دوونی یەکەمیاندا نوێنەری ئەوانەن.

---

سوهرەوەردی لە فەلسەفەکەیدا دەڵێ «وجوود» شتێکی ئیعتباری و عەقڵیە. ئەوەی کە بناغەیە «ماهییەت»ە و گشت جیهان لەوە دروس کراوە. ماهییەت چوار جۆرە:

١ـ نووری «جەوهەر»ی ٢ـ نووری «عەرەز»ی. ٣ـ تاریکی جەوهەری ٤ـ تاریکی عەرەزی

نووری جەوهەری عەقڵگەل و نەفس (گیان)گەلە. ئەمانە لە سەرەوە بۆ خوار دابەش دەکرێن. سەرتر لە گشت نوورولئەنوارە. لەم نوورە تەنیا یەك نوور دەرکەوت کە وەکوو نووری نزیکتر یان نووری مەزن یا عەقڵی یەکەم پێکهات. لە نووری یەکەم ئاسمانەکان و عەقڵەکان و گیانەکان و تاریکیەکان پێکهاتن.

نووری عەرەزی ڕووناکیگەلێکە کە دەبینرێ و هەست دەکرێ وەکوو نووری خۆر و تیشکی ئەستێرەکان و...

تاریکی جەوهەری مادده و جیسمگەلی کێشدارە.

تاریکی عەرەزی «بەرزەخ»ە وەکوو تاریکی کە دەبینرێ و نهۆمی زەمهریرە.

ئیزدیگەل دەڵێن خودا فەرمانداری جیهانی مادە و قورسایی دا بە مەلەکە تاوس کە دەرکەوتنی یەکەمی خودایە. کاکەیش دەڵێن بە بنیامین درا کە ئەویش هەر سەمبولی مەلەکە تاوسە.

بنیامین کارگێڕی جیهانی ماده و قورسایی زەوی بە هەفتەوانە سپاردوە کە لە زەویدا بریکاری ئەون.

---

وتمان لەتێڕامانی «تەعەققول»ی خودا بە خۆی عەقڵی یەکەم واتە عەقڵی گشتی پێکهات. لە تێڕامانی عەقڵی کول بە خودا عەقڵی دووهەم پێکهات. لە تێهزرینی بە خۆینەفسی یەکەم و لە تێهزرینی بە نەبوونی ژێر خۆی جسمی یەکەم کە فەلەکی نۆهەمە پێکهات و هەر بەم شێوە عەقڵی دەهەم و نەفس و جسمی نۆهەم لە مانگدا پێکهاتن (عەقڵی پێشین خودایە کە جێگا و مەکان و نەفس و جیسمی نیە. بە نۆ عەقڵەکەیترەو دەبێ بە دە. دە عەقڵ و نۆ نەفس). عەقڵی دەهەم کە پاش ئیسلام لە ناو سۆفیەکاندا وەکوو جبرەئیل و ڕوحولقودس و... ناسراوە سەرپەرشتی عەقڵەکان و گیانەکان و جەستە و جیسمەکانی سەر زەوی دەکات. لە کاکەییدا جبرەئیلیەکێ لە دوونەکانی بنیامینە کە لە خۆردایە وتمان نووری مانگیش هەر نووری خۆرە واتە ڕۆحولقودس یان جبرەئیل یەکێ کە هەیئەتەکانی بنیامین واتە مەلەکە تاوسە لە مانگدا. بزانین سوهرەوەردی سەبارەت بە عەقڵی دەهەم چێ دەڵێت. یەکێ لە پەرتووکە سەمبولیکەکانی سوهرەوەردی بە فارسی «ئاوازی پەڕی جبرەئیل»ە چیرۆکێکی هەرە جوانە. ئەگەر بمەوێت بە تەواوی بیگێڕمەوە زۆرتر لە ئاوەزی سوور شرۆڤە هەڵدەگرێت.

سەبارەت بە ئاوەزی دەهەم دەڵێت: جبرەئیل دوو پەڕ (باڵ)ی هەیە. یەکێ ڕاست. ئەوە نووری ڕەسەن و بە تەواوی تیشك و موجەڕڕەدە و تیشکی حەقە. یەکێ چەپ هەندێ نیشانی تاریکی تێدایە وەکوو لەکەیەك لە ڕووی مانگدا کە وەکوو پێی تاوسە و نیشانی بوونی ئەوە کە ڕووی لە لای نەبوونە (سوهرەوەردی ئیستیلاحاتی فەلسەفی دژوار بۆ شرۆڤەی بەکار دێنی کە ناینووسین) لە و نەختە نووسراوەدا تێکەڵاوی تیشك و تاریکی لە جبرەئیلدا کە دەرکەوتنێکی دیکەی مەلەکە تاوس یان بنیامینە پیشان دراوە.

عەقڵی دەهەم لە مانگدا تیشکی (تیشکی جەوهەری نەك عەرزی) لە خۆر دەگرێت واتە عەقڵی دەهەم هەر ڕەنگدانەوەی تەعەققولی مەلەکەتاوسە لە خۆردا. عەقڵ و هزری مرۆڤ و ڕاهێنان و بارهێنانی بە دەس عەقڵی دەهەمە کە بەم بۆنەوە ئاوەزی تێکۆشەر ناونراوە. ناویتری «سیمورغ»ە کە لە ئاوەزی سووردا باسمان کرد. جا ئەوەی کە وەکوو وەلی یان سیمورغ لە زەوی لە جەستەی مرۆڤدا دەردەکەوێ هەر عەقڵی دەهەم یان دەرکەوتنیتری مەلەکە تاوسە. ئەوەیە کە لە ئاینی ئێزدیدا دەڵێن زاتی شێخ عەدێ لەگەڵ زاتی تاوسێ مەلەك یەکە. ئەگەر خوێنەری بەڕێز لە

بیری مابیێ لە ئاوەزی سووردا وتمان کە وەکوو ئاسک (نیشانەی مانگ) دەرکەوت لە شەودا و نەیهێشت زاڵ بمرێ و شیری پێدا. ئاسک لەوێدا هەیئەتێکی سیمورغ بوو کە پاشان وەك سیمورغ (پەلەوەر) کە لە ڕۆژدا لە زاڵ پارێزگاری کرد.

ئەگەر خوێنەری بەڕێز لە بیری مابیێ وتمان لە کاکەیی‌دا بیست و هەشت ڕەگەز نوور و بیست و هەشت ڕەگەز تاریکی لەگەڵ زات بەشەر (سەهاك ـ خوەشین ـ عەلی) لە ناوەراستیاندا دەبن بە ۲۹ کە ژمارەی ڕۆژ و شەوەکانی مانگە. جا ئەو زات بەشەرە لێرەدا هەر زاتی مەلەکە تاوسە کە ڕەنگدانەوەی وەکوو عەقڵی دەهەم لە مانگدایە. بە گوێرەی میهرپەرستی یەکەم تەجەللای خودا وە کوو مرۆڤ لە زەویدا وەکوو میترا بووە کە سەلماندمان لەگەڵ خاوەندگار و مەلەکەتاوس ڕێکدێتەوە. هەروا کە سەلماندمان میترا کە گا قوربانی دەکات لە بناغەدا خۆی قوربانی دەکات جا زاتی مەلە کە تاوس لەگەڵ عەقڵی دەهەم و لەگەڵ بنیامین یەك شتە واتە یەکەم تەجەللای خودا وەکوو عەقڵی کول تا عەقڵی دەهەم لە مانگدا هەر دەرکەوتنگەلی خودایە لە هەیئەتگەلی جۆراوجۆردا. هاشمی ڕەزی لە لاپەرە ۲۵۱ی ئاینی میهر، میترائیسمدا دەنووسێ «ئایا میترا و گا یە کێکن؟» ئەم پرسیارەی بێ جواب هێشتۆتەوە. جوابی ئەم پرسیارە تەنیا بە توێژین لە ئاینە کوردیەکاندا دەدرێتەوە کە روون کرایەوە.

لێکچوونێکی دیکەی میهرپەرستی لەگەڵ کاکەیی‌دا قوربانی‌کردنی کەڵەشێر (کەلەباب) بە جێگای گایە. ئەمە لە شرۆڤەی وێنەکاندا تیشکی دەخرێتەسەر و زۆر گرینگە.

---

دەزانین کورونووس ناوی یۆنانی ئەستێرەی زوحەلە و بە مانای زەمانیشە. ئەمە هەڵکەوتە. مانای کرونووس واتە زەمان بووەتە هۆی ئەوەکە پەیکەرە ترسناکەکانی پەرستگەی میهرپەرستی کە پەیکەری میترایە لە حالەتی قەهردا، واتە پەیکەری مەلەکەتاوسە، بە پەیکەری کوورونووس واتە خودای زەمان بزانن و وەکوو زروان بیدەنە قەلەم. سەر لێ‌شیواوی ئەو نووسەرگەلمانە دەرخست. ماموستا ڕەزی کە هەر بیروڕای ئەوانی قبوولە دەڵێ «کوورونووس خودای زەمان وەکوو پەیکەرگە لێکی‌ترسناك نیشان دراوە بەلام لە جێگە و پێگەی ئەو لە ئاینی میترایی‌دا شتێك نازانین. ل۲۱ ئاین میهر میترائیسم» ئەم نەزانینە و ئەو هەڵە گەورە هی بایەخ نەدان بە فەرهەنگ (سەقافە)ی کوردە.

لێکچوونی دیکەی میهردینی لەگەڵ کاکەیی وشەی «یار»ە ئەوان بە ئاینی خۆیان ئاینی «یاری» دەڵێن هاشمی ڕەزی توێژینەری میتراپەرستی دەنووسێ «میهردینەکان بە یەکتر یان «یار»

دەگوت کە پەهلەویەکەی «ئەیار»ە. ئەیار پاشان بە پیتی عەرەبی وەکوو عەیار نووسراوە و عەیارەکان لە مێژوی ئێراندا هەندێ پاش ئیسلام بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە. ل ۲۳۱ سەرچاوەی ناوبراو» «یاری غاریش هەر بۆ میهرپەرستی دەگەڕێتەوە ل ۲۳۵».

---

وتمان لە زەمانی دەرکەوتن (تەجەللا)ی خودا و سەردەمی ئافراندندا زەریایەك تاریك هەبوو و لە ئەدەبی کاکەیی بەتایبەت لە بەشی «دەورەی چلتەن»دا وەکوو دیجلەی دەیجوور... ناوبراوە. لە نەخش و پەیکەرەکانی میترایی‌دا ئاو دەبینین کە گوڵی لیلەوپەڕ (نیلووفەر)ی تێدایە یان ماسی یان دولفین دەبینین کە ئەمانەش سەمبولی دەریان. لە وێنەکاندا پیشان دەدرێت. چون مامۆستا رەزی لەسەر دینە کوردیەکان توێژینی نیە زۆر بە سەر سوورمانەو ئەو زەریاگەلەوەکوو زەریاچەی «کەسەئۆیە» دەناسێنی. تا بەم جۆرە بی‌چەسپێنی بەزەردەشتیەوە. دەزانین کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی نیازی بە مەوعوود و ڕزگارکەرە کە دێت و دین ڕزگار دەکات و دادگەری دادەمەزرێنێت.

لە ئەویستای دوایین‌دا کە چەندان سەدە پاش زەردەشت نووسراوە هاتووە کە زەردەشت دەچێتە زەریاچەی «کەسەئویە» خۆی بشوات. نوتفەی دەڕێژێتە ناو ئاوەکە. فریشتەکان بۆ پاراستنی ئەو نوتفەدێن. هەتا لە زەمانگەلی‌تردا کچێك دەچێتە ناو ئاوەکە و لەو نوتفە ئاوس دەبێت و یەکەمین نەجات دەری زەردەشتی بە ناوی «هوورشیدەر» (بەدابێژی ئێستا) دێتە دونیا. لە زەمانگەلی‌تردا کچێکی‌تر هەر لەو زەریالە ئاوس دەبێت و دووهەمین رزگارکەری زەردەشتی لێ دەزێت. لە ئاخری دونیاشەوە سێهەمین کچ لەو زەریالە بار هەڵدەگرێ و ئاخرین ڕزگارکەری زەردەشتی دێتە دونیاوە. دیارە ئەمە لە حەزرەتی زەردەشت تاکپەرستیراستەقینە بە دوورە و زەمانێ ئەمە خراوەتە نێو ئە وێستاوە کە نیازی سیستەمی دەرەبەگایەتی بووە. ئەو زەریای نەخشگەلی میتراییە، پێوەندی بە زەریای سەرەتای ئافراندنە کە خاوەندگار وەکوو دوڕێك لە سەدەفێك لەو زەریاوە دەردەکەوێ. دەبێ بزانین خاوەندگار و زەریا و سەدەف و دۆر لە تاکپەرستی کاکەیی‌دا هەر یەك شتە کە باسی زۆر هەڵدەگرێ.

---

وتمان کە لە پەیکەرگەلی میترایی کە لە ئینگلیس و ئاڵمان و نەمسا دوزراوەتەوە میترا لە سەدەف دەردەکەوێ. سەدەفیش لە زەریادایە. بۆ چەندەمین جار دوو پاتی کەینەوە کە بی‌توێژینی دینە کوردیەکان روون کردنەوەی نەخشە میترایی‌ەکان ناتەواو و هەڵەیە. زایینی میترا لە سەدەف لە شوینەواری ئاڵماندا پیشان دەدرێت. (وێنەگەلی ژمارە ۱۹، ۳۱و ۳۲)

ئەو بەرێزە ماسیش کە نیشانەی ئاوە وەکوو ماسی «کەرە»ی ئەوێستا دەداتـە قـەڵـەم. دەپرسـین نیشانەیەك کە پیشان دەری کاتی تەجەللای زاتی خودایە، چ پێوەندیەکی لەگەڵ ماسیکەرەی ئـە وێستا هەیە کە ئەهوورامەزدا دە ماسی لەوەی ئافراندووە تا لـەگـەڵ نەهـەنگی دەس کـردی ئـە هریمەندا شەڕ بکات و نەهێڵی بەداری «گەئۆکەرێنە» زیان بگەیەنی. لە زەڕدەشـتیدا تـەجـەللای خودا وەکوو میترا لە هەیئەتی مرۆڤدا کوفرە. تێکەڵاوی و یەکبوونی بناغەی خەیر و شەڕ کـوفرە. لە میهرپەرستیدا شەڕی ئافرێندراوەکانی خودا لەگـەڵ ئافرێنـدراوەکانیشـەیتان بـیمانایـە. لـە زەردەشتیدا دوونادوون کوفرە. بناغەکان کە ئاوا دژ بـە یـەکـن بۆچـی تێـدەکۆشـن دیـاردەکـانی میهردینی نا زانستیانە و بیتوێژین بەزەڕدەشتی بزانن؟ ئـەم بـەرێزە، کەڵـەشـێر کـەلـە نەخشـە میتراییەکاندا هەیە بە نیشانەی ئێزدی «سرۆش» کە ئێزدی پەیام هێنەرە لـەزەڕدەشـتیدا دەداتـە قەڵەم.

**دیاردەی قوربانی کەڵەشێر لە ئاینی کاکەییدا:** لە نەخشە میتراییەکاندا کە میترا گا قوربـانی دەکات، چەند شت هەیە ١ـ خودی میترا بە خەنجەرێکەوە ٢ـ لای شـانی ڕاسـتی خۆرەکـە وەکـوو مرۆڤێك کە تیشك لە دەوری سەریدایە پیشاندراوە. لای شانی چەپی مـانگەکە وەکوو مرۆڤێکە کە داسی مـانگ لە ژێر چناکەیەوە بۆ دوو لای سەری کێشراوە. ٣ـ گا، کە قوربانی دەکرێ ٤ـ سـەگ کە پاش قوربانی لە خوێنی گا کە دەخوات ٥ـ مار ئەویش وەکوو سـەگ لـە خـوێنی قوربـانی دە خوات. ٦ـ دوو پشك کە هێرش دەکاتە سەرگونی گا کە ودەیـەوی پێـوەدا و بیخەسـێنی. ٧ـ لای ڕاستی میترا لاوێکە شەمـاڵەیەکی بەرز کردۆتەوە بە نیشانەی ڕۆژ و ڕۆژهەڵات.

٨ ـ لای چەپی لاوێکیترە کە شەمـاڵەکەی ڕوو بە خوار گرتووە و نیشانەی ڕۆژاوا بوونە.

٩ـ گژ و گیا کە لە خوێنی گاکە سەوز بووە.

جگە لەمانە کە لە گشت نەقشەکاندا هەیە. ١٠ـ قالاو، کە پەیامبەر و پەیامهێنەری میترایـە. ١١ـ شێر کە نیشانەی خۆرە لە ژێر خۆر لای شانیڕاستی میترا دانراوە. ١٢ـ گـا، یـان تاسـك کـە نیشانەی مـانگە لە ژێر مـانگدا لای شانی چەپی میترا هەڵکەندراوە. هەندێ جار بە جێگای گا لە ژێر نەخشی مـانگدا کەڵەشێر کە ئەویش نیشـانەی مـانگە دانراوە وەکوو ئەو نەخشی ژمارە ٢٦ هە ندێ جاریش بە جێگای شێر کە نیشانەی خۆرە هەڵۆ کێشراوە کە ئـەویـش وەکـوو شـێر نیشـانەی خۆرە.

جا له سەر ئەم بناغەیە کە لە ئاینی کاکەیی‌دا کە هەم گا (کەڵە زەردە) و هەم کەڵەشێر قوربانی دەکرێت کە هەر دوو لە میهردینی‌دا نیشانەی هەئومەیان هەیڤە کە باسمان کرد. جا زۆر روون دیارە کە لەو نەخشەدا کەڵەشێر نیشانەی مانگە وەکوو بەرانبەرەکەی شێر و هەڵۆ کە نیشانەی خۆرە. ئیتر چۆن دەبێ وەکوو سرۆشی زەردەشتی بزانرێ؟ لە ئەوێستای دوایی‌دا کەڵەشێر یارمەتی ئێزدی سرۆش دەدات و بە خوێندنی لە بەرەبەیاندا دێوو دیارەگەلی ئەهریمەن دەتارێنێ. ئیتر کەڵەشێریان سرۆش لە زەردەشتیدا نیشانەی مانگ نیە. کەڵەشێری ئەوێستا «پەرو دەرش» سبەینان دەخوێنی و دێوودورنج دەتارێنێ و بەو نەخشگەلە هیچ پێوەندی نیە.

ماموستا رەزی دەڵێ تا نەوەد لە سەدی ئاینی مەسیحی لاسایی کردنەوە لە ئاینی میترایيە «لە نەریتی شێوی پیرۆز یان عیشای رەببانی کە «ئووکاریست»ی پێ دەڵێن لەوەدا حەزرەتی عیسا (د- خ) لەگەڵ حەواریيەکانیدا شێو دەخوات و بۆ ئاسمان سەردەکەوێت. ماموستا دەڵێ لاسایی کردنەوەیەکی تەواو لە میترایيە. ئەو قسەکانی عیسای لە شێوی ئاخردا لە یەکێ لە ئینجیلەکان دەرهێناوە: «من (عیسا) نانی ژیانم. باوك و باوانی ئێوە منیان خوارد.... تا هەر کەس لەوە بخوات زیندوو بمێنێ. منم ئەو نانەی زیندوو لە ئاسمان هاتۆتە خوارەوە ... نانێ کە من دەیدەم بە ئێوە جەستەی منە کە بۆ ژیانی دونیا دەیدەم بە ئێوە.... پاشان جووەکان دژایەتیان کرد و وتیان چۆن مرۆڤ دەتوانێ جەستەی خۆی بدا بە ئێمە تا بیخۆین؟ عیسا وتی ئامین، ئامین، ئەگەر جەستەی کوڕی مرۆڤ، نەخۆن و خوێنەکەی نەخۆنەوە ژیانتان نابێ و هەر کەس جەستەی منی خوارد و خوێنی خواردەوە ژیانی هەتا هەتایی هەیە و من لە رۆژی پەسڵاندا هەڵی دەستێنم چون جەستەی من خواردنی و خوێنی من خواردنەوەی راستەقینەیە ۳۱۲ میترائیسم». ئەوە کە ماموستا لە ئینجیل دەری هێناوە بەیانێکی‌ترە لە تەوحیدی میترا و گا واتە تاك‌پەرستی میترایی کە بناغەی تاك‌پەرستی دینە کوردیەکانە.

لە سەردەمی ئەشکانیەکاندا سەدەی سێ و دووی پێش زایین میهرپەرستی دزەی کردە ئەرمەنستان. دیارە کوردە میهرپەرستەکانی کوردستانی باکوور هەروا کە بردیان بۆ رۆم و ئەورووپا بردیانە ئەرمەنستانیش «سیرار پیدەر نرسیسیان» نووسیویە «ئەرمەنیەکان میترایان بە ناوی «میهر» دەپەرست تا لە ۲۸۷ی زایینی مەسیحی لە ئەرمەنستاندا سەرکەوت». سەرکەوتنی مەسیحی لە ئەورووپا و ئەرمەنستاندا پێوەندی بە نیازی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی بە دینێکە کە پێوەندیگەلی ئەو کۆمەڵگەلە لە چوار چێوەی باوەڕمەندیەکانی جێگرکات. کە دەرە بەگایەتی

دروست بوو میترائیسم کز بوو. هۆی لاوازبوونی عەلەویەکانی زێدەڕۆ و بە حکوومەت نەگەیشتنیان هەر ئەمە بووە کە باسمان کرد. دینە کوردیەکانیتریش جگە لە کاکەیی کە نەختێ لە زەمانی «قەرە قوویونلوو»ەکاندا بە دەسەلات گەیشتن ئیتر وەکوو دەسەلات و حکوومەت لە مێژووا ناویان نیە. ئاینی میترایی و دینە کوردیەکان بە سفرەی یاری و یەکسانی باوەڕیان بوو کە دژ بە دەرەبەگایەتیە.

---

لەسەر ناوی «شێخ عەدیٚ» هەندێ ناکۆکی هەیە. عەرەبەکان وەکوو «عەودەی» ناوی دەبەن» کەسانێ وەکوو عادی و عادێ و هادی دەیزانن. سۆرانی زمان عەدێ دەڵێن بەڵام ئێزدیەکان وەکوو ئادی و ئادێ ناوی دەبەن. لە ئەوێستا، دایکی زمانی کوردیدا بۆی گەڕام. لەوەدا وشەی «ئادا» هەیە بە مانای زانست و ناوەزە. دەزانین لە کرمانجیدا ئادا وەکوو «ئادێ» دابێژ دەکرێ وەکوو خودا کە خودێ دابێژ دەکرێ. وشەی ئادا لە یەسنا ٦٨ و ٢١ ویسپەرد ٤ و ١ لە دۆخی بەرکاردا وەکوو ئادەنم هاتووە. هەروەها لە ئەوێستادا «دی» بە مانای دیتنە. بە پێشگری «ئا» وە «ئادی» بە مانای قووڵ تێ ڕوانین و وردبینی دە جار لە دۆخگەلی جۆراوجۆردا بە کاربراوە (فرهنگ واژەهای اوستا. احسان بهرامی)

---

مامۆستا هاشم ڕەزی وەکوو گشت میهرپەرستناسان دەڵێ «میهرا بە (واتە پەرستگای میهرپەرستی) نیشانەی خۆرە ل ١٨٢ ئاین میهر میترائیسم» دەزانین میهرابە بە تەواوی تاریکە. ئەمە نیشانەیەکیتری یەك بوونی لایەنی تیشك و لایەنی تاریکی واتە میترایان مەلەکەتاوسی دینە کوردیەکانە ئەو مامۆستا هەروەها وەکوو گشت میهرپەرستی ناسان دەڵێ: (پاش جێگیربوونی ئاینی مەسیحی بە جێگای میهرپەرستی لە ئەورووپا) «ئاینی میترایی لە ئاینی مەسیحیدا زیندووما. ئاینی مەسیحی جگە لە درێژەی ئاینی میترایی شتێکیتر نیە. سەرچاوەی پێشوو. ل ٨» ئەو لێك چوونانە کە لە نێوان دینە کوردیەکان و ئاینی مەسیحیدا هەیە لێرەوە سەرچاوە دەگرێ نەك ئەوەی کە دینە کوردیەکان لاسایی ئاینی مەسیحیان کردۆتەوە. ماموستا ڕەزی نووسیویە:

«تایبەتمەندی ئاینی میهری لە دایك بوونیە لە کچی شوو نەکردوو (لە زەمانگەلی جیاجیادا) ل ١٦٨» بە وردی وەکوو لە دایكبوونی شاخوەشین و سان سەهاك و... لە ئاینی کاکەییدا کە باسمان کرد.

مامۆستا ڕەزی دەنووسێ: «لە یەکێ لە پەیکەرەکانی میهرابەکانی ئەورووپادا گای قوربانی پێش کوشتنی بە دەس میترا لە گەمیەکدایە. ل١٨٢ سەرچاوەی نابراو». ئەمە پیشان دەدات گا پێش ئافراندن تێکەڵاو لەگەڵ میترا هەبووە و لە جێگایەکدا وتمان میترا کە گا قوربانی دەکات لە بناغەدا خۆی قوربانی دەکات. گەمیش نیشانەی زەریای پێش ئافراندنە کە لە کاکەییدا وەکوو دیجلەی دەیجوور و.. باسمان کرد. لە هەندێ نەخش و پەیکەریتردا ماسی و دولفین هەیە. ئەمەش هەر ئەو نیشانەیە. ماموستا ڕەزی و میهرناسە ئەورووپاییەکان بەو ڕاستیگەلە نەگەیشتوون.

هەروەها ماموستا ڕەزی دەنووسێت: «کومودیانووس شاعیری مسیحی و دەمارگر لە سەدەی سێ زایینیدا دەنووسێ میترا کە لە بەرد زاوراوە دیارە بەرد پێش لە دایکبوونی میترا هەبووە و ئیتر ناتوانین بە میترا بڵێین خودا. ل ١٨٩ سەرچاوەی پێشوو» نە ماموستا ڕەزی و نە میهرپەرستناسانی ئەورووپایی بەم ڕخنە وەرامیان نەداوەتەوە. وەرامی ئەمە لە دینە کوردیەکاندایە و ئەویش تەوحیدێکی هەرە جوانە کە لە زەریا و دوڕ و سەدەف لە ئاینی کاکەییدا هەیە. هەر کەس لەو تەوحیدە ئاگادار نەبێ بە ڕازی بەرد و میترا ناتوانێ پەی بەرێ تەنانەت بە تەوحیدی گا و میتراش.

لە زۆرینەی پەیکەرەکانی میترا، میترا کڵاوێکی لە سەردایە بە وردی وەکوو کڵاوی دەروێشەکانی خۆمانە کە پرچیان تێدا جێگیر دەکەن. کڵاوێکی درێژە کە نووکەکەی بۆ پێش یان پاش لارەوە بووە. و لە وێنەکاندا دەی بینین لە پەیکەرێکی مووزەخانەی سلێمانیشدا هەیە. سوختەکانی میترایی لە پێگەی چوارەم بەو لاوە لە سەریان دەنا.

شوبهاندنی حەزرەتی عەلی بە «شێری خودا» ڕەنگە سەرچاوەی میهردینی هەبێت. وتمان شێر نیشانەی میترا و خۆرە. لقەکانی سۆفیگەری خۆمان دەڵێن یەکەم دەروێش حەزرەتی عەلیە (د خ).

---

میترا لە بەردیان سەدەف دەزێ. بەرد نیشانەی ئاسمانە. ئاس لە ئەوێستا و کوردیدا بە مانای بەردە و لە وشەی ئاش، ئاساو، ئاسیاو (ئاسی ئاو، واتە بەردێ کە ئاو دەیگێڕێ) یان لە وشەی ئاسۆدا هەیە. ئاسمان لە ئەوێستادا «ئەسمەنە» (ئەس + مەنە) واتە ئەوەی کە تایبەتمەندی بەردی هەیە. لە مێژدا خەڵك سەرنجی بەردی ئاسمانی واتە شەهابیان دابوو و لایان وابوو ئاسمان لە بەرد درووس کراوە. وشەی «مەنە» لە کوردیدا وەکوو «مەنی» ماوەتەوە وەکوو: خواردەمەنی تەقەمەنی و شیرەمەنی و...

لە نێو پەرستگەتاریکەکانی میهرپەرستیدا جۆگەلەی ئاو لە بەرد هەڵکەندراوە. ئەمەش ئاماژە بە زەریای تاریکی پێش ئافراندنە.

لە هەندێ نەقشدا میترا بە تیرو کەوان لە بەرد ئاو دەردێنی. مامۆستا رەزی بە جوانی دەنووسێ: «کانییێ کە میترا دروستی دەکات کانی عیرفان و خوداناسیە و ئاوی خودایی تێدایە. لە پەرستگە ی «سنت پریسك» بەردنووسراوەیەك هەیە کە تێدا نووسراوە: کانیەك کە لەم بەردەهەڵدە قوڵێ پڕە لە خواردنەوەی خودایی کە

ژیان و ژیانی هەتا هەتایی بەدی دێنێ ... ل ٢١٠ سەرچاوەی پێشوو» دیارە لە زەمانی تە جەللای سان سەهاکدا پیرۆز بوونی کانیەکانی تەشار و قەسلان و ... دووپات بۆتەوە.

سەبارەت بە یەك بوونی گاو میترا لە ئاینی کاکەیی‌دا هاتووە: پاش دەرکەوتنی حەق لە سەدەف و بەخشینی دوو جیهان بە پیر بنیامین و ئافراندنی هەندێکی‌تر، لە سەدەف و سیفاتی خۆی گایەك قوربانی دەکرێ:

همان دم یکی گاو زان بارگاه زغیب آمد و گشت قربان شاه

شد آن گاو ایجاد از جام یار که آن یار بودی همان یادگار

«شاهنامەی حەقیقەت،جەیحوون ئابادی»

واتە لەو کاتەدا گایەك لەو بارگا لە غەیب هات و کرا بە قوربانی خودا، ئەو گا لە جەستەی یار کە هەر پیر یادگار بوو دروست بوو. دیارە دوو هەفتی لایەنی نوور و دوو هەفتی لایەنی تاریکی هەر تەجەللاکانی جۆر بە جۆری خودایە لەو جەستەگەلەدا.

---

لە هەندێ پەرستگەی میهریدا، میترا لە نێو گوڵی نیلووفەرەوە (لیلەوپەڕ) دێتە دەرێ مامۆستا رەزی لە کتێبەکەی‌دا لە پەرستگەی فەرانسە و دیبورگی ئاڵمان دوو وێنەی هێناوە.

پاش ئیسلام میهر بە مانای خۆریش هاتووە. سەبارەت بە پێوەندی میهر و نیلووفەر لە ئەدە بیکوردیدا بەیتەکەی خانیمان پێشکەش کرد. ئەمەش بەیتی وەفایی مەهابادی کە شاعیر و نووسەری دەرباری شیخ عوبەیدوڵڵای شەمزینی بووە:

شاعیری سۆفی کورد، وەفایی مەهاباتی، کۆچی‌دوایی ١٨٩٩ وەك خانی بە پێوەندی میهر و گوڵی نیلووفەڕ (لیلەوپەڕ) و هەندێ ئاماژەی‌تر کە بناغەی لە فەرهەنگی گەلەکەیدایە لە شیعرەکانیدا دەهێنێ.

ئاوو تابی ڕووتە مایەی سۆزش و گریانی دڵ.

گا غەریق و گا حەریقی میهری رووت وەك نیلوفەڕ.

غەریق و ئاوی چاو ئاماژە بە ئاوە کە نیلووفەڕی تێدا سەوز دەبێت. میهر لێرەدا بە مانای خۆرە. یان:

شەعشەعەی خورشید نیهان بوو لاڵ و کەڕ بوو نیلوفەڕ

مات و خامۆش ما وەفایی وەك سەحەرگاهان چراغ.

بەڵا بەو «رۆژ» نیلووفەڕ بسووتێ بە مەرگی من سەری زولفت وەلابە

وەفایی رووی یار بە ڕۆژ «خۆر» و خۆی بە نیلووفەڕ شوبهاندووە.

---

مەلەکە تاوس واتە لایەنی قەهر و تاریکی خودا لە ئەدەبی عیرفان و سۆفیگەری پاش ئیسلامدا بە جەلالی حەق ناسراوەو ئاماژەکانی زولف و خەت و خاڵی یارە کە هەر سێ رەشە (خەت مووی ناسکی لا جانگ و سەرووی لێوە) وەفایی:

حەلقەیی زوننا‌ری زولفی بوو بە میحرابی دوعام .... یان:

لە سەر تاق برۆی جانانە، شەیدای زولفی پەرێشانە

سەودا سەر ئەم دڵ دیوانە، قیبلەی بەردا زوننا‌ری گرت. (زوننار پشتوێنی رەشی مەسیحیەکانە کە ئەویش نیشانەی مەلەکەتاوس یان جەلال و قەهری خودایە) ـ یان:

ئیشارەی چاو و عیشوەی زولفەکەت بوون «مورشید»ی رێگام

ئەگەر «دەیری موغان» قیبلەم ئەگەر «زوننار» بەرماڵم.

دەیری موغان هەر ئەشکەوتی میهرپەرستەکانە کە باسمان کرد. زولف قەهر و جەلالی حەق (مەلەکە تاوس)ە

یان: ئێستاکە لە سایەی سەری زوڵف و نەزەری تۆ

گەردن کەچی زوونارم و مەیخانە نشینم.

وتمان مەی لە ئەدەبی عیرفانیدا بناغەکەی نۆشابەی مانگ (هەئومە = هەیڤ)ە لە پەرستگەی میهریدا. وەفایی قەسیدەیەکی بۆ مردنی شیخ عوبەیدوڵڵای شەمزینی هەیە لەوەدا دەڵێ:

شکا پشت و دڵی من بۆ وەفاتی پیری مە بە چەرخێکی فەلەکوای کرد ئەجامم مانە

پیری مەیخانە مورشیدی کامیل و سیمورغ و.... لە عیرفانی میترایی پێش ئیسلامدا. جام و مینا واتە پەرداخ و شووشەی مەی.

هەر لەو چامەدا لە خودا دەپاڕێتەوە:

بەسەر مەستانی بادەی ساغەری عەهدی ئەلستتکەی

بە قەترێکی نەجاتم دەی لە دەس خۆم روو لە دەریاکەم

عەهدی ئەلەست ئاماژەیە بە ئایەتی «ألست بربکم....». وتمان لە شەوی نەورۆز واتە لە کاتی عرووجی میترادا میترا کە تەجەللای خودایە و گا قوربانی کرابوو میترا لە یارانی خۆی بەڵێن دە ستینی. لە ئەدەبی کاکەییشدا·«بەیا بەست» هەیە کە لە ژێر ساجنار خاوەندگار بەڵێن لە دوو هەفت و چلتەن و... دەستێنی. بە باوەڕی من هێنانی ئەو ئایەتە لە لایەن سۆفیە مسڵمانەکانەوە وەکوو ئاماژەکانیتر بناغەی پێش ئیسلامی هەیە. سەبارەت بە جام و مەی بە چڕ و پڕی باس کراوە. یان:

دیسان لە سەر عەهدی ئەلەست جامێك لە جانان بگرە دەست

هەر تا ئەبەد مەخموور و مەست ئاوایە ڕێگەی عاشقان

یان سەبارەت بە جەلالی حەق:

ئەرێ ئەی زوڵفەکەت سەر تا قەدەم هەر حەلقە و بەندە

چ داوێکە کە هەر داوێکی بەندی سەد خیرەدمەندە...

بەختتێکی شکستەی زوڵفی ڕێحانی لەسەر عاریز

لە مەعنای ئاتەش ئەم تۆمارە شەرحی زەند و پا زەندە.

زەند شرۆڤەی ئەویستایە بە پەهلەوی و پازەند شرۆڤەی زەندە. زەند و پازەند لەو شیعرەدا شرۆڤە ی کەلامی خودایە کە خەتی شکستەی زوڵفیش هەر شرۆڤەی کەلامی خودایە لە بەیتی یەکەمدا زوڵف (جەلال و قەهری حەق) خیرەدمەند واتە ئاوەزمەند دەخاتە داوە. مرۆڤی ساکار و گێژ ناکە وێتە ئەو داوە.

ئەلا ئەی ساقیی مەستان بە حەققی پیری مەیخانە

بە گەردش بێنە جامی مەی بە یادی چاوی جانانە

مەیگێڕ و پیری مەیخانە زاراوەگەلی میهرپەرستی کۆنن

عالەم هەموو ڕەنگینەلە بەر عەکسی      هەر ڕەنگە بە ڕەنگێکی هەزار ڕەنگ

جیلوەو تەجەللای خودا هەزاران ڕەنگ و وێنەی هەیە: مەولام ڕەنگ بازەن....

---

وەفایی لە غەزەلێككە لە پەسنی پێغەمبەر (د- خ) داهۆنیویەتەوە دەڵێ

زولّفت لە دوو لا شاد و گو شادن بە جەماڵت

کوا ئەهلی شیمالی هەموو ئەسحابی یەمینە

لە پێش ئیسلام لە ناو هۆزە ئێرانیەکاندا شیمال واتە باکوور جێگای دێو و درۆج «درونج»ە. وە فایی دەڵێ زولّفت لەسەر جوانی رووت پێکەوە سازاون ئیتر بوونەوەری باکووریش هەر ئەسحابی یە مین و دۆستن. تێکەڵاوی جەلال و جەماڵ پیشان دەدا کە بناغەکەی تێکەڵاوی تیشك و تاریکی میترایی و دینە کوردیەکانە. یان:

زولّفت ئەفشان کرد و پەنهان بووی و دونیات کردە تەم

خۆت وە دەر نا عالەمت سووتاند و ئاورت کردەوە.

تێکەڵاوی جەماڵ و جەلال نیشان دەدات. لە جەلالدا کە کەزیە و تاریکیە، خۆت شاردەوە و جیهان پڕ بوو لە تۆم و تاریکی بەڵام کە جەماڵی رووت دەرکەوت (کەزیەت لەسەر روو لاچوو) جیهان لە ئەوینت سووتاو پڕبوو لە نوور

شێخم بە هەوای زولّفی دڵ و دینی بە بادا ـ وەجهی چیە بەو کوفرە کە ئیمان دەفرۆشی؟

واتە شێخی سەنعان بە هەوای زولّفی دڵ و دینی بە بادا، ئەوە چۆنە بەو کوفرە (زولّف) ئیمان (ئیمانی ڕاستەقینە) دەدا بە ئەویندارن؟

یان: ئەژدەهای زولّفت تەلیسمێکە لە سیحری بابلی

میهری تابان شوعلە دەگرێ ماهی تابان بەردەدا

واتە زولّفت وەکوو ئەژدیها (زولّفت نیشانەی جەللای حەق و ئەژدیها و مار نیشانەی مەلەکە تاوسە کە هەر جەلالی حەقە) تەلیسمی سیحری بابلە. لە رەش و تاریکی ئەو زولّفە خۆری رووناك گڕ دەستێنێ و مانگی رووناکی لێ دەکەوێتەوە. مامۆستا وەفایی لە خانەقای شەمزیناندا بووە بزانن چۆن زاراوەکانی میهردینی و دینە کوردیەکان هێشتا لە خانەقای سۆفیەموسڵمانەکاندا هەر ماوە. وەفایی موسڵمانە و رەنگە وەك دینە کوردیەکان باوەڕی بە تاریکی پێش ئافراندنی خۆر نەبێت بەڵام وەکوو جزیری و مەحوی و... هەر لە زاراوەکانی میهردینی کە لە ئەدەبی سۆفیانەی ئێمەدا هەیە کەڵك وەر دەگرێ. ئەگەر بمانەوێ ئاماژەکانی سۆفیگەری و عیرفان کە هی کوردانی پێش ئیسلامە لە گشت شیعرەکانی وەفایی و مەحوی و جزیری و زەبیحی و... دا دەربێنین خوی کتێبێکی سەدان لاپەڕەیە.

لە زۆربەی میهرابەکاندا میترا لە بەرد دەزێ. لە هەندێ جێگادا لە گوڵی لیلەوپەڕ کەلە ناو گۆلاودا دەرۆی دێتە دەرەوە. لە هەندێ جێگادا لە سەدەفە ماموستا رەزی دەنووسێ «لە جێگایەك دا لە سەدەف دێتە دەرەوە کە لە ژێر سەدەفدا شەپۆلی ئاو و نیشانەی بورجەکانی ئاسمان دیارە. ل ۲۷۰» ئەم نەقشە لە میهرابەی کاروبوورگدایە و بە تەواوی لەگەڵ زایینی خاوەندگار لە ئاینی کاکەییدا وەکوو یەکە. بەداخەوە مامۆستا رەزی ئەمەی بە گوڵی «کەسە ئویە»ی زەردەشتی کە هیچ پێوەندیەکی لەگەڵ ئەو نەقشەنیە پێوەندی داوە و باسمان کرد. گوڵی لیلەوپەڕ لە سەر نەخشی میترایی خواجەنشینەکانی سنەدا پیشان دەدرێت. (وێنەکانی ژمارە ۳۹، ٤۱، ٤۲)

مامۆستا رەزیش بە دوونادوونی میهردینی ئاماژەی کردووە، هەڵبەت پێش ئەو توێژینەرە ئوروپاییەکانیش کردوویانە. دەڵێ: «ئوگوستین گەورەی مەسیحی سەدەی چوارەم سەما و سیپاڵێ تایبەتی میهرپەرستەکان بە گەمە و شۆخی دەگرێ بەلام لە راستیدا سەما و سیپاڵێ ئەوان ئاماژە یە بە بورجەکانی ئاسمان و ئاماژە بە تەناسوخ (دوونادوون) و پیشاندانی چوونی روح بۆ جەستەگە لیتره. ماموستا حەواڵە دەدات بە کتێبی «ئاینی میترا»ی فرانتس کومون.

وتمان نیشانەی خاج مەسیحی لە میهرپەرست گرتوویە. لە پەرستگەی میهری لە ژێر کەلیسای سانتاپریسکا (لە ئیتالیا) خاچی پڕ زیوەر پەیدا کرا و لە «کونجیك» (لە یوگسلاوی) لە پە یکەرەکانی شێوی ئاخری میترادا لە سەر نانەکان خاچ کیشراوە کە ئێستاش مەسیحی پەیرەوی لێ دەکات. ل ۳۳۲»

---

نەریتەکانی جەژنی پیرشالیار هێشتا لە هەورامانداا شەوی چوارشەمە دەس پێدەکات کە پێوە ندی ئەو جەژنە لەگەڵ مەلەکە تاوس و میهرپەرستی و دینە کوردیەکاندا پیشان دەدات. لەو جەژنەدا قوربانی کردنی گا لەگەڵ سەمای عیرفانیدا لە زستاندایە و لە بناغەدا جەژنی چلەی مەلەکە تاوسە.

## وشەی میثرە و پاشماوەکانی لە زمانی کوردیدا:

لە ئەوێستادا Mithra (میسرە، بەسینی نووکدددانی) لە بناغەی میز («ز» نووک ددانی) کە لەگەڵ «س» و «ز» جیاوازیان هەیە و لە کوردیدا دابێژ ناکرێ، بەڵام «ز» کەی کە وەکوو «ذ»ی عەرەبی دابێژ دەکرا لە کوردیگەڕووسی وهەورامی و سنەیی‌دا بووە بە دالی موهمەلە کە باسمان کرد. «میذ» بە مانای خۆشەویستی کردن ـ خۆش‌ویستن‌ـ دۆستی کردن. گرێبەست و پەیمان و بەلێن و ئەویندار‌ی کردنە لەگەڵ پاشگرێ «رە» بە مانای پەیمان ـ بەڵێن، گرێ بەست، ئەوین و خۆشەویستیە و هەروەها لە میهرپەرستیدا یەکەم تەجەللای خودایە لە زەویدا و لە زەڕدەشتی‌دا ئێزدی رووناکی و پارێزەری پەیمان و بەڵێنەکە ئەهوورامەزدا ئافراندوویەتی تا لەگەڵ دەس کردەکانی ئەهریمەندا جەنگ بکات و پەیمان شکێنان سزا بدات. لە گاساکان تەنیا بە مانای پەیمان و بەڵێن هاتووە. وەکوو ئێزد ناراستەوخۆ رەت‌کراوەتەوە. بناغەی «میس»یش «سینی نووکدددانی»یە کێ لە ماناکانی پەیمان و بەڵێنە کە هەندێ لە ئەوێستاناسان میسرەلەم بناغەدەزانن. لە ئەوێستادا بناغەی «مید»یشمان هەیە کە هەر بە مانای خۆش‌ویستنە. میسرەلە فارسی هیخامەنشیدا وەکوو «میترە» و لە هیندوستان و لە ناو میهرپەرستەکانی ئەورووپادا وەکوو میترا دابێژکراوە و دەکرێ. چۆن ئەم ئاینە لە پێشدا لە لایەن ئەورووپاییەکانەوە شرۆڤەکرا، وەکوو میترا ناوبراو وشەی «میترائیسم» یان بۆ ئەم ئاینە دانا. سینی نووکدددانی پاشان لە بواری زەماندا سواوە و بووە بە «هـ» وەکوو پەسەنە pethene کە بووە بە پەهن و پاشان لە کوردیدا بووە بە «پان» یان Xsethra کە بووە بە شەهر و پاشان لە کوردیدا بووە بە شار.

هەروەها Mithre بووە بە میهر و پاشان گورانکاری‌تریلێ بەدیهاتووە.

ئەم وشە لە کوردی و زاراوە جۆر بە جۆرەکانی‌دا بە فۆرمگەلی خوارەوە هاتووە کە یەك بە یەك باسی دەکەین: وەکوو مێهر ـ میر ـ میهر ـ مێر ـ مار ـ مەهر ـ مەڕ ـ مێل ـ مل ـ مڵ ـ مۆر ـ مەتر

١ـ وەکوو میهر لە وشەی میهرەبان‌ـ هەروەها عەشایەری کوردی میهریان و میهرەکیان لە پارێزگای فارس‌دا کە ئیستەخری لە سەدەی چواری کۆچیدا ناویانی هێناوە. ئیبنی حووقەل ناوی هۆزی میهرییە و میران (میهران)یشی هێناوە. شاری کۆنی میهرەگان‌کەدەك، دالەکەی دالی موهمەلە بووە کە تەعریب کراوە بە میهرە جان قەزەق و میهرەجان قەزەف و... وشەی تەعریب

کراوی میهرەجان کە بە مانای جەژن بە کار دەچێت، دیارە ئەمە لە میهرەگانی پەهلەوی و کوردی گیراوە کە جەژنی لە دایك بوونی میترایە. ئەو شارە لە پارێزگای کوردنشینی ئێستای ئیلامدا بووە و بە مانای خانووی میترایە.

٢ـ وەکوو میر: هۆزی کوردی هەرەمەزنی میران کە مێژوونووسان هەم وەکوو میران و هەم وەکوو میلان ناویان هێناوە. ئەم ناوە لە بناغەدا «میثران» و «میتران»ە کە ناوی سەرداری مەزنی ئەشکانیە. وەکوو سۆران و گۆران کە باسمان کرد. («ان» ئاخری ئەم پیتگەلە نیشانەی نیسبەتە کە لەسەر زۆر ناوی جوغرافیاییدا هەیە. وەکوو گەنمان ـ قولیان (نزیکی سنە) ماسان، شەمزینان و.... بە مانای گوندی نیسبەت دراو بە گەنم و قولی (ناوی تورکی) ماس و شەمزین و... میریڤان، ناوی ژن لە کرمانجیدا کە هەر بە مانای میهرەبانە پاشگری (وان و بان لە ئەوێستادا وەکوو «پانە» (پا +نە) هاتووە. لەسەر پاشگری «نە» باسمان کرد «پا» بە مانای پاسەوانی و نیگاداری کردنە. وشەی «میهەنگ» بە مانای پێوانە و عەیارە، واتە ئەو ئەندازەی کە بەڵێن دراوە. ئەم وشە هەزار لە هەنبانە بوورینەدا هێناویەتی. ئەم وشە لە ئەوێستادا نەهاتووە بەڵام بە قاعیدەی ئەویستایی دەبێ بە «Mithengh» واتە دۆخی بەڵێن و پەیمان. «میت» ئەو گوێزیان سککە پوولەکە لە یاریدا کەلا، یان گوێزی بۆ دەخەن و لەسەری بەڵێن دراوە کە ئەو ئەندازە ئەگەر بە کەلایان گوێز لێ بدرێ، لێدەر بیبات.

هۆزی «میرەك» (میهرەك) لە ناوچەی لەیلاخی سنە. ئەمە ناوی باوکی سوهرەوەردیشە وشەی «میرە» بە مانای جیژوان کە هەژار هێناویەتی.

«میراو» ئەو کەسەی کە لەسەر بەڵێن و پەیمانێك ئاوی بە گەرەك یان کێڵگەکاندا دابەش دەکرد (مێراو و مێلاویش هاتووە کە باسی دەکەین). لە هەندێ نووسراوەی فارسیدا وەکوو مهراب بەو مانا هاتووە. نابێ وشەی میر کە کورت کراوەی میهرە لەگەڵ وشەی میر، کە کورت کراوەی «ئەمیر»ی عەرەبیە تێکەڵاوکەین. وەك وتمان نابێ خراپی ئەوێستایی و کوردی لەگەڵ خەرابی عەرەبی تێکەڵاوکەین. کاتێ دەڵێن میرمەم میرەکەی کوردی نیە بەڵکوو کورت کراوەی ئەمیری عەرەبیە. میرا خورێ: ئەو کەسەی کە بە پێی پەیمان راهێنان و نیگاداری ئەسپی بە ئەستۆیە. هەروەها گوندی کاولکراوی «میراوە» کە هەژار هێناویەتی ئەم وشە بە مانای جێگایەکە کە بە پێی بەڵێن و پەیمان ئاوەکەی دابەش کراوە.

میرە: نازناوی هەندێ پیاوی ئاینی کاکەیی (هەژار).

ناوی میلاد که پاڵەوانی ئەستوورەییە هەر گۆڕدراوی «میهردات»ە. هەرچەند مانای عەرەبیشی هەیە بەڵام ئەو پاڵەوانە پێوەندی بە زمانی عەرەبییەوە نیە.

٣ـ وەکوو مێهر. لە وشەی مێهران (ناوی پیاو زۆرتر لە ئێراندا) مێهرەوان کە هەر بە مانای میهرەبانە. مێهر. واتە خۆشەویستی و ئەوین. مێهراوەر (ناوی تایفە لە کوردستانی رۆژهەڵاتدا).

٤ـ وەکوو مێر. وشەی مێراو کە باسمان کرد. شاری مێردین (میهردین) کە دابێژی دروستی کرمانیجیە. مێر بە مانای خۆشەویستی لە شیعری مەلا عومەری رەنجووریدا کە زۆرتر لە دووسەد و پەنجا ساڵ لەمەو پێش بۆ وەلی دیوانەی نووسیوە

بەڵێ میرزای خاس عاقیبەت بەخێر

تو چە بارەی من هیچ نەداری مێر

هەژاریش ئەم وشەی بە مانای خۆشەویستی هێناوە. مێرەوان کە هەر بە مانای میهرەبانە و ناوی ژنانەیە کە هەژار هێناویە. مێردینکێ بە مانای مێردینی چکۆلە. ناوی گوندیکە کە بەعسیەکان کاولیان کردووە (هەژار). مێر و چێر بە مانای دۆست و ئاشنا کە هەژار هێناویەتی. مێرو چێر لە سنەدا زۆر بە کار دەچێت. ئەم وشە لە ئەوێستادا هەیە:

(Mithro cithre). چیسرە (سینی نووکدەدانی) بە مانای رەگەزە. بە گشتی بە مانای ئەو کەسەیە کە رەگەزی خۆشەویستی هەیە. هەروەها گوندی کاولکراوی کوردستان کە هەژار هێناویەتی.

٥ـ وەکوو «مار». چون «خشەسرە» (سینی نووکدەدانی) لە کوردی ئەمڕودا بووە بە شار میسرەیش بووە بە مار. یان مار، دابێژیتری «مێر»ە. دوو پیتی ئەلف و «یێ» زۆربەیەك دەگۆڕدرێن بە چەشنێ کە مامۆستا پووورداود ئەوێستاناسی گەورەی ئێرانی دەڵێ ئەم دوو پیتە لە بناغەدا یەك پیتە بەڵام بە دوو دابێژ. لە کوردیشدا هەروایە وەکوو خودا، خودێ ـ کارد، کێرد کاڵ (کشت و کاڵ)، کێڵ ـ ساو (هەورامی)، سێف. ئێستا، ئێستێ، ماردین ـ مێردین و... مێریش وەکوو مار دابێژ کراوە. ماردین ـ مارەیی و مارەبڕین (مارەیی کە مەهریش دەڵێن بە مانای ئەو شتەیە کە لە نێوان ژن و پیاودا پەیمان و بەڵێن لەسەری دەدرێ کە بە ژن بدرێ لە فارسیدا «مەهرییە و لە نووسراوە پەهلەویەکانی زەردەشتیدا کاوین هاتووە لە عەرەبیدا «سەداق» دەڵێن. وشەی مەریێج لە ئینگلیسی و وەکوو ئەوە لە زمانە ئەورووپاییەکاندا بە مانای زەوجین یادگاری میهرپەرستی کۆنی ئەوانە.

نازناوی مار پاش کز بوونی میهرپەرستی و ڕەواجی مەسیحی لەسەر ناوی هەندێ قەشە و نوسقوفی مەسیحی هاتووە کە یادگاری میهرپەرستی پێش ئەوانە وەکوو مارشیموون سەرۆکی نەستووریەکانی سەدەی نۆزدە کە بە دەس سمایل ئاغای سمکۆ کوژرا. کوردەکان وەکوو «شەمعوون» ناوی دەبەن. مامۆستا ڕەشید یاسمی لە دوو ڕاگەیەنەری مەسیحی لە کوردستانی باشوور لە سەدەی سێی زایینی ناو دەبات یەکەم مار ماری، دووهەم مار سابها. «ئا. ئی. کولسنیکوف» لە «ئێران لە سەردەمی هێرشی عەرەب» وەرگێڕ بە فارسی «م ـ ر ـ یەحیایی»دا ناوی «مار سەبر ئیشووع»، «مار ئابا کەشکەری» لە کوردستانی باشوور سەدەی شەش و هەفتی زایینی دەبات هەروەها ناوی کۆنی شاری میافارقەین وەکوو، مار تیۆپۆل، دەبات هەروەها ناوی شاری «ماردیسا» دەبات نزیک نەسیبین لە کوردستان. ئەم دوو شارە نزیکی ماردینن.

«ن ـ پیگلوسکایا، لە کتێبەکەیدا ناوی ئوسقوفی کەرکوك وەکوو «مار شاپوور بە راز» دەبات ل ٦٥. دەبێ بزانین پاشان مەسیحیەکان وشەی «ماری» یان وەکوو نوورانی لێك داوە.

نازناوی مانی «پێغەمبەر سەدەی سێی زایینی» پاشان وەکوو «مار» هاتووە وەکوو شیعرە پەهلەویەکانی پەیرەوانی ئەو:

... ئۆتۆ ئەفرینام یەزەد مارمانی ئۆتۆ نەماچ بەرام یەزەد

بە تۆ ئافەرین دەڵێم ئەی خودا مارمانی بە تو نوێژ (سوجدە) دەبەم ئەی خودا

ئۆ ماری مانی ویندام...

بە ماری مانی ستایشت دەکەم

ناوی «چاو مار» واتە چاوی میترا. مارتین بروین سن دەڵێ ناوی هۆزێکە لە ڕۆژاوای جزیردا. ئەولیای چەلەبیش لە گەشت نامەکەیدا هێناویە.

ناوی «شامار» کە لە کرماشان و ناوچەی گۆراندا زۆر بوو. پیاوێك بەم ناوە لە شۆڕشی ئیسلامی ئێران ١٩٧٩دا لە پارێزگای کرماشان ناودار بوو.

گوندی «ماراو» نزیکی کامیاران لە ڕۆژهەڵات بە مانای جێگایەکە کە ناوەکەی بە پەیمان و بەڵێن دابەش کراوە یان سوێندی لەسەر خوراوە لە پێش ئیسلامدا میهرپەرستەکان و زەردەشتیەکان تەنیا بە میترا سوێندیان دەخوارد.

گۆندی مارنج بە قاعیدە ئەویستایی «میثرۆ ئەنگهە» واتە جێگای عەهد و پەیمان (ڕەنگە بە مانای جێگای ماریش بێت). ئەم گوندە نزیك سنەیە و وەکوو «مەریانج» لە نزیکی هەمەدانـدا هەیە کە هەر بەو مانایە.

لە بەیتی «ناسر و ماڵماڵ»دا بێ‌گومان دابێژی کۆنی ماڵماڵ وەکوو مار مار بووە چون لە زمانی کۆنی کورددا پیتی «ل» و «ڵ» نەبووە و لە گۆڕانی «ر» بە دیهاتوون. دیارە ماڵماڵ لە پێشدا مار مار بووە. دووپات کردنەوە لە ئەوێستادا بۆ تەئکیدە. «ڕەنگە» مارماریش هەر لە مار دابێژیتری میهرەوە گیراوە چون ناوی ئافرەتیشە دیارە ناوی ماری خزوولکە نیە. هەژاریش لە هەنبانەدا وەکوو مارمار هێناویە. ناوی گوندی «مارسیس» کە بەعسیەکان کاولیان کردووە لە بناغەدا ناوی ئوسقوف یا قەشەی مەسیحییە.

مەقدەسی لە سەدەی چواری کۆچی لە «ئەحسەنوتتەقاسیم»دا دەنووسێ: لە یەك فرسەقی میافارقیندا دێری «مارتۆما» هەیە ل ۲۰۵» (مار+ تۆماس)

(وشەی مار خزوولکەی بە ناو بانگ ناوی ئاماژەیی «ئەژی» ئەوێستایی کوردیە. ئەم وشە لە بناغەی «مەر» و «مر» لە ئەوێستادا بە مانای مردنە. بە قاعیدەی ئەوێستایی «مارە» بە مانای کوشندەیە. ئەم وشە پاش تێ پەر بوونی زەمان ئاخرەکەی سواوە و وتمان ئەو شتگەلە کە خەڵك لێ ترساون یان شوورەیی بووە ناوی ئاماژەیان بۆ داناوە. یان وشەی بیگانە یان بۆ هەڵبژاردووە.)

٦ـ وەکوو «مەر» لە وشەگەلی مەرگە بە مانای پیاوی ئاینی ئێزدی. مەرگەهە شوێنی پیرۆز و وەکوو قیبلەی ئێزدیانە لە لالەش (هەژار)

مەریوان. لە شەرەفنامە مێژووی کوردستاندا کە بە فارسی چوارسەد ساڵ لەمە و پێش نووسراوە وەکوو مهروان بە نووسینی کوردی مەهرەوان و پاشان کورت کراوەتەوە. بە قاعیدەی ئەوێستایی «میثرۆپانە» واتە پارێزەر و پاسەوانی بەڵێن و پەیمان. چۆن «مەهرەوان» بە مەریوان گۆڕاوە؟

گوندی نزیکی سنە لە قەباڵە و دۆسیە حکوومیەکاندا بە ناوی «دەگایران» هەیە بە مانای گوندی لەشکر و سەرباز، وتمان ڕانە لە ئەوێستادا بە مانای حەشیمەت و لەشکرە. لە پەنجاکاندا کە من منداڵ بووم وەکوو دگاران دابێژ دەکرا ئێستا «دگەران» دەڵێن. لە پەنجا ساڵدا دەگای ران بووە بە دگەران.

تا مەهرەوانەکەی شەرەفنامەم نەدیبوو نەمدەزانی کە مەریوان لە بناغەی میهرەوە گیراوە.

مەرینا، گوندی کوردستانی باشوور کە وەکوو شێوە مێژینەکەی لە دۆخی مێداهاتووە دۆخی نێرەکەی دەبێ بە مەرینە. لەسەر «نە» و «نا» باسمان کرد.

وتمان زمانی ئازەربایجان پێش تورکی زۆر لە کوردی نزیکە شاری «مەرەند» نزیك تەورێز، بە مانای ئەو جێگایە کە وەکوو شەرت و قەرار بە فەرمانرەوایەك دراوە. میهرەنتە دابێژی کۆنتری مەرەندە.

مەرج ـ کە ماناکەی شەرت بەستن و پەیمان کردنە پاشماوەی میثرەنگەی ئەوێستا بە مانای دۆخ و جێگای بەڵێن و پەیمان بەستنە.

٧ـ وەکوو مەهر. لە کرمانجیدا «مەهرکرن» واتە مارە کردن

گوندی مەهرڤان کە بەعسیان کاولیان کرد (هەژار). مەهروڤان دابێژی رەسەنتری مەریوانە.

٨ ـ وەکوو «مۆر» لە وشەی «مۆر» و مۆرکردندا. مۆر یان مۆرك کە ژێر نووسراوە و سەرگەنم و جۆی شەن و کەو کراویان پێ دیاری دەکردو وەکوو بەڵێن و پەیمانێك ئەژمێردرا.

وشەی مۆرکیش، هەر بە مانای مۆرە

گوندی «مۆردین» نزیکی هاوار لە هەورامان بەشی کوردستانی باشوور کە هەر دابێژێکیتری میهردینە

مۆرتك= پیاوی زانا و باوەڕ پێ کراوی گوند (هەژار)

مۆرخانە= بە مانای نقێمی ئەنگوستیلەیە (هەژار). نقێم لە مێژدا وەکوو مۆر، کەڵکی لێ وەردەگیرا

مۆر= شتگەلی پان و خرت کە لە یاریدا شەرت و مەرجی لەسەر دەکرێ.

٩ـ وەکوو مەتر. مەتران پیاوی ئایینی مەسیحی نەستووری کە سەرتر لە قەشەیە. ئەم وشە چون بە میترا نزیکترە لە «مار» نازناوەکانی پێشوو رەسەنترە.

مەترا، گوندی کاکەیی کە بەعسیان کاولیان کرد (هەژار)

١٠ـ وەکوو مێل کە هەر دابێژیتری مێرە لە یەك دوو وشەدا دیم. وشەی مێلاو لە ناوچەی سەقزدا بە مێراو دەڵێن کە باسمان کرد.

١١ـ وەکوو «مل» تەنیا لە یەك وشەدا دیم. لە گوندەکانی ناوچەی بیجار لە کوردستانی رۆژهەڵاتدا کە شوانەکان مەڕ و ماڵاتیان دەگێڕاوە ناو دێ پاشان بە کۆڵانەکاندا دەگەڕان و بە دەنگی بەرز دەیانگوت «ملاو» مەبەست شوانانەیەك بوو کە بە پێی بەڵێن و پەیمان قەراردرا بوو

بدرێ بە شوان. ملاو گوردرادی میهرا و و ئەویش کورت کراوەی «میشراونگهـ»ی ئەوێستاییە واتە دۆخ و جێگاو زەمانی بەڵێن کراو. لە لەیلاخ ناوچەی سنەدا وەکوو ملاو دابێژ دەکرێ.

١٢ـ هەندی ناوی جوغرافیاییتر لە کوردستانە کە لـە بناغـەی وشـەی میهـر نـین بـەلام بـە میهردینییەوە پێوەندی هەیە وەکوو «شەمزینان» کە کورت کراوە «شەمس‌دینان»ە. مەقدەسی لە ئەحسەنوتتەقاسیم‌دا وەکوو شەمسینییە هێناویە و لە شارەکانی گرێ دراو بە ئامێدەوە ناوی دەبات وەرگێڕ بە فارسی لە ژێر نووسدا دەڵێ: یاقووتی حەمـەوی و ئیـبنی ئـەسیر وەکـوو شەمسـانییە هێناویانە و وەکوو گوندەکانی خابوور ناوی دەبەن. ل ١٩٣ ئەحسەن و...» رەنگە ناوی شەمسدینان واتە خۆرپەرستان عەرەبەکانی سەردەمی ئیسلام بڕیویانە بە سەر ئەم شارەدا. هەروا کە بە هـەڵـە بە زەردەشتیەکان دەڵێن ئاورپەرست بە میهردینەکانیش کە روو بە خۆرستایشتیان دەکرد وتوویانە خۆرپەرست.

---

**هەندێ پاشماوەی میهرپەرستی لە کوردستاندا**

١ـ میهرپەرستەکان خانووکانیان روو بە رۆژهەلات دروس دەکرد. زۆربەی گوندەکانی کوردسـتان هەروا دروس کراوە.

٢ـ گرینگترین رەنگ لە پەرستگە میهریەکاندا رەنگی سـوورە. مـیترا کـەوا و کـلاوی سـووری هەیە.

رەنگی سوور و ئەرخەوانی کاردینال و قەشە مەسیحیەکان پاشماوەی میتراییە.

٣ـ رەنگـی دیـواخی سـووری بـووك لـە کوردسـتاندا نیشـانەی میهـر و ئـەوینـە و یادگـاری میهرپەرستی کۆنە. شارەزووی نووسیبووی کە سوهرەوەردی کلاوی درێژی سـووری لـە سـەر دەنـا. سوور لە ئاوەزی سووردا باسمان کرد کە تێکەلاوی نوورو تاریکیە.

٤ـ مەقامی هەفتەمی میهردینی کە پاپ یان پاپایە (پاشان مەسـیحیەکـان گرتوویانـە) کـە تەجەللا و جێ‌نشینی میترایە لە زەویدا. سێ نیشانەی هەیە: داس ـ گۆچان ـ حەلقـە. باسمـان لـە سەر حەلقەیە کە نیشانەی جەغزی خۆرە و نیشانەی سەرەکی میترایە. وتمان میترا خودای بەلـێن و پەیمانیشە. بووك و زاوا لە کاتی دەسگیرانی یان مارە بڕینـدا بـە نیشـانەی بـەلـێن دەیـان کـردە ئەنگوستی یەکتر. ئەم نەریتە میتراییە، ئەورووپاییەکان بە گشت جیهاندا بلاویان کردەوە. پێش ئەوە لە کوردستاندا وەکوو کلکەوانە واتە ئەنگوستیلەی نقیم‌دار بوو. نقیمەکەی یاقووت بوو کە سـوور و نیشانەی ئاسمانی چوارەمە کە خۆری تێدایە. زۆر پێشتر لە بەدیهاتنی میتراپەرسـتی لـە رۆژاوای

ئێران واته له مادی ڕۆژاوادا، جەغز نیشانەی میترا بوو. نیشانەی چاوەدێری ئەو لەسەر قسەی ڕاست و درۆ بوو. درۆزن واته «میترۆ درۆج» له لایەن میتراوه سزادەدرا.

٥ـ به وێنەی پەیکەری ژماره ٦و ٧ زۆر بە وردی بنوارن ئەم پەیکەره کە لە سەرووی بەردنووسراوەی بێستوونە، لەسەر دەخمەیەك لە شاری سەهەنە نزیك بێستوونی کرماشانیش هەیە. له تەختی جەمشیدیشدا هەیە. له سەرووی پەیکەرەکەی قزقاپان نزیکی دووکانیش هەیە. لەسەر مۆرکێکی داریووش شای هیخامەنشیدا دۆزراوەتەوە. داریووش لە رستەی یەکەمی بەردنووسراوەکەی بێستووندا دەڵێ ئەهوورامەزدا خودای گەورەیە... ئەمە بوو بە هوی ئەوه کە توێژینەرانی ئەورووپایی له گشت گرینگتر «رۆمەن گیرشمەن» وەکوو پەیکەری ئەهورامەزدای بزانن. پاشان توێژینەرانی ئێرانی که به گشتی لایەنگری ئاینی زەردەشتین به دروستی، زانیان کە به پێی ئەوێستا ئەهوورامەزدا نابێ پەیکەری هەبێ بەڵام بە بیروڕای من خۆیان لە بناغەی پرسەکە گێل کرد و وتیان پەیکەری «فرەوەهر» یان بە ئەوێستایی «فرەوەشی» یان بە فارسی ئێستا «فروهەر»ە. باسی فرەوەیشمان کرد. وتمان به پێی ئاینی زەردەشتی مرۆڤ لە ناخیدا پێنج هێزی هەیە. یەکێ لەوانە فرەوەشیه که به هزر و شوعور مانا کراوه.

له ئاینی زەردەشتیدا وەکوو لایەنێکی رۆحی مرۆڤ لە جەژنەکاندا بۆ ماڵبات دەگەڕێتەوه. هەروەها هەندێ مانا و لایەنیتری هەیە. (ب.ب. فەرهەنگ نامهای ئەوێستا هاشم رەزی) نەختێ بیر کەینەوه، فەرەوەشی ناتوانێ هیچ پێوەندیەکی بەو پەیکەرەوە هەبێ و لایەنگرانی ئاینی زەردەشتی بۆ ناونانی ئەو پەیکەرەگەلە پەلەیان کردووه. ئەم پەیکەرەگەلە هی میترایە وەکوو خودای بەڵێن و پەیمان و ڕاستی و دژ به درۆزن. بەڵگەکانمان ئەمانەی خوارەوەن:

١ـ پەیکەرەکە وەکوو هەڵۆ یان سیمورغە کە وتمان سیمورغ یان پیر یان .... نیشانەی میترایە

٢ـ حەلقەی دەورەکەی بە جوانی پیشان دەدات کە جگە لە میترا هیچ ئوستوورەی ئاریایی نیشانەی حەڵقەی نیە.

٢ـ ئەو پەیکەره حەلقەیەك لە دەستیدایە کە نیشانەی دروستی قسە و بەڵێن و پەیمانە.

٣ـ داریوش له بەرد و نوسراوەکەی ڕووداوگەلی گرینگ و مێژوویی و سەرکوتی هێزگەلی لایەنگری درۆو پەیمانشکێن باس دەکات. میترا لە سەرەوه گەواه و شاهێدی ڕاستی قسەو بەڵێنەکانی داریووش و چاوەدیری ڕاستی و ناراستیه و دەستی وەکوو دەستی شاهێد بەرز کردۆتەوه.

٤ـ ئەم پەیکەرە لەسەر مۆرکێکی داریوش هەیە کە گیرشمەن لە کتێبەکەی داهێناویە و دەزانین مۆر ئامرازی بەڵێن و پەیمان بەستنە پێم وابێ هەر ئەم بەڵگە بەسندەیە بۆ میترایی بوونی ئەو نەخشە. فەرەوەهر چ پێوەندیەکی بە مۆرەوە هەیە.

مامۆستا میهردادی بەهار ئەو سێ پەیکەرە لە بیستوون و سەهەنە و قزقاپاندا بە شتێکی رەسەنی ئێرانی نازانێ و دەڵێ لە نێو چۆمان «لە فەرهەنگی بابلی دزەی کردۆتە ناو فەرهەنگی ئێرانی ل ٤٥١ پژوەشی در ئەساتیر ایران».

بە باوەڕی من دوو لێكچوونی رواڵەتی هۆی پێکهاتنی بیروڕای مامۆستایە. یەکەم: پەیکەرەکانی شەمەش (شەمشە) یەکێ وەکوو ئەو سێ پەیکەرەیە، بەڵام ئەو پەیکەرە حەڵقەی نیە و ئێستاش هەندێ لە رێکخراوە فەرهەنگیە ئاسووریەکان لێ کەڵك زەردەگرن. دووهەم شەمەش خودای خۆرە و هەندێ بە میترا نزیکە، بەڵام میترا خودای خۆر نیە بەڵکم تەجەللای خودای تاکە. ئەمن پەیکەری شەمەشم نەدیوە کە حەڵقەی هەبێت. ئەگەریش هەبێت دەبێ بزانین ئەو سێ پەیکەرە کە دوانی لە کوردستانی رۆژهەڵات و یەکێکی لە باشووردایە هی سەرەتای مادەکان و هیخامەنشیەکان پێش بەدیهاتنی ئاینی میتراییە و رەنگە ئێرانیەکان وەکوو ئەلفبێ لە بابلیەکانیان وەرگرتووە و بە جێگای خودای بەڵێن پەیمانی خۆیان کەڵکیان لێ وەرگرتووە. پاش بەدیهاتنی ئاینی میترایی لە سەدەی پێنج و چواری پێش زاییندا ئیدی ئەم پەیکەرە نەماوە و پەیکەری میترای گا کوژ لە پەرستگە تاریکەکانی میهرپەرستیدا دێتە گۆڕێ.

دیاکو نوف لە مێژووی مادا ئەوەی قزپان بە گۆڕی «هووخشەثرە» (هوو= چاك. خشەثرە = فەرمانرەوایی و هێز و دەسەڵات. خشە لە بناغەی «خشی» ئەوێستایی و «شی» کرمانجی بە مانای هێز و توانینە وەك «ئەزنەشیم» واتە من ناتوانم. ثرە پاشگری دۆخ و ئامرازە). پادشای بە هێزی ماد کە ئاشووری تێشك شکاند دەزانێت دەڵێت یەکێ لەو دوو کەسە کە کەوان بە دەستیانەوەیە هووخشەترەیە. ئەوەی سەهەنەیش هەر لە سەردەمە (گۆڕی سەردەمی ئارییایەکان پێش بڵاوەبوونی ئاینی زەردەشتی و میهرپەرستی)دایە.

لە هەندێ جێگا وەکوو مۆرەکەی داریوش لەو نەخشەدا میترا کڵاوی مادی لە سەردایە (پاشان لە ئەو کڵاوە پارسەکان لاساییان) کردەوە (ل ٣٠٥ تاریخ ماد ـ دیاکونوف)

٤ـ پەیکەرەکەی تاقەوسان و هەڵەی توێژینەرانی ئێرانی:

یان خۆگێل کردن لە راستی تا ناوی کورد لە نێواندا نەبێ.

بۆ وێنەی ژمارە ١٠ بنوارن. ئەم پەیکەرەگەلە لای ڕاستی تاقەکاندایە. لەوەدا چوار پەیکەر دەبینین. لە لای چەپەوە میترا بە شیرەوە لە پشت فەرمانڕەوای تازەی ئەردەشێر بە حاڵەتی هەڕەشە وەستاوە. شیرەکەی بەرز کردۆتەوە و نزیك سەری فەرمانڕەوای تازەی کردووە. ئەم فەرمانڕەوا پاش شکستی کوردانشا فەرمانڕەوای ماد، قەرارە بە جێگای ئەو دابنرێ. جلی مادی لە بەردایە. ئەم جلە لە بەرد نووسراوەی بێستوون و پلیکانەکانی تەختی جەمشید لە فارسیشدا هەیە. لای ڕاست پەیکەری ئەردەشێرە کە حەلقەیەك بە نیشانەی بەڵێن و پەیمان دەدات بە دەست فەرمانڕەوای تازەوە. ئەم حەڵقە شنلێکی لێ ئاویزانە کە چەشنی قوماشی هەوریشمیە و نیشانەی فەرمانڕەواییە. لە ژێر پێی ئەردەشێر و فەرمانڕەوای تازەدا جەستەی کوژراوی کوردانشا دەبینین کە سەر و شانی لە ژێر پێی ئەردەشێر و پاکانی لە ژێر پێی فەرمانڕەوای تازەدایە. زۆر بە داخەوە مامۆستا هاشمی ڕەزی لە کتێبە ناوبراوەکەیدا لە لاپەڕە ١٩٦ لە ژێر ئەم پەیکەرەدا ڕاستەقینەی وەکوو مێژوونووسانیتری ئێرانی شاردۆتەوە و نووسیوە «تاجگیری ئەردەشێری دووهەم سەدەی چواری زایینی». ئەوەکەی تانجستاندنە؟ حەڵقەکە نیشانەی دایرەی خۆر و پەیمان بەستنە و لەسەنبولەکانی میترایە ئاڵ و گۆڕ دەکرێ. لە کاتی تاجداندا میتراکەی لە پشت تاج گیرەوە بە حاڵەتی هەڕەشە دەوەستێ و... ؟

داب وا بوو کە «موو بە دان مووبەد» کە سەرترین پلەی ئاینی زەڕدەشتی بوو تانج بنێتە سەر پادشای تازە. خۆ ئەوە مووبەدان مووبەد نیە. جل و بەرگی ئەو لە نەقشەکانیتری ساسانیدا جیاوازە. ئەو پەیکەرە وەکوو ئەردەشێر شنێلی فەرمانڕەوایی هەیە. حەڵقەکە شنێلی لێ ئاوێزنە، پیشان دەدات کە لەسەر فەرمانڕەوایی گرێ بەست دەکرێ و پەیمانی وەفاداری بە ئەردەشێر لە فەرمانڕەوای تازە دەسێنرێت.

لە کارنامەی ئەردەشێری بابەکاندا سەبارەت بە شەڕی ئەو لەگەڵ کوردەکاندا بە شێوەی خوارەوە هاتووە. ئەم دەقە پێش ئیسلام بە زمانی پەهلەوی (پەهلەوی ساسانی) نووسراوە:

پەس هەچ هان وەس سپاە ئەو گوندی زاول هەم کەرت

پاش لە ئەوە زۆر سپا(ی) بە (لە) گوندی زاول پێك هێنا

ئۆ ئەو کاریچاری کورتانشاە مادیك فەرنوفت

و بە جەنگی کوردنشای مادی تەشریفی برد (زاوڵ لە ڕۆژهەڵاتی ئێران سنووری ئەفغانستاندایە. ئەمڕۆ وەکوو زابول ناوی دەبرێ).

وەس کاریچاری خوونرێژیشنیەـ بووت
زۆر جەنگی خوێنریژانە بوو
ئۆ سپاهی ئەرتەخشێر ستوویەـ پەتی گیرفت
و سپای ئەردەشێر ستۆیی پیێ گیرا (بەستۆ هات)
ئەرتەخشێر هەچ سپاهی خوێش نیازان ببووت
ئەردەشیر لە سپای خۆی دڵپەرێشان ببوو
ئەندەر شەپ ئەو ویاپانیێ مەت
لە شەودا بە بیابانیێ هات
کەش هیچ ئاپ ئۆ خوەریشن ئەندەر نە
کە ئەوە هیچ ئاو و خۆراکی تێدا نە (بوو)
ئۆ خوەت ئۆ ئەپاک ئەسواران ئۆ ستووران
و خۆی و گشت سواران و ئەسپ و هێستران
هەمیست ئەو گورسەکیەـ ئۆ تیشنەکیەـ مەت
هەمووان بە برسیەتی و تینوویەتی هات (ن)
ئۆ هەچ دوور ئاتەخشی شەپانان دیت
و لە دوورەوە ئاگری شوانان (ی) دی
ئۆ ئەرتەخشێر ئەو ئانووز شووت
و ئەردەشێر بە ئەویێ چوو
مەرتیێ پیر ئانووز دیت
پیاویێ پیر (ی) لەویێ دی
کیێ ئەپاک گۆسپەندان پەت دەشتی کۆف بووتەند
کە کشت مەڕەکان(ی) بە دەشتی کێو بوون
ئەرتەخشێر هان شەپ ئانووز شووت
ئەردەشیر ئەو شەوە (بۆ) ئەویێ چوو
ئۆ رۆچی دوتیکەر هەچ ئەوێشان راس خواست
و رۆژی دیکە لە ئەوان ریگە(ی) خواست

ئەوێشان گوفت کۆ هەچ ئیتەر سێ فرسەنگ

ئەوان وت (یان) کە لە ئێرە(وە) سێ فرسەق

روستاکێ هەست ئەپێر ئاپادان

گوندێ هەیە زۆر ئاوەدان

ئۆش مەرتووم ئەو پەتخوویە وسیار هەست

و مەردمی ئەوێ بە دەخڵ و دان زۆر(یان) هەیە

ئەرتەخشێر ئەو هان دیەـ شووت

ئەردەشێر بە ئەو دێ چوو

مەرت فریستات ئۆ ئەسووبارانی خوێش هەمووگین

پیاو (ی) هەنارد و سوارانی خۆی هەموویی

ئەو دەرخواست

بە دەرخواست (کرد)

سپاهی ماتیکان پەت هەن داشت کۆ نوون هەچ

سپای مادەکان لایان وابوو کە هەنووکە لە

ئەرتەخشێر ئەپێ بیم بووت

ئەردەشێر بیترس بوو(ن). لەم دەقەدا ماد و کورد هاو مانا بە کار براون دیارە لەو سەردەمـەدا کورد دوو ناوی بووە هەم بە ماد ناسراوە و هەم بە کورد.

ئەرتەخشێر ٤٠٠٠ مەرت ئاراست ئۆ ئەپەر ئەوێشان

ئەردەشێر ٤٠٠٠ پیاو(ی) رازاند و بەڕ ئەوان

تاژتەك شەپیخوون کەرت

هێش (و) شەوهێرشی کرد

ئۆ هەچ کورتان مەرت ئەو هەزار ئەوزەت

و لە کوردان پیاو(ی) بە هەزار کوشت (هەزاران پیاوی کوشت)

ئەپاریك خەستەك ئۆ دەستگیر کەرت

پاشماوەی بریندار و دەسگیر کرد

ئۆ هەچ کورتانشاه ئەپاك پوسەران بەراتەران فرزەنتان

و لە کوردانشاه (و) گشت کوڕان (و) برایان و منداڵان (ی)

هێز نۆ خواستەك ئەو پارس وسیە کەرت

خێر (دارایی) و ماڵ بۆ پارس (ی) ڕەوانە کرد

وەرگێڕانی ئەم دەقە بەو ئاسانیە کە نووسیمان نەبووە. پەهلەوی نووسانی زەمانی ئەشکانی و ساسانیەکان هەزار وشەی سوریانیان تێکەڵاوی ڕستە پەهلەویەکان دەکرد تا خەڵکی ئاسایی تێ نەگەن. ئەم هەزار وشە بە «هەزواریشن» یان «هەزوارش» بە ناو بانگە. وەرگێڕی زمانی پەهلەوی دەبێ ئەو هەزار وشە سوریانیە بزانێ. من ئەو دەقەم لە وەرگێڕاوەکەی بەڕێز دوکتور محەمەد جواد مەشکوور بە فارسی دەرهێنا. ئەو بەڕێزە هەزوارشەکانی کردووە بە پەهلەوی. لە کارنامەدا کارەکانی ئەردەشێر وەکوو موعجیزە لە قەلەم دراوە و تەنانەت تێکشکانەکەیشی وەك سەرکەوتنی وایە. ئەردەشێر کە ئەوندە بە هێز بوو زنجیرە شایی ئەشکانی تێك شکاند و لە ناوی برد دیارە لە شەڕێکی دژواردا لە کوردەکان شکست دەخوات و پاشان زۆر بە دژواری کوردەکان تێك دەشکێنێ.

لە وەرگێڕانی ئەم بەشەی کارنامە بە فارسی هەڵە هەیە و پێم وابێ ئەو هەڵەیش وەکوو لێکدانەکەی پەیکەرەکانی تاقەوسان بۆ سووك نیشاندانی کورد بە عەمد کراوە. سێ کەس وەرگێڕی کارنامە بە فارسی لە وەرگێڕانی «ئۆ هەچ کورتان مەرت ئەو هەزار ئەو زەت» هاوردوویانە (و لە کوردان هەزار پیاوی کوشت) دیارە ئەمە هەڵەیە و وا دروستە «و لە کوردان بە هەزار، پیاوی کوشت. وشەی ئەو کە بە مانای، بە، یە و لە هەورامیشدا هەیە هەر لەو بەشەدا نۆ جار دوو پات بۆتەوە» واتە ئەوندەی کوشت کە یەکەی ژماردن هەزار بوو. پەندی فارسی هەیە «حەساو بە دینار بەخشین بە خەروار» ئەمە بەو مانا نیە کە یەك دینار حەسێب کە و یەك خەروار ببەخشە. یەکەم وەرگێڕ کە کارنامەی بە پازەند وەرگێڕاوە پیاوی ئاینی زەردەشتی «خودایار دەستوور» بوو. پاش ئەو سادق هیدات و جوادی مەشکور بە فارسی زەریان گێڕاوە. ئەم سێ دەقە هیچ جیاوازیەکیان لە واتا کردندا لەگەڵ یەك نیە. خودا یار دەستوور زانیویە کە بە چوار هەزار کەس ناکرێ هەزاران پیاو بکوژرێ بەڵام دەکرێ هەزار پیاو بکوژرێ.

شەڕی دژ بە کورد و سەرکەوتنی ئەردەشێر ئەوندە گرینگ بووە کە بۆ ئەوە لە تاقەوسان بۆ سەرکەوتنەکەی یادگاری دروست کردووە. ئەگەر گشت دەقەکانی کارنامە بخوێننەوە بۆتان دەردەکەوێ کە بە سەرهات نووسانی کارنامە، ئەردەشێریان وەکوو پیرۆزێکی ئاینی زەردەشتی و خاوەن کەرامات لە قەلەم داوە. دوژمنەکانیان بچووك و ئەویان گەورە و خاوەن موعجیزە لە قەڵەم

داوە. دیارە ئەردەشێر بۆ شەڕی کوردان لەو پەڕی ئێرانەوە لەشکری هەرە زۆری لەگەڵ خۆی هێنا،
تا ناوەندی گەورەی میهرپەرستی لە نێو بەرێ و ئاینی زەردەشتی فەرمی بکات.

لە کارنامەدا هەیە کە ئەردەشێر بۆ هەر کوێ چووە بینیویانە کە «فەڕ» وەکوو بەرخێك بە دوایدا بووە و رزگار بوونی لە گرفت و تەنگەژە بە یارمەتی شوانان لە کارنامەدا زۆرە. کاتێك بە دەس ئەشکانیەکانەوە هەڵ دێ بۆ فارس لەوێدا «کورتان شەپانان» واتە شوانانی کورد بە هانایەوە دەگەن. لە بە سەر هاتی پێغەمبەران وەك مووسا و بەتایبەت عیسادا شوان دەوری هەیە. ئەو هەلکەوتە لە سەدەی چواری زایینیدا بۆ کوردگەلێك گرینگە چون پاش ئەو شەڕەیە کە بۆ یەکەم جار چەوسانەوەی گەلی کورد دەس پێدەکات. پاش ئەردەشێر لە زەمانی کوڕەکەی شاپووردا پەرستگە میترایییەکانی کوردستان (ماد) بە دەس وەزیر و مووبەدان مووبەد بە ناوی «کەریتر» وێران کرا. ئەمە کەریتر لە کەتیبەکەی بە ناوی کەعبەی زەردەشت لە پارێزگای فارسدا ئاماژەی پێ کردووە. پاش فەرمی بوونی ئاینی زەردەشتی و کاولکردنی زۆربەی دێر و پەرستگە میتراییەکان و پاشان ئاینی کۆنی کوردان جگە لە کوردستانی باکوور و رۆژئاوای ئێستا بە شاراوەیی بەڕێوە دەچوو و هەروا گەیشتە پاش ئیسلام و دینە کوردیەکانی لێ دروست بوو.

سەبارەت بە حەڵقە کە وتمان نیشانەی میترایە و لە پەیمانی هاو سەرگیری لە لایەن بووك و زاوایشەوە ئاڵ و گۆڕ دەکرێ باسمان کرد و بە پێی ئەوە نەخشەکانی تاقەوسان و سەهەنە و قزقاپان و بێستوون و مۆرەکەی داریووشمان روون کردەوە. حەڵقە کە شنێلی پێوە ئاوێزان بێت نیشانە پەیمان بەستن لەسەر فەرمانڕەوایەتیە. لە تاقە گەورەکەی تاقەوسان و زۆر شوێنەواری مێژوویی پێش ئیسلامی ئێران بەتایبەت نەخشەکانی ساسانیدا هەیە. لەو دەقەدا «ئەو هەزار» بە مانای بە هەزارە نەك هەزار.

مەولەوی دەفەرمێ:

| | |
|---|---|
| من وزۆ ئەو گێج ئەو ئەوسەردی مەیل | ئەو ئەو قەبایل من ئەو کۆی دوجەیل |

٥ـ نەریتەکانی شەوی چلە یان شەوی یەلدا. لە سەر وشەی یەلدا (لە دایك بوون. وشەی قەرز کراو لە سوریانی) بە چڕوپڕی لە بەشی یەکەمدا باس کراوە. لەم شەوە لە کوردستانی رۆژهەڵاتدا (نازانم باکوور و باشوور و رۆژئاوا چۆنە) هەموو خزمان لە ماڵی سەرۆکی ئەو ماڵباتە کۆ دەبنەوە.

خۆ راکگەلێك دەخورا کە نیشانەی تووڕێژی و زاوزێیە. یەکەم برنج کە وەکوو دۆڵمە (یاپراخ) لە گەڵا مێو و کەلەرم دروست دەکرێ. دووهەم هەنار و شووتی کە بۆ ئەو شەوە هەڵ دەگیردرێ.

چون کاڵەکیش تووی زۆرە بەڵام خراپ دەبێ، لە سنە و دەوروپشتیدا دەخرێتە سرکەوە و لەو شەوەدا وەکوو نەریتێکی گرینگ دەخورێ. میوەگەلێك کە توویان کەمە وەکوو سێوو.... لە وشەوەدا نەدەخورا.

سێهەم توو کوولەکە و نۆکەقەنی و تووەشووتی و پستە (فستەق) و فنق کە وەکوو ئاجیل دەبرژێت و لەو شەوەدا دەی تروکێنن. لە جێگاکانیتری ئێراندا ئەو شەوە میترایە بەرێز دەگرن بەڵام نەریتەکانی لەگەڵ کوردستان جیاوازی هەیە.

کالەك تورش و دوڵمە (یاپراخ) تایبەت بە کوردستان بەتایبەت سنەیە و هاوبەش لەگەڵ هەنار و شووتی و ئاجیلدایە.

٦ـ لەسەر نەریتەکانی نەورۆز (شەوی عرووجی میترا) و هێلکە رەنگ کردن و... باسمان کردووە. بەداخەوە جگە لە ئاگرکردنەوە و خۆش رابواردن لە کوردستانی باشووردا لەم نەریتە هیچ نەماوە.

٧ـ نەریتەکانی چوارشەمە سووری جگە لە ناو ئێزدیەکان و کاکەییەکاندا لە باشووردا شوێنەواری نەماوە. لە رۆژهەڵات لە ناوچەی موکریان و مەهاباتدا زۆر بەرێزتر لە نەورۆز بە ئاگر کردنەوە و شادیەوە بەرێوە دەچێ. لە سنەی ئێستادا کە تا ٨٠ لە سەدی گوندنشینگەلێکن کە لە پەنجا ساڵ لەمەو پێشەوە هاتوونەتە شار لەگەڵ رابووردوو جیاوازی هەیە.

ئێستا پێش ئاوابوونی خۆر ئاگر دەکرێتەوە و لە دەوریدا هەڵپەرکێ دەکرێ بەڵام چل ساڵ لەمەو پێش هەرماڵێك بۆ خۆی لە بەردەرکی ماڵ (نە لە سەربان کە تایبەت بوو بە ئاگری نەورۆز) ئاگر دەکرایەوە. لە لای ئاگرەکە دەفری سواڵەتی کۆنیان دەشکاند و پاش تەواوبوونی ئاگرەکە سواڵەتی شکاو و بووڵی ئاگرەکە کۆ دەکرایەوە و لەگەڵ سکەیەکی کەم بایەخ فڕێ دەدرایە زبڵدانی کۆڵانەکە. پاش ئاگرەکە تاریك داهاتبوو دەهاتنە ماڵەوە شێو، خۆراکی یەکاوە بوو کە لە برنج دروست دەکرا و گوشتی تێدا بوو. پاشان ئاجیل و شەو چەرەی ئەو کاتە کە بریتی بوو لە سرینچك و تووە شیرینە و قەیسی کوت و قۆخی وشك کراوە و هەجووجەك (تووە هەرمێ برژاو) دەخورا. لەو کاتەی نزیك نەورۆزدا وەکوو ئەمڕۆ میوە نەبوو (لە بیر نەچێتەوە کە سەلماندمان نەورۆز لەگەڵ جەژنێ سەری ساڵ تێکەڵاو کراوە و چوارشەمە سووری واتە کوڵە چوارشەمە ئاخرین چوارشەمەی وەرزی بەهار بووە. کە ئێستا ئاخرین چوارشەمەی وەزی زستانە.

۸ ـ شوێنەواریتری میترایی لە کوردستاندا: خاڵ کوتاندن، لە پەنجا ساڵ لەمەو پێشدا کە دەچووین بۆ حەمامەکانی سنە لەسەر سینگ و باسك وزەندی پیاوان خاڵ کوترابوو. هەموو ئەم خاڵگەلە بریتی بوون لە شێر، فریشتە (پەری ـ کە ژنێکە دوو باڵی هەیە و بە وردی وەکوو فریشتەکانی سەرووی تاقە گەورەکەی تاقەوسانە). ڕۆسەم (پاڵەوانی ئوستوورەیی کە لە چیرۆکە حیماسیەکانی ئێراندا زۆر بە نرخە بەڵام ناوی لە ئەوێستاو دەقە زەردەشتیەکاندا نیە چون کوشندەی ئەسفەندیار کوڕی گوشتاسپ شا، پەرە پێدەری ئاینی زەردەشتیە). هەروەها ئەسکەندەر و ماسی و ئەژدیها. هەروەها شێرێك کە لە سەرپشتی خۆر هەیە. گوڵێك وەکو نیلووفەر کە ئافرەتێك لە نێویدا دەهاتە دەرەوە. ئەمانە هەموو بە میهردینیەوە پێوەندی هەیە.

۹ـ هەڵپەڕین ـ هەڵپەڕین لە کوردەواریدا بریتیە لە هەڵپەڕکێ شایی ـ هەڵپەرکێی شەڕ ـ هەڵپەڕکێی لە شەڕ گەڕانەوە (شەلان لە هەڵپەڕکێی سنەدا) هەڵپەڕکێی پرسە (چەمەری) و هەڵپەڕکێی ئاینی کە ئەو هەڵپەڕکێیە بە ئامرازی موسیقای تایبەتەوە ئێستا لە ناو کوردە موسڵمانەکاندا وەکوو کوورەی زیکری لێ هاتووە. بە هەڵپەڕکێی ئاینی «سەماع» دەڵێن. بە باوەڕی من سەمای ئاینی و هەروەها هەڵپەڕکێی چەپی پاشماوەی سەمای پەرستگە میترایەکانە. (دەبێ توێژینی لەسەر بکرێ).

۱۰ـ هەندێ نیشانەی سەر عەلەمەکان. لە ڕۆژی ئاشووردا ڕۆژی شەهید بوونی حسێن کوڕی عەلی (د ـ خ) لە ناوچە شیعەنشینەکانی کوردستان بەتایبەت لە کرماشاندا، دەستەی تازیەدار عەلەمێکیان هەیە کە پیاوێکی زۆردار دەتوانێ هەڵیگرێ. لە لێوارەکانی ئەم عەلەمەدا پەیکەری تاوس و هەڵۆ هەیە کە هەر دوو لە نیشانەکانی میهرپەرستیە. بە باوەڕی من ئەوە هی زەمانی غوللاتی شیعەیە کە هاتۆتە ناو شیعەکانی جەعفەریەوە. لە تارانیش هەر وەکوو پارێزگای کرماشان ئەو پەیکەرگەلەم لەسەر عەلەمەکان دیوە. (دەبێ توێژینی لەسەر بکرێ).

۱۱ـ موسیقا: ئامرازەکانی تەمۆرە و دیوان (کە ماناکرانەوە) و دەف و تەپڵ پێوەندی بە موسیقای ئاینەوە هەیە. ئێستاش دەف و تەپڵ لە خانەقاکان و تەمۆرە (تەن + مۆرە) و دیوان (دیڤی وان) لە جەمخانەکان و لە لالەشدا بەکار دەبرێ. وتمان تەمۆرە لە ڕۆمدا کرا بە دیوان. میهرپەرستی کە چوو بۆ ئەوروپا لە ئامرازی موسیقای ئەوێ کەلکی وەرگرت.

پاش لە نێوچوونی میهرپەرستی لە بەرانبەرئاینی مەسیحیەوە لە کەلیساکاندا لە ئامرازی ئورگ کەلك وەرگیرا.

١٢ـ روو بە رۆژهەڵات دروس‌کردنی خانووەکان لە گوندەکانی کوردستاندا لەسەر ئەو باوەڕەی میهرپەرستیەکە دەیانەویست کاتی سپێدە یەکەم تیشکی خۆر بداتەوە نێو ماڵەکانیانەوە. ئەم کاتە کاتی ستایشتی میهرپەرستەکان بوو. بەم بۆنەوە توانجی خۆرپەرستیان لێیان دەدا.

١٣ـ کێلی قەبری بەرز لە کوردستانی باکوور و لە ئازەربایجان و لورستان و کرماشاندا تایبەتی عەلەویەکان (شیعەکانی زێدەڕۆیی‌کەر) بووە.

١٤ـ پەیکەری شێر و بەران کە وتمان شێر نیشانەی میترا و ئاژەڵی گیاخۆر نیشانەی مانگە لەسەر قەبرەکانی لورستان و ئازەربایجان و کوردستانی باکوور هەیە کە هی عەلەویەکانە و ئەمیشە بناغەی باوەڕمەندی ئەوان پیشان دەدات.

١٥ـ وتمان شێر نیشانەی میترایە. لوڕەکان (کە بەشێ گرینگ لە کوردن) لە ناوچەی بەختیاریدا لایان وایە دوو جۆر شێر هەیە.

شێری گەنم ڕەنگ کە شێری موسڵمانە و شێری کافر کە دێزە و یاڵەکانی ڕەشە.

ئەگەر تووشی شیری موسڵمان هاتی بە عەلی (د- خ) سوێندی بدە بەڵام شێری کافر هێرش دەکاتە سەرت ئێستا بەختیارییەکان شیعەی دوانزە ئیمامین بەڵام ئەو باوەڕە لە میهرپەرستیەوە ماوەو شێری ڕەش هەر لایەنی قەهر و تاریکی خودایە کە باسمان کرد.

١٦ـ لە شوێنەوارەکانی‌تری میهرپەرستی قوربانی کردنی گایە لە شەوێکی چوارشەمەی ئاخری چلە گەورەی زستاندا لە هەورامان لە سەر گۆڕی پیر شالیار. لەو تارێکدا بڵاوم کردۆتەوە کە پیرشالیار زەردەشتی نەبووە و زەردەشتی گۆڕی نیە.

ئەو لەسەر ئاینی کاکەیی بووە و ئەم قوربانی کردنەش نەریتی هەرە گرینگی میهرپەرستیە. هەروەها قوربانی کردنی گا لە پەرستگەی لا لەشدا.

١٧ـ شێری ئاو: لە مێژدا شێری ئاویان وەکوو سەری شێر دروست دەکرد کە لە دەمیەوە ئاو دەهاتە دەرەوە. لە نەخشە میترایيەکانی ئەورووپادا دەبینین کە میترا بە کەوان تیر بۆ بەرد دەخات و لە بەردە ئاو دەزایەنەتە دەرەوە. وتمان بەرد نیشانەی ئاسمانە و باران میترا دەی بارێنی و یەکێ لە نیشانەکانی میترا شێرە. ئەوەیە کە ئەو ئامرازە وەکوو سەری شێر دروست دەکرا. ئێستاش هەر چەند وەکوو سەری شێر نیە هەر «شێر»ی پێ دەڵێن.

---

لەسەری ساڵ و ڕۆژژمێرە وردەکەی خەییام (تەقویمی جەلالی) قسەی کەمان کرد. خەییام تەقویمە هەتاویەکەی خۆی بەم جۆرە هێنایەکایەوە:

ئەو مانگەکانی ساڵی کرد بە دوانزە مانگی سی ڕۆژە کە دەکاتە ٣٦٠ ڕۆژ، پێنج ڕۆژی دزراو، یان پەنجەی تار (خەمسەی موستەرەقە)ی خستە سەر مانگی ئاخری زستان کە دەکاتە ٣٦٥ ڕۆژ. چوارساڵ یەکجاریش پێنجەکە دەبێ بە شەش ڕۆژ.

١٢٠ ساڵ یەکجاریش کەبیسە دەکرا بە دوو ڕۆژ. ئێستا لە ئێران پەنجەی تار نەماوە بە جێگای ئەوە مانگەکانی بەهار و هاوین کراون بە ٣١ ڕۆژ، ئاخر مانگی زستان کراوە بە ٢٩ ڕۆژ. لە کەبیسەدا ٢٩ دەبێ بە ٣٠ ڕۆژ.

---

سەری ساڵی پێش ئیسلام لە سەرەتای دووهەم مانگی بەهاردا بوو. هاوینی گەورە لەو ڕێکەوتەدا دەستی پێ دەکرد و تا ئاخری یەکەم مانگی پاییز درێژەی بوو. خەییام سەری ساڵی هێنایە سەرەتای یەکەم مانگی بەهار کە لە بەشی یەکەمدا وتمان لەگەڵ نەورۆز تێکەڵاو کرابوو.

نەورۆزی ئێستا کە بە پێی تەقویمەکەی خەییامە لە گشت ئەو ناوچەگەلە کە هۆزە ئێرانیەکانی تێدایە وەکوو یەك بەڕێوە دەچێ. سەری ساڵی پێش ئیسلام کە بە وردی دەکاتە ٢٠ی ئاوریل واتە شەوێ ئاخری مانگی یەکەمی بەهار ڕێکەوتە لەگەڵ جەژنی گەورەی سەری ساڵی ئێزدیەکان. ڕووداوە مێژووییەکان نەوروزیان هێناوەتە شەوی یەکەمی ئیعتیدالی بەهاری و بووە بە جەژنی سەری ساڵیش، ئێمەیش ئیستا بە پێی ڕووداوە مێژووییەکان ئەم ڕێکەوتە بەڕێوە دەبەین. سەری ساڵی ڕەسەن هی ئێزدیەکانە.

---

لەسەر ڕەنگی سوور و پیرۆزی ئەم ڕەنگە لە میهردینیدا قسەی زۆرمان کرد و لە ئاوەزی سووردا وتمان ڕەنگی سوور بەرهەمی تێکەڵاوی تیشك و تاریکی واتە دەرکەوتنی مەلەکە تاوسە.

دانانی ماسی سوور لە سەر سفرەی نەورۆز کە ئاوەکەی نیشانەی زەریای یەکەمین پێش ئافراندن (دیجلەی دەیجوور...) و ماسیە سوورەکەی نیشانەی مەلەکە تاوسە. لەسەر سفرەی نەورۆز جگە لە سەوزی چەنددانەوێڵەی سەوز کراو (لە پێشدا هەفت جۆر دانەوێڵە سەوز دەکرا) گوڵی سومبولیش هەیە. پیم وابێ لە پێشدا گوڵی لیلەوپەڕ (نیلووفەڕ) بووە. هەروەها لە ڕۆژی سێزدەبەدەردا کە وتمان ڕۆژی عرووجی لایەنی تاریکی و قینی خودایە لە جێگا جۆر بە جۆرەکانی ئێراندا پیاوێك جلی سوور لە بەر دەکا و کڵاوی سوور لە سەر دەنێ و بە خەڵووز دەس و دەم و چاوی خۆی ڕەش دەکا و بەدایرەیەکی چکۆلەوە دەردەکەوێ و بە خوێندنی هەڵبەست و گۆرانی و هەڵپەرکێ دڵی خەڵك شاد دەکات. ئێستا بەم پیاوە دەڵێن حاجی فیرۆز (حاجی پیرۆز). دیارە وشەی حاجی پاش ئیسلام و موسڵمان بوونی خەڵك بە جێگای وشەیەکی دێرین دانراوە. حاجی کەسێکە

بۆ حەج دەچێ و مەلەکە تاوس ئەوەیە لەو ڕۆژەدا بۆ ئاسمانی خۆر عرووج دەکات. وتمان دیواخی سووری بووکیش لە کوردستان هەر پێوەندی بە میهردینییەوە هەیە. لە ئەورووپا بە پێی شوێنەواری میهردینی جلی زاوا ڕەش و جلی بووك سپییە.

لێرەدا تیشك و تاریکی کە ڕەنگی سوور پێك دێنێ جیا جیا بووە بە جلی زاوا و بووك و جیاوازی پێك نەهێناوە.

---

هێلکە ڕەنگ کردن لە جەژنەکاندا کە مەسیحیەکانیش بەڕێوەی دەبەن دابێکی دینە کوردیەکان و میهردینییە. هێلکە چەند مانای هەیە:

١ـ نیشانەی ئاسمانە، پێستەکەی بەردی ئاسمانە. زەردێنەکەی خۆرەو توخمەکەی کە لەسەر زەردێنەکەیە، میهر، یان مەلەکەتاوسە.

٢ـ نیشانەی سەدەفە، زەردێنەکەی دووڕی ناو سەدەفەکە و توخمەکەی میترا، یان مەلەکە تاوس، یان خاوندگارە. چەرمێنەکەی زەریای پێش تەجەللای حەق و پێستەکەی، ئاسمان = بەرد = قاپووڕی سەدەفەکەیە. تەوحیدی ئەمانە باسی زۆر هەڵ دەگرێت. دیارە مەسیحیەکان پاشان لە میهردینی کوردی پێش زایینی عیسا (د ـ خ) زەریان گرتووە.

لە نەریتی خواردنی شێوی ئاخری میتراییدا نەخشی هەڵکەندراویك لە ستایشتگای میترایی Koncik کونجیك لە یوگسلاویدا دۆزراوەتەوە کە بە تەواوی لەگەڵ بەیابەستی ژێر ساجناری کاکەییدا یەك دەگرێتەوە. دەزانین پاش خواردنی شێوی ئاخر میترا بۆ ناو خۆر عرووج دەکات. واتە لە ژێر خۆر یان ساج ناردا بووە. زۆر بە وردی بۆ وێنەی ژمارە ٢٠ بنوارن:

لەم نەخشەدا مێزێکی شێو خواردن هەیە. لە پشت مێزەکەوە میترا و هلیووس (ڕۆحی خۆر کەوتمان لەگەڵ بنیامینی کاکەییدا وەکوو یەکن) دانیشتوون. لە لای ڕاستی مێزەکەوە دوو کەس ڕاوەستاون کە یەکەمی ژنە و خۆی لکاندووە بە مێزەکەوە. کەسی دووهەم لە پشت سەریەوە پیاوەو دەموو چاوێك وەکوو هەڵۆی هەیە. لای چەپەوە دوانیتر ڕاوەستاون کە دەمووچاویان بە دەس دەمارگرانی مەسیحی شکیندراوە. میتراو هلیووس لەگەڵ ئەو چوار کەسە هەر کام لەتێك گۆشتی قوربانی لە دەستیاندایە و خەریکن دەیخۆن.

لە پێش مێزەکەدا سەری کەڵەکێویەکی قوربانی کراو (کەڵە زەردە!) بە دیمەنێکی مەعسوومانەوە هەیە. دیارە لاشەکەی خوراوە. لای کەڵەکەوە شێرێکی تووڕە هەیە.

لەم نەخشەدا پەیکەری هەشت بوونەوەر هەیە و بە تەواوی بیرهێنەری کاتی بەیا بەستی کاکەییە لە ژێر ساجناردا. میترا هەر خاوەندگارە. هلیووس پیر بنیامینە کە لە ئەورووپادا ناوی گۆڕدراوە. لە رۆمدا بووە بە سول. ژن دایەرەزبارە. شێری تووڕە لەگەڵ مسەفا (ئیزرائیل و کارگێڕی تووڕەیی خودا) رێك دێتەوە. کەڵی قوربانی کراو لەگەڵ پیر یادگار کە لە ژێر ساجناردا قوربانی کرا یەکن. پیر یادگار لە دوونەکانی سەر زەویدا وەکوو سیاوەش و ئیسماعیل و ئیمام حسێن (د - خ) و کەسانی دیکە قوربانی دەکرێت یان شەهید دەبێت. ئەوەی لای راست کە وەکوو هەڵۆیە هاوتەرازی «داود کەوەسوار»ە. ئەوانەی کە دەموچاویان شکێندراوە، لەگەڵ ئیبراهیمی ئێوەت و پیر مووسا رێك دێنەوە. دیارە ئەمە سەرشانۆکەیە و لە بەرانبەریاندا کەسانی دیکە هەن.

ئەو دانیشتن و شێوی ئاخرە زەمانێکە کە بووژانەوەی ژیان و رێك و پێك کردنی ژیانی مرۆڤ تەواو بووە. لە کاکەییش‌دا خاوەندگار پاش سدوورات و ئافراندنەکانی لە ژێر ساجناردا کە بە باوەڕی من مەبەست زەویە دانیشتن ساز دەکات و بەیابەست = بەڵێن و پەیمان دەکرێت و لەوێدا پیر یادگار قوربانی دەکرێت. (بۆ نەخشەکە لە کتێبی «میترائیسم ئاین مهر - هاشم رەزی» کەلکم وەرگرتووە.

مامۆستا رەزی فەلسەفەی قوربانی و خواردنی گوشتی ئەوە بە «توتمیسم» پێوەندی دەدات (سەرچاوەی ناوبراو. ل ۳۰۷). (توتمیسم یان توتم پەرستی ئەوەیە کە قەبیلە سەرەتاییەکانی هەرە مێژین یان ئەوانەی لە دارستانەکانی ئافریقا و ئامازوندا دەژین گیانلەبەرێك وەکوو نیشانەی قەبیلەکەیان دەپەرستن و گۆشتی ناخۆن). چ پێوەندییەکی بە شێوی ئاخری میترا هەیە؟!

بەڵام وتمان کە میترا یان خاوەندگار بە قوربانی ئاژەڵ لە بناغەدا لە زاتی خۆی جیهان و ژیان پێك دێنی و پەیتا پەیتا وزەی پێ دەبەخشێ. مانگ لە نووری خۆر پڕ دەبێ. مانگ کە نووری حەقە لە لایەن خودی حەقەوە قوربانی دەکرێت تا جووڵە و ژیان و جوانی و تەوین لە زەویدا پێك بێت. لە زاتی حەق سدوورگەلێك پێك دێت. لە ئۆلی میترابیدا وەکوو سەمبول لە میتراوە خۆر، لە خۆرەوە مانگ تیشك زەردەگرێت لە مانگەوە بۆ جیهانی ژێر ژیان و مرۆڤ پێك دێت. مرۆڤ و گیانەوەر و گیا لە راستیدا فەیەزانی خودایە کە لە چەند پەردە تێپەر دەبێت تا بە مرۆڤ دەگات و هەروا کە وتمان هەر ئێستاش ئەم کارە وەکوو سەمبول لە لایەن رۆحولقودسەوە بە یارمەتی سەندن لە خۆر ئەنجام دەگرێت.

وتمان سەر ساڵی هۆزە ئێرانیەکان جگە لە زەردەشتیەکان لەوانە کورد ڕۆژی یەکەمی مانگی دووهەمی بەهار بووە کە بە وردی لەگەڵ جەژنی گەورە و سەری ساڵی ئێزدیەکان یەك ڕۆژە. تەقویمەکەی خەییام هێنایە مانگی پێشتر و لەگەڵ نەورۆز تێکەڵاو کرا بەڵام ڕۆژی سەری ساڵی ئێزدی بە وردی ڕۆژی دەس پێکردنی سەری ساڵی پێش ئیسلامی هۆزە ئێرانیەکان لەوانە کورد بووە. زەردەشتیەکان سەرەتای ساڵیان هەوەڵی زستانی گەورە بووە کە لە دووهەم مانگی پاییزەوە دەستی پێدەکرد، بەڵام سەری ساڵی میترایی هەر ئەوەی ئێزدیە.

لە ئەویستادا بەهار و پاییز نیە تەنیا دوو وەرزی هاوین و زستان هەیە. هاوین وەکوو «هەمە» و «هەمەنە» لە هەورامیدا «هامن» بە مانای هاوینە.

«زیم» و «زیمە» بە مانای زستانە. زستان بە قاعیدەی ئەوێستایی دەبێ بە زمووستانە («ز» بزرۆکەی هەیە. زم + وو + ستا+ نە. زم واتە زمسان یان زڤستان یا زوستان. لەسەر «وو» باس کرا. «ستا» بە مانای وێستان. لەسەر «نە» باس کرا. بە گشتی بە مانای کاتێکە کە وەرزی زستانی تێدا وەستاوە.

---

وتمان «ئیبنی نەدیم» داسنی وەکوو دیسانی (کرمانجی دێسنی) ناو بردووە گشت نووسەرەکان دیسانی بەشێ لەمانەوی دەزانن. تەنیا ئەبووڕەیحانی بیروونیە کە دەڵێ دیسانی پێش لەمانەوی هەبووە چون مانی لە بەرهەمەکانیدا ئاماژەی پێ کردووە. هەندێ نووسەر وشەی داسنی بە جێگای ئێزدی بەکار دەهێنن لەوانە «عەبدولقادر بن روستەم بابانی»ە لە کتێبی «سەیرولنەکراد» کە بە فارسی نووسراوە و بە تێکۆشانی «موحەمەد ڕەئووف تەوەکوللی» چاپ کراوە. لەوەدا داسنیان وەکوو ئێزدیانی نیشتەجێ لە چیای «زەنگارییە» (شنگار) دەناسێنێت (سەرچاوەی ناوبرا. ل ١٨٦)

ئەو هەندێ لە بیرو باوەڕەکانی ئیزدی هێناوەو و بە داسنی ئێزدیەکانی ناساندووە، ئەگەر لە ڕاستیدا داسنی و ئێزدی یەك بن دیارە داسنی لەگەڵ دێسانی ئیبنی نەدیم یەك نین چون دێسانی دوانەپەرست بوونە بەڵام ئێزدی تاكپەرستن. توێژینی زۆرتری پێویستە.

---

«سیاه چشما، ماها، من این ندانستم      که ماه چهارده را غمزه از غزال بود».

واتە ئەی چاوڕەش، ئەی مانگ، من ئەمەم نەدەزانی کە خەمزە و نازی مانگی چواردە لە ئاسکەوەیە. ئەو بەیتە فارسیە هی غەزەلێکی ئەبوو تاهیری خەسرەوانی شاعیری فارسیوێژی سەدەی چواری کۆچی دەرباری سامانیەکانە، (گنج سخن، ذبیح‌الله صفا ـ ج ١ ل٢٢)

هەرچەند بە موسڵمان بوونی هۆزە ئاریيەکان پێوەندی ئوستوورەیی و ئۆلی مانگ و ئاژەڵی گیاخۆر نەما، بەڵام ئاژەڵی گیاخۆر وەکوو سەمبولی مانگ لە فەرهەنگی ئەواندا بۆماوەیەکی زۆر هەر مابوو. شایانی باسە جگە لەو شاعیرە و ئەو بەیتە لە ناو شاعیرە فارسەکاندا هیچ کەسم نەدیوە بەو شتە ئاماژەی کردبێت.

---

وتمان لە میهرپەرستیدا بەرد ئاماژە بە ئاسمانە و وشەی ئاسمانیشان لێکدراویەوە کە لە وشەی «ئەس= ئاس» بە مانای بەردگیراوە. لە ئەدەبی کاکەییش‌دا، تەوەن واتە بەرد هەر ئاماژە بە ئاسمانە. لە کەلامی نەوەدو نۆ پیری شاهودا کە دوونەکانی پێشینی خۆیان دەر دەبڕن. پیر نامدار دەڵێ.... نامم حەکام بیوەرتەر نە ئاسمان. زۆرێك لەو نەود و نۆ پیرە وشەی ئاسمان یان سەما، یان ئەفلاکیان هێناوە بەڵام پیر حاجی بە جێگای ئاسمان، وشەی تەوەنی هێناوە کە لە هەورامیدا بە مانای بەردە «..... نامێم جاسووس بیوەرنەکۆی تەوەن» یان پیر ئەڵماس دەڵێ «.... نامێم زەمزەم بیوەرنە سەمای تاش» سەمای تاش واتە ئاسمانی بەردین. تاش بە مانای زەردە و رەوەزە. پیر مەستی دەڵێ، نامێم بیعەتران وەرنە سەنگ بەردی، کە هەر مەبەست ئاسمانە.

---

جامی مانگ و سیمورغ نیشانەی خۆر لە ئەدەبی کاکەیی‌دا هەیە کە نیشانەی هەرە کۆنی کوردەواریە خەلیفە دەمیاری نەوسوودی شاعیری زەمانی باوە نائووس پێش سان سەهاك پارچە شیعرێکی هەیە لەوەدا بە نائوس دەڵێ:

قازیتەن قازی هەر دوو سەر پەی یار      جامش مەهتاوەن بن چەرخوو دەووار

واتە داوەرت «قازی»ە (قازی دوونی بنیامینە لە زەمانی باوە ناوزدا) لە «هەوەڵ» و «ئاخر»ەوە. جامی خواردنەوەی لە مانگەشەوە لە ژێر چەرخی خولدەردا.

مورغوو نوورین پەڕ لف شنەو پێوار      مووچەو کۆی چلتەن ناکۆمەی ئەخزار

واتە پەلەوەری تیشك پەڕ رێنەی شنەی شاراوە کە مووچەکەی جێگای هاتنی چلتەن (رۆژهەلات) لە کۆگای ئاسمانەکانەوەیە (مووچە بەشی خواردنی پیرۆزە لە جەمخانەکاندا)

لە ئەدەبی کاکەیی‌دا وەکوو ئاماژەکانی کۆنی میترایی زۆر بە پەیوەندی میهر و شێر یان خۆر و شێر ئاماژە کراوە و هەندێك پێشکەش کرا. «عەبدول نازار» شاعیری کاکەیی زەمانی سان‌سەهاك لە بەشی کەلامی «پیر یادگار» لە شیعرێکی‌دا دەڵێ:

نەی وەر غەسڵانی .....+ دیوان نووری نەی وەر غەسڵانی

ئینـــا گـــەواهـــی مـــەدی بـــەیـــانی + بـــرایم و یادگـــار بافتـــە و یـــەك تـــانی ...

«ئافتا و چەنی «شێر» یەك جەسە و جانی + ئەخـزەر ڕێسـمان بـە شـەش تـەکـانی

مـــەندەرمـــدانی نـــەکۆی ســـەریری + گـــا شـــێر ئافتـــاوەن گـــا ئافتـــا و شـــێری

{«ئافتاو» چەنـی «شـێر» یـەك جەسـەو جـانی + ئـەخـزەر ڕێسـمان بـە شـەس تـەکـانی + مەندەرمدانی نەکۆی سەریری + گا شێر ئافتاوەن، گا ئافتاو شێری} واتە لەم بەر، کانی غەسلانە وە، دیوانی نوور لەم بەرکانی غەسلانەوەیە، ئێستا بە بەیان گەواهی دەدەم کـە شـائیبراهیم و پـیر یادگار لە یەك تان (تاڵ) چندراون، خۆر لەگەڵ شێر یەك جەستەو گیانن (خـۆر و شـێر یادگـار و ئیبراهیمن کە لە یەك تالە تیشکن) وەك چنراوەی سەوزی شەست لـۆ کـە یـەك گـوریس دروسـت دەکەن، لە جێگای تەختی شادا کە ڕاخراون گاهێ شێر خۆرە (ئیبراهیم یادگارە) گاهێ خۆر شـێرە (یادگار ئیبراهیمە واتە تیشکی مانگ و خۆر هەر دوو یەکن).

---

جەژنی ئێزدیەکان لە دەی مانگی گەلاریزدا لەگەڵ چلەی عرووجی میترا ڕێك دێتەوە. هەروەهـا جەژنی پیرشالیاری هەورامی لە چوارشەمەیەکی ناوەراست مانگی زستان (بەفرانبـار)دا لـەگـەڵ چلەی زایینی میترا لە سەدەف یان بەرد ڕێك دێتەوە. چون زەردەشتی زەمانی ساسانی نەیتوانی ئەم نەریتە لە ناو بەرێ ناویان نا جەژنی «سەدە» واتە سەد ڕۆژ لە ساڵ تێپەڕیوە. بەهار کـوردیش لـە هەندێ ناوچەی کرماشاندا هەر چلەی زایینی میترایـە. سـاڵی زەردەشـتی لـە سـەرەتای دووهـەم مانگی پاییزەوە دەستی پێدەکرد.

تەواو

لەم بەرهەمەدا سەدان ناوی جوغرافیایی و ئوستوورەیی وکەسانی هاوچەرخ و پێشوو هاتووە کە ئەگەر گشتی بنووسرێ لاپەڕەی زۆر دەگرێتەوە بەڵام پێویستە ناوی کتێب و سەرچاوەگەلێ کە لەم کتێبەدا لەوانە کەڵك وەرگیراوە یان ئاماژەی پێکراوە بنووسرێ.

## ریزی کتێب و سەرچاوە

### ناوی نوسەری کتێبەکان لە دەقەکەدا هاتووە

آئین مهر میترائیسم (هاشمی رەضي)
آئین میترا (فرانتس کومون)
آئین میترا (مارتین وێرمازون)
آئین یهود
اثار الباقیه عن قرون الخالیه
اثار الحق
أواز پر جبرئیل
اثار فارسي حضرة شیخ شهابالدین
ئاوەزی سوور. ب. ب، عقل سرخ
ئاوێنە (گۆڤار ژمارە ٩)
ئایندە (گۆڤار ژمارە٣٤)
ئایندە (گۆڤار ژمارە ٣٩)

ا ـ ئـ

احسن التقاسيم

اوراق

ايران از ابتدا تا اسلام

ايران در آستانەی يورش تا زيان

ئەوڕێستا

ئينجيل

سوهرەوەردی

اخبار البغداد

اخبار الدوله السلجوقيه

ارتنگ (ارژنگ)

اسكندرنامه

اسلام در ايران

اشكال العالم

اعلام التقي

اعلام الهدی

اقبال نامة

البدأ و التأريخ

التنبيه و الاشراف

الشبك

الشجره الالهيه

الكامل

الهی نامه

المسالك و الممالك

الملل و النحل

انسیکلوپدی اسلام

ب

بابك خرمدین

برایمۆك (بەیت)

برگزیده اسار عین‌القضاة

برهان الحق

برهان قاطع

بصایر

بندهش (بونده‌هیشن)

پ

پرشن میتولوجی

پژوهشی در اساطیر ایران

ت

تاریخ أصطخري

تاریخ غازانی

تاریخ گردیزی

تاریخ گزیده

تاریخ ماد

تاڤگه (گۆڤار)

تاویل الزکات

تمهیدات

تحفة مظفرية

تحقيقى در دين يهود

تذكرة الاولياء

ترانه‌های باباطاهر

تلويحات

ج

جامع‌الحكمتين

جامعه شناسى مردم كرد (كۆمەڵگاناسیی گەلی كورد)

جستجوهاى تصوف

جغرافياى تاريخى ايران

جهانگشاى جوينى

چ

چەردە باسێك لەبارەی كوردانەوە

ح

حبيب‌السير

حكمه‌الاشراق، ب.ب، فەلسەفەی ئیشراق

حكمت خسروانى

خ

خاکسار و اهل حق

خسرو شیرین

د

دائرەالمعارف الاسلامیه

دائرەالمعارف فارسی

دبستان المذاهب

دول الاسلام

دەورەی چل تەن (دەفتەری کاکەیی)

دیوانه گەوره

دیوانی مەلای جزیری

دیوانی مەولەوی

دیوانی بێسارانی

ر

راحەالسرور و آیەالسرور

راڤەی وشەی کورد (وتار، گۆڤار)

روزی با جماعت صوفیان

رساله عشق

رساله فی حاله الطفولیة

رشف النصائح

ریگ وێدا

## ز

زبان مورچەها

## س

سرچشمه تصوف در ایران

سروه (گۆڤار ژماره ۹۲)

سفرنامه ابن حوقل (ایران در سورەالارض)

سلامان و ابسال

سکاها

سوهرەوەردی حەلەب

سوهرەوردی دانای حکمت باستان

سەرەنجام

سەیدەوان (بەیت)

سیاحەتنامەی ئەولیای چەلەبی

سیرالاکراد

سیرەی سەلاحەددین

## ش

شاهنامەی حەقیقەت

شاهنامەی فیردەوسی

شناخت اساطیر ایران

شەرەفنامە

شەدادولئەزار

شێخ فەرخ و خاتوو ئەستی
شیرین و فەرهاد

ط
طبقات‌الاطباء

ع
عقل سرخ(عەقڵی سوور ـ ئاوەزی سوور)
عوارف

ف
فارسنامه ابن بلخی
فتوح البلدان
حکمه الاشراق
فرهنگ پهلوی
فرهنگ فرق اسلامی
فرهنگ گیل و دیلم
فرهنگ نامهای اوستا
فضائح الباطنیة
فرهنگ واژەهای اوستا

ق
قیژەی سیمورغ (صفیر سیمرغ)

قەرو خاتوو گوڵە زەرد (بەیت)
قرآن (قورئانی پیرۆز)
قرمطیان بحرین و فاطمیان
قیام و نهضت علویان زاگروس

ك

کتاب الفهرست، ئەلفیهریست
کتاب پلوتارخ
کتیبەهای اشکانی نیسا
کرد و پیوستگی نژادی او
کورد
کاکەیی
کارنامه اردشیر بابکان

گ

گاثا (گاسا ـ گاساکان)
گنج سخن

ل

لاس و خەزاڵ (بەیت)
لغتنامه دەخدا
لغەالعرب (گۆڤار)

م

مالللهند

مانی و تعلیمات او

ماه در ایران

مجموعه فی‌الحکمه الالاهیه

مخزن‌الاسرار

معجم الادباء

معجم‌البلدان

مقالات الاسلامیین و الاختلاف المسلمین

مەم و زین (ئەحمەدی خانی)

مەم و زین (فولکلۆر)

میترائیسم ئایین مهر

میهریەشت

موسحفێ رەش

منطق‌الطیر

موتارحات

مثنوي معنوي

مشارع

ن

نام‌ئاوران یارسان

نزهة الارواح و روضة الافراح (تاریخ‌الحکماء)

ناسر و مالّماڵ (بەیت)

نزهە القلوب

و

واژه نامه ایران باستان

وفیات الاعیان

ولآتانی رۆژهەلآتی خەلافەت (سرزمینهای خلافت شرقی)

وی دێودات (وەندیداد)

ویسپەرد

وێدا (وێداکان)

ه

هفتپیکر

هۆم یەشت (هوم یشت)

هەنبانە بۆرینە

هەیا کلوننور

ی

یادداشتهای قزوینی

یشتها (یەشتەکان)

یەسنا (یسنا)

وینەی ژمارە ١:

تابووتی سواڵەتی گۆڕی زەمانی هیخامەنشیەکە لە شووشدا دۆزراوەتەوە و بەدا بێمیهرپەرستی نێژراون.

لە (ایران از ئاغاز تا اسلام. رومن گیرشمن. ترجمە محمد معین).





وێنەی ژمارە ٢:



گۆڕی زەمانی هیخامەنشی لە شووش باشووری ڕۆژاوای ئێران. مردوو لە تابووتی سواڵەتدایە. ئەمە دابی میهرپەرستیە. دیارە ئەو زەمانە دابی نەسوودان و نەستۆدانی زەردەشتی بەڕێوە نەبراوە.

**وێنە ژمارە ٣**





مردوو لە تابووتی سواڵەتی لە گۆڕدا. لە شووش دۆزراوەتەوە. هی زەمانی ئەشکانیەکانە کە میهرپەرستی زۆر پەرەی سەندبوو (ایران از ئاغاز تا اسلام. رومەن گیرشمەن. وەرگێڕ بە فارسی موحەممەد موعین)



ئەم نەخشە ئەردەوانی پێنجەم پادشای ئەشکانیەکە بە گومانی نووسەری ئەم پەرتووکە پەیمانی فەرماندارى وڵاتێك لەگەڵ کەسێکی دیکە دەبەستێ.

وێنەی ژمارە ٤



نەخشی لە بەرد هەڵکەندراوی «ئانوو با نی‌نی» پادشای لوولووبیەکان لە «سەر پل زەهاو» کوردستانی رۆژهەڵات هەزارەی سێی پێش زایین. لەگەڵ خوداوەند «نی‌نی» پێیان لەسەر دوژمنی شکست خواردوو داناوە و خوداوەند بە حەڵقە (بازنە) بەڵێن و پەیمانی حکومەتی پێ دەدات. لە سەریانەوە خۆر کە خاچ لە ناوە راستیدایە چاوەدێرە. دیارە بازنە و خور وەکوو نیشانەی بەڵێن و پەیمان زۆر کونترە لە هاتنی ئارییاییەکان لە ناوچەکەدا. پاش هەزار ساڵ وەکوو پیشان دەدرێ داریووشی هیخامەنشی لە بێستووندا لاسایی ئەوەی کردۆتەوە. هەشت سەدساڵ پاش داریووش ئەردەشێری ساسانی لە تاقەوساندا سەری کوردانشای مادی خستۆتە ژێر پێی. لە بێستووندا بە جێگای خاچ و خۆر پەیکەری هەرە کۆنی میترا پێش بەدی هاتنی ئاینی میترایی دانراوە. دیارە زۆر هەڵەیە بەو نەخشە لە ئێراندا ئەهوورامەزدا یان فرووهەر (فرەوەشی) دەگوترێ. لە نەخشەکەی تاقەوساندا وەکوو پیشان دەدرێ بە جێگای ئاماژەی میترا لە سەرەوە خودی میترا بە شێوە وەستاوە.

وێنەی ژمارە ٥



گۆڕی پادشای ماد لە بازێری «سەهەنە» (سەهانە = سەدکانی) نزیک کرماشان کە وەکوو دەخمە لە تاشە بەرد هەڵکەندراوە.لە سەر دەخمەنیشانەی رۆحی خۆر هەڵکەندراوە. ئەو نەخشە هیچەند سەدە پێش بەدی هاتنی ئاینی میتراییە. دیاکو نوف دەخمەکەی قزقاپان لە کوردستانی باشوور بە گۆڕی «هوو خشتەترە» پادشای بە هێزی ماد کە ئاشووری تێك شکاندەزانێ و ئەوەی دووکانی داود لە سەر پل زەهاو بە گۆڕی «ئشتۆ ویگۆ» دەناسێنێ کە هەر ئەو نەخشەی ° هەرەکۆنی رۆحی خۆری لەسەر بەرد نووسراوەکەی داریووشی لە بێستووندا هەیە. هێرتسفوڵد ئەو نەخشەی وەکوو پەیکەری ئەهوورامەزدا و میترا ناساندووە کە ئەهوورامەزداکەی هەڵەیە. دخمەکانی سەهەنە و قزقاپان زۆر لە یەك دەچن. دەخمەکەی سەهەنەش هی پادشایەکی مادە بەڵام نازانین کامیان.

وێنەی ژمارەی ٦:

بێستوون ڕۆژهەڵات جەستەی کوژراوی فەرماندراری ماد لە ژێر پێی داریووشدایە. دەستی راستی بە نیشانەی سوێندو راستی قسەکانی بەرز کردووتەوە لە بەرانبەریدا پەیکەری میترا پێش بەدیهاتنی ئاینی میترایی دەبینرێ لە نەخشەکەی ئانوربانی‌نی‌دا بە جێگای ئەو نەخشە خۆر و خاچ هەیە. ب. وێنەی ژمارە ٤



تاقەوسان رۆژهەلات یەكێ لە دوو فریشتەی تاقە گەورەكەی تاقەوسان. فریشتە یان پـەری بـە ئاینی زەردەشتیەوە پێوەندی نیە. فریشتە لە ئەوێستادا وەكوو «پـەئیریكـا» (پـەئـیری = پـەری) ناسراوە كە بوونەوەرێكی ئەهریمەنیە.



## وێنەی ژمارە ٧



نەخشی سەر بەردنووسراوەی بێستوون. وەکوو پەلەوەرێك لە خۆر هاتۆتە دەری و بازنەی کەمەر و دەستی راستی پێشاندەری رۆحی خۆرە. دەستی چەپی کە نزیك بە دلە بە نیشانەی گەواه بوون بەرز کردۆتەوە (ب.ب. بەشی هەفتەم)

وێنەی ژمارە ٨:



ئەو نەخشە لەسەر کاشی سواڵەتی زەمانی هیخامەنشی لە تەختی جەمشێد دۆزراوەتەوە. بەو بازنەگەلە کە لە پێیدایە دیارە کە چەشنێکیتری نەخشەکانی سەهەنەو و تاقەوسان و قزقاپانە. لە دین و فەلسەفەی کوردیدا وەکوو سیمورغ ئاماژەی پێ کرا.

وێنەی ژمارە ٩



ئەم نەخشەش وەکوو ئەوانەی سەحنە و قزقاپان و بێستوون نەخشی میترایییە پێش بەدیهاتنی ئاینی میترایی. لەم لاو لایەوە گوڵی لیلەوپەڕ (نیلووفەڕ) رووا‌وە کە وەك وتمان سەمبولی میترایە. بازنە و گوڵی لیلەوپەڕ بە جوانی پیشاندەدات کە ئەو نەخشە نیشانەی ئەهوورامەزدایان فرووهەر نیە.

**وێنەی ژمارە ١٠**



جەستەی کوژراوی کوردانشای مادی لە ژێر پێی ئەردەشێر و فەرمانداری تازەیدا (ب. ب. بەشی هەفتەم ل ٤٥٦)

وێنەی ژمارە ١١

کوردانشای مادی لە ژێر پێی ئەردەشێر و فەرمانداری تازەی ماددا





وێنەی ژمارە ١٢

گوڵی لیلەوپەڕ لە ژێر پێی میترادا کە یەکێ لە سەمبولەکانی میترایە.

وێنەی ژمارە ١٣:

ئەردەشێری ساسانی کە لەگەڵ فەرمانداری تازەی ماد بە بازنە و شنێل پەیمانی وەفاداربوون دەبەستێ



وێنەی ژمارە ١٤:

تاقە گەورەکەی تاقەوسان میترا ـ خەسرەو پەرویز ـ ئەناهیتا خودای پارێزەری ئاوەکان



وێنەی ژمارەی ١٥

گوڵی لیلەوپەڕ (نیشانەی میترا) لەم لاو لای تاقەگەورەکەی تاقەوسان





وێنەی ژمارەی ١٦:

ئەم دوو پەیکەرە لە تاقەوسان وەکوو دوو پادشای ساسانی ناسێندراون کە چی لە پەیکەرەکانیتردا وەکوو ئەهووڕامەزدا!

**ێنەی ژمارەی ١٧:**

**یەکێ لە فریشتەکانی ئەم لار لای تاقە گەورەکەی تاقەوسان کە وتمان بە میهردینیەوە پێوەندی هەیە.**



**وێنەی ژمارە ١٨:**

**تاقە گەورەکەی تاقەوسان. لە سەرەوە میترا ـ خەسرەوپەروێز ـ ئەناهیتا**







وێنەی ژمارەی ١٩:

دەرکەوتنی میترا لە سەدەف و لیلەوپەڕ. لەسەر میترا دولڤین دانراوە کە ئەویش وەکوو لیلەوپەڕ نیشانەی ئاوو زەریای یەکەمینە لە دینە کوردیەکاندا. لە ستایشتگای «مەرنهایم» لە فرانکفورت دۆزراوەتەوە.



وێنەی ژمارەی ٢٠:

ئەم پەیکەرانە لە ستایشتگای میترایی کونجیك لە یوگسلافیا دۆزراونەتەوە. شرۆڤەکەی لە بەشی هەفتەمدایە. بەڕێوەبردنی شامی ئاخر و پەیمان بەستنی میترایە. بە وردی وەکوو بەیابەستی ژێر ساجی ئارە. ژمارەکان خۆم دامناوە.

وێنەی ژمارەی ۲۱:



ئەم پەیکەرە کە بە هەڵە بەزروان ناسێندراوە بە جوانی و ئاشکرایی تەوحیدی دوولایەنی قین و تاریکی و نوورو رەحمەتی حەق وەکوو ئەو تاك پەرستیە کە لە دینە کوردیەکاندایە پیشان دەدات. شێر و مار و ئامرازی جنسی نیشانەی قەهرە وەکوو سوهرەوەردی دەڵێ) یان جەلالی حەق وەکوو عیرفان و سۆفیگەری دەڵێ جوانی دیمەن و ئەندام و شەماڵەی نوور نیشانەی ئەوین و جوانی یان «حوسن» کە سوهرەوەردی دەڵێ، یان جەماڵی حەق کە عارفگەل دەڵێن. بە گشتی لێکدرانی ئەو دوو لایەنە مانای تەواوی مەلەك تاوسی کوردانە. ئەگەر زینێر و وێرماوزن و کومون و رەزی و... ئەوانەی ناومان برد زانیاریان لەگەڵ دینە کوردیەکان بوایە بێ هیچ بەڵگەیەك نەیاندەگوت کە زروانە.

**وێنەی ژمارە ۲۲:**

**دوو پەیکەری لایەنی ڤین و تاریکی حەق کە بە هەڵە بەرزوان ناسێندروان**



**وێنەی ژمارە ۲۳:**

**لەم پەیکەرەدا دوو لایەنی ڤین و تاریکی و تیشك و بەزەیی خودا وەکوو یەك راستەڤینە پیشان دراوە.**



وێنەی ژمارە ٢٤:

دەرکەوتنی میترا لە گوڵی لیلەپەڕ (تەجەللای خودا لە زەریای تاریکی یەکەمین لە دینە کوردیەکاندا) ئەم گوڵە لە ناو ئاودا دەڕوێ



**وێنەی ژمارە ٢٥:**

**زایینی میترا لە بەرد. لەم پەیکەرەدا مار بە نیشانەی لایەنی ڤین و تاریکی حەق بەشێ لە بەردە.**

**لە بەشی پێنجەمدا وتمان کە لە فەلسەفەی سوهرەوەردیدا ڤین و تاریکی (قەهر)ی حەق لە مادەی تاریکدا کامیل دەبێت کە مادەی تاریکیش چەشنێ نوورو تەجەللای خودایە.**



## وێنەی ژمارە ٢٦



لەم نەخشەدا میترا خۆی ئامادەی کوشتنی گا دەکات. لە ڕاست و چەپیەوە مانگ و خۆر هەیە. سەنبولی خۆر شێرە کە لە ژێریدایە. سەنبولی مانگ هەم ئاژەڵی گیا خۆرە و هەم کەڵەشێر کە وەکوو کەڵەشێر لە ژێریدایە. قوربانی کردنی کەڵەشێر لە ئاینە کوردیەکاندا بە جێگای ئاژەڵی گیاخۆر بۆ ئەم راستیە دەگەڕێتەوە. لە نەخشەکەدا دوو کەسی (کووت و کوتووپات) دەبینین کە نیشانەی خۆر هەڵاتن و خۆر نیشتنە.

سەگ و مار و دوو پشك چاوەڕێی قوربانی کردنن. قالاو و هەڵۆش لە نیشانەکانیتری ئاینی میتراین.

وێنەی ژمارە ٢٧

میترا و قوربانی کردنی گا (مانگ). شرۆڤەی لە ناو دەقەکاندایە.



وێنەی ژمارە ٢٨



**ستایشگای میهری ئوستیا له ئیتالیا. میترا له کاتی کوشتنی گا (هەئومەیە هەیڤ = هزم = مانگ)دا**

وێنەی ژمارە ٢٩



Lion-headed god standing on globe with crossed circles

پەیکەری لایەنی ڤین و تاریکی خودا کە بە هەڵە بەرزوان ناسێندراوە.

وێنەی ژمارە ٣٠

پەیکەری میترا پاش بەدیهاتنی ئاینی میترایی لە کاتی کوشتنی گادا

(ب.ب. ناوەڕۆکی بەشەکانی ٣ تا٧)



وێنەی ژمارە ٣١

دوو پەیکەری میترا کە وەکوو دینە کوردیەکان لە سەدەف دەردەکەوێ. ب.ب. بەشی هەفتەم.





وێنەی ژمارە ٣٢

پەیکەری لایەنی قین و تاریکی حەق کە بە هەڵە بەزروان و کرونووس ناسراوە. ئەو پەیکەرە هەر میترایە لە جەستەیەکی‌تردا شێر و مار و ئامرازی جینسی نیشانەی لایەنی قەهر و تاریکی حەقە.

وێنەی ژمارە ٣٣:

پەیکەری سەری گەورەی میترا بە کڵاوە تایبەتەکەیەوە لە نەمرووود داغ کوردستانی باکوور



وێنەی ژمارە ٣٤:

دوو پەیکەریتری لایەنی ڤین و تاریکی حەق





وێنەی ژمارە ٣٥:

ئەم دوو وێنە هی سەکاییەکانە کە هەر ئارییایی بوونە. لە تەپۆلکەی یەک لە «پازریک» ئاسیای ناوەندی دوزراونەتەوە. شێر (خۆر) خەریکە گا (هەئومە ـ هەیڤ یان مانگ) دەکوژێ. دیارە ئەوانیش وەکوو ئارییاییەکانی هیندوستان و ئێران بە ئوستوورەی میترا و هەیڤ باوەڕیان بووە.

(کتێبی سەکاکان. تا ما را تالبووت رایس. وەرگێڕ بە فارسی روقیە بێهزادی)



**وێنەی ژمارە ٣٧**



لێرەدا بە جێگای شێر کە نیشانەی خۆر و میترایە، هەڵۆ (سیمۆرغ) کە ئەویش هەر نیشانەی خۆرە و لە بەشی سوهرەوەردیدا باس کرا «هەئومە» یان هەیڤ یان مانگ دەکوژێ. ئەو وێنەش لە ئاساری سەکاییەکانە و لەسەر کۆتاڵی سەر زینی ئەسپ لە تەپۆلکەی یەکی «پازریک» لە ئاسیای ناوەندی دۆزراوەتەوە. سەدەی پێنجی پێش زایین. (کتێبی سەکاکان تامارا تالبووت رایس. وەرگێڕ بە فارسی روقیە بێهزادی)

## وێنەی ژمارە ٣٨

وێنەی خاچ لە برنجەی هەزار ساڵ پێش زایین. لە کۆ کراوەکانی «ئەکرمەن». لە «ماکۆ» (مادکۆ) دوزراوەتەوە. (پیشان دەدات خاچ وەك نیشانەی خۆر زۆر مێژینەترە لە ئاینی مەسیحی). لە کتێبی «ماه در ایران» وەرگیراوە.



وێنەی ژمارە ٣٩

میترا (شێر) لە حاڵی کوشتنی (هوئەمە = هەیڤ= مانگ). سنە. خواجەنشینی ماڵی وەکیل



وێنەی ژمارە ٤٠

هەر ئەو نەخشەی سەروو. بیرهێنەری نەخشی سەکایی و زۆر پەیکەریتری میترایی لە ئەورووپا و میهرابەکانی رۆم.





وێنەی ژمارە ٤١:

گوڵی لیلەوپەڕ (نیلووفەڕ) لەم لاو لای نەخشی میترا و هۆم لە وێنەی خوارەوەدا لە سەر بەردی خواجە نشینەکانی سنە ماڵی «وەکیل» لە قەتارچیان.



وێنەی ژمارە ٤٢:

میترا (شێر) گا (هەئومە= هەیڤ) دەکوژێ. لەم لاولای گوڵی لیلەوپەڕ کە هەر نیشانەی میترایە هەڵکەندراوە. خواجەنشینی ماڵی وەکیل. گەڕەکی قەتارچیان شاری سنە. پاشماوەی میهرپەرستی کۆنی کورد.



**وێنەی ژمارە ٤٣**

**پەیکەری سوهرەوەردی لە مەیدانی سوهرەوەردی شاری سنە.**



**وێنەی ژمارە ٤٤:**

**نەخشێکی‌تری میترا و هەیڤ لە خواجەنشینی شاری سنە لە گەڕەکی ئاغە زەمان کووچەی دەبباغی.**

# سوپاسنامە

لە ساڵی ٢٠٠٤دا دەستم بە نووسینی ئەم بەرهەمە کرد. بەڵام پاش چوار ساڵ تووشی نەخۆشی دەروونی هاتم. بیرو هزرم تێك شێواو حافزەم لە کارکەوت.

لە پێشدا سوپاسی پزیشکی بەڕێز و هاوشاریم جەنابی کاك "دوکتۆر فەرزین ڕەزاعی" دەکەم کە ژیانی ئاسایی دووبارەی بۆم مسۆگەر کرد. پاش دوو ساڵ دەواو دەرمان کۆکراوەکانم شڕوپڕ کردبوو و زۆربەی لە نێو چووبوون، دووبارە دەستم بە تێکۆشان کرد و لە هاوینی ٢٠١١دا کتێب ئامادەی چاپکرا.

سوپاسی کاك "ڕەفعەت مورادی"دەکەم کە ئەو کاتە لە ناوەندی چاپ‌و بڵاوکردنەوەی سلێمانی کاری.دەکرد ، کتێبەکەی زۆر بە وردی خوێندەوەو بۆ بەچاپ گەیشتن لەو ناوەندە پەسەندی کرد و لە کورتکردنەوەو هەڵەبڕیدا ڕێنوێنی کردم.

سوپاسی بەرپرسی چاپ‌و بڵاوکردنەوەی سلێمانی کاك "محەممەد کۆردۆ" دەکەم کە ڕەزامەندی خۆی نیشاندا بۆ بەچاپ گەیشتنی ئەم کتێبە.

سوپاسی کاك "محەممەد عەبدوڵڵا" دەکەم کە لە هەڵەبڕی دواییدا ڕەنجی زۆری کێشا. هەروەها سوپاسی زۆرم پێشکەش بە برادەرانی چاپخانەو گشت ئەوانەی کە بۆ لەچاپدانی ئەم بەرهەمە تێکۆشاون.

سوپاسی تایبەتیم پێشکەش بەیارو خەمخۆر و هاوسەری هەمیشەیی ژیانم "نەسرین حیجازی" دەکەم کە لەتاریکی‌و زەختی ژیاندا هاوڕێ و یاوەرم بووە.

# دوایینامە

سوپاسی خوێنەری بەڕێز دەکەم و ماندوو نەبی پێ دەڵێم، کە خۆی بە خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە ماندوو کرد. هیوادارم:

١- بەو ئاکامە گەیشتبێ کە ئەگەر وەکوو کوردێك لێی بپرسن، ئایا گەلەکەی تۆ کە پێوە شانازی دەکەی وەکوو هەندی گەلی خاوەن فەرهەنگ و شارستانییەت توانیویەتی سیستەمی دینی و عەقیدەتی تایبەت بەخۆی پێك بهێنێت؟ ئایا توانیویەتی سیستەمێکی فەلسەفی تایبەت بە خۆی بە جیهانی خاوەن فەرهەنگ و شارستانییەت پێشکەش بکات؟ بەشانازییەوە بڵێت، ئەرێ ئەوتا دینە کوردیەکان و بناغەکەی. ئەوەتا فەلسەفەی ئیشراقی سوهرەوەردی و بناغەکەی.

٢- ئەوەی لە کەم و کوورِی و رەخنە یان روانگەی تایبەت یان پرسیاری هەیە بە ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی رابگەیەنێت، بە شانازییەوە وەری دەگرم و وەرامی دەدەمەوە.

٣- ئەگەر ئەیەوی بە زاراوەی کرمانجی یان زمانێکیتر وەریگێڕێتەوە هەر لەگەڵ ئەو ناوەندی پێوەندی بگرێت تا ئیزنی وەرگێڕانی پێ بدرێت.

محمد حیجازی

پاییزی ٢٠١١

مەبەست لە شوناس، تایبەتمەندیگەلێکە کە تەنیا پێوەندی بە یەک شتەوە هەیە و دەبێتە هۆی جیابوونەوەی لە شتگەلی دیکە. کورد وەکو مرۆڤ تایبەتمەندیگەلێکی فەرهەنگی و مرۆڤناسانە «ئانترۆپۆلۆژیک»ی هەیە کە لەگەڵ مرۆڤگەلی دیکەدا هاوبەشە. ئەمە شوناسی مرۆڤایەتییە نە شوناسی گەلی کورد، هەروەها وەکو موسڵمان تایبەتمەندیگەلێکی هەیە کە لەگەڵ موسڵمانانی جیهاندا هاوبەشە. ئەمە شوناسی ئیسلامییە. بەڵام وەکو کورد لە بوارگەلی جۆراوجۆری فەرهەنگیدا تایبەتمەندیگەلێکی هەیە کە تایبەت بەخۆیەتی و دەتوانین دابەشی بکەین، وەکو شوناسی ئوستوورەیی، شوناسی هونەری کە خۆی بە چەند لایەن دابەش دەکرێ، و....
پاش توێژینێکی زۆر نووسەری ئەم پەرتووکە بۆی روون بۆوە کە کوردیش وەکوو گەلانی گەورە و سەرکەوتوو، لە فەرهەنگە دەوشاوەکەیدا بۆ خۆی خاوەنی سیستەمگەلی باوەڕمەندی و دینی و فەلسەفی تایبەتە، بەڵام توێژینی لەسەر نەکراوە و بەتایبەت فەلسەفەکەی لکاوە بە فەلسەفەی ئیسلامیەوە. فەلسەفەی کوردی لەگەڵ باوەڕمەندی ئۆلی ئیسلامیدا جیاوازی گرنگی هەیە، بەڵام دژایەتی نییە. جگە لە فەلسەفە کورد بۆ خۆی خاوەنی سیستەمی ئۆلی (دینی) و هەندێ سیستەمگەلی باوەڕمەندی تریشە و تایبەت بە خۆیەتی کە لەم بەرهەمەدا بناغەکانی روون کراوەتەوەو ناساندراوە.

## شوناسی ئۆلی و
## فەلسەفەی نەتەوەی کورد

بەڕێوەبەرێتیی
چاپ و بڵاوکردنەوەی
سلێمانی
٢٠١٢